**باران:** ١) ئاوێ کە بە دڵۆپە لە هەورانەوە دا دەرژێ؛ ٢) بارەکان، چەند باری بارەبەر [ف] ١) باران؛ ٢) چند بار باربر.

**باراناو:** ئاوی ڕاوەستاوی باران لە قولکەدا [ف] آب باران جمع شده.

**بارانبڕان:** ئاخر و ئۆخری بەهار کە هەرەتی باران‌باربن نامێنێ، مانگی جۆزەردان [ف] موسم قطع‌شدن باران.

**بارانپێو:** کەسێ یان ئامرازێ لە بارشتی زەوینی باران لێدراو دەکۆڵێتەوە [ف] باران‌سنج.

**باران دادان:** هەوەڵ هاتنەخواری باران [ف] شروع باران.

**باران‌داکردن:** باران دادان [ف] شروع باران.

**باراندن:** لە بەرزیەوە پرژاندن: (هەورە ڕەش **باراندی**، زاوایان گوڵباران کرد) [ف] بارانیدن.

**باراندن:** هاوار و گازی بزن و مەڕ [ف] صدای بز و گوسفند.

**بارانە:** ١) باران لە هەورەوە؛ ٢) ئەو باجەی باجگر بۆ هەر بارێك دەبستێنێ [ف] ١) باران؛ ٢) باج‌بار.

**بارانەو بڕان:** باران بڕان [ف] موسم قطع‌شدن باران.

**بارانی:** ١) هەوای هەورو بێ‌تاو: (ئەمڕۆ هەوا **بارانیە**)؛ ٢) باڵاپۆشی باران دانەدەر [ف] ١) هوای بارانی؛ ٢) بالتو بارانی.

**باربردن:** ١) بارکێشانی بارەبەر؛ ٢) باردزین: (دزهات **بارەکانی برد**)؛ ٣) هەڵگرتن و لێ قەبوڵکردن: (بەخوا برا من **باری تۆ نابەم**) [ف] ١) حمل بار؛ ٢) دزدیدن محموله؛ ٣) تحمُّل.

**باربو:** یارمەتی‌دانی هەژارو بەك‌کەوتە بە پوڵ و ماڵ لە لایەن هاوساو هاوماڵانەوە [ف] کمك مالی.

**باربەست:** ئامادەی سەفەر [ف] مُهیّای سفر.

**باربەستن:** پێك‌نانی ئەسباب و کەل و پەلی سەفەر [ف] رخت سفر بستن.

**باربەستە:** باربەست [ف] نگا: باربەست.

**باربەند:** ١) گوریسی بار پێچان؛ ٢) ئەویلەی سەر ئەگیراوی هەڵبەستراو بۆ بەکسم، بەهاربەند [ف] ١) طناب باربندی؛ ٢) بهاربند.

**باربەندی:** پێچاندنەوەی باروبنە [ف] باربندی.

**باربەنی:** باربەندی [ف] باربندی.

**بارتەقا:** هەمبەر، بەرانبەر، بانەقا [ف] برابر.

**بارچەوت:** پیاوی ناڕاست، بێ ناکار [ف] کنایه از آدم ناراست.

**بارخانە:** ١) ئەو بارانەی کەل و پەلی بازرگانین: (بارو **بارخانە**یەکی زۆر هات)؛ ٢) باری لەسەریەك هەڵچناو: (هەموو لە عەنباردا لە **بارخانە** داوە)؛ ٣) وەختی توتن فرۆشتن: (فەرزەکەت لە **بارخانەی** توتن دەدەمەوە) [ف] ١) محمولۀ بازرگانی؛ ٢) بار برهم انباشته؛ ٣) موسم فروش تنباکو.

**بارخانو:** هیم، خیم، بناغە [ف] اساس، شالوده.

**بارخانی:** بارخانو [ف] اساس، شالوده.

**بارخستن:** ١) ئیسراحەت‌کردنی کاروان: (با لێرە **باران بخەین**)؛ ٢) بێچو لەبەر چون: (ئەم بزنە ئەمساڵ **باری خست**) [ف] ١) اُتراق کاروان؛ ٢) بچّه انداختن.

**باردابەستن:** زۆر توند پێچانی بار [ف] محکم باری را بستن.

**باردار:** زگ‌پڕ، ئاوس [ف] باردار.

**بارداگرتن:** ١) دەفر پڕکردن بە نیازی بارکردن: (**باران داگرە** با بارکەین)؛ ٢) هێنانەخواری بار [ف] ١) جوال پُرکردن؛ ٢) باری را پائین آوردن.

**بارڕاست کردنەوە:** ١) لا باری خوار هەڵێنان؛ ٢) بر بەتبە لە کۆمەگو دەفر یا هانن: (زۆر لێ قەوماو بوم کاکم **باری ڕاست کردمەوە**) [ف] ١) راست نمودن بار کج؛ ٢) کنایه از کمك کردن و فریادرسی.

**بارژن:** بارشت، باربن [ف] باریدن باران.

**بارسایی:** بارست [ف] حجم.

**بارست:** ئەستوری و بڵندی، حەجم: (**بارستی** بەفر بستێك‌بو، **بارستی** ئەستورایی مارەکە قولێك دەبو) [ف] حجم.

**بارستایی:** بارست [ف] حجم.

**بارسوك:** ١) کەم ئەرك؛ ٢) خەم نەخۆر بۆ ماڵی دنیا؛ ٣) هەژارو نەدار: (کەرکوڵ و **بارسوك**) [ف] ١) کم تعلّق؛ ٢) سبکبار؛ ٣) بی‌چیز و ندار.

**بارسوك کردن:** ١) زەحمەت و دەرد لەسەر خەڵك کەم‌کردن؛ ٢) لەباری بارەبەر کەم‌کردن [ف] ١) کمك؛ ٢) از بار باربر کاستن.

**بارسوکی:** برینی لە ئاسودەیی و کەم ئەرکی [ف] سبکباری.

**بارش:** ١) بارین لە هەورەوە، دارژانی بەفر یا باران یا تەرزە؛ ٢) وارش [ف] ١) بارش؛ ٢) حصار.

**بارشت:** بارش [ف] بارش.

**بارك:** جوجەڵە مریشکی بەهارە [ف] جوجۀ بهاره.

**بارکردن:** ١) بار لەسەر پشتی بارەبەر دانان؛ ٢) کۆچ کردن [ف] ١) بارکردن؛ ٢) کوچ کردن.

**بارکەفتن:** نۆشی نزوڵی هاتن، بخت کەوتن، بۆ ئەهاتن. ئەهامەتی [ف] بدبیاری.

**بارکەوتن:** بارکەفتن [ف] بدآوردن.

**بارکەوتو:** بۆ ئەهاتو، خراپ لێ قەوماو [ف] بدبخت.

**بارکەوتە:** بارکەوتو [ف] بدشانس.

**بارکێش:** بارەبەری بەهێز [ف] بارکش.

**بارکێشان:** زەحمەت کێشان، ئەرکی خەڵك وەستۆ گرتن [ف] بار مردم بدوش کشیدن.

**بارگا:** دەزگاو خانو بەرەی گەورە پیاوان [ف] بارگاه.

**بارگر:** دارێ کە ئەیخەنە چێنی بارە کانی بارخانە تا ئەرمێ [ف] چوب لای بار.

**بارگران:** ١) بارقورس، کەسێ کە ئەرکی زۆری لەسەرە؛ ٢) بریەتی لە میوانی چاو ئەزێر یان هەواڵی خوێنتاڵ؛ ٣) تەمەڵ و تەوەزەل. لەش قورس [ف] ١) رنجبر، زحمتکش؛ ٢) مهمان سِمج و گران‌جان؛ ٣) تنبل.

**بارگرانایی:** ئەرکی زۆر [ف] رنج بسیار.

**بارگرانی:** ئەرك و ماندویی زۆر، بارگرانایی [ف] رنج طاقت‌فرسا.

**بارگە:** ١) خورجێن و بەرو بوخچەی سەفەر؛ ٢) باری خواردەمەنی و ئەسبابی سەفەری پیاوی ماقوڵ [ف] ١) رخت سفر؛ ٢) بار و بنۀ سفر

بزرگان.

**بارگەتێك نان:** خۆ ئامادە کردن بۆ سەفەر ف رخت سفر بربستن.

**بارگەچی:** ١) کەسێ کە ئابدارباشی سەفەری ماقولانە؛ ٢) سەرقافڵەی، کاروان ف ١) آبدارباشی؛ ٢) قافلەسالار.

**بارگەوبنە:** کەل و پەل و ئەسپاوی سەفەر ف باروبنه.

**بارگیر:** ئەسپی بارەبەر، ئەسپی ناژەسەن ف یابو.

**بارگیل:** بارگیر ف یابو.

**بارگین:** بارگیر ف یابو.

**بارلێنان:** کۆچ کردن، باری سەفەر بەستن ف کوچ.

**بارماخ:** قامیشە جگەرە ف ورق سیگار فیلتردار.

**بارمتە:** گرۆ، گریو، شتێك لەبانی شتێکی‌تر بە ئەمانەت داندرابێ ف گروگان.

**بارن:** ١) بەفرێ کە با لە بڵندایی و زەقایی بردبێتی و دە فوڵکەی پەسناوبێ؛ ٢) میوەی کە با وەراندوبەنی، باوەرێن ف ١) برفی که باد آنرا جمع کرده باشد؛ ٢) میوهٔ باد ریخته.

**بارنامە:** پسولەی سیابی باران ف بارنامه.

**بارندۆخ:** بەبارشت، بەباران، بارێن: (هەورێکی بارندۆخ بو) ف بارنده.

**بارنەبردن:** هەڵنەکردن، گوزەران نەکردن دەگەڵ یەکێ: (هەرچێ دەکەم باری نابەم) ف نحمل نکردن زندگی.

**بارنەبەر:** بربەنی لە گوێ نەبیس و لاسار و نەگونجاو ف بازیگوش.

**بارنەوەر:** بارنەبەر ف بازیگوش.

**باروبارخانە:** ١) کەل بەلی پارچەو شتی‌تر کە بە کاروان دبێت؛ ٢) بەهیسا بۆ کەفەلی گەورەی ژنانی دەڵێن: (عەجەب بارو بارخانەیەکی هەبە) ف ١) کالای تجارتی؛ ٢) کنایه از باسن بزرگ.

**باروبو:** باربو ف کمك.

**باروت:** دەرمان نفەنگ، باروت ف باروت.

**باروتخانە:** جبەخانە، جەبەڵخانە، جێگەی چەك و فیشەك بۆکردنەوە ف زرّادخانه.

**باروتی:** زۆر ورد: (چای باروتی دەکرم) ف باروتی. بسیار ریز.

**باروشك:** بارانی بەباوە، شلێوە ف باد و باران با هم.

**باروشە:** باوەشێن، باروشە ف بادبزن.

**باروشە:** بازوشە ف بادبزن.

**بارۆکە:** جوجەڵەمر بشکی بەهارەی ساڵ تەواو نەکردو ف جوجهٔ بهاری.

**بارۆگ:** باگر، بابێچ، شوێنێ کە زۆر با بگرێنەوە ف مکان بادگیر.

**بارونە:** گیایەکی بۆن خۆشە دەگەڵ پەنیر ئەیخۆن، بادرەنگ ف گیاه بادرنگ.

**بارە:** ١) بهێنە، وەرینە؛ ٢) بەهرەو داهات: (بارەی مولکەکەت چەند بو؟)؛ ٣) لەمەڕ، لەبابەت: (دەربارەی نۆ بو، دەربارەی منەوە دەدوان)؛ ٤) جار، کەڕەت، هەل، جەل: (دوبارە هاتەوە)؛ ٥) بەش، بێش، بار: (لەو بەش بەشینە بارەی من چەندە؟)؛ ٦) قەرەبو، تۆڵ: (بارەکەلای خۆم دەستێنمەوە)؛ ٧) هێز، توانایی: (ئەم کارە گرانە لەبارەی منا نیە) ف ١) *فعل امر*: بیاور؛ ٢) حاصل و بهره؛ ٣) درباره؛ ٤) دفعه، بار؛ ٥) سهم؛ ٦) جبران، تلافی؛ ٧) توانایی.

**بارە:** هاواری ناژەڵی وردە ف بع‌بع.

**بارهاتن:** هەڵکەوتن، رەخسان، خوگرتنی رۆژانی منالی: (ئەم هەتبوە باش بارنەهاتوە) ف بارآمدن.

**بارەبار:** هەراو هوریای ناژەڵی وردە ف صدای بز و گوسفند.

**بارەبو:** باربو ف کمك.

**بارەبەر:** هەرچی باری بکەن و باری بێ بگوێزنەوە: (هێندە زۆتە، بارەبەری سەگە) ف باربر.

**بارەچە:** داهات، دەرامەت ف درآمد.

**بارەش:** بیهێنە، بۆمی‌بێنە، بێرانی ف ببارش.

**بارەش:** رەشەبا، بای هەرە بەقەوەت ف باد شرقی.

**بارەقەلا:** نافەرم، نافارم، دەست خۆش، چاکت کرد: (حەمەی وەسا فەتاح سەد **بارەقەڵلا** لەم هەموو زیشە / بەتەنیا گوێدرێژێ چۆن دەبا ئەو بارە قامیشە) «شیخ رەزا» ف آفرین.

**بارەکەلا:** لەجیاتی هەڵمەت، قەرەبوی مەزمەزی کایە ف تعویض تیله.

**بارەکەڵلا:** بارەکەلا ف تعویض تیله.

**بارەکەڵلا:** بارەقەڵلا ف بارك‌الله.

**بارەکەو:** جوجکە کەو ف جوجهٔ کبك.

**بارەکی:** بارەبەر ف باربر.

**بارەگا:** بارگا ف بارگاه.

**بارەنداز:** جێگەی خستنی بار ف بارانداز.

**بارهنگیف:** ١) بەرد بان داری پەناریگە کە باری تێ دەگیرێ؛ ٢) کەسێ کە بە گاڵتە پێ کردن خەڵك تووڕە دەکا ف ١) مانعی در کنار راه که بار با آن برخورد کند؛ ٢) مسخره کننده.

**بارەنگێو:** بەردو داری پەنا رێ کە بار نیێ دەهاڵقێ ف نگا: بارهنگیف.

**بارەنناز:** بارەنداز ف بارانداز.

**بارهەڵگر:** ١) بارەبەر؛ ٢) رنجدەرو زەحمەتکێش ف ١) و ٢) زحمتکش.

**بارەی:** بیهێنە، نەوەبێنە، بۆمی بارە، بارەش ف ببارش.

**باری:** ١) شیاوی بارکردن، بەرانبەری سواری؛ ٢) لۆسە، بارە، ئاسنێکی وەك داردەستی دەم نیژە وەبن بەردی قورسی دەدەن تا هەڵی بێنن، مەڵغە، لەوازە، نوێڵ، دەلەم ف ١) باری؛ ٢) دیلم.

**بارێ:** ئەبسە، هەرچۆنی بێت، باڵێ ف باری بهرجهت.

**بارێزە:** ١) گیابەکە لە کەرەوز نەکا؛ ٢) باوەرێن، ئەو میوەی با دەبوەرێنێ؛ ٣) وردە بارانی بە دەم باوە ف ١) گیاهی است؛ ٢) میوهٔ از درخت ریخته؛ ٣) نم‌نم باران.

**باریسە:** ١) فرفرە، فرفرۆکە؛ ٢) داری نێوان کۆڵەکەو کاربتە ف فرفرهٔ کاغذی؛ ٢) چوب میان ستون و دبرك.

**باریك:** ١) زراف، بەرانبەری ئەستور؛ ٢) لەڕو لاواز ف ١) باریك؛ ٣) لاغر.

**باریکان:** ١) ریسی زۆر باریك و ناسك؛ ٢) لونە کێو لە بنارەوە بەرەو دەشت، لای باریکایی ف ١) نخ نازك؛ ٢) دماغهٔ کوه.

**باریك رێسی:** بریتی لە دانەواندن و قسەی لوس کردن ف تملّق.

**باریك و بنیسی:** لەڕی و کزی زۆر لە نەخۆشیەوە: (خەسوم داویەنە باریك و بنیسی لەوانەیە نەژی) [فا] لاغری بیش از حد.
**باریکە:** ١) تیزماڵك، پارچەیەکی کەم‌بەر لە چەرم یان کوتاڵ؛ ٢) ریزە نەقەڵی بەراویزی جلك لە دەرەوە [فا] ١) نوار؛ ٢) دوخت حاشیهٔ لباس.
**باریکەڕێ:** رچە، کویرەڕێ، ریگەی نەسك [فا] کوره‌راه.
**باریکەلانە:** باریکەلانە، زۆر باریك و لەڕ، باریکەلە [فا] باریك‌اندام.
**باریکەلانە:** باریکەلانە [فا] لاغراندام.
**باریکەلە:** باریکەلە، باریکەلانە [فا] لاغراندام.
**باریکەلە:** باریکەلانە [فا] لاغراندام.
**باریکی:** زراڤی [فا] باریکی.
**بارین:** ١) هاتنەخواری بەفرو باران؛ ٢) هاوردن، هێنان [فا] ١) باریدن؛ ٢) آوردن.
**بارێن:** ئەوی دەبارێنێ: (هەوریکی **بارینە**) [فا] بارنده.
**بارینە:** وەنەوز، جۆرت، خەو نوچکە [فا] پینکی.
**باریە:** لۆسە، مەلغە، باری، نویل [فا] دبلم.
**باز:** ١) مەلی راوچی بەناو؛ ٢) دبسان، دوبارە؛ ٣) ناواڵە، والا؛ ٤) شەقام، هەنگاوی بلند دەگەڵ هەڵبەزین؛ ٥) ریگەی ناسراو: (بردە**باز**، ری**باز**، بازی بێر بان)؛ ٦) راکردن، هەلاتن: (رەشو لشێرْدا **بازدا**)؛ ٧) بەغارو پەلە رۆیشتن: (**بازدە** زو بگەهە)؛ ٨) پاشگری لێزانی: (فوما**رباز**، مەکرباز)؛ ٩) دورێن: (گیانباز)؛ ١٠) بەوانا نارەزوکەر: (مێ**باز**، نێرباز)؛ ١١) باج و پیتاك [فا] ١) باز شکاری؛ ٢) دوباره؛ ٣) باز و سرگشاده؛ ٤) راه؛ ٥) راه مُشخص؛ ٦) فرار کردن، دویدن؛ ٧) باعَجَله؛ ٨) بسوند مهارت؛ ٩) باختن؛ ١٠) آرزومند؛ ١١) باج.
**بازار:** ١) شوینی سەوداو مامەڵە، سوك؛ ٢) سەودا کردن، نرخ پرسین: (م گەنم **بازار** کر گەلەکی بوهابە) [فا] ١) بازار؛ ٢) مُعامله.
**بازارتیژی:** گەرم بازاڕی، سەودای زۆر لە بازاردا [فا] بازارگرمی.
**بازارخۆش:** زۆرفرۆش، سەوداخۆش [فا] خوش‌معامله.
**بازارکرن:** ١) نرخ پرسین؛ ٢) کڕین [فا] ١) نرخ پرسیدن؛ ٢) خریدن.
**بازارکەر:** کەسێ کە زۆر هاتوچوی بازار دەکاو شت بۆ خەڵك نەکڕێ [فا] کسی که سروکارش با بازار زیاد باشد.
**بازارکەساد:** کەم‌فرۆش [فا] بازارکساد.
**بازارکەسادی:** بازاری کەم‌کڕین و فرۆشتن [فا] رکود بازار.
**بازار کەساس:** بازار کەساد [فا] بازار کساد.
**بازارکەساسی:** بازارکەسادی [فا] کسادی بازار.
**بازارگەرمی:** بازارتیژی [فا] بازارگرمی.
**بازاری:** ١) دوکاندار، مامەڵەچی ناو بازار؛ ٢) کەم نرخ و سوك: (گوڵ نەمرۆ خۆی مقابیل کرد بە روخسارت لەلای خەڵقی / بەڵێ هەردەم دراوو هەرزەگۆن مەحبوبی **بازاڕی**) «حریق» [فا] ١) بازاری؛ ٢) کم‌بها.
**بازباز:** هەڵبەز دابەزو بەخۆ هەڵدان هاتوچۆ کردن: (مشکان لەمێشکی وشکت **بازبازو** گەز گەزێنە) «هەژار» [فا] پرش، جهش.
**بازبازان:** ١) کێ‌بەرکێ لە بازداندا؛ ٢) بزۆزی و هەڵبەزدابەز، بازباز [فا] ١) مسابقهٔ پرش؛ ٢) جَست و خیز.
**بازبازۆکێ:** بازبازان [فا] مسابقهٔ پرش.
**بازبازێن:** بازبازان [فا] مسابقهٔ پَرش.
**بازبەند:** بازوبەند، خشڵی فۆڵ، حەمابەڵی بەمت و مورەوە کە لە سەرروی ئانیشکەوە دەبەسترێ [فا] بازوبند.
**بازپەرێن:** ئەوکەسەی لەڕاوە بازدا باز بەرەو نێچیر هەڵدەفرێنێ، فوشچی، بازەوان [فا] بازپَران، فوشچی.
**بازد:** باز، شەقاوی بەهەڵبەزینەوە [فا] پَرش.
**بازدان:** ١) بەڕێن بەهەنگاو لە جوگە یان لە کەند؛ ٢) بەپەلە رۆیشتن، غاردان؛ ٣) لەترسان هەلاتن [فا] ١) پر یدن؛ ٢) دویدن؛ ٣) فرار کردن.
**بازدبازدێن:** بازبازێن [فا] مسابقهٔ پرش.
**بازد بازۆکێ:** بازبازێن [فا] مسابقهٔ پرش.
**بازدبردن:** بازدان [فا] نگا: بازدان.
**بازددان:** بازدان [فا] نگا: بازدان.
**بازدەبەران:** دوامین حەوەنەی زەنسەمە کە خۆر لە ناوابوندا جێ گۆڕکێ دەکاو دەراو هەراو تردەکا [فا] حالت آفتاب در آخر بن هفتهٔ اسفند.
**بازدەلبازد:** بازبازێن [فا] مسابقهٔ پرش.
**بازدێ:** بهێڵن، وازبێنن، بێلانن [فا] بگذارید.
**بازدێم:** وێڵم کەن، لێم گەڕێن [فا] ولم کُنید.
**بازڕ:** باڵدارێکی بۆرو گچکەو گۆشنخۆرە، مشك‌گره [فا] از مرغان کوچك شکاری.
**بازرگان:** سەوداگەر، ماڵ‌فرۆش [فا] بازرگان.
**بازرگانی:** سەوداگەری، داوستەد [فا] بازرگانی.
**بازرە:** ١) کەوانە، ویکەوتنی هاوێژراو لە بەرد یا دیوارو گەڕانەوە: (بەردەکەی هاویشتم وەدیوار کەوت **بازرەی** کردو سەری خۆمی شکاند)؛ ٢) دەرپەڕین و نەرەبون: (کەروێشکەکە لەلان دەرپەڕی و بازرەبو، بۆ بازرەت کرد؟) [فا] ١) کمانه؛ ٢) جهش و گریز ناگهانی.
**بازرەقە:** ١) بازرە؛ ٢) فیجقەکردنی ناو یا خوێن [فا] ١) نگا: بازره؛ ٢) فَوَران.
**بازریشك:** بارینی بەفرو باران بەباوە [فا] بارش همراه باد تُند.
**بازگ:** بازو، دورەنگ، ئەبلەق [فا] خلنگ.
**بازگوڕ:** ١) باریدەو کۆمەگ، هاریکاری: (**بازگوڕی**: هاریکاری کردن)؛ ٢) هیواو هومێد [فا] ١) کمك؛ ٢) اُمید.
**بازگە:** ١) جێگە بازدان؛ ٢) ریگەی هاتوچۆی حەیوانەکێوی [فا] ١) محل پرش؛ ٢) گذر بُز کوهی.
**بازگەشت:** پێژیوان، بەشیمان [فا] پشیمان.
**بازمان:** پاشەکەوت، لێ‌بەجێماو [فا] پس‌انداز.
**بازن:** موچەوانە، دەستەوانەی ئاڵقە لە زێر یان لە زیو، بازنە: (لە گۆوەندی میری مەزن / دەستیان دەشت، نەزیو نە **بازن**) [فا] اَلنگو.
**بازند:** بازن [فا] اَلنگو.
**بازنە:** ١) بازن؛ ٢) گەوی ناسن کە وەك بازن لە شکستەی دەهاڵێنن [فا] ١) اَلنگو؛ ٢) حلقهٔ آهنی.

**بازو:** ۱) بازگ؛ ۲) باهوّ، قوّڵ ف ۱) دورنگ؛ ۲) بازو.
**بازوبەن:** بازبەند ف بازوبند.
**بازوبەند:** بازبەند ف بازوبند.
**بازوّر:** بازێ، مەلێکی بۆری بچوکە مشك‌گرە ف پرنده‌ای است کوچك بەرنگ خاکستری.
**بازە:** ۱) بازگ؛ ۲) جوّرە کوتاڵێکی نەستور؛ ۳) تاوی سەگ؛ ۴) بهێڵە: (**بازە با دڵەکەم سانێ بێ‌خەم بوّ**) ف ۱) دورنگ؛ ۲) نوعی قماش؛ ۳) اسم سگ؛ ۴) بگذار.
**بازەبەر:** پردەباز، بەردی ناو چەم‌و بوار کە بەسەریا باز ئەدەن بوّ پەڕینەوە ف گُذار، سنگ گُذار.
**بازەبەران:** بازدە بەران ف نگا: بازدەبەران.
**بازەڵە:** ۱) بەڵەکی کەم؛ ۲) شەرم شکاو؛ ۲) خرکەڵەو هەراش: (منالەکەنان **بازەڵە** بوە)؛ ۴) قەمچان، رێخان، گەمەیەکە بە وردە بەردی لوس نەکرێ، بازەڵێن ف ۱) دورنگ؛ ۲) از خجالت درآمده؛ ۳) بالندگی کودك؛ ۴) بەقول دوقول.
**بازەڵێن:** قەمچان، رێخان، گەمەیەکە کە وردە بەرد لە لەپەوە هەڵداوێنە پشتی دەست‌و هەڵیدەدەن‌و دەیگرنەوە ف بەقول دوقول.
**بازەوان:** ئاگاداری بازی‌ڕاو ف نگهبان باز شکاری.
**بازی:** ۱) گەمە، گاڵتە؛ ۲) لە پاشگر بدا دەبێتە چاوگەی باز بە هەموماناوە ف ۱) بازی؛ ۲) در حالت پسوند مصدر «باز».
**بازێ:** ۱) هێندێ: (**بازێ** کەس تێ ناگەن ئێژم چە؟)؛ ۲) هەنگاوێکی هەراو ف ۱) بعضی؛ ۲) بك پرش.
**بازی‌بەند:** بازوبەند، فۆڵبەند ف بازوبند.
**بازیچە:** لەیسنوك، ئامرازی گاڵتەو سەرگەرمی ف بازیچە.
**بازین:** دوّڕان، خوسار ف باختن.
**بازبوەن:** بازوبەند ف بازوبند.
**باژ:** باج ف باج.
**باژار:** شار، شاروکە ف شهر، شهرك.
**باژاری:** شارسنانی، خەڵکی باژێر ف شهروَند.
**باژوّ:** ۱) گەمبەیێ بادەوەی هەبێ؛ ۲) لێخورە ف ۱) کشتی بادبانی؛ ۲) بران.
**باژەڵە:** ۱) بازرە؛ ۲) نەخوّشیەکی پێسنە نابیەنی منداڵان، زیپکەبان لە دەست‌و پا دێت ف ۱) نگا: بازرە؛ ۲) مرضی پوستی در کودکان.
**باژێر:** ۱) شار، شاروکە؛ ۲) بازار ف ۱) شهر؛ ۲) بازار.
**باژێری:** شارستانی، باژاری ف شهروند.
**باژیلە:** ۱) نەخوّشی پێستی منالان، باژەڵە؛ ۲) نەخوّشی بەر مسولدانی منالْ کە میزی پێ ناکرێ ف ۱) مرض پوستی کودکان؛ ۲) شاش‌بند کودکان.
**باژێلە:** ۱) باژیلە؛ ۲) بازرەو نەرە ف ۱) نگا: باژیلە؛ ۲) نگا: بازرە.
**باس:** ۱) لێدوان؛ ۲) خەبەر: (**باسی** توّمان دەکرد، دەنگ‌و **باس** چیە؟) ف ۱) بحث؛ ۲) خبر.
**باسترمە:** گوّشتی دە ریخوّلە ئاخنراو ف کالباس.
**باستورمە:** گوّشتی لێبراوی دەربخوّلە ئاخناو ف کالباس.
**باستیلك:** باسوخ، باسوق، باسوێ، شتێکی شیرینە لە نیشاستەو شیرە دەکرێ ف باسْلق.
**باسرە:** شوێنێ با زوّری بگرێتەوە ف جای بسیار بادگیر.
**باسریشك:** بەفر و باران‌و با پێکەوە ف بارش برف و باران و وزش باد با هم.
**باس قەندە:** کلکە سەبیلەی دارین ف دستهٔ بلند چُپُق.
**باس قەنگە:** باس قەندە ف دستهٔ بلند چُپُق.
**باس قەنئە:** باس قەندە ف دستهٔ بلند چُپُق.
**باسك:** ۱) لە جومگەی دەستەوە تا هاچنك؛ ۲) لە سەری پەنجەوە تا شان: (مەلە **باسکە**)؛ ۳) ملەی کێو، بستو؛ ۴) دار جگەرە، موّدنە، دەمنە، دارسیغار؛ ۵) باڵی مەل ف ۱) ساعد دست؛ ۲) بازو؛ ۳) ستیغ کوه؛ ۴) چوب سیگاری؛ ۵) بال پرنده.
**باسکردن:** ونو وێژ دەربارەی شتێ با کەسێ ف گفتگو.
**باسکڵاو:** گەڵای رێواس، رێواسی بێ‌تیرتك، کڵاوبن ف برگ ریواس.
**باسکەسەگ:** سەگی دورە کە دایك تاژی‌و باوك سەگەو باریکە لەیە ف سگ دورگه شکاری.
**باسکەمەلە:** جوّرێ مەلە کە بە نەوزمی باسك هاوێشتن دەبێ، مەلەباسکە ف نوعی شنا، شنای کرال.
**باسکەوجاز:** باسکێش ف چوب درازین خبش.
**باسکێش:** ئێرەقە، داری نێوان نیر و دەندە، مژانە، باسکەوجاز ف چوب درازین خبش.
**باسلق:** باسوخ، باستبك ف باسْلُق.
**باسمباز:** حەوڕوّژی پڕ بارانی سەرە بەهار ف هفت‌روز بارانی در فروردین.
**باسمە:** شقلی خەرمان ف مُهر خَرمَن.
**باسمێل:** بەفیزو خوّزانەر: (باسمێلی: فیزودەعبە) ف منکبر و خودپسند.
**باسنامە:** کتێبی چیروّکان، داستانی نوسراو ف کتاب داستان.
**باسوخ:** باسنبك ف باسلُق.
**باس‌وخواس:** خەبەر، دەنگ‌و باس ف اخبار.
**باسوّر:** بای‌سور، نەخوّشیەکی گرانە، نەخوّش نای گرانی لێ دێ‌و لاچاوی سوردەبێ، بای ممبارەك ف بیماری باد سرخ.
**باسورمە:** باستورمە ف نگا: باستورمە.
**باسوق:** باسنبك، باسوخ ف باسلُق.
**باسەر:** بای لە بەرزیەوە ف تندبادی که از ارتفاع وَزَد.
**باسەرە:** باسرە ف نگا: باسرە.
**باسەڕە:** مێرگ‌و بژوێن‌و جێی لەوەڕی باش ف چراگاه، مرتع.
**باش:** ۱) چاك، دژی خراپ؛ ۲) پاشگر بە وانا: کار بەدەست: (وریا لای ئاغا بوبتە سور **باش**) ف ۱) خوب، نیکو؛ ۲) پسوند بەمعنی رئیس.
**باشار:** ۱) دەربردن، خوّڕاگرتن؛ ۲) بەرانبەری، پێوەستان: (کەس **باشاری** ناکا) ف ۱) مقاومت؛ ۲) مقابله.
**باشتر:** چاکتر ف بهتر.
**باشترین:** هەرەچاك ف بهترین.

**باش قەپان:** جۆرە مارێکی زەردی ئاماڵ سور [ف] نوعی مار.

**باشلوخ:** سەرکڵاوی باران دانەدەر [ف] کلاه بارانی.

**باشوو:** واشە، باشوک [ف] چرغ.

**باش و بۆشی:** دەس بڵاوی، ماڵ بەفیڕۆدان [ف] ولخرجی.

**باشوور:** لای قوبلە، نێوان خۆر هەڵات و ڕۆژاوا و بەرانبەر بە باکوور [ف] جُنوب.

**باشوک:** باشوو، باشوکە، مەلێکی ڕاوکەری بچوکە چۆلەکە دەگرێ، واشە [ف] چرغ.

**باشوکە:** باشوک [ف] چرغ.

**باشوێل:** جۆرێ کوڵوانەی زنانە [ف] نوعی رودوشی زنان.

**باشە:** ١) باشوک؛ ٢) وشەی پەسند کردن: (پیرۆت پیاوی **باشە**) [ف] ١) چرغ؛ ٢) خوب است.

**باشەل:** چارۆکەی ژنان کە داوێنی لە کەمبەریان گرێ دەدەن، کوڵوانە [ف] رودوشی زنانه.

**باشەوالا:** برێتی لە لینگ روت و بێدەر بێ [ف] کنایه از شخص بدون شلوار.

**باشی:** ١) بەسندی، دژی خرابی؛ ٢) باشگری بەمانا سەرکار، سەردەستە: (لوتی **باشی**، مونشی **باشی**) [ف] ١) خوبی؛ ٢) پسوند بەمعنی سردسته.

**باشێل:** باشەل، کوڵوانە [ف] رودوشی زنانه.

**باشیل:** ئاوارەو دەربەدەر [ف] آواره و خانه‌بدوش.

**باع:** دەنگی مەڕو بەرخ [ف] بع‌بع.

**باعە:** باع: (**باعەی** بەرخ دێت، مەڕە کە **دەباعێنێ**) [ف] صدای گوسفند.

**باعیس:** سەبەب، هۆ، سۆنگە [ف] موجب، باعث.

**باغ:** باخ، دارستانی میوە، ڕەزی نزیک [ف] باغ.

**باغبڕین:** ١) لەدوژمنایەتی داری باغ بڕینەوە؛ ٢) هەڵبەرناوتنی لکە مێو لە سەرە بەهاردا [ف] ١) قطع درختان باغ از روی دشمنی؛ ٢) هَرَس کردن رَز.

**باغچە:** باخچە [ف] باغچه.

**باغر:** لەخۆ دەرچو، بەفیز و هەوا: (کاورا بەهەوای پارە **باغر** بوە لەخۆی دەرچوە) [ف] مَغرور.

**باغە:** ١) باقەی گیاو گەنم، بەسنە؛ ٢) چێکراو لە بنێشت یا ماکی نەوت: (ئەزبێحەکەم **باغەیە** بە ئاگر دەسوتێ)؛ ٣) نەخۆشیەکی سمی بەکسم، باخە [ف] ١) بستهٔ گیاه؛ ٢) مصنوع از نفت یا سقز؛ ٣) مرضی در سنوران.

**باغەل:** باخەل، پاخل [ف] بغل.

**باغەوان:** ئاگاداری باغ: (من کارم هەر **باغەوانی** بە) [ف] باغبان.

**بافت:** ١) شیاوی، ڕەوابی: (**بافتی** ئەمکارە نیە)؛ ٢) هۆنە، هۆندراو: (ئەم کەوابە زێڕ**بافتە**)؛ ٣) خەرج: (سەبدی هەرجێش بێ **بافتی** رای نوش کەرد) [ف] ١) شایستگی؛ ٢) بافت؛ ٣) خرج.

**بافتە:** نیزماڵکێکی هۆندراو لە پەراوێزی عەبای دەدورن [ف] نوار حاشیهٔ عبا.

**بافرۆ:** بوختان و درۆ [ف] بُهتان.

**بافرە:** ١) کەنیرەی سپی و بێ خەوش؛ ٢) ناوی پەڕەسپغاریکە [ف] ١) کنبرای خوب؛ ٢) نوعی کاغذ سیگار.

**بافڕە:** فرفرە، هەرچی بەبا دەخولێنەوە [ف] بادفر.

**بافس:** میوەی وەریوی رزیو [ف] میوهٔ ریختهٔ له شده.

**بافل:** ناو هەڵدێر، تافگە، سەروەشێن [ف] آبشار.

**بافلە:** تازە موسوڵمانی خاچپەرست [ف] مسیحی تازه مسلمان شده.

**بافوور:** ١) تریاک؛ ٢) ئەسبابی تریاک کێشان [ف] ١) تریاک؛ ٢) ابزار تریاک کشی.

**بافیاگ:** ١) هۆندراو، هۆنە؛ ٢) بربەتی لە قسەی هەڵبەستەو درۆ [ف] ١) بافته؛ ٢) بهتان.

**بافیش:** بەخۆ هەڵگوتن، ناربفی خۆکردن [ف] خودستائی و لاف و گزاف.

**باق:** ١) باوک، باب؛ ٢) ئاماڵ نزیک لە رەنگا: (زەر**باق**: ئاماڵ زەرد)، واش [ف] ١) پدری؛ ٢) متمایل به...

**باقبرا:** برای هەر لەباوک، برای‌بابی، دوکوڕ لە بابێک و دودایک [ف] برادر پدری.

**باقی:** بادام، بەهیف [ف] بادام.

**باقاندن:** هاواری جانەوەری وەک ڕبوی و ئەمانە لە نەخۆشی [ف] واق واق کردن.

**باقانن:** باقاندن [ف] واق‌واق کردن.

**باقر:** ١) مس؛ ٢) مسی غەلای لێ نەدراو؛ ٣) چێشتی لەمسدا ئێک‌چو: (ئەم چێشتە **باقربوە** مەیخۆن)؛ ٤) عەیبی نادیاری: (ئاخری **باقری** دەرهات)؛ ٥) روسیایی و ناوزڕان: (ئێستا ئەواو **باقر** بوە هەر ئابڕوی پێوە نەماوە) [ف] ١) مس؛ ٢) مس سپید ناشده؛ ٣) غذای فاسد شده در ظرف مسی؛ ٤) عیب پوشیده؛ ٥) رسوابی.

**باقل:** وا بیر دەبەم، وا ئێبدەگەم، پێم وایە، ولۆ هزر دبەم، بەبیرا من [ف] حدس می‌زنم.

**باقلاو:** شێوی باقلەو ئاوو ڕۆن [ف] آش باقلا.

**باقلە:** ١) دانە وێڵەیە لە کەلودا دەبێ و دەنک پان و درشتو سورمەیی رەنگە لە لۆبیا دەچێ و لەو زلترە؛ ٢) بەری گیابەکی گەڵا دەرزی کوێستانیە وەک کەما کە «**لۆ**»ی پێدە لێن [ف] ١) باقلا؛ ٢) گیاهی برگ سوزنی.

**باقۆ:** ١) بز، جۆرێ ماسی لوسی سمبڵداری دەم گەورەبە، شبعه نایخۆن؛ ٢) هەنجیری هێشتا نەگەیشتو؛ ٣) قەزوانی فەربک [ف] ١) نوعی ماهی؛ ٢) انجیر کال و نرسیده؛ ٣) چاتلانقوش دلمل.

**باقۆڕە:** ١) بەچکە بەران، کودەلە وەراز؛ ٢) زەبەلاح و ئەرە [ف] ١) بچه خوک؛ ٢) لندهور.

**باقۆفە:** ئەباغی کرمێ و رزیوی میوە [ف] میوهٔ گندیده.

**باقە:** ١) باغە، باوەشێک گیا یا دەغلی بەسراو؛ ٢) واقەوزیفەی ڕبوی و...؛ ٣) نەخۆشیەکە نوشی بزن ئێ: (**باقە** بزە کەونۆسە ناو بزەکانم) [ف] ١) گیاه بسته؛ ٢) واق‌واق؛ ٣) نوعی بیماری بُز.

**باقەبەس:** ئەو گیابەی باقەی پێ دەبەستن [ف] گیاه مخصوص بستن.

**باقەبەست:** باقەبەس [ف] نگا: باقەبەس.

**باقەبێن:** باقەبەس ف نگا: باقەبەس.

**باقی:** ١) هەرماو؛ ٢) ماوەی ژمارەو پارە: (چەندم باقی دەدەیەوە، دینارم دایتێ باقیەکەت نەدامەوە) ف ١) باقی؛ ٢) باقیماندە.

**باقیە:** تەقەڵ، تیك، (کەوشەکانم جوت باقیە کرد) ف بخیە.

**باك:** ترس: (من لە تیر و تانەوو زیندان‌و دار باکم نیە) «هێمن» ف باك و هراس.

**باکردن:** پەنەمان، ئاوسان، هەڵامسان ف آماسیدن.

**باکوت:** ١) بەفری بەبا پەستواو، کرێوە بەبای توندەوە: ٢) میوەی با وەراندو ف ١) برف بادآوردۀ متراکم: ٢) میوۀ باد ریختە.

**باکوڕ:** بەرانبەری باشوڕ، پشنەو قو بلە ف شمال.

**باکوڕە:** گۆچان، گۆپاڵ، داردەستی سەرچەمیو ف چوگان.

**باکوڕك:** بای زۆر ساردی زستان، سوزەی سەرما ف باد سرد زمستانی.

**باکوزیرك:** باو بۆران، توف‌و کرێوەو بادەوە ف کولاك و دمه.

**باکوڤە:** باقوفە، میوەی رزیوی با وەراندو ف میوۀ باد ریختە.

**باکەش:** ١) بابویر، کەلـێنـێ بای تێدا دێ؛ ٢) کەڵـەشـاخـی حەجامەت‌کێش، کوپێ کە لە پشتی نیشاوی دەگرن ف ١) مَنفَذ باد: ٢) بادکش.

**باکەف:** خشتی هەڵکفاوی تەواو لەکڵ دەرنەچو ف آجر نیم‌پختە.

**باکێش:** باکەش ف بادکش.

**باگا:** شوێنی باگر ف مَنفَذ باد.

**باگ:** با ف باد.

**باگر:** باگا ف مَنفَذ باد.

**باگردان:** بانگوبڕ، بانگوش، باگردین، بان‌گلێر ف بام‌غلتان.

**باگردێن:** باگردان ف بام‌غلتان.

**باگرو:** بای‌توند ف تندباد.

**باگروکە:** گێژەلوکە ف گردباد.

**باگژە:** بایەکە نێونجی شەماڵ‌و زریان ف باد میانۀ شمال و جنوب.

**باگوردان:** باگردان ف بام‌غلتان.

**باگوردێن:** باگردان ف بام‌غلتان.

**باگونە:** گو ن پەنەمان لەبەر قەڵەوی ف آماس خایە.

**باگەڕ:** گێژەلوکە، گەردەلول، باهۆز ف گردباد.

**باگێژە:** باگەڕ ف گردباد.

**بال:** ١) لەکن، لەلا، لجـم، با، لنك: (تشتێ من لبال تەنە)؛ ٢) چنگێ تەیرا، باڵی‌مەل ف ١) نزد؛ ٢) بال پرندە.

**باڵ:** ١) دەستی باڵـدار، چنگی تەیر؛ ٢) هەرچـوار پەلی گیانـدار: (دەسـرێژبان کرد چوار باڵیان کردم)؛ ٣) لەسەر پەنجەوە تا چەنەگە: (گوریسەکە هەشت باڵ بو)؛ ٤) باخەڵ بە راکشاوی: (دەڵێن بیاوی دەبـاڵدا بوە)؛ ٥) تێکەڵاوی‌و نزیکی: (دوماڵ دەباڵ یەکدان) ف ١) بال پرندە: ٢) چهار دست و پا: ٣) از سر پنجە تا چانە: ٤) آغوش: ٥) مُختلط بودن.

**باڵا:** ١) بلندی، بەرزی؛ ٢) بەژن، قام، قەد ف ١) بلندی؛ ٢) قد.

**باڵابـوست:** باوەعـەمـرە، بستـەبالا، چلەنوك، بەتەمەنی دەبالانەکردو، باواقوڕەت ف کونولە.

**باڵابەرز:** بەژن بەرز ف بلندقامت.

**باڵابەرزە:** سبهەم کلك لە پەنجەدا، تلباناوی، قامکی قونێ، قامکە قوچە ف انگشت وسطی.

**باڵابەژن:** ناونەی باڵاروان ف آینه تمام‌قد.

**باڵاپۆش:** جلکی سەرتاپایی، عەبا، کەپەنەو هیتر ف بالاپوش.

**باڵاتە:** ١) سەرەتای گەیشتنی میوە: ٢) نێوی گوندێکە ف ١) آغاز رسیدن میوە؛ ٢) نام دهی است.

**باڵاخانە:** نهۆمی‌دوەم ف طبقۀ دوم.

**باڵادەس:** ١) دەسـەڵات‌دار: (یاخـوا هەر باڵادەس بی)؛ ٢) گەورەتر: (سۆرۆ باڵادەسی منە) ف ١) بانفوذ؛ ٢) اَرشد.

**باڵادەست:** باڵادەس ف نگا: باڵا دەس.

**باڵادەستە:** نە درێژ نە کورت، نێونجی ف قد متوسط.

**بالار:** کاریتە ف دیرك.

**باڵاروان:** ١) ناوێنـەی گەورە، ئەبنکـا مەزن، جامی باڵانـوێن: ٢) کولانکەی بان، رۆچنەی میچ ف ١) آینۀ تمام قد: ٢) روزنۀ بام.

**باڵاشمە:** داری دیرەگی سەرتاقەی دیوار کە داری تری بەسەردا رابەڵ دەکەن ف دیرك تاقچە.

**باڵاشەمە:** باڵاشمە ف دیرك تاقچە.

**بالافر:** فرۆك، فرۆکە، نەیارە ف هواپیما.

**بالافس:** باڵابوست ف کونولە.

**باڵاڤ:** ١) کوڵ، شیو وکوڵ: ٢) خۆ شتن: ٣) جلکێدا ئدراو بۆ شوشتن: (ئـەو جلکێ هانـا باڵاڤینە) ف ١) رختشوئی: ٢) آب‌تنی؛ ٣) رخت آمادۀ شستن.

**باڵاکردن:** بەرز بو ن، گەورە بو ن، درێژ بو ن ف بلندشدن، رشد کردن.

**باڵاگەردان:** بەڵاگێڕ، دەسەر گەڕان ف بلاگردان.

**بالان:** ئەلـە گورگ‌و تەڵـە ریوی: (گورگی باڵان دیدەبە) ف تلۀ آهنی گرگ و روباه.

**باڵانوێن:** ئاوێنەی باڵاروان ف آینۀ تمام قد.

**باڵانی:** نیستری باب ئەسپی داك ماکەر ف استر پدر اسب.

**باڵباز:** جەکداری میری، سەرباز ف سرباز.

**باڵبەست:** قوڵ‌بەست ف کت‌بستە.

**باڵبەستن:** قوڵ بەست کردن ف کت بستن.

**باڵبەستە:** قوڵ بەست‌کراو ف کت‌بستە.

**باڵتوز:** ژن خوشك، خوشکی ژن ف خواهر زن.

**باڵتە:** ١) پاڵتاو، باڵاپۆشی ئەستور: ٢) بیور، تەور، تەوەر: ٣) چەشکە، چەژە ف ١) پالتو؛ ٢) تبر؛ ٣) طُعمۀ شکار.

**باڵخەنجەرە:** باڵدارێکە باڵی لە وێنەی خەنجەر هەڵکەوتوە ف پرندەای کە بالش شبیە بە خنجر است.

**باڵدار:** هەرچێ بفڕێ ف پرندە.

**باڵدان:** ١) لاواندنەوە؛ ٢) بارازتن ف ١) نوازش: ٢) حراست.

**باڵشمە:** چوار چێوەی دەرك‌و پەنجەرە ف چهارچوبۀ در و پنجره.

**بالغ:** بالغ، بلوغ، تێپەرکردو لە منالی، پێگەیشتو، منالێ کە شەیتانی دەبێ ف جوان بە حدّ بلوغ رسیدە.

**بالق:** بالغ ف بالغ.

**بالگرتن:** ۱) دەحەوا چون؛ ۲) بۆ بێچوە مەلێ کە تازە نەتوانێ بفرێ نەبڵێن ف ۱) پرواز کردن؛ ۲) پرواز آموختن.

**بالگرتنەوە:** دەحەواوە چون، فڕین ف پرواز کردن.

**بالگە:** بالشت، سەرین، سەنیر ف بالش.

**بالمەمی:** مۆم، شەمێ، شەم، مێو ف شمع.

**بالمیش:** بنەبڕ، فڕان، فرکردو، ئاسەوار بڕاو ف فناشدن.

**بالنج:** ۱) بالگە؛ ۲) نانیسک ف ۱) بالش؛ ۲) آرنج.

**بالنجەك:** بالگەی بچوك، نازبالنج ف نازبالش.

**بالندە:** بەرندە، مەل، نەبر ف پرندە.

**بالنگ:** ۱) بارونە، گیایەکی بۆن خۆشە، بادرەنگ؛ ۲) جۆرێکە لە نیرەی نارنجان ف ۱) بادرنگ؛ ۲) نوعی از مرکّبات.

**بالنگو:** بارونە ف بادرنگ.

**بالننە:** هەرچی دەفڕێ ف پرندە.

**بالنە:** بالدار ف پرندە.

**بالو:** هەرچونێك بێت، بالێ، بارێ ف بهرحال.

**بالور:** هێلکەدان لە مریشکدا ف تخم‌دان مرغ.

**بالورە:** گۆرانی هەڵدانی کچو کوڕ لە چیا کە هەوایەکی تایبەتی هەیە ف نوعی ترانۀ کُردی.

**بالوری:** بالورە ف از ترانه‌های کُردی.

**بالوعە:** ئەو گونجەی کە ئاو بۆ رەهەند ئەبا ف مجرای فاضلاب.

**بالوك:** ۱) بالوکەی پشتی دەست، بابلە؛ ۲) تاژیلۆکە ف ۱) زگیل؛ ۲) آخوندك.

**بالوکە:** ۱) بالوك، بالۆکە، چەند فیتکەیە لە پشتی دەست دێ و زیپکەش نیە؛ ۲) جۆرە کولەیەکی باریکە لانەی زینە، تاژیلوکە، ئاژی ئەحمەد زاوکەرە، ئەسپی پێغەمەر ف ۱) زگیل؛ ۲) آخوندك.

**بالۆکە:** بالوکەی پشتی دەست، گەنمە ف زگیل.

**بالوگرتن:** هەڵفڕین، فڕین ف پر بدن، پرواز کردن.

**بالول:** ۱) ناوی پیاوێکی ناودار؛ ۲) بریەتی لەزانا؛ ۳) بریەتی لە گێلۆکە ف ۱) بهلول؛ ۲) کنایه از زیرك؛ ۳) کنایه از هالو.

**بالولە:** بابۆلە، نیکەی درێژ لە نان و پێخۆر ف ساندویچ.

**بالولی:** گوێ نەدەرو شەرکرو بێ‌باك ف منهوّر و بیباك.

**بالون:** ۱) تورەکەی زەلامی فودراوی پڕ لە گاز کە بە هەوادا ئەچێ؛ ۲) فرۆکە، بالافڕ ف ۱) بالون؛ ۲) هواپیما.

**بالویز:** بریکاری دەوڵەت لە دەوڵەتێکی تردا، سەفیر، سپاردەی میری ف سفیر.

**بالویك:** بالوکە ف زگیل.

**بالە:** ۱) خروکە، بۆرگ لەبێست، ناولە؛ ۲) دەنگی کاریلە ساوا؛ ۳) سوکەڵەی براله ف ۱) آبله؛ ۲) صدای بزغاله؛ ۳) مخفّف (براله: برادر).

**بالە:** ۱) دەسکێشی چەرمین؛ ۲) بڵێ ناسن، بێمەرە، بیر ف ۱) دستکش چرمی؛ ۲) بیل آهنی.

**باڵەبان:** ۱) دەهۆڵی گەورە؛ ۲) ئێستری زەلام و بەهێز؛ ۳) پیاوی تەژە و زەبەلاح؛ ۴) سەقر ف ۱) دُهُل بزرگ؛ ۲) استر گُندە؛ ۳) مرد لَندهور؛ ۴) چرغ.

**باڵەبە:** بالانە ف نگا: بالاتە.

**باڵەتەپە:** باڵ لە زەوبدانی مەل لە کاتی مردنا، پەلەقاژە، هەڵبزوفان ف پرپر زدن مرغ در وقت سر بریدن.

**باڵەتەپێ:** بالەتەپە ف نگا: باڵەتەپە.

**باڵەخانە:** ژور لە نهۆمی بالادا ف طبقۀ دوم عمارت.

**باڵەشتە:** بالنجەك ف نازبالش.

**باڵەشۆرە:** نەخۆشیەکە توشی مریشك و جوجك دێ باڵ شۆڕ دەکەنەوە ف نوعی بیماری مرغ.

**باڵەشۆرێ:** باڵە شۆرە ف نوعی بیماری مرغ.

**باڵەفڕە:** ۱) باڵ لێکدانی جوجەڵە مەل بۆ فێربونی فڕین؛ ۲) باڵ بەیەکادان لە ناچاری ف ۱) کوشش برای پرواز؛ ۲) بهم زدن بال از سر ناچاری.

**باڵەفڕێ:** باڵەفرە ف نگا: باڵەفرە.

**باڵەکە:** دەفەی‌شان، پارۆی‌شان ف استخوان کتف.

**باڵەکەو:** لەکەوبان لە داژگیردانی دەغڵ لەسەر جۆخین بەپێوە ف بیختن گندم در خرمن به‌حالت ایستاده.

**باڵەوان:** سەقر، باڵەبان ف چرغ.

**باڵێ:** ۱) باڵەدارینەی داوەڵ و بوکەبارانە؛ ۲) هەرچونێك بێت، بارێ ف ۱) بال چوبی مترسك؛ ۲) بهرصورت.

**بالیشت:** بالنج، سەرین، بالگە ف بالش.

**بالیف:** بالگە ف بالش.

**بالین:** ۱) پشتبوانەی دیوار و کۆڵەکە؛ ۲) دارێکە دەبخەنە پشتی دەرگای داخراو ف ۱) کمکی دیوار و ستون؛ ۲) چوبی که پشت در نهند.

**بالین:** بالگە، بالیف ف بالش.

**بالینە:** رفێدە، شتێکە وەك دوشەکەڵە نانکەر نانی پێ پێوەدەدا ف بالشتك.

**بالیوز:** بالویز، سەفیر ف سفیر.

**بالیوزخانە:** بنکەی بریکاری دەوڵەت لە دەوڵەتێکی تر ف سفارتخانه.

**بام:** ۱) واش، نامساڵ، نزیك لە رەنگا، رەنگ؛ ۲) بلا، بلان، بهێڵە: (بام وابکا خۆم دەردی نەزانم)؛ ۳) بادام؛ ۴) باشگر بەواتا: ببومابە: (خۆزی لەوێ بام)؛ ۵) دەگەڵم، لەنەکما ف ۱) فام؛ ۲) بگذار؛ ۳) بادام؛ ۴) می بود می؛ ۵) با من.

**بامجان:** بابنجان، باجانارەش ف بادنجان.

**بامجان فەرەنگی:** ئەماتە، باینجانە سورە، باژانا سوّر ف گوجه‌فرنگی.

**بامرنێ:** نەخۆشی جاوقولکە، تاعون ف طاعون.

**بامێ:** بامیە، سەوزیەکی کەلو دارە دەچێندرێ ف بامیه.

**بامیه:** بامێ ف بامیه.

**بان:** ١) بانگی نوێژ: (مەلابانی‌دا)؛ ٢) گازی: (**بانی** کە بابێ)؛ ٣) لای سەرو: (لەبان‌نەو کێفە)؛ ۴) سەربانی خانو؛ ۵) بانو، زەمینی دەشت‌و بڵند: (بان هۆبەنو. ناڵەبان)؛ ۶) هوگر و خاوەن بەزەیی: (نەو مانگابە لە گویلکەکەی نەبان بوە)؛ ٧) بین، بۆن ف ١) اذان؛ ٢) صدازدن؛ ٣) طرفِ بالا؛ ۴) بام؛ ۵) فلات؛ ۶) مأنوس؛ ٧) باشىد.

**باناندن:** بێجوی بێ‌دابك خستنە بەر دابکێکی نر (بانین: کاری بانۆك) ف الفت دادن بچهٔ حیوان به حیوان دیگر.

**بانبارگە:** بەربوك، نەوژنەی دەگەڵ بوك دەچنە ماڵی زاوا، پاخەسو ف بنگهٔ عروس.

**بانبانك:** جانەوەریکە لەنیرەی سمۆرە دەست کورت‌و فاج‌درێژە لە رەوەزە بەرداندا دەژی ف جانوری از نیرهٔ سمور.

**بانپوشین:** خشڵێکی ژنانە لەسەری دەدەن ف زیوری است که برسر زنند.

**بانتلێن:** باگردان، بان‌گلێر ف بام غلنان.

**بانجیلە:** ١) بانجێڵە، هەبوانی بێ‌بانی هاوبنە بۆشەو لەسەرنوستن: ٢) هەربانێکی نەوی‌و چکۆڵە وەك بانێژەی ناش ف ١) نراس؛ ٢) هر بام کم‌ارتفاع و کوچك مانند بامك آسیا که گندم بر آن ریزند.

**بانجێڵە:** بانجیلە ف نگا: بانجیلە.

**بانسەر:** خەمڵ‌و خشڵێکی ژنانە لەسەری دەدەن. لاسەرە ف زیوری زنانه.

**بانشــان:** ١) جاروکــەی شان‌پۆش؛ ٢) قەڵادۆشـە، نیوان‌شان ف ١) شانه‌پوش؛ ٢) میان کتف.

**بانق:** شوینی داوسنەدی پوڵ‌و پارە. بانگ ف بانك.

**بانقۆ:** جۆرێك قوماری پەڕانە. بانك ف نوعی قمار با ورق.

**بانك:** بانق ف بانك.

**بانگ:** ١) بانق؛ ٢) بانگی نوێژ؛ ٣) گازی: (**بانگم** کرد گوێت لێ‌نەبو)؛ ۴) بانقـۆ؛ ۵) گریانی شیوەن: (بۆیان لە **بانگی**‌دا) ف ١) بانك؛ ٢) اَذان؛ ٣) صدا؛ ۴) نوعی قمار با ورق؛ ۵) شیون و زاری.

**بانگاف:** نێوان رۆژاوا‌و خەوتنان ف میان مغرب و عشا.

**بانگاواز:** بەفەو هەراکردن ف فر بادزدن.

**بانگدان:** بانگی نوێژ گوتن ف اذان گفتن.

**بانگدەر:** بانگوێژ. نەوەی بانگی نوێژ نەخوێنێ ف مؤذّن.

**بانگروز:** خلۆر، تۆنۆر، گلار: (لەوبانەوە **بانگروز** بومەوە)؛ خلێر، تلێر ف غلت.

**بانگ کردن:** گازی کردن، گاسی کردن ف صدا زدن.

**بانگردێن:** باگردان ف بام‌غلنان.

**بانگلێر:** باگردان ف بام‌غلنان.

**بانگوش:** ١) باگردان؛ ٢) باگردان گێڕ ف ١) بام‌غلنان؛ ٢) بام‌غلنان گردان.

**بانگوێز:** باگردان ف بام‌غلنان.

**بانگوێژ:** بانگدەر ف مؤذن.

**بانگـەڕ:** ١) باگردان؛ ٢) پیاوی بانگێڕ ف ١) بام‌غلنـان؛ ٢) کسی که بام‌غلنان را بر بام می‌گرداند.

**بانگەڕان:** بانگەڕ ف نگا: بانگەڕ.

**بانگەشە:** شات‌و شوت ف لاف و گزاف.

**بانگەواز:** بانگاواز ف فر باد.

**بانگ هەڵدان:** شیوەن بەدەنگی بڵند ف گریه و شیون با صدای بلند.

**بانگ هێشتن:** بۆ نان خواردن‌و بەزم‌و شایی خواستن ف دعوت به جشن.

**بانگێڕ:** ١) کەسێ کە باگردان ئەگێڕێ؛ ٢) باگردان ف ١) آنکه بام غلنان می‌گرداند؛ ٢) بام غلنان.

**بانگێشتن:** بانگ هێشتن ف دعوت بەسور.

**بانگین:** هەرە بڵند، بەرزتر ف بلندترین.

**بانما:** نامرازی شاندەری باهانن، بابێو ف بادسنج.

**بانماڵ:** بەفرماڵ، کەسێ بەفر پارۆ دەکا ف برف‌روب.

**بانو:** ١) دەشتی بەرز، بان؛ ٢) کەبوانوی ماڵ. ژنی بەرێز ف ١) فلات؛ ٢) بانو.

**بانۆك:** کەسێ بێجوی دابك مردو دەخانەوە بەر دابکێکی‌تر ف آنکه دام مادر مرده را به حیوان دیگر عادت دهد.

**بانە:** ١) نەو هێڵانەی پێش توم چاندن جونێر خانەخانەی پێ‌دیاری دەکا تا سنـوری نۆ چانـدنەکە دیاری بێت؛ ٢) لەوەرگەی بەهارانە بەر لە چونــی زۆزان؛ ٣) بڵنــدایی نێوان دو دێراوی ئاودێری؛ ۴) موی نۆکــەبــەر؛ ۵) هاوبنــە هەوار؛ ۶) ناوی شارێك‌و مەڵبــەنــدێك لە کوردسـتــانــدا؛ ٧) دەشتایی بڵندتر لە دەوروبەری خۆی ف ١) فواصلی که برای تخم‌پاشی روی زمین می‌کشند؛ ٢) مرتع بهاری قبل از ییلاق؛ ٣) بلندی میان دو جوب؛ ۴) موی زهار؛ ۵) ییلاق؛ ۶) اسم شهری در کردستان؛ ٧) فلات.

**بانەگا:** بەرگەدە، جێگەی لێ‌ڕوانی نۆکەبەر ف زهار. شرمگاه.

**بانەمەڕ:** ١) هاوبنە هەوار؛ ٢) دوهەمین مانگی سال، مەهێ گولان ف ١) ییلاق؛ ٢) ماه دوم سال.

**بانەناو:** سواغ، فوزنێ هەڵسون. سبواق ف گل اندود.

**بانەوبان:** بازدان لە بانێکەوە بۆ بانێك ف پرش از بامی به بامی دیگر.

**بانی:** دەشتی بەرز، بانو، بان ف فلات.

**بانیژە:** ١) نەو جێگەی گەنمی باراشی لێ‌رۆدەکەن‌و لەوێوە دەرژێنە گەرو لەبـۆ بەرداش؛ ٢) هەمـو سەربـانێکی نەوی‌و چکـۆڵە ف ١) بامكِ آسیاب که از آنجا گندم به گلوی آسیاب می‌ریزد؛ ٢) بام کوچك.

**بان‌یەك:** لەسەریەکتر، کەڵەکە ف برهم انباشته.

**بان یەك نان:** کەڵەکە کردن. لەسەربەك دانان ف بر هم نهادن.

**بانین:** کاری بانـۆك، وەبـەرخستنی بێچو بەر دابکی نەبان‌و بیگانە ف عادت دادن دام مادر مرده به حیوان دیگر.

**باو:** شێوە. نامــاڵ. واش: (پــارچــەکــە رەش باوە. شبن‌**باوە**)؛ ٢) پاڵ، نەکــانــدان: (**بــاوێك** بە جوڵانەوە نێ)؛ ٣) وشەیەکە بۆ گەمە دەگەڵ منداڵ دەگوترێ: (بەچەکە باوا **باوباوێن** دەکەبن)؛ ۴) باب، باف؛ ۵) رمێن‌و رەونەق: (تیر وکەوان لە**باو**کەوتوە)؛ ۶) هەل. دەرفەت: (**باوباوی**

نۆبو نەت‌کرد لەدەسنت دا)؛ ٧) هێزو فەدو بالا: (هەر لە نەمەنێکداین بەلام نەو لەمن باو خۆشترە)؛ ٨) خول‌و سوڕی نوند: (خول خولە کەم باش باودەخوا)، («باوەخولێ»: گەمەیەکی منالانەیە)؛ ٩) شباو: (نەم گۆشنە باو دبانی من نیە)؛ ١٠) هەرەت، جەنگە، ناف؛ ١١) وەرە، بێ فـ ١) فام؛ ٢) هُل دادن؛ ٣) کلمەای کە هنگام بازی با بچەها گو بند؛ ٤) بدر؛ ٥) رونق؛ ٦) فرصت؛ ٧) رشد و نمو؛ ٨) جرخیدن سر بع؛ ٩) شابان؛ ١٠) عُنفوان؛ ١١) بیا.

**باوئیرك:** گەوی مس یا ناسن. نالقەی مسین یا ناسنین فـ حلقهٔ مسی یا آهنی.

**باوا:** ١) باپیر، کالك، («باواگەورە»: بابی باب‌و بابی دایك)؛ ٢) باب فـ ١) پدربزرگ؛ ٢) بدر.

**باواقوڕەت:** چلەنۆك، باواعەمرە فـ کوتولە.

**باواگەورە:** باوکی بابیر، باپیرە گەورە فـ جدّ بدری.

**باوام:** بادام، بەهێف، باڤی فـ بادام.

**باوان:** ١) ماڵەبابی ژن‌و بوك؛ ٢) لەلای نەوان، لنك‌وا فـ ١) خانهٔ بدری؛ ٢) نزد آنان.

**باوانی:** جبازی بوك، نەوەی بوك بۆ ماڵە زاوای دەهێنێ فـ جهاز عروس.

**باوالێ:** وشـەی خۆشـەویستی‌و ریزلێ نان بۆ بـاب فـ حرف محبت و احترام به بدر.

**باوباوێن:** گاڵتە دەگەڵ منالاکردن‌و باوباو گوتن فـ شوخی کردن با کودك.

**باوبڕ:** ١) تۆزو غومـار، تۆزو خۆڵ، غوماری کە با دەیهێنێ؛ ٢) قوزەی زگ‌و نڕ و نس فـ ١) گرد و غبار؛ ٢) کنایه از باد شکم.

**باوجو:** نەگەرچی، هەرچەندە، دەگەڵ نەوەشڕا فـ باوجود، هرچند.

**باودبان:** رەوای ددان، شباوی دگان فـ باب دندان.

**باوڕ:** برۆا، یاقیدە فـ باور، عقیدە.

**باوســەنــدن:** ١) وەبـرەو کەونن، وەڕەواج کەونن؛ ٢) وەسـەر کەوتن بەرسـەرغـەنیم‌دا؛ ٣) سوڕخـواردنی بەنەوزم فـ ١) رواج یافتن؛ ٢) ظفر یافتن؛ ٣) بشدّت جرخیدن.

**باوسەنن:** باوسەندن فـ نگا: باوسەندن.

**باوش:** باوەش، هامێز، نامێز فـ آغوش، بر.

**باوشك:** باوێشك، دەم داچەقاندن لەبەر خەوهاتن فـ خمیازه.

**باوك:** باب، باڤ فـ بدر.

**باوکـە:** ١) نێرەی باڵدار کانێ جوجەڵەی هەبە؛ ٢) بانگ‌کردنی باب: (بـاوکە! کەوشم بۆ بکڕە) فـ ١) برندهٔ نر هنگامی که جوجه داشته باشد؛ ٢) کلمهٔ خطاب به بدر.

**باوکەڕۆ:** وشەی شیوەن‌و خەمباری فـ کلمهٔ شیون و نوحه.

**باوکەلێ:** وشەی خۆشەویستی‌و نازداری: (باوکەلێ بۆ دیارت نەبو) فـ کلمهٔ مُحبّت و نوازش.

**باوگ:** باوك فـ بدر.

**باوگەوازی:** شەرە جنێو، جوێن بەبەکدان فـ دشنام بهم دادن.

**باول:** جانتا، چەمەدان، سندوقی لە چەرم‌و مقەبیا بۆ جلك نێنان فـ جمدان.

**باولێ:** نەخۆشی جۆکی بێجوی ناژەڵ فـ بیماری زانوی بره و بزغاله.

**باوەبیارە:** زڕباب، بێگانەی مێردی دایك فـ ناپدری.

**باوەت:** بابەت فـ بابت.

**باوەخولێ:** سوڕخواردن بەدەوری خۆدا فـ بەدور خود چرخیدن.

**باوەخـون:** جونـەوەی بوك بۆ بەکـەم‌جار بۆماڵی باوك فـ اولین بازدید عروس از خانهٔ بدر.

**باوەخۆن:** باوەخون فـ نگا: باوەخون.

**باوەڕ:** ١) باوڕ، برۆا، باوەڕی؛ ٢) سنـــوری نێوان دوزەوی، کەوشـەنی دوکێڵگە فـ ١) باور؛ ٢) مرز بین دو کشتزار.

**باوەر:** ١) بهێنە، وەرێنە؛ ٢) جوگەی ناودەغڵ فـ ١) بیار؛ ٢) مسیر آب در کشتزار.

**باوەڕپێکراو:** نەمین، جێی باوەڕی فـ اَمین، جای اعتماد.

**باوەڕنامە:** بسولەی گەوابی خوێندن، گەواهینامە فـ کارنامهٔ تحصیلی.

**باوەرماڵ:** باك کردنەوەی لیتەی ناو جۆگە فـ لجن‌مالی جوب.

**باوەرە:** باوەر، بهێنە، بێرانە فـ بیار.

**باوەرێن:** میوەی کە با وەراندوبە فـ میوه باد ریخته.

**باوەژن:** هەوێی دابك، ژن‌باڤ، زڕدابك فـ نامادری.

**باوەش:** باوش فـ آغوش.

**باوەشێن:** باروشە فـ بادبزن.

**باوەعەمرە:** چلەنۆك، بالابۆست، باواقوڕەت فـ کوتولە.

**باوەقوت:** باوەعەمرە فـ کوتولە.

**باوەقوڕەت:** باوەقوت فـ کوتولە.

**باوەڵ:** ١) باولێ؛ ٢) بێجـــوی ناژەڵـێ کە نوشی باوەڵی بو بێت فـ ١) بیماری زانوی بڕّە و بُزغالە؛ ٢) بڕّە و بزغالە مریض.

**باوەڵێ:** ١) نازناوە بۆ سەیدان: (جومە خزمەت باوەڵێ بۆ زیارەت)؛ ٢) بیری بەك کەونو: (باوەڵێ بابەکی بەسە)؛ ٣) جۆری نەخۆشی ناژاڵ فـ کلمهٔ خطاب به سادات؛ ٢) پیر و فرتوت؛ ٣) نوعی بیماری احشام.

**باوەلێ:** نەخـۆشیەکە نوشی ساوای ناژەڵ دەبێ‌و نەژنۆی دەبەنەمێ فـ بیماری زانوی برّه و بُزغالە.

**باوەگۆ:** قسە دەقسە داکەر، کەسێ لەناو قسەی بەکی‌ترا هەڵدەدانێ فـ کسی در میان سخن دیگری ببرد.

**باوەگێژە:** باوەخولێ فـ نگا: باوەخولێ.

**باوی:** ١) بادام؛ ٢) نەخـــۆش بەدەردی باداری، بادار فـ ١) بادام؛ ٢) مبتلا به رماتیسم.

**باوێ:** باوێژە فـ بینداز.

**باوێژە:** باوەرێن، نەومێوەی کەبا لەداری وەراندوە فـ میوهٔ باد ریخته.

**باوێشك:** باوشك فـ خمیازه.

**باویلکـە:** بشیلە پابزە، گیابەکـە نۆکـەی سپی‌و سوك‌و گرژنە پایزان با بلاوی دەکانەوە، پابلکە، شەلەمین‌کەرە فـ گُل قاصد، قاصدك.

**باوێلی:** باویلکە، بابلکە، پەپولەپابزە فـ گُل قاصد، قاصدك.

**باهـو:** ١) قۆڵ، کوڕ؛ ٢) وارشی دیوار یان خەندەکی دەوری باغچە؛ ٣)

لاتسپانەی دەرگا؛ ٤) ئالۆداری دارەڕا؛ ٥) شاهێنی تەرازوو؛ ٦) ئاسۆگ، کەناری ئاسمان؛ ٧) شان‌و پیل ف ١) ژرف؛ ٢) خَنْدَق؛ ٣) دوطرفِ طولی چهارچوبهٔ در؛ ٤) تیر سقف؛ ٥) شاهین ترازو؛ ٦) اُفُق؛ ٧) کتف.

**باهۆ:** شان‌وپیل: (ئەلا ئەی نازەنین ناهو بە باهۆ / دڵی سەبیادی خۆت هێنابە لەرزە) «نالی» ف کتف.

**باهۆدار:** زەلام‌و بەهێزو ناقەت ف تنومند و نیرومند.

**باهـوز:** ورەبا، هۆرەبا، بای زۆرساردی توند بەمژەوە ف بادِ سرد و سخت همراه با مه.

**باهۆڕ:** باهوز ف نگا: باهوز.

**باهۆز:** گەردەلول، گێژەلوکە ف گردباد.

**باهەڵکردن:** باهانن ف وزیدن.

**باهەنجیر:** بانسکە، جۆرێ‌هەنجیری زۆر خراپ ف نوعی انجیر نامرغوب.

**باهێر:** ١) زەمینی نەکێڵدراو؛ ٢) سەرگەردان‌و سەرلێ شێواو ف ١) زمین بایر؛ ٢) سرگردان.

**باهیڤ:** بادام ف بادام.

**باهیڤۆک:** پەنەسینی قاچ لەبەر ماندویی، ئاوسانی پا لەماندگی ف آماس پا از فرطِ خستگی.

**بای:** ١) شەمچـە، شخـاتە، شقاڵە، کرمیت، گۆگرد، شقارتە؛ ٢) نرخ، قیمـەت، بایی؛ ٣) بیبی: (قیبلەم سوپـەردەی وەبسی نازاریـای) «سەیدی» ف ١) کبریت؛ ٢) نرخ؛ ٣) باشی.

**بایام:** بادام ف بادام.

**بایباڵدان:** گەڕان لەدەشت‌و دەر بۆ حەسانەوەو خەمڕەواندن ف تفرُّج.

**بایجان:** بامجان، بابنجان، باجان ف بادنجان.

**بایدە:** بادیە، زەرکی ئاوخواردنەوە ف ظرفِ آبخوری.

**بای دەبور:** بای‌خۆر ئاوابی ف دَبور، بادِ مغرب.

**بایر:** زەمینی نەکێڵدراو، بور، بەبار، کۆدە ف زمین بایر.

**بایز:** سوکەڵەناوی بایزبد ف مخفف بایزبد.

**بابس:** هۆ، سەبەب، باعیس ف سَبَبْ.

**بایست:** بابس ف سَبَبْ، علّت.

**بایستی:** بابس ف سَبَبْ.

**بای‌سور:** نەخۆشیەکە، بای مبارەک ف بادِ سرخ، نوعی بیماری.

**بای‌فەرەنـگ:** ئاگرە، ئاورە، زیپکـەو پۆرگ کە لە دەم‌و چاو دێت ف آتش فارسی.

**بایلە:** ١) بالوک، بالوکە؛ ٢) پارچە قوماشێکی زۆر تەنکە ف ١) زگیل؛ ٢) نوعی پارچه بسیار نازک.

**بایلکە:** باویلکە، پنسلەپابزە ف قاصدک.

**باینجان:** بامجان، باجان ف بادنجان.

**باینجانی:** رەنگی بابنجان، سورمەیی تاریک ف بەرنگ بادنجان.

**بایە:** بادیە، زەرکی ئاوخواردن لەمس یا لەدار ف ظرفِ مسی یا چوبی آبخوری.

**بایەخ:** قەدرو ئیحترام بار، گرینگی ف ارزش، قدر.

**بایەف:** قەریکە بادام، چەقالە بادام ف چغاله‌بادام.

**بایەقوش:** کوندەبو، کوندەبەبو ف بوف کور.

**بایەو:** بایەف ف چغاله‌بادام.

**بای‌هەوا:** بادیهەوا ف مُفت.

**بایی:** ١) بەفیزو لەخۆگۆڕاو: (لەوەتا دەوڵەمەندە **بایی** بوە)؛ ٢) بادام؛ ٣) نرخ، قیمەت ف ١) متکبّر؛ ٢) بادام؛ ٣) نرخ.

**ببا:** ١) ئەگەر وابو با؛ ٢) ببیا، ببوا ف ١) اگر چنان می‌شُد؛ ٢) بِبَرَد.

**ببام:** وابومایە، وابوایینم ف بودمی.

**ببان:** وابوابن ف بودندی.

**ببڕ:** ١) برندە؛ ٢) بەبڕشت‌و هێزدار: (لەم ئاوەدا بکوژو **ببڕ**هەر خۆ بەنی)؛ ٣) فەرمانی بڕین: (حەوجار بگر، جارێك **ببڕ**) ف ١) بُرا؛ ٢) بزن بهادُر؛ ٣) اَمر به بُرش.

**ببڕای:** بەهیچ جۆر، هەرگیز: (ببڕای **ببڕای** ناچمەوە گوند) ف هرگز، ابداً.

**ببلە:** بێچوی تازەزاو، ساوا، کۆرپەساوا ف نوزاد.

**ببوایێن:** دەبون ف می‌بودند.

**ببوابن:** دەبوین ف می‌بودیم.

**ببوایە:** بوایت ف می‌بود.

**ببونایە:** ببوابتن ف می‌بودند.

**ببە:** بوە، فەرمانی بردن ف امر به بُردن.

**ببیە:** ببیسە، گوێ‌بگرە ف بشنو.

**ببێ:** ١) ببێژە؛ ٢) هەبێ، دژی نەبێ ف ١) بگو؛ ٢) باشد.

**بت:** ١) خودای دەسکرد؛ ٢) پێشگریکە: (**بت**‌خۆم، **بت**گرم) ف ١) بُت؛ ٢) پیشوند بەمعنی تُرا.

**بت‌پەرس:** کەسێ خوای دەسکرد بپەرستێ ف بُت‌پرست.

**بت‌پەرست:** بت‌پەرس ف بُت‌پرست.

**بتخانە:** شوێنی‌بتان ف بُتخانه.

**بتر:** ١) پتر، زیاتر، بێتر؛ ٢) هەراشتر، زوتر هەڵدان‌و بەخۆداهاتن ف ١) بیشتر؛ ٢) رشید، بالنده.

**بتری:** شوشەی تراو تێ‌کردن، بوتری، بوتڵ ف بطری.

**بتەو:** پتەو، مەحکەم، توندو قایم، خۆگر ف محکم.

**بتی:** پور، میمك ف عَمّه، خاله.

**بجم:** بیزو، بجوڵێ ف حرکت کن.

**بچڕان:** پسان، قوت‌بون، قەتیان، قرتیان ف گُسستن.

**بچڕاندن:** قەتاندن، پساندن، قوت‌کرن، قرتاندن ف قطع کردن.

**بچـڕك:** ئاوساجی، زلوبی، ئانێکە لە ناو رۆنا سوری دەکەنەوە، کولێرە بەرۆن ف گردهٔ روغنی، چلپك.

**بچرك:** بچڕك ف گردهٔ روغنی، چربك.

**بچڕیان:** بچڕان ف گُسستن.

**بچڕین:** پساندن ف قطع کردن.

**بچکۆك:** چکۆڵە، بیچك، بچوك، کەم قەوارە، گچکە ف کوچك.

**بچکۆڵ:** بچکۆك، دەبێنەناو بوکوران ف کوچك.

**بچکۆلانه**: بچکۆك ف کوچولو.

**بچکۆله**: بچکۆك ف کوچولو.

**بچکه**: ۱) بچکۆك؛ ۲) بێچو ف ۱) کوچولو؛ ۲) بچّه.

**بچکه‌لانه**: بچکۆك ف کوچولو.

**بچکه‌له**: بچکۆك ف کوچولو.

**بچۆ**: فه‌رمانی ڕۆیشتن، بڕۆ ف برو.

**بچوچك**: چکۆله ف کوچك.

**بچـوُك**: ۱) بچکۆك؛ ۲) به‌پله که‌متر: (کوڕی من **بچوکی** تۆ به) ف ۱) کوچك؛ ۲) خدمتگزار.

**بچـوکی**: کەم فەوارەیی، خزمەنکـاری و نۆکەری: (نا دەمرم **بچوکیت** دەکەم) ف خدمتگزاری.

**بچوله**: بچکۆك ف کوچك.

**بچه‌نگانی**: ئامبازبون، مل ده‌به‌رمل نان، ده‌سته‌ملان ف گلاویزشدن.

**بختیان**: قسه‌ی هه‌ڵبه‌سته، تۆمه‌ت، بوختان ف بُهتان.

**بخۆ**: ۱) فه‌رمانی خواردن؛ ۲) هه‌ربۆخۆی، له‌خۆوه ف ۱) بخور؛ ۲) خودبخود.

**بخۆر**: زۆرخۆر، خۆرا ف پُرخور.

**بخوُر**: سوته‌نی بۆن‌خۆش ف بخوُر.

**بخۆز**: گای خه‌فۆك، گابه‌ك كه له‌كانی جوت كردندا ئه‌خه‌فێ ف گاوی كه در اثنای شخم می‌خوابد.

**بخه**: ۱) بهاوێژه، باوێژه؛ ۲) بێدابماڵه: (چه‌قۆ له هه‌سان **بخه**‌با تیژبێ) ف ۱) بینداز؛ ۲) بمال.

**بخێری**: بوغاری، ئاگردانێ دوكه‌ڵی له‌سه‌ربان بلاوبێت، مغاری ف بُخاری.

**بدۆ**: قسه‌زان و ده‌م باراو ف سخنور.

**بده**: ۱) به‌هـره و داهـات، ده‌رامه‌ت؛ ۲) باج و پیتاكی میری؛ ۳) فه‌رمان به‌وانا: (وه‌ده، بیه‌خشه)؛ ۴) به‌واتای ده‌هنده ف ۱) درآمد؛ ۲) باج و خراج؛ ۳) *فعل امر* بده؛ ۴) دهنده.

**بده‌ر**: ۱) ده‌هنده: (كابرابه‌كی نان‌بده‌ره)؛ ۲) بده، وه‌ده، بده‌به؛ ۳) بریتی له‌ژنی بێ‌شه‌رم ف ۱) دهنده؛ ۲) بده؛ ۳) كنایه از زن بی‌شرم.

**بدبه**: بڕوانه، ئه‌ماشاكه ف ببین.

**بڕ**: ۱) كه‌مێك: (بڕێك ناوم ده‌یه، ئه‌و بڕه‌چیه ده‌مده‌یه‌ی؟)؛ ۲) قه‌ڵه‌نداریکی براو: (دوبڕداربێنه)؛ ۳) ساڵ له‌ته‌مه‌نی به‌كسمدا: (جوانوه‌كه‌به‌ك بڕه بان دوبـڕه؟)؛ ۴) تابشت و هێز: (بڕناكه‌م له‌م كێفه سه‌ر كه‌وم، له‌گریوه غاردا بڕی ته‌كسرد)؛ ۵) ده‌ستـه و كه‌رت: (بڕه مه‌ڕێك هات، نوشی بڕه پیاوێ بوم)؛ ۶) نیره و نایفـه: (بـرا نۆ نێرێ جافم له‌كـام بڕی؟)؛ ۷) دابـاجبن و له‌ت كردن: (قـه‌ڵت و بڕی نبخسن، داره‌كـانی قه‌ڵت و بـڕكـرد)؛ ۸) پاشگری به‌مانا بڕنده: (جاران داربـڕیو نێسنـا بو به میری سه‌ربڕ)؛ ۹) پاشگری به‌مانا كون‌تێكه‌ر: (دز به‌ماڵ‌بڕ دبواره‌كه‌ی بڕبوه)؛ ۱۰) درانـدنی پارچه به‌فه‌بچی بان به‌ده‌ست: (حه‌وجار بگر جارێك ببڕ)؛ ۱۱) قونارکه‌ر: (ئه‌م هه‌تبوه ئانودۆ بڕبو)؛ ۱۲) بڕشت و كار راپـه‌ڕاندن: (زۆر پیاوێكی به‌بڕه)؛ ۱۳) گۆتره یێ‌پێوان و ژمار: (به‌ری ئه‌م گوێزه له بڕ به‌چه‌نده؟)؛ ۱۴) فه‌به‌ڵ و به‌كجاره‌كی: (ئه‌م خانوه‌م له‌بڕ به‌كـردن داوه)؛ ۱۵) بواری ئاو: (ئه‌م روباره بڕنادا)؛ ۱۶) ده‌سكاری پەڕی فومار: (بڕی لێده)؛ ۱۷) له‌گه‌ڵ دور كه‌ونو: (ئه‌م گیسكه له‌مبگه‌ل بڕ بوه)؛ ۱۸) به‌زۆر خستنـه‌نـاو: (داربان تێ بڕی)؛ ۱۹) دزی وشك: (كـراسه‌كه‌م ئه‌ڕو بڕه) ف ۱) اندكی؛ ۲) قطعهٔ بریدهٔ چوب؛ ۳) یك سال در عمر چهارپایان؛ ۴) توان؛ ۵) دسته و گروه؛ ۶) تیره و عشیره؛ ۷) قطع كردن؛ ۸) پسـونـد به‌معنی بُرنـده؛ ۹) بسـونـد به‌معنی سوراخ‌كُننـده؛ ۱۰) بر بدن پارچه؛ ۱۱) از بین برنـده؛ ۱۲) بُرش، قاطعیّت؛ ۱۳) روی‌هم؛ ۱۴) كُنتـرانی؛ ۱۵) گُدار آب؛ ۱۶) بُرزدن اوراق پاسور؛ ۱۷) از جمع جا مانده؛ ۱۸) به‌زور جادادن؛ ۱۹) خبس.

**بڕا**: ۱) بڕدرا به‌تیخ بان به ئه‌ورو هه‌رچی: (بـه‌تـه‌ور داره‌كـه **بڕا**)؛ ۲) خه‌لاس بو، كۆتایی هات: (نانمان له‌ماڵی **بڕا**، مانگا مردو دو**بڕا**) ف ۱) قطع شد؛ ۲) تمام شُد.

**برا**: ۱) نێر بنه‌ی هاودابك و باو بان هاوبه‌ك له‌وان، برێ؛ ۲) بردرا، دزی هاوردرا ف ۱) برادر؛ ۲) بُرده شُد.

**براباب**: نێر ینه‌ی هاوباب و دایك جیا ف برادرِ پدری.

**برابه‌ش**: هاوبه‌ش له‌ماڵی دنیادا، دۆستی زۆر نزیك ف سهیم در میراث.

**براتوُته**: قامكی به‌ناقامكه چكۆله ف انگشت بنصر.

**بڕاده**: خاكه‌مرمه‌ند، ورده‌ئاسنی بڕبه‌ند لێدراو ف بُراده آهن.

**براده‌ر**: دۆستی نیر، ده‌سنه‌برا ف دوست، رفیق.

**براده‌ری**: دۆسنایه‌نی و هه‌واڵه‌نی پیاو ف دوستی.

**برازا**: فرزه‌ندی برا، زاروی برا، برازی ف برادرزاده.

**برازازا**: نه‌وه‌ی برا ف نوهٔ برادر.

**برازاڤا**: برازاوا، باربه‌ده‌ری زاوا له‌كانی بوك گوێزانه‌وه‌دا پشتێنه‌ی بوك ئه‌و ده‌بیه‌ستێ ف ساقدوش.

**برازاگ**: برازا ف برادرزاده.

**برازاوا**: برازاڤا ف ساقدوش.

**برازه**: نوێڵ، لۆسه، باری، باربه، مه‌لغه، له‌وازه، ده‌له‌م ف دیلَم، اَهرُم.

**برازی**: برازا ف برادرزاده.

**براژتن**: برژاندن، كه‌واوكردن، بر بانكردن، بۆدانی دانه‌وێڵه له‌سه‌ر ساج ف بر بان كردن، بودادن.

**براژن**: ژنی برا ف زن برادر.

**براشتن**: براژتن، بۆدان ف بریان كردن، بودادن.

**براشتی**: برژاو، بر بان كراو، بۆدراو ف بر بان شده.

**براكێ**: براده‌ر، دۆستی نزیكی نێر ف دوست و برادر.

**براكه**: وشه‌ی خۆشه‌وبستی بۆ دواندنی براده‌ر ف حرفِ نوازش دوستانه.

**برالو**: ئالۆبالۆ، به‌لالۆك، هه‌ڵهه‌لوك ف آلبالو.

**برالوك**: به‌لالۆك، ئالو بالو ف آلبالو.

**برالوی**: برالو ف آلبالو.

**براله**: ۱) وشه‌ی خۆشه‌ویسنی بۆ دواندنی براده‌ر؛ ۲) ناوی گیابه‌كه ف ۱) كلمهٔ محبّت‌آمیز دوستانه؛ ۲) گیاهی است.

**برام:** ١) برای من؛ ٢) بردیانم، بریام ف ١) برادرم؛ ٢) برده‌شدم.

**برامازگ:** بەرێکە لە بەری دارمازو ف پُرغَند.

**براماك:** برای هەرلەدایك لەباو نا ف برادر مادری.

**بڕان:** ١) دوایی هاتن؛ ٢) جودابی: (لێك **بڕان**)؛ ٣) گەیشتن: (میرانت چەند پێ‌بڕا؟، نەوکیژو کوڕە پێك **بڕان**)؛ ٤) دابڕبن، لەت‌بون ف ١) پایان بافتن؛ ٢) جدائی؛ ٣) نصیب‌شدن؛ ٤) قطع‌شدن.

**بڕاندن:** بڕ بن ف قطع کردن.

**بڕانە:** ١) جیرەو موچەی دیاری کراو؛ ٢) باج‌و پیتاکی ساڵانەی میری ف ١) مستمرّی؛ ٢) باج و خراجِ سالانە.

**بڕانەوە:** ١) بڕبانەوەو کۆتایی هاتن؛ ٢) لەت‌بونی دارو... بە مشارو تیغو ... ف ١) تمام شدن؛ ٢) قطع‌شدن.

**برابانە:** وەك برا ف برادروار.

**برای‌توتە:** برانونە ف انگشت بنصر.

**برایەتی:** ١) برابون؛ ٢) خۆشەویستی‌و رەفتاری برابانە ف ١) و ٢) برادری.

**برایی:** برابەنی: (براما **برایی** کیسەمان جیابی) ف برادری.

**بڕبانە:** پیاوی زەبەلاح‌و نەزە، زلی نافوڵا ف مَردِ لندهور و بدقیافه.

**بڕبڕ:** ١) کەم‌کەم، نۆزەنۆزە؛ ٢) لەت‌لەت، زۆر پارچەی بڕاو ف ١) کم‌کم؛ ٢) پارچەپارچه.

**بڕبڕاگە:** مۆغەرەی پشت ف ستون مهره‌ها.

**بڕبڕە:** ١) بڕبڕاگە؛ ٢) بڕبڕ؛ ٣) داسی ددانەدار وەك هەرە؛ ٤) خزمی نزیك ف ١) ستونِ فقرات؛ ٢) کم‌کم؛ ٣) داسِ دندانەدار؛ ٤) خویشاوندِ نزدیك.

**بڕبون:** جیابونەوەو ناوەکی بون: (مەڕ لەگەڵە **بڕبوە**) ف جُداشدن و از جمع بُریدن.

**بڕبەند:** مڕمەند، نامرازی ناسن‌ڕنین، مورەت ف سوهان.

**بڕبەنگ:** بربەند ف سوهان.

**بڕپێدان:** قسە لەقسەدا کردن ف در میان سخن آمدن.

**برج:** ١) مزلگەی رۆژ لەعاسمان؛ ٢) مانگی ساڵ؛ ٣) قوڵنگرەی قونی قەلا ف ١) و ٢) و ٣) بُرج.

**برجی پیرێژن:** دومین حەوتەی رەشەمە کە زۆر ساردە ف بردالعَجوز، سرمای پیرزن.

**برچی:** برسی، نبژ، دژی تیر ف گُرسنه.

**برچەبرج:** دەنگی قولتە قولتی ناو ف صدای غلیان آب.

**برچینی:** برسیاتی، برسەبەنی، نبژی ف گرسنگی.

**بڕدان:** جیاکرنەوەی هێندێ لەهێندێ ف جُداکردن.

**بردن:** ١) برن، بەرانبەری هێنان؛ ٢) بربەنبەلە تیراکردن ف ١) بُردن؛ ٢) سپوختن، درآمیختن.

**بردنەبەست:** تەنگ پێ‌هەڵێنان، تەنگە تاوکردن ف در تنگنا قرار دادن.

**بردنەسەر:** ١) بەناکام گەیاندن، ئەنجامدان؛ ٢) گوزەراندن، رابواردن ف ١) بەانجام رسانیدن؛ ٢) گذراندن.

**بردنەوە:** ١) قازانج لەقوماردا؛ ٢) گەڕاندنەوە بوشو بنی پێشو ف ١) بُرد در قمار؛ ٢) بازگرداندن.

**بڕدۆنە:** زەلامی ناقوڵاو نەزە ف بلندبالای تنومند.

**بڕە:** شفرە، ددانی بەراز ف شُفرهٔ گُراز.

**بڕەك:** نیرەبەراز، بەکانە ف گراز.

**برزە:** گوم، ون، وندا ف گُم، مفقود.

**برژ:** بەناگر چزان بێ‌سونان: (گۆشتە کەهێشتا نیوە**برژ** بوخواردمان) ف برشت.

**برژان:** ١) برشتەبون؛ ٢) مژوڵ، بژانگ، موی پێلوی‌چاو، برژانگ ف ١) برشته‌شدن؛ ٢) مُژه.

**برژاندن:** براشتن، بربان کردن، بۆدان ف برشته‌کردن، بودادن.

**برژاندنەوە:** خوێن‌ڕاگرتنی بربن بەدەرمان ف خون‌بست کردنِ زخم به کمكِ دارو.

**برژانگ:** بژۆڵ، مژۆڵ، موی پێلوی چاو ف مُژه.

**برژانەوە:** ١) سوزبانەوەی زام، ژانی بربن‌و سوتان؛ ٢) وێستانی خوێن بەهۆی دەرمان ف ١) سوزش زخم؛ ٢) خون بندآوردن با دارو.

**برژاو:** ١) براشتی، بربان؛ ٢) برژانگ ف ١) برشته؛ ٢) مُژه.

**برژۆڵ:** ١) برژانگ؛ ٢) برزەوربشاڵی کوتاڵ؛ ٣) داسوکەی گوڵی دەغڵ ف ١) مژه؛ ٢) پرز قماش؛ ٣) بُرز خوشه گندم و...

**برژی:** برژاو ف برشته.

**برژیاگ:** برژاو ف برشته.

**برژیان:** برژان ف برشته‌شدن.

**برژیانەوە:** برژانەوە ف نگا: برژانەوە.

**برژیاو:** برژاو ف برشته.

**برژین:** برژان ف برشتن.

**برژینەوە:** برژانەوە ف نگا: برژانەوە.

**برژیو:** براشتی، برژاو ف برشته.

**برساق:** جۆرێ شیرینی ف نوعی قطاب.

**برس:** وزە، هێزو توانا ف توان، نا.

**برست:** برس ف توان.

**برسی:** برچی، نبژ، دژی‌تیر ف گُرسنه.

**برسیابەتی:** بێ‌نانی، ورگ بەتاڵی ف گُرسنگی.

**برسیتی:** برچینی، برسیاتی ف گُرسنگی.

**برسیەتی:** برسیابەنی، ناورابی ف گُرسنگی.

**برش:** ١) کەرو، نەوکەفە شینەی دەکەوێتە سەر ترشاوو نانی کۆن، کەڕەکیفە؛ ٢) ناحەزو ناشیرین: (رەش‌و برشە)؛ ٣) هەناسەو هێز: (یەك چەند گەرمە، برشم هەڵات) ف ١) کَفَك؛ ٢) سیەچرده؛ ٣) نفس و رَمَق.

**بڕشت:** ١) هێزی بڕین؛ ٢) بەهرەی چێندراو؛ ٣) زەمینی بەپیت؛ ٤) برس؛ ٥) پارچەبەکی براو بۆ درون؛ ٦) کوز، قاش: (**بڕشتێ** هەنی داپێم) ف ١) بُرش؛ ٢) بهرهٔ محصول؛ ٣) زمین حاصلخیز؛ ٤) تاب و توان؛ ٥) پارچهٔ برش خورده آمادهٔ دوختن؛ ٦) قاچ هندوانه و...

**برشتە:** برژاو ف برشته.

**بەیداخ:** ئالا، بەباخ، پارچەی بەدرۆشمی گەل و قەوم، عالا ف پرچم.

**بەیداخدار:** ئالاهەڵگر، بەباخدار ف پرچمدار.

**بەیدەس:** ١) سڵ، قوشقی، ئەسپ یا ماینێك کە ڕام نەبووە و ناگیری؛ ٢) بەردەست، تەسلیم، مل‌دەر؛ ٣) دەسوپێ سپی و کارلەدەس نەهاتو ف ١) رموك؛ ٢) تسلیم و سپر انداخته؛ ٣) دستپاچه.

**بەیدەست:** بەیدەس ف نگا: بەیدەس.

**بەیدێ:** وەرن، بێن ف بیایید.

**بەیرەم:** لۆسە، مڵغە، باربە، نوێڵ ف اهرم.

**بەهبستن:** بیسن، شنەفتن، ژنەوتن ف شنیدن.

**بەیلوت:** جۆرێ هەڵپەڕکێ ف نوعی رقص گروهی.

**بەین:** ١) نێوان، ماعبەین؛ ٢) دۆستایەتی، ئاشنایەتی؛ ٣) وەختێکی زۆر ف ١) میانه؛ ٢) دوستی؛ ٣) مدتی زیاد.

**بەینەت:** وەفا، ئەمەگ ف وفا.

**بەینەت‌دار:** بەوەفا، بەئەمەگ ف وفادار.

**بەیە کاچون:** ١) دەگژ بەکرا چون؛ ٢) چونە ناو بەکتر، تێك بەزین ف ١) باهم گلاویزشدن؛ ٢) درهم شدن، درهم رفتن.

**بەیەکادان:** ١) شالاو بۆسەر بەکتر بردن: (ئێران و عیراق **بەبەکانەدەن**)؛ ٢) تێکەڵ کردن: (ئاردورۆنەکە **بەبەکادە**) ف ١) بر یکدیگر هجوم بردن؛ ٢) قاتی کردن.

**بەیەك گەیشتن:** پێك گەیین، توشی بەك بون ف وصال، بەهم رسیدن.

**بەبەوە:** بارن، بەفرێ کە با ڕنیویەوە و دەقوڵکەی بەسناونەوە ف برف جمع شده بەوسیلهٔ باد در کوهستان.

**بێ:** ١) ناوی دوهەم پیتی ئەلفوبێکە؛ ٢) وەرە؛ ٣) با، جولانی با؛ ٤) بەجگە: (**بێ** تۆ دنیا کاولە)؛ ٥) میوەی داری بەی؛ ٦) لەپێش وشەوە نەبون دەگەیێنێ: (**بێ**‌پارەم)؛ ٧) پاش وشە: بوێ، بێێ، مانا دەدات: (ئەگەر وابێ دەبێ پیاوێ چابێ)؛ ٨) بۆ ف ١) حرف دوم از حروف الفبا؛ ٢) بیا؛ ٣) باد؛ ٤) بی؛ ٥) میوهٔ درخت به؛ ٦) پیشوند نداری؛ ٧) باشد؛ ٨) بود.

**بی:** ١) دارە بی؛ ٢) بێوەژن، ژنی شو مردو ف ١) بید؛ ٢) بیوەزن.

**بیابان:** ١) دەشتی چوڵ؛ ٢) بورانەوە: (دڵم **بیابان** بوە دەبورێنەوە) ف ١) بیابان؛ ٢) از هوش رفتن.

**بێ ئابڕو:** ئابڕونەدار، بێشەرم و حەیا ف بی آبرو.

**بێ ئارام:** دانەسەکناو، بێ‌ئۆقرە ف ناآرام.

**بێ ئاگا:** بێخەبەر، های لەهیچ نا ف ناآگاه.

**بیام:** بوبام، بوایتم ف بودمی.

**بیانك:** بەهانە ف بهانه.

**بیانگ:** بەهانە ف بهانه.

**بیانو:** بیانگ ف بهانه.

**بیانی:** ١) بەهانە؛ ٢) بێگانە، غەوارە ف ١) بهانه؛ ٢) بیگانه.

**بیاوان:** بیابان، چۆل ف بیابان.

**بێ ئاورو:** بێ‌ئابڕو ف بی‌شرم.

**بێ ئاوەز:** بێ‌عەقڵ، هەقمەق ف نابخرد.

**بێ ئۆرت:** بێ‌ئیعتوبار، نەجێ‌باوەڕ ف بی‌اعتبار.

**بێ ئۆقرە:** بێ‌ئارام ف بی‌آرام.

**بێ ئۆل:** بێدین، بێ‌ئایین، کافر ف بی‌دین، کافر.

**بێ ئەمەگ:** بێ‌بەینەت ف بی‌وفا.

**بێ ئەنوا:** بێ جێگەی حەسانەوە، بێ‌پەنا ف بینوا.

**بیبا:** ١) هەیبوابە، بوایێ؛ ٢) بیوات ف ١) اگر داشت؛ ٢) ببردش.

**بێبار:** ١) وازوازی، هەردەم لەسەر فکرێك؛ ٢) کەلای خوار و خێچ و لاپان ف ١) دمدمی مزاج؛ ٢) تبلهٔ کج‌پهلو.

**بیبار:** ١) ئیسوت؛ ٢) سەوزیەکە نیژوناوك بەئۆ و ف ١) فلفل سیاه؛ ٢) فلفل فرنگی.

**بێبارە:** بێ‌بەش ف بی‌بهره.

**بێباسك:** بێکەس و تەنیا، تەنیاباڵ ف تنها و بی‌همکار.

**بێ باڤ:** ١) باب‌مردو، سێوی، هەتیو؛ ٢) برێتی لەبەدناکار و مرۆی پیس ف ١) پدرمرده؛ ٢) کنایه از آدم هرزه و بدرفتار.

**بێباك:** ئەترس، گوێ‌نەدەر ف بی‌باك.

**بێباوك:** بێ‌باڤ ف بی‌پدر.

**بێ بڕ:** زەوی کەم‌بڕشت، کەم دەرامەت ف زمین بی‌حاصل.

**بێ بڕانەوە:** هەرهە، ناهەنا ف جاویدان.

**بێ بژار:** زەمینی پاك لەگیای خراپ و بێکارە ف زمینی که علف هرز نداشته باشد.

**بیبك:** بیبیلەی چاو، رەشکێنە ف مردمِ چشم.

**بێ بگار:** قوڵی بێ‌پەی ف بسیار عمیق.

**بێ بن:** ١) زۆرقوڵ، پەی نەدەر؛ ٢) کچێ کچیەتی دۆراندبێ ف ١) بسیار عمیق؛ ٢) دختر بی‌بکارت.

**بیبن:** پشتێن، بشنان، کەمەربەند، کەمبەرە ف کمربند.

**بێ بەخت:** ١) بێ‌ئامان، پەیمان شکێن؛ ٢) کڵۆڵ، نەگبەت، قەرەبەخت ف ١) بدقول و پیمان‌شکن؛ ٢) بدبخت و کم‌شانس.

**بیبەر:** بیبار ف فلفل.

**بێ بەر:** ١) داری بێ‌میوە؛ ٢) ماینی نەزۆك ف ١) بی‌ثمر؛ ٢) مادیان نازا.

**بێ بەری:** بێ‌بەش: (ژنەکەی لەمیرات **بێ‌بەری** کردوە) ف محروم از ارث.

**بێ بەش:** بێ‌پار، بێ‌بەهر، هیچ پێ‌نەبڕاو ف محروم از سهم.

**بیبی:** ١) بوکەڵەی منالٚ؛ ٢) رەشکێنەی چاو، بیبك ف ١) عروسك؛ ٢) مردم چشم.

**بێ بیر:** بێ‌هۆش ف فراموشکار.

**بیبیلکە:** باڵدارێکی بچوکە ف پرنده‌ای است کوچك.

**بیبیلە:** ١) رەشکێنەی چاو؛ ٢) منالی ساوا لەزمانی منالاندا ف ١) مردم چشم؛ ٢) نوزاد بەزبان بچەها.

**بیبیلە گەرە:** جۆرێ مارمێلکە ف نوعی مارمولك.

**بێ بێن:** ١) بێ‌بوێن؛ ٢) بێ‌پشو، کەم‌حەوسەلە ف ١) بی‌بو؛ ٢) کم‌حوصله.

**بیبین:** پشتبند، پشتێن، بیبن ف کمربند.

**بێ بێهن:** بێ‌بێن ف کم‌حوصله.

**بێ بۆڕ:** تەور، تەوەر فا تَبَر.

**بێ پەرکەم:** بێ لەمپەر، بێ کۆسپ و بەرهەڵست فا بلامانع.

**بێ پەی:** زۆرقووڵ، بێ بن فا بسبار ژرف.

**بێ پیڤان:** بەدەر لەپێوان و بەراوەرد کردن، زیاد لەئەندازە فا بی حد.

**بێ پێوان:** بەراوردی دەغل لەگۆترە فا برآورد غله.

**بێ تاب:** بێ تاقەت، ماندو فا ناتوان.

**بێتار:** ١) بەڵاو دەرد، مسیبەت؛ ٢) بێهۆشی، بورانەوە فا ١) بلا و مصیبت؛ ٢) بیهوش شدن.

**بیتاقە:** بلیت، بتاقە، پەتە فا بلیط.

**بێ تام:** ١) ناخۆش، بێ چێژە؛ ٢) بێ جەوراییی فا ١) بی‌مزه؛ ٢) بدون جربی.

**بێتان:** ١) سست و شل، بێ هێز؛ ٢) بەرژین نەکراو فا ١) سست و ناتوان؛ ٢) بی برجین.

**بێتاو:** ١) بێ هێزو تابشت؛ ٢) سێبەر، سیی رۆژ فا ١) بی تاب؛ ٢) سایه.

**بێتاوان:** بێ گوناح، بێ خەتا، بێ سوچ فا بی خطا.

**بێتر:** زورتر، پتر فا بیشتر.

**بێتڤاب:** بێ تاقەت، بێ هێز فا ناتوان

**بێتك:** باپشکێو، چنچکەسلاو فا گُل مژه.

**بێتن:** ١) پێژتن؛ ٢) بێژتن، دابێژنن فا ١) پُختن؛ ٢) بیختن.

**بێتۆ:** ١) بەبێ تۆ، تونەبێ؛ ٢) بێ تۆم و بەزر فا ١) بی تو؛ ٢) خالی از هسته.

**بێتو:** ١) بێتۆ؛ ٢) ئەگەر، گر بمان: (**بێتو** بباری تەرز دەبێن) فا ١) نگا: بێتۆ؛ ٢) اگر.

**بێ توان:** بێ هێز، بێتان فا ناتوان.

**بێ توتە:** ماڵ بەکوڵ و رەبەن، بێ ئەنوا فا بینوا.

**بێتوك:** ١) سادە، بێکولکە؛ ٢) برێتی لە نەدارو نزار فا ١) سادە؛ ٢) کنایه از فقیر.

**بێتە:** ١) بێنۆ؛ ٢) هاتنێ بکا: (با بێتە نبرە) فا ١) بدون تو؛ ٢) بیاید.

**بێ تەرەف:** بێ لایەن، تەریك، دورەپەرێز فا کنارە گیر.

**بێ تەشە:** بێ تاقەت و لەکارکەوتە فا بی تاب و توان.

**بێتەل:** لاسلکی، بێ سیم: (**بێتەل** جیە؟ شیعری ماریکونی) «مەلا فەتاح وەهبی» فا بی سیم.

**بیج:** زوڵ، حەرامزادە فا حرامزاده.

**بێجا:** نابەجێ، نارەوا فا نابجا.

**بێجگە:** بەجگە، بل فا بجُز.

بێجەرگ: ترسەنۆك، قزە فا ترسو.

**بێجێ:** ١) بێجا؛ ٢) لەقەرز نابوت: (قەرزی کردوە ئیستا **بێجێ** دەرچوە) فا ١) نابجا؛ ٢) ورشکست.

**بیج:** زوڵ، بیژو، بیج فا حرامزاده.

**بێچارە:** بێ دەرەفەت، بەسەزوان، هەژار فا بیچاره.

**بێچاورو:** بێ شەرم و حەیا، بەڕو فا پررو، بی شرم.

**بێچاوەڕو:** بێچاوڕو فا بی شرم و حیا.

**بێچاوێتی:** بەدور لەچاوی پیس فا دور از چشم بد.

**بیچکەلانە:** چکۆلوکە: (وەرە بت بینم دەم **بیچکەلانە**) فا کوچولو.

**بیچکەلۆکە:** بیچکەلانە فا کوچولو.

**بیچکەلە:** بیچکەلانە فا کوچولو.

**بێچولە:** بەچك: (**بێچولە**مار) فا بچهٔ مار و حشرات.

**بێچەك:** زووت لەنامرازی جەنگ، بێ سیلاح فا بی سلاح.

**بیچم:** ١) شکڵ و هەندام؛ ٢) تەرح و دیدار؛ ٢) تەرزو شێوە، جۆر؛ ٤) گزیکارو حیلەباز فا ١) هیئت؛ ٢) سر وسیما؛ ٣) شیوه؛ ٤) ناروزن.

**بێچو:** ١) وەچە، زا، بەچکی ئاژەڵی وردەو مەل و خشوك؛ ٢) جۆرێ پوڵی عوسمانی فا ١) بچه؛ ٢) واحدی در پول عثمانی.

**بێچولە:** ١) بەچکی ساوا؛ ٢) ماسولەی خەرەك فا ١) نوزاد؛ ٢) ماسورهٔ دوك.

**بێچون:** بێ هاونا فا بی نظیر.

**بێچی:** بەرخ و کاریلە فا بچه دام.

**بێچیڤان:** شوانی بەرغەل فا چوپان برّه و بزغاله.

**بێحال:** ١) نەخۆشی لەسەرمردن؛ ٢) هەژارو ئاتاج فا ١) مرض الموت؛ ٢) بینوا و محتاج.

**بێخ:** بن وریشە فا بیخ.

**بێخ بڕ:** بن بڕ، لەرەگ دەرێنان فا ریشه کن.

**بێخو:** سەربەخۆ، بێ پرس، بێ مانا فا خودسر.

**بێخود:** بێخۆ فا بیخود.

**بێخودی:** ١) بێخۆ؛ ٢) بورانەوە، لەهۆش چون فا ١) ببخودی؛ ٢) از حال رفتن.

**بێخوست:** وس، بێ دەنگ و بێ جوڵە فا بی حرکت و صدا.

**بێ خولق:** بێ کەیف، وەڕەز فا بکر، ناراحت.

**بێ خولك:** بێ خولق فا بکر.

**بێ خەبەر:** ١) بێ ئاگا؛ ٢) کتوپڕ، لەنکاو فا ١) بی‌خبر؛ ٢) ناگهان.

**بێخەم:** خاترجەم، دڵناسودە، نارخەیان فا آسوده خاطر.

**بێدا:** زیاد لەئەندازە فا زیاد از اندازه.

**بێداد:** ١) بێدا، زیاد لەئەندازە؛ ٢) لەدوای داد دێت وانا: هاوار فا ١) بیش از حد؛ ٢) بیداد.

**بێدار:** ١) نەخەوتو؛ ٢) لاواز: (زۆر **بێدار**و بارە) فا ١) بیدار؛ ٢) لاغرمردنی.

**بێداوی:** ١) لەدوانەهاتو، بێ برانەوە؛ ٢) کاری بێ بەهرەو نەتیجە فا ١) بی نهایت؛ ٢) بیهوده.

**بێدڵخە:** حەوت رۆژ لەجلەی جوکی زستاندا فا هفت روز در جلّه کوچك.

**بێ دوایی:** بێداوی فا نگا: بێداوی.

**بێدوش:** دەفری شیردوشین، بیرەدوش فا ظرف شیردوشی.

**بێ دوندان:** ئاژەڵی نەزوك فا دام نازا.

**بێدەر:** ١) خرمان؛ ٢) بێ یەناو بێکەس: (بێکەس و بێدەر خوم) فا ١) خرمن؛ ٢) بینوا.

**بێ دەرەتان:** جارە نەماو، رێگەی نەجات لێ بەستراو فا بیچاره و

درمانده.

**بێدەس**: ١) نەدارو هەژار؛ ٢) دەست نەڕویشتو ف ١) فقیر و نیازمند؛ ٢) ناتوان.

**بێدەست**: بێدەس ف نگا: بێدەس.

**بێدەم**: شەرمن لە قسەکردنا ف خجالتی.

**بێدەمار**: ١) خۆ بەزل‌نەزان؛ ٢) بێ‌غیرەت ف ١) متواضع؛ ٢) بی غیرت.

**بێدەموپل**: ١) بێدەم؛ ٢) قسەنەزان ف ١) خجالتی؛ ٢) نافصیح.

**بێدەمودوان**: کەم‌قسە ف کم‌حرف.

**بێدەنگ**: ١) هیچ نەوێژ؛ ٢) ئارام ف ١) خاموش؛ ٢) آرام.

**بێدین**: بێ‌ئاین، لەخوانەترس ف بی‌دین.

**بیر**: ١) چاڵاو؛ ٢) هزر، فکر؛ ٣) یاد: (بیرت‌دێ عەبای بیوەبو جێ‌باری لمت) «خەییام» ف ١) چاه؛ ٢) تفکر؛ ٣) یاد.

**بێر**: ١) بێمەرە، بێڵ؛ ٢) کۆبونی ئاژەڵ بۆ دۆشین؛ ٣) جێگەی دانیشتنی حەیوان گر بۆ دۆشین، بەردەبێر؛ ٤) بەهرە: (وڵاتێکی بەخێرو **بێرە**) ف ١) بیل؛ ٢) جمع شدن گلّه برای دوشیدن؛ ٣) جای آنکه حیوان را برای دوشیدن نگهمیدارد؛ ٤) بهره، فایده.

**بیرا**: بەزەین، زۆر بەبیر و هۆش ف زیرك و باهوش.

**بیراز**: ١) گرێی کردنی بەرداش: (بەرداش لوس بوە **بیراز** کردنی دەوێ)؛ ٢) رێك و بێ‌کلۆ کردنی زەوی، تەخت‌کردن: (زەویم **بیراز** کردوە بۆ توتن) ف ١) مرمّت و تعمیر سنگ آسیا؛ ٢) صاف کردن شخم.

**بیرازتن**: ١) بیرازکردنی بەرداش؛ ٢) تەخت‌و لوس کردنی زەوی ف نگا: بیراز.

**بیرازکردن**: ١) بیرازتن؛ ٢) بڕبێتی لە دارکاری و تەمێ کردن ف ١) تعمیر سنگ آسیا؛ ٢) کنایه از کتك‌کاری.

**بێرانە**: بهێنە: (شایی کورمانە رەزیلی مەکە هەر بەنج کەس دونان **بێرانە**) ف بیار.

**بیراو**: چاڵاو ف چاه آب.

**بێراقلك**: سەوڵی کەڵەکەوان و قەیاغ‌وان ف پاروی قایقرانی.

**بێرایی**: باران‌نەگر، هەبوانۆکە ف تراس.

**بیربردن**: لەهزردامان، لەبیرمان، لەبیر بون؛ ٢) لەبیرچون ف ١) بیادماندن؛ ٢) فراموش کردن.

**بیربلاو**: فکر بەرێشان،خەیاڵاوی،کەم‌هۆش ف کم‌هوش‌وپریشان‌خاطر.

**بێربێروك**: گوڵەستێرە ف کرم شبچراغ.

**بیرچون**: لەیادچون ف فراموش کردن.

**بیرچونەوە**: لەیادچونی ئەوی زانراو ف فراموش کردن.

**بیرخستنەوە**: بەیاد هێنانەوە ف یادآوری.

**بێرك**: ١) گیرفـان، بەریك، جێو، بەرك؛ ٢) بێڵی پچوك، خاکەنـازی چکۆڵە؛ ٣) بێر، جێ دۆشینی ئاژاڵ؛ ٤) گۆمبلکە لەچیا ف ١) جیب؛ ٢) بیلك؛ ٣) جای دوشیدن گلّه؛ ٤) استخر طبیعی در کوه.

**بیرکردن**: ١) یادکردن، ناسە؛ ٢) لەبیرچون، فەراموش کردن: (خودێ من **بیرکرد**) ف ١) یادکردن؛ ٢) فراموش کردن.

**بیرکم**: دەریاچە، زرێبار، گۆل ف دریاچه.

**بێرکم**: قەفەس، رکە ف قفس.

**بیرکەم**: کەم‌هۆش، کەم‌زەین، کەم‌بیر ف کم‌هوش.

**بیرکەوتنەوە**: وەباد هاتنەوە ف بیادآمدن.

**بێرو**: ١) شەرمن، شەرمبون، فەدبکـار؛ ٢) بێشـەرم و ڕوهەڵماڵاو ف ١) خجالتی؛ ٢) پررو.

**بێروّ**: بگەڕێوە، وەگەڕێ، وەرەوە ف برگرد.

**بیرو**: نەخۆشی پێستە وشکوتەڕی هەبە ف اکزما.

**بێروخ**: ناوچەیەکە لەکوردستان ف ناحیه‌ای در کردستان.

**بیروّڤ**: ١) بیرو؛ ٢) نیروێ، دارێکی دەوەنە ف ١) اکزما؛ ٢) درختچه‌ای جنگلی.

**بێرون**: ١) چۆڵ و بیابـان؛ ٢) بەشـەخانوی میوان و پیاوان، بەرانبەری نەندەرون ف ١) بیابان؛ ٢) قسمت بیرونی خانه.

**بێرۆن**: بێ‌چەوری ف بدون چربی.

**بێرونی**: خانوی میوانخانە، بێرون ف قسمت بیرونی خانه.

**بێرە**: ١) جێگەی دۆشینی کۆمەڵی ئاژاڵ، بێر؛ ٢) بهێنە، بارەی؛ ٣) وەرە، بێ؛ ٤) بەم شوێنە: (چەندێکە **بێرە** فێر بوە ئاژوا) ف ١) جای دوشیدن گلّه؛ ٢) بیار؛ ٣) بیا؛ ٤) به‌اینجا.

**بیرە**: ناوجۆ، قەخوارنێکە لجەهـ دکن ف آبجو.

**بیرهاتنەوە**: کەوتنەوە یاد ف یادآمدن.

**بیرەخەو**: سوکەڵەخەو ف پینکی.

**بێرەدۆش**: ١) مەڕدۆش، ئەوکەسەی ئاژەڵ دەدۆشێ؛ ٢) دەفری شیر تێدا دۆشین ف ١) شیردوش؛ ٢) ظرف شیردوشی.

**بیرەوە**: یادکرنەوەی ساڵانەی شتێکی عەزیز، بیرەوەری ف یادبود.

**بێرەوە**: بگەڕێوە، بێروّ ف برگرد.

**بیرەوەر**: خاوەن فکر و بەزەین، بیرا ف متفکر.

**بیرەوەری**: ١) یاداشت، نوسینـەوەی رووداو؛ ٢) یادکردنەوەی ساڵانەی مردوی گەورە ف ١) یادداشت؛ ٢) یادبود.

**بێرەهـ**: بێ‌ڕەگ، بێ‌غیرەت ف بی رگ، بی غیرت.

**بیرهێنان**: خستنەیاد ف یادآوری.

**بیرهێنانەوە**: وەیاد هێنانەوەی لەبیرچو ف یادآوری کردن.

**بێرێ**: ١) نەبەشەقامدا؛ ٢) بڕێتی لەبێ‌ناکارو نابەسەند ف ١) بیراهه؛ ٢) بدکردار.

**بێری**: ١) مەڕدۆش، دۆشەری ئاژاڵ؛ ٢) یاد: (م **بێری** یاتە کر بو) ف ١) شیردوش؛ ٢) یاد.

**بێرێتـە**: جۆرێ سەمـای بەکـۆمەڵ، یەکێك لەداوەتی کوردان ف نوعی رقص دسته‌جمعی.

**بێریڤان**: مەڕدۆش: (ئەز حەلاندم **بێریڤانا** پەزی) ف شیردوش.

**بیز**: ١) رەنگ: (ئەم قاڵی‌یە لەبیزی هاوتاکەی نیە)؛ ٢) ئیشتیا، واز: (**بیزم** نایە بیخۆم)؛ ٣) دڵ لێ هەڵەنگوتن، قێز: (**بیزم** لێ دەبێتەوە) ف ١) رنگ؛ ٢) اشتها؛ ٣) تهوّع.

**بیزا**: گیایەکی بەنـاوبانگە بۆ نرشیات و بۆنا و شیرێژ بەکاردێ ف گیاهی

اسب مشهور.

**بێزات**: ترسەنۆك، ترسۆنەك، بێزراو ف بُزدل، ترسو.

**بێزاد**: بێدەغڵی ئازوقە لەماڵدا ف بی آذوقە.

**بێزان**: ١) وەڕەز، جارس، جاڕز؛ ٢) دەمخوار؛ ٣) بێدەم، کەسێ دەڤی نەبێ: (ونم ئابا بەزاری خۆت دەپرسی حاڵی زاری من؟ / بروێ هێنایە بەك وەك شکلی لا بەعتی کەبێزارم) «تالی» ف ١) بیزار؛ ٢) دهان کج؛ ٣) بی‌دهان.

**بێزان**: وەڕەزبون، لەبەردڵ لاچون: (دڵم لێی بێزاوە) ف بیزارشدن.

**بێزران**: بێزان ف از چشم افتادن.

**بێزراو**: ١) لەبەرچاو کەوتو؛ ٢) ترسەنۆك ف ١) از چشم افتاده؛ ٢) بُزدل.

**بێزکردن**: دڵهەڵەنگوتن لەدیتنی کەسێ یا شتێ ف حال بهم خوردن از دیدن کسی یا چیزی.

**بێزگ**: مەگیرانی، نارەزوی ژنی تازە حاملە ف ویار.

**بێزگەوان**: مەگیرانی کەر، ژنێ کەبێزگ دەکا ف زن ویاردار.

**بێزنەهاتن**: نارەزو نەکردن، دڵلێ شێوان، خۆش نەویستن ف متنفر بودن.

**بێزو**: بێزگ ف ویار.

**بێزوکردن**: مەگیرانی کردنی تازە سك‌پڕ ف ویارکردن.

**بێزوکەر**: مەگیرانی کەر، بێزگەوان ف ویاردار.

بێزە: ١) منالی ناوسك، تۆل، بیزە، بێزی، پس، بز؛ ٢) سیراج، شیرێز، زاژێ؛ ٣) پۆڵێکی کەم: (بە بێزە بەك نابکرم) ف ١) جنین؛ ٢) سیراژ؛ ٣) پشیز.

بێزەرو: گیابەکی گەلاوردی ناونـاوە، نامی نیزەو لەتیرەی کوزەلـەبە ف گیاهی است آبزی.

**بێزەواد**: بێ‌نان و بژیو لەماڵدا ف بی‌قوت لایموت.

**بێزی**: بێزو، بێزگ ف ویار.

**بێزیاگ**: لەبەرچاو کەوتو، بێزراو ف ازچشم افتاده.

**بێزیان**: بێزران، بێزان ف از چشم افتادن.

**بێژ**: ١) پاشگری بەواتا: بێژەر: (گۆرانی بێژ، ستران بێژ)؛ ٢) پاشگری بەواتا: لێدەری ئامرازی موزیك: (بلویر بێژ، تەنبور بێژ)؛ ٣) دابێژەر، لەبێژنگ دەر: (ناردبێژ) ف ١) پسوند بەمعنی گوبنده؛ ٢) نوازنده؛ ٣) بیزنده.

**بێژار**: ١) ربتاڵ، بژگور، لەت و دڕاو: (کراس و کەوای بێژار بێژارە)؛ ٢) بێژەهر: (ماری رەش بێژارە) ف ١) سوراخ و پارەشده؛ ٢) ماری که سم ندارد.

**بێژان**: ١) گیابەکی بۆن توندی گوڵزەردە کە مێش نوخنی ناکەوێ؛ ٢) دابێژین بەهێڵەگو بێژنگ کردن؛ ٣) گوتن، ناخافتن، ئێشنبغالی ف ١) گیاهی است با گل زرد که مگس از آن گریزد؛ ٢) بیختن؛ ٣) گفتن.

**بێژانن**: دابێژتن، بێژان ف بیختن.

**بێژانە**: گیای بێژان ف گیاه «بێژان».

**بێژانـەوە**: ١) دوبـارە لەهێڵەگ دان؛ ٢) دوپـاتە کردنەوەی قسە ف ١) دوباره بیختن؛ ٢) دوباره گفتن.

**بێژتن**: دابێژان، لەهێڵەگ دان ف بیختن.

**بێژتی**: دابێژراو، لەهێڵەگ دراو ف بیخته.

**بێژمار**: لەژمارە بەدەر ف بی‌حد.

**بێژن**: ١) بێژنگ، هێڵەگ، تەڵبێر، موخل؛ ٢) دەنگی جوڵان و بزوتن؛ ٣) پیاوێ ژنی نەبێ، سەڵت و رەبەن ف ١) غربال؛ ٢) صدای حرکت؛ ٣) مرد مجرد.

**بێژنگ**: تەڵبێر ف غربال.

**بێژو**: زۆڵ، بیج، حەرامزادە ف حرامزاده.

**بێژو**: کەم‌شیر، ژن و ئاژەڵی کەم‌شیر ف زن یا حیوان کم‌شیر.

**بێژوك**: چەنەباز، زۆربێژ، چەقەسرو، چەڵەنەباز، زۆربڵێ، فرەوێژ ف وراج، یاوه‌گو.

**بێژوك**: ١) بەرهـەمی نائـاسـایی: (ئەوگیسکە **بێژوکە** زێیە، ئەو نیسکە **بێژوکـە** ناکـوڵێ)؛ ٢) بزنێ کە هەر بەدوسـاڵی بزێ؛ ٣) ددان یان ئەنگـوستی زیاد لە ناسایی ف ١) غیرعادی؛ ٢) حیوانی که یکسال قبل از موعد بزاید؛ ٣) دندان یا انگشت اضافه.

**بێژە**: ویژە ف ادبیات.

**بێژەك**: ١) ئاژەڵی کەم‌شیر؛ ٢) قەوان، گرامەفۆن، سندوقی ستران‌ئان ف ١) حیوان کم‌شیر؛ ٢) گرامافون.

**بێژەن**: گۆرانی بێژ ف ترانه‌خوان.

**بێژی رەش**: گەنمە گوڵ‌رەش ف گندم سیاه خوشه.

**بێژین**: ١) دابێژتن، بێژتن؛ ٢) بێزو، مەگیرانی؛ ٣) بڵێین ف ١) بیختن؛ ٢) ویار؛ ٣) بگوییم.

**بیس**: ١) شنەفتن، گوێ لێ‌بون، ژنەوتن، بیستن: (**نەبیسێ، نابیسێ**)؛ ٢) دوجار دە، بیست ف ١) شنیدن؛ ٢) بیست.

**بێس**: ناوجی‌کەر ف میانجی.

**بێ‌سامان**: ١) لەئەندازە بەدەر، لەرادە بەدەر؛ ٢) بێ‌ماڵ، فەقیر، نەدار ف ١) خارج از حد؛ ٢) فقیر و محتاج.

**بێسان**: بێستان، جێگەی کاڵەك و شوتی و... ف جالیز.

**بێسانەوان**: ئاگاداری بێستان ف جالیزبان.

**بێسانەوە**: هەمبێنەماندو، دور لە ئیسراحەت ف بی‌استراحت.

**بێساو**: داسی کول کە لەهەسان‌دانی دەوێ ف داس کُند.

**بیست**: بیس ف عدد بیست.

**بێستان**: بێسان ف جالیز.

**بێستانەوان**: بێسانەوان ف جالیزبان.

**بیستراو**: بیسراو، ژنەوتو، شنەوتە، بیسنی ف شنیده شده.

**بیستن**: بهیستن، گوێ لێ‌بون، شنەفتن، ژنەوتن ف شنیدن.

**بیستنەوە**: ١) دوبارە شنەفتن؛ ٢) بیستنی قسەبە کەدەربارەت گوترابێ ف ١) دوباره شنیدن؛ ٢) شنیدن حرفی دربارهٔ خویش.

**بیستوك**: تەلەیفون، تێل، تەل ف تلفن.

**بیستەم**: دوای نۆزدەهەم ف بیستم.

**بێسعود**: بەدبەخت، کلۆڵ، جارەرەش ف بدبخت.

**بیسمیل**: شوشتنی شتی مردار کە بیسمیللای لەسەر دەڵێن: (سەگ

خۆی لێدام چوم جێکاکەم **ببسمیل** کرد) ف شستشوی جائی که نجس شده.

**بیسن**: بیسنن ف شنیدن.

**بێسو**: ١) بێگومان، راست، دروست؛ ٢) بۆنی لۆکەی سوتاو ف ١) بی‌گمان؛ ٢) بوی پنبۀ سوخته.

**بێسو**: زەبەت، بۆسە، حەشارگەی ڕاوچی، مردەو زیندە، سیپە ف کمین‌گاه شکارچی.

**بێسۆز**: بەدقەوڵ، پەیمان شکێن ف بدقول.

**بێسوس**: بێڤ سۆز، چرای بەرێ کە پیو یان نێ دەکرد ف چراغ پیه‌سوز.

**بێسە**: ١) بێ‌نرخ، سوک لای خەڵك؛ ٢) زاوەستە ف ١) بی‌ارزش؛ ٢) بایست.

**بێسەر**: بێ‌حیساب‌و هەژمار، ئازاد: (**بێسەر** هەرچێ دەیەی بیە) ف بی‌حساب و اندازه.

**بیسەر**: گوێ‌دێر، گۆهدار، گوێگر، شنەوننە ف شنونده.

**بێسەروبن**: ١) تێکەڵ پێکەڵ، لێکدراوو تێکدراو؛ ٢) لەڕادەو ژمارە بەدەر ف ١) درهم برهم؛ ٢) از شماره بدر.

**بێسەروبەر**: حاڵ‌شڕ و لێقەوماو، نەدارو هەژارو بەك‌کەوتە ف بدحال و پریشان.

**بێسەروپا**: شەلانی، لات، جەورە، خوزی و نوزی، بێکارەو خوێڕی ف اوباش و بی‌سروپا.

**بێسەروپێ**: بێسەروپا ف بی‌سروپا.

**بێسەروزمان**: نەخۆشی بێهوشی لەمردن ف حالت إغما.

**بێسەروسەودا**: بێدەنگ‌و بێ‌هەرا ف ساکت و خاموش.

**بێسەروشوێن**: شرت‌وگوم، تەواو وندابو: (وەفایی ناخری خێرێ دەمێکە **بێ‌سەروشوێنە**) ف گُم‌وگور.

**بێسەری**: بێ‌سەرداری ف بی‌رهبری.

**بێسی**: ماستی هەڵگەڕاو یان ترشاو ف ماست تُرش شده.

**بێسیرە**: بەرسیلە، بەسیلە، قۆرە ف غوره.

**بێسیرە**: گوێ‌نەدەر بەهیچ، گەللایی، حولحولی ف حرف‌نشنو و لاقید.

**بێسیم**: لاسلکی، بێ‌تەل ف بی‌سیم.

**بیش**: ١)رونی،دانیشە،بنیش؛٢)مێشە،بێشە ف ١)بنشین؛٢)بیشه.

**بێش**: ١) بەش، بەهرە؛ ٢) باج، پیتاکی دەوڵەت یان خان ف ١) قسمت و سهم؛ ٢) باج دولت یا خان.

**بێشك**: ١) لانك، لاندك، دەرگوش، دەیدیك، بێشکە؛ ٢) بێگومان‌و سۆ ف ١) گهواره؛ ٢) بی‌گمان.

**بێشکە**: ١) لانك، بێشك؛ ٢) ساوالە بەرخ‌و کار؛ ٣) مەشکە ف ١) گهواره؛ ٢) نوزاد بز و گوسفند؛ ٣) مَشك.

**بێشو**: لەڕادە بەدەر، زیاد لەئەندازە ف بی‌حدّ.

**بێشومار**: لەژمارە بەدەر، بەکجار زۆر، بێژمار ف بیشمار.

**بێشون**: پەیمان‌شکێن، بێ‌وەفا ف بدقول و بی‌وفا.

**بێشوێن**: وندابو، شرت‌وگوم، بێ‌سەروشوێن ف بی‌اثر.

**بێشە**: مێشە، دەحل، لێڕی دەسنێژ ف بیشه.

**بێشەرم**: ڕوهەڵماڵاو، بێ‌حەیا، بەڕوو ف بی‌شرم.

**بێشەلان**: جێگەی پڕدارو دەوەن، جەنگەڵ ف بیشه و نیزار.

**بێشەلانك**: قوڵکەی ئاش کە ئاوی ئاشی لێ دەر دەکەوێ ف گودی که آب آسیاب از آن خارج شود.

**بێشەما**: جۆرێ توتنی بۆنداره ف نوعی توتون مرغوب.

**بێشەمە**: بێشەما: (بۆ توتنەکەی **بێشەمە**وٚ شاورو شێتنە / شێت‌بوم‌و نەهات. وەختە دڵم دەرچێ لەداغا) «شێخ‌رەزا» ف نگا: بێشەما.

**بێشەنگ**: شوزەبی، شەنگەبی ف بید مجنون.

**بێشیر**: ئاژەڵی وشك کردو، کەم‌شیر ف حیوان شیر خُشك کرده.

**بێشیرە**: بەرسیلە، قۆرە ف غوره.

**بێشیك**: بێشکە، لانك ف گهواره.

**بێع**: بێشەکی سەودا: (**بێعم** دەیە ماڵی تو بێ)، بەیعانە ف بیعانه.

**بێعار**: بێ‌شەرم‌و هاروهاج ف بی‌شرم، بی‌عار.

**بێعانە**: بێع ف بیعانه.

**بێفرشك**: بر بەنی لەپیاوی بێ‌شەرم‌و بێکارەو تەمەڵ ف کنایه از آدم ناباب و بیکاره.

**بیڤ**: هەل، دەرفەت ف فُرصت.

**بێڤا**: نابەجێ، قسەی فۆڕو بێنام، قسەی لابەلا ف نابجا.

**بیڤر**: تەور، بڤر، بیور ف تبر.

**بیڤك**: دوژمنایەتی، دژایەتی ف عداوت، دشمنی.

**بیڤل**: بی‌بیلە، رەشکێنەی چاو، گلێنەی چاو ف مردُمك دیده.

**بێڤل**: کەپۆ، کەپ، لوُت، دم، بۆز، قەپۆز، دفن ف بینی.

**بێڤەر**: ناهومێد، هەناسەسارد ف نومید.

**بێڤەری**: ناهومێدی، هەناسەساردی ف نومیدی.

**بیڤیر**: نەخۆش لەسەر مردن، کەنەفت، کەلەلا ف بیمار در حال مرگ.

**بیڤیر**: گیایەکە لەجۆ ئەکا ف گیاهی شبیه جو.

**بێقام**: لەرێ دەرچو، ڕێگەی راست ون‌کردو ف گُمراه.

**بیك**: ١) وەوی، بوك، بوُیك؛ ٢) داربی ف ١) عروس؛ ٢) بید.

**بێکار**: بەتاڵ، بێ‌شوغل ف بیکار.

**بێکارە**: تەمەڵ، تەوەزەل، لەش‌گران ف بیکاره، تنبل.

**بیکانی**: بوك‌بوکێنەی منالان، گەمەی بوکەڵە ف عروسك‌بازی.

**بیکمار**: مارمێلکە، مارمزوك ف مارمولك.

**بیکوانە**: دەموکانە ف موبزك.

**بیکوڵ**: دارەبی خۆرسك ف بیدخودرو.

**بێکەس**: بێ‌خزم‌و سەرپەرشت ف تنها و بیکەس.

**بێگ**: بەگ، گەورە، ئاغا ف بیگ.

**بێگار**: کاری بەگ بەزۆرداری، کاری زۆرەکی‌و بەخۆرایی ف بیگار، سُخره.

**بێگارچی**: ئەوەی بێگار دەکا ف کارگر سُخره.

**بێگاری**: کاری بێگار ف بیگاری.

**بێگاڤ**: بێ‌وەخت، ناوەخت ف نابهنگام، بی‌موقع.

**بێگاڤی**: بێگاڤ، بەناوەختی ف نابهنگام.

**بێگانه:** غه‌واره، نه‌ناس، لاوه‌کی، بیانی، خه‌ریب ف بیگانه.

**بێگـانـه‌بـه‌ده‌ر:** خۆمـاڵی‌مان، وه‌شـه‌یه‌که بۆ ڕۆیشتنی غه‌واره. له‌کۆز ده‌کونرێ ف اصطلاحی برای بیرون فرستادن بیگانه از مجلس خودی.

**بێگانه‌به‌رست:** جاش، نیشتمان فرۆش ف بیگانه‌پرست.

**بێگۆ:** بۆزۆ ف گیاه بوگرفته.

**بێگۆه:** گوێ نه‌بیس، نه‌ژنه‌و، سه‌رسه‌خت، لاسار ف حرف نشنو.

**بێگوێ:** بێگۆه، بی گوێچکه ف حرف‌نشنو.

**بێگه‌ڤ:** لاسار و نی‌نه‌گه‌یشنو، هه‌فه‌مه‌ق ف سرسخت و احمق.

**بێگه‌ڤی:** لاساری، سه‌رسه‌ری بون ف هرزگی و بی‌بندوباری.

**بێگه‌ن:** بۆگه‌ن، بۆنی ناخۆش ف بوی گند.

**بیل:** خاك، خۆڵ ف خاك.

**بێڵ:** ١) بێمه‌زه؛ ٢) پاڕۆی داربن ف ١) بیل؛ ٢) پارو.

**بێڵا:** نه‌نوا، باران‌نه‌گر، هه‌یوان ف تراس.

**بێڵانه:** بێ‌هێلانه، بریتی له ره‌به‌ن‌و بی‌نه‌نوا ف کنایه از آواره.

**بێڵایی:** به‌رهێوان، سه‌کۆی سه‌ر داپۆشراو ف تراس، ایوان.

**بیلبیله:** ره‌شکێنه، گلێنه‌ی چاو ف مردُمك دیده.

**بێڵته‌کردن:** بنخۆڵ کردنی دار له به‌هاردا ف سست کردن خاك درخت.

**بێڵچه:** بێمه‌زه‌ی چکۆله، بێڵ ناسنی ده‌سنی ف بیلچه.

**بێڵکار:** بێڵچه ف بیلچه.

**بێڵکاری:** کار به‌بێمه‌زه ف بیلکاری.

**بێلندان:** جه‌ژنێکی خاچ‌په‌رستانه ف از اعیاد مسیحیان.

**بێلۆ:** سه‌رچـاوه‌یه‌ك که به‌هـار ده‌ژینـه‌وه. کوێره‌کـانی ف چشمه‌ای که تابستان بخُشکد.

**بێلۆچکه:** بێڵی چکۆله‌ی ئاشه‌وان بۆ ئارد، پاڕۆ ف بیلچهٔ آسیابان.

**بێلۆز:** جۆرێ هه‌رمێ ف نوعی گُلابی.

**بێڵه:** ١) بهێڵه، لێ‌گه‌ڕێ، وازبێنه؛ ٢) هاواری بزن، باره ف ١) بُگذار؛ ٢) صدای بُز.

**بێڵه‌بێڵ:** هاوار هاواری بزن ف صدای بیابی بُز.

**بێڵه‌دارینه:** پاڕۆ ف پارو.

**بیله‌ك:** زه‌ندانه، زرێی باسك‌و فۆڵ ف زندبیج.

**بێڵه‌کان:** بیشکان، بیشك ف ابزار گیاه کندن.

**بێڵه‌کۆ:** خۆڵه‌که‌وه، مشکی، خۆڵه‌مێش ف خاکسنر.

**بێڵه‌که‌ڕه:** مارمیلکه‌ی شه‌وگه‌ڕ ف نوعی مارمولك.

**بێڵه‌وه:** بهێڵه‌وه، ڕابگره ف بهل.

**بێڵه‌هه‌ر:** گیایه‌کی کوێستانێیه ده‌کرێته گزره ف گیاهی که برای علف کوبند.

**بێلتیڤان:** گۆرانی بێژی داوه‌ت‌و زه‌ماوه‌ند ف رامشگر.

**بێلیته:** ١) سه‌ماو سران بێکه‌وه؛ ٢) بێر بنه ف ١) رفص و ترانه با هم؛ ٢) نوعی رقص گروهی.

**بێلیڤه:** بێ‌ده‌ره‌تان ف آواره و دربدر.

**بێم:** ١) بام، وه‌رم؛ ٢) ده‌ڵێم، ده‌بێژم: (ئه‌ز بێم‌و لۆنینه)؛ ٣) به‌بی من ف ١) ببابم؛ ٢) بگویم؛ ٣) بدون من.

**بیم:** ١) ترس؛ ٢) بوُم ف ١) ترس و بیم؛ ٢) بودم.

**بێماد:** ڕه‌نگ‌وڕۆ ناخۆش ف رنگ‌پر بده.

**بیمار:** له‌ش به‌بار، نه‌ساغ، نه‌خۆش ف بیمار.

**بیمارسان:** نه‌خۆشخانه، خه‌سه‌خانه ف بیمارستان.

**بیمارستان:** بیمارسان ف بیمارستان.

**بیماری:** نه‌خۆشبن، نه‌ساخی ف بیماری.

**بێمراد:** به‌ئاوات نه‌گه‌یشتو، کام نه‌دیو ف ناکام.

**بێمرێس:** بێ‌که‌یف، ناناسایی، بێماد ف بی‌حال.

**بێملن:** فه‌ریکه قه‌زوان ف چغالهٔ ثمر بنه.

**بێمۆك:** جۆرێ قه‌زوانی ورد ف نوعی ثمر ریز بنه.

**بیمه:** دابین ف بیمه.

**بێمه:** ١) به‌بێ‌ئێمه؛ ٢) بێم ف ١) بدون ما؛ ٢) ببابم.

**بێ‌مه‌ژگ:** بێ‌مێشك، گه‌وج، بێهۆش‌و گۆش ف بی‌مُخ.

**بێمه‌ژی:** ١) بێ‌مه‌ژگ؛ ٢) وه‌بێ ئێمه‌بش ف ١) بی‌مُخ؛ ٢) بدون ماهم.

**بێمه‌عد:** بێماد، بێ‌مرێس ف بی‌حال.

**بیمه‌له‌رزه:** بومه‌له‌رزه ف زلزله.

**بێمێ:** بۆی بێم ف بخاطرش بیایم.

**بێمێشك:** بێ‌مه‌ژگ ف بی‌مُخ.

**بیمیشك:** جۆرێ بیه گوڵی سپی بۆنخۆش ده‌کا ف بیدمشك.

**بێن:** ١) بۆن، بۆ؛ ٢) به‌ند، به‌ندکه‌ر: (زاربێن، ده‌م بێن)؛ ٣) نزیك‌بنه‌وه؛ (بێن بنان ببێم) ف ١) بو؛ ٢) بند؛ ٣) بیابند.

**بین:** ١) هه‌ناسه، نه‌فه‌س: (له‌بن گوما بین ده‌کێشم)؛ ٢) گه‌رو: (ده‌سنی ده‌بینی ناوه نه‌بخنکێنێ) ف ١) نفس؛ ٢) گلو.

**بێنا:** ناسه‌ر، هه‌رماو، له‌بڕان به‌دور ف بی‌نهایت.

**بینا:** زۆربین، چاوتیژ ف بینا.

**بێناز:** بێ‌سه‌رپه‌رشت، بێ‌خه‌مخۆر ف بی‌نان بی‌غمخور.

**بینافتی:** جۆرێ هه‌نجیر ف نوعی انجیر.

**بێناو:** که‌س‌نه‌ناس ف گمنام.

**بێناوك:** میوه‌ی بێ‌ده‌نك ف بی‌دانه.

**بیناهی:** ڕۆشنی چاو، سۆ، سۆمایی، سۆما، هه‌نه‌ر ف بینایی.

**بینایی:** جۆرێ هه‌نجیر، بینافتی ف نوعی انجیر.

**بینایی:** بیناهی ف بینایی.

**بینایی‌چاوان:** خودا، خودێ ف خُدا.

**بێن‌خۆشك:** کنێره ف گیاهی است.

**بیندۆش:** ده‌فری شیردۆشین ف ظرف شیردوشی.

**بینده‌ر:** بنده‌ر، خه‌رمان، خۆیان ف خرمن.

**بێنژین:** پژمین، پشمین، پنژین ف عطسه‌کردن.

**بینشك:** پژمه، بنژین ف عطسه.

**بێن‌فال:** بۆته‌گه، بۆدزنی نیری ف بوی ته‌گه وقت جُفتگیری.

**بێن کوز برك:** بۆکرۆز ف نگا: بۆکرۆز.

**بینگ:** نه‌فه‌س، هه‌ناسه ف نفس.

**بین گرتن:** مان کردن، سوڕانی مەبین: (ئەم خولخولە وادەسوڕێنەوە بین دەگرێ)؛ ٢) قرقراکە گرتن [ف] ١) از شدت چرخش، ایستاده نمودن؛ ٢) گلو گرفتن.

**بێنمایی:** بێ نوێژی، حەیزا [ف] حیض.

**بێنموت:** پوخەکە، پونەکە، بێچم ناپەسەند [ف] بی نمود.

**بێنمود:** بێنموت [ف] بی نمود.

**بێ نوێژ:** ژن لەکاتی حەیزدا [ف] زن هنگام حیض.

**بێ نوێژی:** خوێن هەبونی ژن، حەیز [ف] حیض.

**بینە:** بهێنە، بارە [ف] ببار.

**بینـە:** ١) هەناسە خواردنەوە، پشو وێستاندن؛ ٢) بهێنە، بێنە، بارە؛ ٣) هۆبە، زوم [ف] ١) نَفس حَبس کردن؛ ٢) ببار؛ ٣) اوبه.

**بینەقاقە:** ناوەندی گەرو [ف] بیخ گلو.

**بینە کێشان:** پشو راگرتن لەبن ئاودا [ف] نفس گرفتن زیر آب.

**بێنەوا:** بێ نەنوا، هەژار [ف] بینوا.

**بێنەوایی:** بێ جێ وڕێو بێچارەیی [ف] بینوایی.

**بینی:** دیتی، چاوی پێ کەوت [ف] *فعل ماضی*: دید.

**بێ نیاز:** کاربەکەس نا [ف] بی نیاز.

**بینین:** دیتن [ف] دیدن.

**بینینـەوە:** ١) دۆزینـەوەی گوم بو؛ ٢) چاوپێ کەوتنی دورکەوتو [ف] ١) گم‌شده‌ای را یافتن؛ ٢) بازدید.

**بێو:** نەگەروابێ: (بێو باران نەبارێ) [ف] اگر چنین باشد.

**بێوار:** نەزوك [ف] نازا، یائس.

**بێوارە:** غەوارە، بێگانە، نەناس [ف] بیگانە.

**بێور:** بڤر، تەور، باڵتە [ف] تَبَر.

**بێورە:** ترسەنۆك [ف] بُزدل.

**بیوك:** گیایەکە [ف] گیاهی است.

**بێولە:** بەچکەی ورچ [ف] بچەخرس.

**بێوڵەت:** بێ بەخت، چارەڕەش، کڵۆڵ [ف] بدبخت و بیچارە.

**بێوە:** ژن یان شوی جونە مردو [ف] بیوە.

**بێوەپیاو:** ژن مردو [ف] بیوەمرد.

**بێوەج:** بێ نرخ، بێ قیمەت [ف] بی ارزش.

**بێوەخت:** بێ کاف [ف] نابهنگام.

**بێوەر:** ١) بێ بەر، بێ میوە؛ ٢) بێ بەهرەو فایدە: (رەنجی بێوەرم دا) [ف] ١) بی ثمر و میوە؛ ٢) بی بهرە.

**بێوەژن:** شومردو [ف] زن بیوە.

**بێوەژن کۆشی:** بربنی لە رەنج و دەردی هەژاری کێشان بونان [ف] کنایه از تحمل رنج و فقر بسیار.

**بێوەلە:** بەچکەساوای ورچ [ف] بچەخرس.

**بێوەمێرد:** بێوەپیاو [ف] مرد بیوە.

**بێوەی:** بێ زیان، سەلامەت [ف] بی آزار.

**بێویژان:** بێزان، گیایەکی بۆن نوندە [ف] گیاه «بێزان».

**بێ وێنە:** بێ هاوتا، بێ هەواڵ [ف] بی نظیر.

**بێ هاوتا:** بێ وێنە [ف] بی نظیر.

**بیهر:** تاسەو ئارەزوی زۆر [ف] اشتیاق.

**بێهمان:** وشەیەکە دەگەڵ فلان نێژنی [ف] بهمان، مترادف فلان.

**بیهن:** ١) بۆن؛ ٢) نَفَس [ف] ١) بو؛ ٢) نفس.

**پیەنا:** بوگم [ف] بوده‌ام.

**بیهن دان:** ئیسراحەت کردن، پشودان: (پیچەکی بیهنا خۆبدە) [ف] استراحت کردن.

**پیەنە:** بیهێنە [ف] بیارش.

**بێهۆش:** ١) دڵ بوراو؛ ٢) گێژو نازبرەك [ف] ١) مدهوش؛ ٢) ناهُشیار.

**بێهۆش بون:** لەهۆش چون، بورانەوە [ف] ازهوش رفتن.

**بێهۆش دارو:** دەرمانی بێهۆشی [ف] داروی بیهوشی.

**بێهودە:** خوڕایی، فیرۆ، بێ فایدە [ف] بیهودە.

**بێ هەناو:** ترسەنۆك، بێ زراو [ف] بُزدل.

**بی هەنجیر:** گەرچەك [ف] کرچك.

**پیەی:** بون [ف] وجود.

**بێ هێز:** بێ وزە، بێ توش، بی نابشت [ف] ناتوان.



**پا:** ١) لاق، قاچ، پێ؛ ٢) بەرانبەر؛ ٣) پلە، دەرەجە؛ ٤) ئەندازە: (بەم پابە بێ)؛ ٥) هاو قومار: (پـای قومار)؛ ٦) پەلەپیتکە؛ ٧) لەمل، لەعودە: (ئەم کارە بای تۆ)؛ ٨) رکێف؛ ٩) بن‌و خوارو: (لەپای دیواران)؛ ١٠) کەوابێ: (پـا ژمـەرا جێ‌نابت)؛ ١١) وشـەی سەرسـوڕمـان، پەحـا: (پا! عەجیبـە)؛ ١٢) خاوێن، پاك: (شـۆردم، پا بۆتەوە)؛ ١٣) تێکۆڵ: (ئەم خیارەم بۆپـاکـە) ف ١) پا؛ ٢) برابـر؛ ٣) پایە، درجە؛ ٤) اندازە؛ ٥) حریف در قُمار؛ ٦) تلنگر؛ ٧) عُهده؛ ٨) رکاب؛ ٩) پایین، بُن؛ ١٠) پس؛ ١١) حرف تعجُّب؛ ١٢) پاك؛ ١٣) پوست، پوسته.

**پائەوشار:** دەپی ژێرقاچی جۆلا ف پای افشار جولاهی.

**پابـونـەوە:** ١) لەناوچون، رویشتن‌و نەمان: (تۆخەی لێرە پابۆوە)؛ ٢) بربەنی لەمـەرگی بەدفـەر: (کەنگێ نەوزالمە پا دەبینەوە)؛ ٣) خاوێن کردنەوە: (چەندی دەیشۆم پا نابینەوە)؛ ٤) خەلاس بون لەئەرك ف ١) از میان رفتن؛ ٢) کنایە از مرگ دشمن؛ ٣) پاکیزە شُدن؛ ٤) فراغت یافتن.

**پابەرە:** دەرپێ ف تُنبان.

**پابەند:** ١) پێوەند، بەندی ئاسنی قاچی بەکسم؛ ٢) گوێ پێدان‌و تبلاقە: (بەهیچ شتێ پابەند نیم) ف ١) کندپای زندانی؛ ٢) پای‌بند، تعلّق.

**پابەوەخت:** کیژەعازەوی دەزگیراندار ف دم بخت.

**پابێل:** بڕشتی بەك پێمەرە ف برش یکبار بَیل زدن.

**پاپ:** تلفی شتی تراو ف دُردی.

**پاپا:** ١) زۆر بەتاسەو داواکار؛ ٢) باپیر؛ ٣) مەزنی خاچ‌پەرستان؛ ٤) پێ لەزمانی منالاندا ف ١) آرزومند؛ ٢) پدربزرگ؛ ٣) پاپ؛ ٤) پای در لغت بچەگانە.

**پاپاجانە:** کەوشی منالان، پاپوچە ف پاپوش بچە.

**پاپاچینە:** ١) پێ پێلکەی کەرێزکەن کە لەدیواری دەکوڵێ؛ ٢) نەردیوان، پەیژە ف ١) پلکان قنات؛ ٢) نردبام.

**پاپاخ:** کڵاوی عەجەمی ف نوعی کُلاه.

**پاپاغ:** پاپاخ ف نوعی کلاه.

**پاپریك:** جۆرێ پەپولە ف نوعی پروانە.

**پاپل:** وردە لکی دار ف جوانە درخت.

**پاپلەکانێ:** جۆرێك جۆلانەی گوربس ف نوعی تاب.

**پاپۆڕ:** گەمیە، کەشتی ف کشتی.

**پاپۆڕوان:** گەمی‌وان ف ناخُدا.

**پاپۆڕەوان:** گەمیەوان، پاپۆڕوان ف ناخُدا.

**پاپوچە:** کەوشی منالان ف کفش بچەها.

**پاپوش:** ١) پێڵاو، پالا؛ ٢) دەرپێ ف ١) پای‌افزار؛ ٢) تُنبان.

**پاپەتی:** پێخواس، بێ‌پێڵاو، خواس ف پابرهنه.

**پاپەجانە:** پاپاجانە ف کفش بچه.

**پاپەل:** بن‌گەلا، بن پەلك ف برگ زیرین.

**پاپەنجە:** پەیژە، سلەم، ناردیوان ف نردبام.

**پاپەی:** زۆر داواکار، پاپا ف بسیار خواهان و طالب.

**پاپی:** ١) جاسوس، زوانگیر، شوفار؛ ٢) دەمەقاڵە، بنار ف ١) جاسوس؛ ٢) جدال لفظی.

**پاپیا:** بەپای پیادە، بەپێ‌یان ف پیادەرفتن.

**پاپیارەتە:** رۆیشتن بە پیادەیی، پەیامە شین ف پیادە رفتن.

**پاپیاساوین:** ١) پێ خوست کردن؛ ٢) بریتی لە چاوپـۆشی کردن‌و سەرپۆش لەسەردانان ف ١) لَگدکوب کردن؛ ٢) کنایە از پوشیدن و ماست‌مالی کردن.

**پاپیانان:** پێ‌لێ‌نان، پێخوست کردن ف لگدکوب کردن.

**پاپی سلێمۆنی:** پەپوسلێمانە ف شانەبسر، هُدهُد.

**پات:** نەبدۆرانی شەترنج ف اصطلاح مساوی در شطرنج.

**پاتاڵ:** ١) ئاژاڵ، ولسات؛ ٢) کۆنەپەڕۆ؛ ٣) رونی بێ‌بەرگ؛ ٤) بیکارە؛ ٥) پیری لەکار کەوتو ف ١) دام اهلی؛ ٢) کهنه پارچه؛ ٣) برهنهٔ فقیر؛ ٤) لَش و بیکارە؛ ٥) پیر و فرتوت.

**پاتاوە:** پالا، پێلاو، کاڵە، کاڵك ف پاتابه.

**پاتشا:** لەقەمی شاو سوڵتان ف پادشاه.

**پاتك:** ١) پشت مل، بۆی‌مل؛ ٢) چەپکێ لەگەڵا تونن؛ ٣) پارچەپینە؛ ٤) بشتەسەر ف ١) پس گردن؛ ٢) دستەای از برگ توتون؛ ٣) وصلهٔ قماش؛ ٤) قفا.

**پاتك‌بان:** مل‌فەوی، مل‌ئەستور ف گردن‌کُلُفت.

**پاتن:** ١) برژان، ببژان؛ ٢) سوتان، شەوتین ف ١) بریان شدن، پختن؛ ٢) سوختن.

**پاتــو:** ١) کۆلــوی‌نان، هەویری لەتەنـدورا سوتـاو؛ ٢) کولێرە؛ ٣) کلوەبەفری درشت ف ١) خمیر در تنور سوخته؛ ٢) گرده نان؛ ٣) دانه برف دُرشت.

**پاتۆز:** ماشێنی دروێنە ف ماشین دِرَو.

**پاتۆڤ:** گیایەکە وەك قاشاغ بەکـسـی پێ‌دەماڵن ف گیاهی است بُرس مانند.

**پاتۆق:** شوێنی کۆم بونەوە ف پاتوق.

**پاتۆڵ:** شەڵوار، شەرواڵ، پانتۆڵ، رانکی لەقوماش ف شلوار.

**پاتۆڵە:** کولێرە، ستورك، ئەستورکە ف گرده نان.

**پاتە:** ١) کەوشی چەك‌و شڕ؛ ٢) کەوشی لاستیك، گالۆش؛ ٣) دوبارە؛ ٤) ورتکەنان؛ ٥) بەرماو ف ١) کفش کهنه و پاره؛ ٢) گالُش؛ ٣) دوباره؛ ٤) ریزه نان؛ ٥) نیم‌خورده، پس‌مانده.

**پاتەتە:** پینەی کەوش ف وصلهٔ کفش.

**پاتەخت:** شاری ناوەندی، پایتەخت ف پایتخت.

**پاتـەخـۆر:** ١) بەرمـاو خۆر؛ ٢) بریتی لەبباوی خۆفـرۆشی خوێڕی‌و سەرسواڵکەر ف ١) ریزه‌خوار خوان مردم؛ ٢) کنایه از خودفروش گدامنش.

**پاتەران:** وڕاوە ف هذیان گفتن در خواب.

**پاتەی:** هەڵ پەڕناوتنی دار ف هَرَس درخت.

**پاتیل:** مەنجەڵی پچوك، بەرۆشی گچکە ف دیگِ کوچك.

**پاتیلە:** پاتیل ف دیگ کوچك.

**پاجڤە:** وەرگێران، تەرجەمە ف ترجمه.

**پاجۆش:** لکی لەبنی‌دار دەرچو ف جوانهٔ از پای درخت.

**پاچ:** ١) بڕین بەفەیچی؛ ٢) قەزمە، کولنگی بەك‌دەم؛ ٣) پەڕاندن بەتیخ: (دای‌پاچە)؛ ٤) ماچ، راموسان ف ١) برش با فیچی؛ ٢) کلنگ؛ ٣) قطع چیزی با تَبر یا تیغ؛ ٤) بوسه.

**پاچاڵ:** پێچاڵ، قولکەی ژێر پای جولا ف پاچال.

**پاچرا:** پێچرا، بنچکی لەدار بان لەقوڕ بۆ فونبلکەچرا ف پاچراغ.

**پاچڕکێ:** لەسەر پەنجەو بێ‌هەست رۆیشتن ف باورچین.

**پاچڤە:** پاجڤە ف ترجمه.

**پاچکاری:** زەوی کوڵین بەقازمە ف کلنگ کاری.

**پاچکرن:** ماچکردن، راموسین ف بوسیدن.

**پاچکـە:** ١) پێچـك، پایە؛ ٢) کەللەپاچە، سەروپـێ ف ١) پایـه؛ ٢) کلّەپاچه.

**پاچلە:** سنگی تەنافی رەشماڵ ف میخ رسن سیاه‌چادُر.

**پاچولکە:** قەزمەی پچوك، پاچەکۆڵە ف کلنگ کوچك.

**پاچە:** ١) کەللەپاچە، سەروپێچك؛ ٢) پەڕۆ ف ١) کلّەپاچه؛ ٢) کهنه.

**پاچەچی:** سەللك‌و پێچك‌فرۆش بەکولاوی ف پاچه‌فروش.

**پاچەڤە:** پاجڤە ف ترجمه.

**پاچەقولی:** ١) جومگەی پا، بەرگوێزنگ، سەری قولەقاپە؛ ٢) پێ‌لە پێ پێچان لە زۆران‌دا ف ١) مُچ پا؛ ٢) لُنگ کردن در کُشتی.

**پاچەك:** تەپاڵە، ریخی وشکەوەبو ف تپاله.

**پاچەکۆڵە:** پاچولکە ف قزمهٔ باغبانی.

**پاچین:** ١) پەڕاندن؛ ٢) خوارکردنەوەی بزمارو... ف ١) پی کردن، برش؛ ٢) پرچ دادن.

**پاچینە:** پاپەنجە، نەردبوان ف نردبام.

**پاخ:** پارچەی کۆنە، پەڕۆ ف وصلهٔ کهنه.

**پاخان:** خۆهەڵکێشان‌و شان‌وشوت، لەدوای وشەی چاخان دێت ف چاخان.

**پاخر:** مس ف مس.

**پاخراو:** پێخواس، پێخاوس، پاپەتی ف پابرهنه.

**پاخرکەر:** مسگەر ف مسگر.

**پاخستن:** ١) لەپێ‌کەوتن، زۆر مانـدوبـون لەرێگەدا؛ ٢) زۆر نەخۆش‌و کەلەلا کەوتن ف ١) ازپا افتادن و بر بدن در راه؛ ٢) از شدت بیماری نا نداشتن.

**پاختە:** کەڵەك، مەکر، فر بو ف حیله.

**پاخڵ:** ١) باخەڵ؛ ٢) گیرفان، بەریك ف ١) بغل؛ ٢) جیب.

**پاخـوا:** ١) پێخـوێ، ئەندازەیەك قوڕ بۆ رۆژە سواغێك؛ ٢) ئەوکلۆشەی خراوەتە بەرپێ بۆ گێرەکردن ف ١) مقدار کاه‌گل آمادهٔ یك روز کار؛ ٢) خرمن نیم‌کوب شده.

**پاخۆشە:** پێخوست، لەبەرپێ‌دا وردبو، بەرپێ‌دراو ف لگدمال شُده.

**پاخەسو:** بەربوك ف بنگه.

**پاخێل:** عەرابەی لادێ ف عرادهٔ دهاتی.

**پادار:** ١) جانەوەری خاوەن پا؛ ٢) کۆتەرەدار؛ ٣) پایەدارو بەرقەرار ف ١) ضد خزنده؛ ٢) تنهٔ درخت؛ ٣) برقرار و پایدار.

**پادارانـە:** باجـێ کەبۆ لەشکرکێشی لەخەڵکی‌دەسێنین ف باج لشکرکشی.

**پاداری:** میوەی باوەرێن ف پادرختی.

**پاداش:** قەرەبو، سزا، تۆڵەی چاکە ف پاداش.

**پاداشت:** پاداش ف پاداش.

**پاداگرتن:** پێ‌داگرتن، سوربون لەسەر کارێ ف اصرار ورزیدن.

**پادان:** پێ‌لێ‌دان، تێ هەڵدان ف تیپازدن.

**پادانەگەز:** پاداگرتن ف نگا: پاداگرتن.

**پاداو:** ١) تەڵە، تەپکە؛ ٢) چەرمێکی بەئاڵقە لەقاچی دەبەستن بۆ بەدار هەڵچون ف ١) دام، تله؛ ٢) حلقهٔ چرمی که بپای بندند و از درخت بالا روند.

**پادسن:** تازە پیر ف نوپیر.

**پادشا:** پاتشا ف پادشاه.

**پادەشت:** پێدەشت، بەرداوێنی چیا ف دامنۀ کوه.

**پادەشتی:** دەشتی بەرکێو ف جلگۀ دامنۀ کوه.

**پادینگ:** سندۆڵ، بەشە فوڵەکەی دینگی چەڵتوك ف شالیکوب.

**پار:** ١) ساڵی پێشـــو؛ ٢) بەش، پاژ؛ ٣) کلافـەدەزو؛ ٤) نیمـەی پاش: (پارشەو)؛ ٥) پوش، لەوەڕ ف ١) پارسال؛ ٢) قسمت، جزء؛ ٣) کلافه نخ؛ ٤) نیمۀ دوم؛ ٥) کاه.

**پارازتن:** ئاگاداری کردن ف نگهداری.

**پاراستن:** پارازتن ف نگهداری کردن.

**پاران گوێن:** گوێلوار، پارێنە ف گوساله پارینه.

**پارانەوە:** لاڵانەوە، بەزەلیلی‌و زەبونی داوا کردن ف لابه و التماس.

**پاراو:** ١) تێراو؛ ٢) شەق‌و توڕتر لەگەشە ف ١) سیرآب؛ ٢) شاداب و خرم.

**پارپار:** گیای پر پرە، پەڵپینە ف گیاه خرفه.

**پارت:** دەستە، کۆمەڵ ف گروه، دسته.

**پارتی:** لایەنگری بەدەستەڵات ف پارتی.

**پارچ:** ١) گاسن؛ ٢) قەزمە، پاچ؛ ٣) بەمجۆرە ف ١) گاوآهن؛ ٢) کلنگ؛ ٣) اینطور.

**پارچە:** ١) پاژ، لەت؛ ٢) کوناڵ، قوماش ف ١) پارچه؛ ٢) قماش.

**پاردو:** پاڵو، ئەوئالقە یا ئەوگوریسە کەبن کلکی بەکسم دەگرێ ف پاردُم.

**پاردە:** ١) سیپـە، حەشـارگە، رەبەت، بۆسـەی راوکەر؛ ٢) خەندەك؛ ٣) دیواری کورت ف ١) کمین شکارچی؛ ٢) خندق؛ ٣) دیوار کوتاه.

**پارزن:** پاڵوێنە، راوك ف پالونه.

**پارزنگ:** پارزن ف پالونه.

**پارزون:** پارزن ف پالونه.

**پارزونگ:** پارزن ف پالونه.

**پارسو:** پەراسو ف دنده.

**پارسوستور:** بریتی لەبەفیز ف کنایه از منکبّر.

**پارسە:** سواڵ، گەدایی، خوازەلۆکی ف گدایی.

**پارسەك:** سواڵکەر، گەدا، خوازەلۆك ف گدا.

**پارســەنگ:** ١) کۆمەگی بەردی تەرازوی سوك؛ ٢) تۆزێ گران کردنی تەرازولەبەرخاتری کڕیار ف ١) پارسنگ ترازو؛ ٢) خاطرانۀ مُشتری.

**پارشەو:** ١) نیمەی دوهەمی شەو؛ ٢) دوهەم شەوی رۆژوەوان، پارشێو ف ١) بعد از نصف شب؛ ٢) سحری.

**پارشێو:** پارشەو ف سحری.

**پارکە:** کەرد، تەختەی چێندراو، دوکان، کەردو ف قطعه زمین کاشته شده.

**پارکـەر:** ١) کلافـەگر، تەختـەیەکـە سێ قوچکەی تێ براوە، کەلافی دەزوی لەسەر هەڵدەکەن؛ ٢) بەش‌کەر ف ١) کلافه‌گیر؛ ٢) تقسیم‌کننده.

**پارکۆڵە:** بێچوی دوساڵەی ورچ‌و بەرازو... ف بچۀ پارینۀ خرس و گراز و...

**پارگۆل:** پارگوێر ف گوساله پارینه.

**پارگوێر:** گۆلکی پار، بەچکەچێلی دوساڵە، پارین، پانیر ف گوساله پارینه.

**پارگوێل:** پارگوێر ف گوساله پارینه.

**پارگە:** پارکە ف کرد کشاورزی.

**پارگیر:** پارکەر، کلافەگر ف کلافه‌گیر.

**پارگین:** ١) پارزن؛ ٢) پارۆنیك ف ١) پالونه؛ ٢) نگا: پارۆنیك.

**پارگێن:** پارزن ف پالونه.

**پارو:** ١) ئەوپـارچە خۆراکەی بۆجارێك ئەیخەنە دەم، نیکە. لوقمە؛ ٢) پارچە، بەش ف ١) لقمه؛ ٢) جُزء.

**پارۆ:** بێڵی داربن ف پارو.

**پارۆکڵە:** جێژنێ کەبەخۆشی پێ‌گرتنی منداڵ دەکرێتە خێر ف غذایی که بەمناسبت پاگرفتن بچه داده می‌شود.

**پاروگلێن:** پاروزل، لوقمـە گەورە، فرەخۆر، گەپ‌نیکە ف لقمه بزرگ، کنایه از پُرخور.

**پارۆنە:** مریشك‌و مراوی‌و بوقلەی دوساڵە ف ماکیان دوساله.

**پارونەك:** پارگوێر ف گوساله پارینه.

**پارۆنیك:** خەندەکی دەوری ماڵ ف جوی اطراف، خانه.

**پارە:** ١) پول، دراو، پەرە؛ ٢) پاژ، پارچە، لەت؛ ٣) شڕو دڕاو؛ ٤) ئەوێ بەرانبەری ئێرە؛ ٥) کەمترین دراوی تورکان: (قیمەتی ماچی دوسەد کیسەیی ساغەو نیمە / غەیری یەك کیسەیی سەد **پارە** لە گیرفانمدا) «نالی» ف ١) پول؛ ٢) جُزء؛ ٣) پاره؛ ٤) آنجا؛ ٥) کمترین مبلغ پول تُرکی.

**پارەپەرەست:** رەزیل، رژد ف خسیس.

**پارەپیس:** چروك، رژد، دەس قوچاو، چکوس، رەزیل ف خسیس.

**پارەدار:** دەوڵەمەند، پولدار، دارا ف پولدار.

**پارەموڵ:** دەوڵەمەند، زەنگین، پارەدار ف پولدار، ثروتمند.

**پارەوکـە:** منـاڵێ باش بەرێدا بڕوا: (شوکر **پارەوکە** بوە)، پێڕەوکە ف بچۀخوب پاگرفته.

**پارهەڵکەر:** پارکەر ف نگا: پارکەر.

**پاری:** پارو، نیکە ف لُقمه.

**پاڕیان:** پاڕانەوە ف لابه‌کردن.

**پاڕیانەوە:** پاڕانەوە ف لابه و خواهش.

**پاربخـۆر:** بریتی لە خۆفرۆش بەبێگانە، چڵکاوخۆر، بێگانەپەرست ف پست و بیگانه‌پرست.

**پارێز:** ١) پەهـەریز، لەهێنـدێ خۆراك دەم‌گرتنەوە؛ ٢) خۆ پاراستن؛ ٣) هجوم لە نەخافڵ؛ ٤) بێستانی نەرەکاڵ؛ ٥) بۆسە، کەمین ف ١) پرهیز؛ ٢) دوری کردن؛ ٣) یورش غافلگیرانه؛ ٤) پالیز؛ ٥) کمین.

**پارێزان:** نورەکەی پشت ف نوبر، پشت کشـاورزان.

**پارێزبـردن:** لەنەخافڵ‌و بەهێواشی بۆچون، هجوم کردن ف غافلگیرانه هجوم بُردن.

**پارێزچون:** خۆ مەلاس کردن لەناو رەبەتدا ف در کمین نشستن.

**پارێزدار:** ئاگادار، لایەنگر، دازدار ف هوادار، طرفدار.

**پارێزڤان:** بێستانەوان ف پالیزبان.

**پارێزکردن:** خۆ دورخستن لەخۆراك یا لەکەسێ ف پرهیزکردن.

**پارێزگا**: ١) حەشارگەی راوچی؛ ٢) مەلبەندێکی گەورەی دەولەتی، ئەستان، ویلایەت: (پارێزگای هەولێر) [ف] ١) کمین شکارچی؛ ٢) اُستان.

**پارێزگار**: ١) دیندارو لەخوا ترس؛ ٢) کەسێ کەدەتوانێ بپارێزێ: (پارێزگارت خوابێ) [ف] ١) پرهیزکار؛ ٢) مُحافظ.

**پارێزگە**: پارێزگا [ف] نگا: پارێزگا.

**پارێزنای**: پاراستن [ف] نگهداری.

**پارێزەر**: ١) کەسێ پیاو دەپارێزێ؛ ٢) وکیلی دادگا، محامی، ناوقانی [ف] ١) حامی؛ ٢) وکیل دادگستری.

**پارێڤ**: گۆشتی بیشاو لە تەندوردا [ف] گوشتِ در تنور نفیده.

**پارێن**: گوێلپار، پارگوێل، پارگوێر، پانیر [ف] گوسالهٔ پاربنه.

**پارینە**: پارێن [ف] نگا: پارێن.

**پارێنەوە**: پارانەوە [ف] لابه و خواهش.

**پاز**: ئاگاداری، نێشک، پاس [ف] نگهبانی، پاس.

**پازار**: ١) بەردێکە بەزۆر رەنگان، بۆخشل دەبێ؛ ٢) رۆژی یەکشەممە: (رۆژی یەکشەممە کە مەشهورە بەرۆژی **بازار**) «شێخ رەزا» [ف] ١) سنگ گرانبت؛ ٢) یکشنبه.

**پازدە**: دەو پێنج [ف] پانزده.

**پازدەمین**: ژمارەی نۆبەتی بۆ پازدە [ف] پانزدهم.

**پازدەهەم**: پازدەمین [ف] پانزدهم.

**پازدەهەمین**: پازدەمین [ف] پانزدهم.

**پازدەیەم**: پازدەمین [ف] پانزدهُم.

**پازگا**: جێگەی نێشک گرتن [ف] پاسگاه.

**پازگر**: جەزابەرچی، کێشک چی [ف] پاسدار.

**پازمالە**: مالی خزمەتکار لەخانوی ئاغادا، ژێرمالە [ف] خانهٔ نوکر در منزل ارباب.

**پازناو**: مەلغەی بەرداش هەلێنان [ف] اهرُم سنگ آسیا برداشتن.

**پازناوک**: پازناو [ف] نگا: پازناو.

**پاژ**: ١) بەش، بەشێك لەرۆژێك؛ ٢) بەلگە، دەلیل [ف] ١) جُزء؛ ٢) سند و دلیل.

**پاژنو**: پانیەی پا، پاژنە [ف] پاشنه.

**پاژنە**: پاژنو [ف] پاشنه.

**پاژنەکێش**: کەرەنە، پارچێکی لوسی پێلە، بۆ دەپێ کردنی کەوشی تەنگ دەکار دەکرێ [ف] پاشنه کش.

**پاژنەهەلکێش**: پاژنەکێش [ف] پاشنه کش.

**پاژنە دەرگا**: بن رنسمانە، ئەو قولکە دارەی دەرگای لەسەر دەگەرێ بۆ کرنەوەو داخستن [ف] پاشنهٔ در.

**پاژوخ**: وەرام، پەرسف، جواب، جوال [ف] پاسخ.

**پاژەرۆژ**: شکوفەی گەلاگوێز [ف] جوانهٔ برگ گردو.

**پاژی**: کەم، جوزئی [ف] جُزئی.

**پاژینە**: ١) کەپەکی نارد؛ ٢) بنزبلی گەنم [ف] ١) نُخاله گندم؛ ٢) ته غربال.

**پاس**: ١) پاز، ئاگاداری؛ ٢) پسولەی رێگەدان بۆ سەفەر [ف] ١) پاس؛ ٢) اجازهٔ سَفَر.

**پاسا**: ١) وەشارنو، بەرپبوار، نادبار؛ ٢) چاوپۆشی؛ ٣) سەرپۆش؛ ٤) داپۆشەر، گوم کەر، وەشێر؛ ٥) پێ لەعەرز خسنن، یا بەزەوینا ساوین [ف] ١) پنهان؛ ٢) چشم‌پوشی؛ ٣) سرپوش؛ ٤) پنهان کننده؛ ٥) پا برزمین سابیدن.

**پاس پازوك**: هەلەپەزە، پس‌پسەکۆلە [ف] نوعی عنکبوت.

**پاساپۆرت**: بەلگە ئیجازەی سەفەر، لەدەولەتێ بۆ دەولەتێ [ف] پاسپورت.

**پاسادان**: نوژینەوە، لێ وردبونەوە [ف] پژوهش.

**پاسار**: ١) لێوارەی بان؛ ٢) پەند پێدان‌و تەمێ کاری [ف] ١) لب بام؛ ٢) درس عبرت.

**پاسارە**: لێوارەی بان، پاسار، گوێ سوانە، سوانە [ف] لب بام.

**پاساری**: چۆلەکەی ناو ئاوایی، جفیك، چێشکە [ف] گُنجشك.

**پاسپۆرت**: پاساپۆرت [ف] پاسپورت.

**پاسفندە**: گەندەل، رزیو: (ئەم‌دارە **پاسفندە** بوە) [ف] پوسیده.

**پاسقالی**: نیز، نانە، گالتەپێ‌کردن، تەشمەری، تەقلیت [ف] مسخره.

**پاسکردن**: ١) کێشك گرتن؛ ٢) وەڕینی سەگ، رەوینی سە [ف] ١) پاسداری کردن؛ ٢) پارس سگ.

**پاسگا**: پازگا [ف] پاسگاه.

**پاسگر**: کێشك چی، جەزابرچی [ف] پاسدار.

**پاسگە**: پازگا [ف] پاسگاه.

**پاسوخ**: پاژوخ، جواو، جواب [ف] پاسخ.

**پاسە**: ئاوەها [ف] اینطوری.

**پاسەبان**: پاسگر [ف] پاسبان.

**پاسەرنیان**: سەردەدونان، شوێن کەونن [ف] تعقیب کردن.

**پاسەوان**: پازگر [ف] پاسبان.

**پاسەوانی**: نێشك‌گرتن، کێشك‌کێشان [ف] نگهبانی.

**پاش**: ١) دواوە؛ ٢) بڕینی لەقنگ؛ ٣) پاشگری بەوانا پرژێن: (**ناوپاش**) [ف] ١) پس مُقابل پیش؛ ٢) کنایه از مقعد؛ ٣) پسوند به‌معنی پاشنده.

**پاشا**: ١) لەقەمی مەزنی ئێران؛ ٢) لەقەمێکی تورکی بۆ پیاوە گەورەکانیان [ف] ١) پادشا؛ ٢) لقب بزرگان ترک.

**پاشا پاشایێن**: میرمیرێن، گالتەیەکی هەموانی‌و دەستەجەمعی لەکوردستان [ف] یکی از سرگرمیهای گروهی در کُردستان.

**پاشاخور**: بەرماوێ ئاژەل لە قەسەل‌و ئالف [ف] پس‌ماندهٔ عَلَف.

**پاشاراو**: ئاراو، کەفاوی جارێك جل تێدا شۆراو [ف] پس‌آب رختشوئی.

**پاشارۆ**: پاشەرۆك، میوەی پاش چنینێ لەباغ بەجێ‌ماو [ف] پساچین.

**پاشاگەردانی**: بریتی لەتێکەل پێکەلی‌و هەرکەس هەرکەس [ف] هرج‌ومرج و بی‌قانونی.

**پاشام**: پارشێو، دواشێوی رۆژوگر [ف] سحری.

**پاشان**: لەوەبەدوا، دوایێ [ف] بعداً.

**پاشایەتی**: ١) لە پلەی پاشادا بوُن؛ ٢) بریتی لە کەیف‌سازی‌و تەباری: (بەپاشایەتی دەژی) [ف] ١) شاهی؛ ٢) کنایه از خوشگذرانی.

**پاشباره:** دەستەندو، جێ دەسگرەی جونێر لەئامورا ف دەسنگیرۀ خیش.

**پاشبەن:** پێوەندی پاشوی بەکسم ف پابند ستور.

**پاش‌بەند:** پاشبەن ف پابند ستور.

**پاشتەرك:** بەشی لای کلك لەکورتانو زین ف جای خُرج در زین.

**پاشتەرکی:** باری پاشتەرك ف بار دنبالۀ زین.

**پاشتێلانە:** سێ رۆژانەی بوك هێنان ف جشن سەروزۀ عروسی.

**پاشخان:** وچخانە، خەلوەتی، ژوری کەلوپەل لەپشت ژوری دانیشتن ف پستو.

**پاشخستن:** گوێ نەدان، خوڵێ گێل‌کردن، وەدرەنگ خستن ف اهمال کردن.

**پاشخوان:** بەرماو ف ماندۀ خوراك.

**پاشخوانە:** پاشخوان ف ماندۀ خوراك.

**پاشـدار:** کەسێ باکەسانێ کە لەدوای لەشکرەوە دەڕۆن. بەرانبەری پێشەنگ ف دنبالەرو لشکر، مقابل طلایە.

**پاشدز:** دزێ کەپاسی دزان دەدێرێ ف دُزد پاسدار دُزدان.

**پاشدزە:** پاشدز ف نگا: پاشدز.

**پاش‌رۆ:** بەرانبەری پێشەنگ، ئەوچەکدارانەی لە دوای لەشکرەوە دەڕۆن ف پس‌قراول.

**پاشقل:** گردەوە کوبی، لەدەم گێڕانەوە، لەشتێ شتێ وەلانان، پاشەکەوت ف صرفەجوئی.

**پاشقل‌دان:** گێڕانەوە: (ئاخری هێندێکی **پاشقل‌دا**) ف اندوختن.

**پاشقول:** ١) پێ لەپێ پێچان لە زۆرەوانیدا؛ ٢) پاشقل ف ١) لُنگ کردن در کُشتی؛ ٢) پس‌انداز.

**پاشکـۆ:** هەگبە، خورجێکی پچوکە کە لەدوای زین لەسـەر تەرکی دادەبەستن ف خُرج کە بر ترك اسب بندند.

**پاشکـەوان:** ١) پاشـدز؛ ٢) فیشەك فڕێ دەرەوەی تفەنگ ف ١) نگا: پاشدز؛ ٢) فشنگ انداز تفنگ.

**پاشکەوتن:** لەدوامان، بەجێمان ف واماندن.

**پاشکەوتو:** بەجێ‌ماو ف جاماندە، واماندە.

**پاشکەوتە:** بەجێ‌ماو، سەرنەکەوتو ف واماندە.

**پاشگـر:** لەرێزمـانـدا بەوپیتانە دەڵێن کە دەکەونە دوای وشەوەو ماناپان دەگۆڕن ف پسوند.

**پاشگەز:** پەشیمان، پێژەوان ف پشیمان.

**پاشڵ:** ١) بەشی خوار کەمەر لە پشتەوە؛ ٢) باخەڵ؛ ٣) لاڕان لە دواوە؛ ٤) پالوی بەزەنگوڵە؛ ٥) قافیەی شیعر، وشەی دوای نیوە شیعر ف ١) از کمر بپایین از پُشت؛ ٢) بغل؛ ٣) عقب ران؛ ٤) پالدُم زنگدار؛ ٥) قافیۀ شعر.

**پاشمار:** شکایەت لێکراو ف مُدّعیٰ علیه. شکایت از او شده.

**پاشمـارە:** پاشماڵە، ماڵێ کە خزمەتی ماڵەگەورە دەکاو لەویش ماڵی بێ دراوە ف خدمتکار کە با خانوادە در خانۀ ارباب است.

**پاشماشە:** فیشەك فڕێ دەرەوە، پاشکەوان ف فشنگ انداز تفنگ.

**پاشماگە:** کەلەپوور، میرات ف میراث.

**پاشمـالـە:** ١) ئەومـالـەی لەگەڵ خێل بۆهـەوار دەچن و لەبەر نەداری خزمـەتیان دەکەن؛ ٢) پاشمارە، ژێرماڵە ف ١) خانەای کە با ایل بە ییلاق رود از فقر خدمتکار آنان شود؛ ٢) نگا: پاشمارە.

**پاشمامان:** ژنێ کە لەمناڵ هێنان‌دا باریدەی مامان دەدا ف کمك ماما.

**پاشماوە:** ١) ئەوی لەبەرشتێ مابێتەوە، باقی، بەرماو؛ ٢) زیندوی کەس و کار مردو ف ١) باقیماندە؛ ٢) تنها بازماندە.

**پاشملە:** خراوگوتنی کەسی نەدبار، لەپشت‌سەرەوە خوێندن، غەیبەت ف غیبت.

**پاشمەرگە:** مناڵێ پاش مەرگی باوك بێتە سەردنیا ف بچەای کە بعد از مرگ پدر بدنیا بیاید.

**پاشمەندە:** باقی‌ماو ف باقیماندە.

**پاشمەنە:** پاشمەندە ف باقیماندە.

**پاشن:** دوایی، دوماهی: (رۆژا**پاشن** گەهامە) ف پسین.

**پاشنی:** پاژنە، پانبە ف پاشنە.

**پاشنی‌کەش:** پاژنەکێش، کەرەنە ف پاشنەکش.

**پاشو:** دوپەلی دواوەی بەکسم ف پای ستور.

**پاش‌وپێش:** بەرودوا ف پس و پیش.

**پاشۆرە:** ناوی گەرمی دەرماناوی کەقاچی نەخۆشی پێ‌دەشۆن ف پاشویە.

**پاشوڵ:** پاشڵ ف نگا: پاشڵ.

**پاش‌وەچە:** نەوەو نەوی چرك ف نبیرگان.

**پاشوەن:** پاشبەند ف پابند حیوان.

**پاشەبەرە:** ١) پاشەرۆك؛ ٢) برێتی لە دوامین فرزەند ف ١) پساچین؛ ٢) کنایە از آخرین فرزند.

**پاشەخورج:** پاشتەرکی، هەگبە ف خرج اسب.

**پاشەدزە:** پاشدز ف نگا: پاشدز.

**پاشەرۆژ:** لەوەدوا، ئابندە، رۆژانی دوایی ف آیندە.

**پاشەرۆك:** پاشارۆ، میوەی بەجێ‌ماو، دوای باغ ڕنین ف پساچین.

**پاشەکەفت:** کۆوە کردن، پاشقل ف پس‌انداز.

**پاشەکەوت:** پاشەکەفت، گلدرباوە ف پس‌انداز.

**پاشەکەوتی:** گلۆدراو ف پس‌انداز.

**پاشەکی:** لەدوایی بارەدان، بەرانبەر بەبعانە ف پسادَست.

**پاشەڵ:** جلی سەرپاشڵ، بەرگی پاشل، دواوەی داوێن ف قسمت عقبی دامن.

**پاشەلەقە:** بەنەنبەڵی رۆیشتن ف سلانەسلانە.

**پاشـەوانـە:** صندوقێ لەپلورەی هەنگا نۆشانە تێدا هەڵبەستن ف جعبۀ چوبین برای شانەگذاری زنبور.

**پاشەوپاش:** پشتەورۆ ف وارونە، پشت و رو.

**پاشی:** ١) لەدوای؛ ٢) پاشو؛ ٣) دوایە، پاشان ف ١) بعداً؛ ٢) پای ستور؛ ٣) بعد از، پس از.

**پاشێل:** پێ‌خوست، بەرپێ دراو، بەپاکوتراو ف لگدمال.

**پاشین:** هەرەدوا ف واپسین.

**پاشیو:** پارشیو ف سحری.

**پاقك:** پیفوك، کیفوك. گیایەکە بنەکەی دەبرژێنن بان دەکوڵێنن‌ودەبخون ف گیاهی پیازدار و خوردنی.

**پاق:** لینگ. لاق، قاچ ف لِنگ. پاعموماً.

**پاقاوێژ:** ئەوەی کەلەرێ رویشتندا قاپ لەقاپ دەدا ف چهارپای سگدست.

**پاقر:** ۱) مس؛ ۲) ژەنگی مس، پاخر، باقر ف ۱) مس؛ ۲) زنگار مس.

**پاقژ:** پاك، خاوێن، تەمیس ف پاکیزه.

**پاقژه:** پەلەقاژه. لەناوان یان بۆدەرەنان بەدەست‌و بێ تێکۆشان ف دست و پازدن.

**پاقلانچکه:** گیایەکی رەوانەو گەڵای دانەداره ف گیاهی با برگهای کنگره‌ای.

**پاقلاوه:** شیرنیەکە بەناوبانگ، باقلاوا ف باقلوا.

**پاقله:** باقله، دانەوێڵەیەکە دەکلودا پەروەردە دەبێ ف باقلی.

**پاقلیر:** گوێزی فەریکی تێکوڵ لێ داڕناو ف گردوی نر پوست کنده.

**پاقلینچکانه:** گیایەکە لە پرپرە دەکا ف گیاهی است شبیه خرفه.

**پاقولاغ:** سمی حەیوانی دوسم ف سُم حیوان جُفت سُم.

**پاك:** ۱) خاوێن. پاقژ، پاکژ، تەمیز؛ ۲) گشی، هەمو، تەواو؛ ۳) باش، پەسند، خو. چاك ف ۱) پاکیزه؛ ۲) همه؛ ۳) خوب.

**پاکار:** شاگرد وەستا، بەردەست، خولامی هەمیشه ئاماده ف پاکار.

**پاکان:** پیاوچاکان، شێخ‌و مەشایخ ف نیکان.

**پاکانه:** تومەت لابردن: (پاکانەی خۆم‌کرد، پاکانەی کردم) ف تبرئه.

**پاکایی:** جێگەی نەپیس لە زەوبن ف جای تمیز در زمین.

**پاك‌بونەوه:** پابونەوه ف نگا: پابونەوه.

**پاکتاو:** بێ گەرد، خاوێن، پاقژ ف پاکیزه.

**پاکرانەوه:** زۆرچون بۆ شوێنێ: (پای کراوەتەوە هەمو رۆژ سەرمان لێ دەدا) ف بسیار به خانه‌ای رفتن و مزاحم شُدن.

**پاکردن:** ۱) تێکوڵ لێ‌کردنەوه؛ ۲) کورت‌هێنانی تیر با بەرد لە ئامانج، بەرکردن ف ۱) پوسته کندن؛ ۲) پایین هدف زدن.

**پاکردنەوه:** ۱) خاوێن کردنەوه، تەمیس کردن؛ ۲) هێنانی کەسێ بۆشوێنێ کە لەپێشدا ئەدەهات: (من پام کردەوە ئەنبا نەئەهات) ف ۱) تمیز کردن؛ ۲) پاگشانی، کسی را بەجائی که قبلا نمی‌رفت بردن.

**پاکرنەوه:** پاکردنەوه ف نگا: پاکردنەوه.

**پاکژ:** ۱) خاوێن، تەمیز، پاقژ؛ ۲) پاوان. کۆده، جێ لەوەڕی قەدەغه ف ۱) پاکیزه؛ ۲) قُرُق.

**پاك کردن:** ۱) تۆکڵ لێکردنەوه؛ ۲) خاوێن کردنەوەی دانەوێڵە: (گەنمەکە پاك بکـه بۆ باراش)؛ ۳) بژاری کێڵگـه لە درك‌و داڵ ف ۱) پوسته‌چیدن؛ ۲) بوجاری؛ ۳) وجین غلّه.

**پاك کردنەوه:** خاوێن کردنەوه، تەمیس کردن ف تمیز کردن پلید.

**پاکڵ:** ۱) ئاگر هەڵکەر؛ ۲) کلی پرد، پایەی پرد ف ۱) افروزندهٔ کوره؛ ۲) پایهٔ پُل.

**پاکله:** پاکڵ ف نگا: پاکڵ.

**پاك‌لەپاك:** تۆڵەکردنەوه: (قەرزەکە پاك‌لەپاك بو) ف بی‌حساب.

**پاکلیر:** ۱) پاقلیر؛ ۲) توێخلی سەوزی گوێز ف ۱) نگا: پاقلیر؛ ۲) پوستهٔ سبز گردو.

**پاکـو:** ۱) باوەشـەگیای نەبەستراو؛ ۲) دەسکەنەی گیا، هێندەی لەبن کەوش بنرێ؛ ۳) گیای دروای بەسەر یەکداکراوی نەبەستراو ف ۱) دسته گیاه بسته نشُده؛ ۲) مقدار گیاه به‌اندازهٔ گنجایش زیر بغل؛ ۳) مجموعهٔ گیاه دروشدهٔ بسته نشده.

**پاك‌وپوك:** بەفیڕۆو خوڕایی لەدەست‌دان: (دەسمایەکەی پاك‌وپوك کرد) ف بهدَر و بیهوده.

**پاکوپیس:** چاکوخراپ، رندوکرێت ف نیك و بد.

**پاکو پیسکردن:** چاك لەخراپ هەڵاواردن ف خوب از بد جدا کردن.

**پاکوت:** شێلان‌و کوتان بەپێ ف لگدمال.

**پاکوتره:** پێ‌چوێلەکە، پێ‌مر بشکه. گیایەکەدەخورێ ف گیاهی خوردنی.

**پاکوته:** دەرجا. لەجێ خۆوە پێ‌هەڵێنان‌و بەزەوی‌دا دان ف دَرجا.

**پاکودان:** رنینەوەی گیا بەدەست ف چیدن گیاه با دست.

**پاکوره:** کلۆی پیڕو، کولوتابالی نەگرتوه ف مَلَخچه‌کەهنوز پرواز نکرده.

**پاکوڕه:** نوکەری بەردەستان ف نوکر.

**پاکه:** خاوێنی، تەمیزی ف تمیزی.

**پاکەپاکه:** پەتاته، سێفەزەمینە،سێف‌زەمینی، کارتۆفڵ ف سیب‌زمینی.

**پاکەت:** دەفری کاغەزین بۆ تامەو هەرچی ف پاکت.

**پاکەمی:** ماندوەنی، شەکەتی، ماڵنگی ف خستگی.

**پاکەنه:** کەوشکەن، جێگەی کەوش داکەندن ف کفش‌کَن.

**پاکەوان:** کەنناس، سپور، کۆلان‌ماڵ، زبڵ‌زێڕ ف آشغالی، رُفتگر.

**پاکەوەبون:** ۱) خاوێن بونەوه، پاك‌بونەوه؛ ۲) بر بەنی لە مەرگی بێ‌فەر ف ۱) تمیزشُدن؛ ۲) کنایه از مرگ بدسگال.

**پاکی:** خاوێنی، تەمیزی. پاکیه ف پاکی، تمیزی.

**پاکیزه:** پاك، خاوێن. تەمیس ف پاکیزه.

**پاکیش:** بەکسم ف سنور.

**پاگا:** بواری چەم ف گُدار.

**پاگرتن:** پێ گرتن، فێرەرۆیشتن بونی منال ف پاگرفتن بچه.

**پاگره:** نەخۆشی قاچ‌وقول نەستور بون، واریس ف بیماری واریس.

**پاگۆ:** پەرسف، وەرام، جواو ف جواب، پاسُخ.

**پاگوشا:** بردنی دەزگیرانی کچ بۆماڵی خەزورر ف نامزد دختر را به خانهٔ پدری بُردن.

**پاگه:** ۱) داری ژێر ریسمەی دەرگا؛ ۲) تەوێڵه، ئاغەڵ‌مەڕ ف ۱) چوب زیر پاشنهٔ در؛ ۲) آغُل، طویله.

**پاگەزدان:** پێ جەقاندن، سوربون لەسەر کاری ف لِجاج و اصرار.

**پاگیر:** پرلە گیروگرفت ف دست و پاگیر.

**پاگیره:** ۱) دودەپی ژێرپـای جولا؛ ۲) کیژی دەزگیران دار ف ۱) تختهٔ زیر پای جولا؛ ۲) دختر نامزدشُده.

**پاڵ:** ۱) پشت: (پـاڵ بەدیوارەوە دە)؛ ۲) جێگـەی پشت پێوەدان: (پاڵ پشتی لێ دانـدرابـو)؛ ۳) نەنـدەرون: (لـەپـاڵ خۆیدا نورەیه)؛ ۴)

١) صخرهٔ صاف و مُرتَفع؛ ٢) شنالنگ صاف شُده؛ ٣) بُرّا، تیز.

**تێشت**: ناشتی، نانی بەیانی، بەرقلبان □ چاشت.

**تیشـك**: ١) تیرێژ، نیرۆژ، رونـاکایی خۆر؛ ٢) بریقەدانەوە؛ ٣) کوڵکەو موی درێژ، نیسك □ ١) شُعاع برنو؛ ٢) انعکاس پرتو؛ ٣) پَشم و موی زیاد.

**تێشکان**: بن‌کەونن لەشەڕ بان لەسەوداو مامەڵەدا □ شکست خوردن، زیان دیدن.

**تێشکاندن**: سەرکەونن لەشەڕ بان لەسەوداو مامەڵەدا □ شکست دادن، زیان رساندن.

**تێشکـاو**: ١) ژێرکـەوتو لەشەڕدا؛ ٢) زەرەرلێ کەونو لە سەودادا □ ١) شکست خورده؛ ٢) زیان دیده در معامله.

**تێشو**: بژیوی سەفەر، توشە □ توشه.

**تێشوبەرە**: ١) نان بەری جوتبار بۆدەشت؛ ٢) توشەبەرە □ ١) کسی که غذای دروگر را برایش می‌برد؛ ٢) توشه‌دان.

**تێشودان**: توشەدان، توشەبەرە □ توشه‌دان.

**تێشوك**: شنومەك، کەل‌بەل □ اثاث و لباس.

**تێشوکردن**: ١) بێك هێنانی بژیو بۆ سەفەر؛ ٢) برێتی لە تێشت خواردن □ ١) آماده کردن توشه؛ ٢) کنایه از صبحانه خوردن.

**تیشە**: ١) توشە؛ ٢) رەگی نازە رواوی دەغڵ □ ١) توشه؛ ٢) جوانهٔ تازهٔ گیاه.

**تیشە**: توشە □ توشه.

**تیشـەبـڕ**: شەختـەیی کە دەخلی شین هەڵـدەتـەکێنێ □ یخ‌زدنی که ساقه‌های سبز را می‌خشکاند.

**تیشەشاخ**: کەفری حولی‌و بڵند لەچیا، تیشەبەردی کێو □ صخرهٔ صاف و مُرتَفع.

**تیشەلان**: بەردەلانی سەخت □ سنگلاخ صعب‌العُبُور.

**تیشەمب**: گانو، شاتو، توی‌رەش □ شاه‌توت.

**تێ‌شیشـان**: بە پەلـەپـەل خەریکی کارێك بون □ بەشتـاب مشغـول بەکاری شدن.

**تیغ**: دەمەکێردو شیر و خەنجەر □ تیغ.

**تێغ**: تیغ □ تیغ.

**تیغە**: دیواری نەنکی نێوانکەر، لەمیەری ناسك لەتورو بەرد □ حاجز دیواری، تیغه.

**تیغەشان**: ١) ملەی کێو؛ ٢) لاشانی چیا، تیغە □ ١) ستیغ کوه؛ ٢) تیغهٔ کوه.

**تیف**: ١) لوس‌و لەبارو رێك لەبەرچاو؛ ٢) تنۆکە ناو؛ ٣) دەنکە باران □ ١) شیك؛ ٢) قطرهٔ آب؛ ٣) قطرهٔ باران.

**تیف‌تیفـە**: تیغ پێداهێنـانەوەی تاشراو: (سەرم تیف‌تیفە بدە)؛ ٢) خۆ جوان‌و لوس کردن: (واخۆی تیف‌تیفە داوە جحێڵان شێت دەکا) □ ١) دوتیغه کردن؛ ٢) آراستن.

**تیف‌تیفەدان**: تیف‌تیفە □ نگا: تیف‌تیفه.

**تیفشاڵ**: توێژ، توێژاڵك □ کاشه.

**تیف**: گیزە، دەنگی گوللەی هاوبژراو □ صدای گلوله.

**تیفرگ**: چۆزەپۆپنە، چویلەکەبەکی کاکوڵ بەسەرە □ شانه‌بسر.

**تیفسی**: بەلەمی چێشت، دەفری گراران، دەوری دربژوکەی گەورە □ دیس.

**تیفل**: ١) قسەی بەتێکوڵ، پلار، تێز؛ ٢) هیچ‌و پوچ‌و بێ‌نرخ؛ ٣) تێکوڵ □ ١) حرف تودار؛ ٢) بی‌ارزش؛ ٣) پوسته، قشر.

**تیفوك**: چێشکە، چوڵەکە، پاساری، مەلیچك □ گنجشك.

**تێ قوڵپاندن**: لەسەرەوە تێ‌رژاندن، تێدا هەڵپ کردنەوە □ از بالا ریختن.

**تیقە**: تربقە، دەنگی خەنین □ صدای خنده.

**تیقەل**: رزیوی دڕاو □ پوسیده و پاره.

**تیقەلو**: جل‌شڕ، شڕوڵ، بەرگ‌دڕاو □ ژنده‌پوش.

**تیك**: ١) باقیە، نەقەل؛ ٢) درون، دورمان؛ ٣) تیشە شاخ □ ١) بخیه؛ ٢) دوخت؛ ٣) صخرهٔ صاف و مرتفع.

**تێك**: ١) گش، هەمو. ٢) دەناویەکدا؛ ٣) قیت، زۆپ □ ١) همه؛ ٢) توی هم؛ ٣) قُد.

**تیکان**: درکی‌دار، درك، چقڵ □ خار.

**تێکبردن**: دەناوبەکڕا کردن □ درهم فروکردن.

**تێکبەربون**: تێکەڵ بەبەك بون بۆشەڕ □ بەجان هم اُفتادن.

**تێکبەردان**: بەگژ یەکتردا کردن □ بەجان هم انداختن.

**تێکبەڕاندن**: دەباڵ بەکترنانی دو بان چەندشت □ توی هم قرار دادن.

**تێکپەڕین**: چونەناویەکی چەندشت □ تداخُل اشیاء.

**تێکچون**: ١) شێوان، لەبەریەك بڵاوبون؛ ٢) تورەبون، لەباری ناسایی لادان □ ١) آشُفتن؛ ٢) مُنقلب شُدن.

**تێکخران**: بەبەکەوە بەسنران □ بەهم بسته‌شُدن.

**تێکخراو**: بەیەکەوە بەسنراو، پێکەوە گرێ دراو □ بەهم بسته شُده.

**تێکخستن**: لێك قایم کردن، بەیەکەوە گرێدان □ بەهم گره زدن.

**تێکـدان**: ١) خراپ کردن؛ ٢) تێکەڵ کردن؛ ٣) شێواندنی کار □ ١) خراب کردن؛ ٢) قاطی کردن؛ ٣) بەهم زدن کار.

**تێکدەر**: ١) وێرانکەر؛ ٢) کار خراپ‌کەر □ ١) ویرانگر؛ ٢) آشوبگر.

**تێکڕا**: پێکەوە، گش، هەمی □ همه‌باهم، مجموعاً.

**تێکڕایی**: گش لەگش، سەرپاك □ همگانی، عمومی.

**تێ کردن**: ١) دەناو رژاندن: (ناوی تێکە)؛ ٢) سازدان: (سەبیل تێکە) □ ١) ریختن توی؛ ٢) مُهیّا و آماده کردن.

**تێکسرمان**: تێرگۆشتی‌و پەنەوی □ چاق و قوی‌بنیه بودن.

**تێکسرماو**: گیانداری تێرگۆشتی پتەو □ چاق و قوی بُنیه.

**تێکسمران**: تێکسرمان □ چاق و قوی بنیه بودن.

**تێکسمراو**: تێکسرماو □ چاق و قوی بُنیه.

**تێکشان**: رابردنی بەبەلە: (بێرەدا هات‌و تێکشا) □ عبور با شتاب.

**تێکشکان**: بەجاری بەسەریەکدا وردبون‌و شکان □ بکباره در هم شکستن.

**تێکشکاندن**: وردو خاش کردن بەسەر یەکدا □ خُرد و خاش کردن.

**تێکشکاو**: بەسەریەکدا شکاو □ درهم شکسته.

**تێك كردنەوە:** بڕینی لە هەمو گیان شكاندن: (لەشی **هەموتێك كردەوە**) ف كنایه از شكستن اعضای بدن در كتك‌كاری.

**تێك گیران:** ١) دەناو یەك ترنجان؛ ٢) بڕێنی لە مل دەبەرملی یەك نان ف ١) درهم فروشدن؛ ٢) كنایه از گلاویز شدن.

**تیكلە:** ١) بەروشی پچوك، مەنجەلۆكە؛ ٢) جەرەی ئاوكێشان ف ١) دیگ مسی كوچك؛ ٢) سبوی آبكشی.

**تیك لهەڤ:** تێكڕابی، بێ‌هەڵبژاردن ف درهم، بدون استثنا.

**تیكمە:** دوگمە، توكمە، قوبچە ف توكمە.

**تیكوپیك:** بەجارێك خراوكراو، بێ‌سەرەوبەرە ف داغان.

**تێ كوتان:** خستنەناوەوە بەزۆر ف سپوختن.

**تێ كوتاندن:** تێ كوتان ف سپوزیدن.

**تێ كوتانن:** تێ كوتان ف سپوختن.

**تێ كۆشان:** تەقالا كردن، هەوڵدان ف كوشیدن.

**تێ كۆشین:** تێ كۆشان ف كوشش.

**تێ كوشین:** ١) تلیت، تریت، نان‌وڵین لە شۆربادا؛ ٢) دوغرەمە، دوغورمە ف ١) ترید؛ ٢) سالاد ماست و نان خشك.

**تیكە:** ١) لەت، پارچە لەشتێك؛ ٢) پاپۆلە، لەففە؛ ٣) پاروو ف ١) پارە؛ ٢) ساندویچ؛ ٣) لقمە.

**تێكە:** دەناوی برژێنە: (جای **تێكە**، مێوژان **تێكە**) ف بریز توی.

**تێك هالان:** تێك ئالۆزان، لێك هاڵان ف برهم پیچیدن.

**تیكەتیكە:** لەت‌لەت، پارچەپارچە ف تكّه‌تكّه.

**تێكەڵ:** تەڤ لهەڤ، لێكدراو، ئاوێتە ف درهم، آمیختە.

**تیكەلاو:** تێكەڵ ف درهم، آمیختە.

**تێكەڵ بون:** ١) لێكدران، بەناو یەكدا چون؛ ٢) بڕێتی لە جوت بون نێر و مێ ف ١) درهم آمیختن؛ ٢) كنایه از جفت‌گیری نر و مادە.

**تێكەڵ پێكەڵ:** بێ‌سەرەوبەرە، هەڵشێواو، شێواگ ف آشفته، درهم برهم.

**تێكەڵدان:** تەڤ لهەڤ كرن، لێكدان بەدار یان بە كەوچك: (شیرەكە **تێكەڵ دە**) ف بهم زدن.

**تێكەڵ كردن:** ئاوێتە كردن، لێكدان، آمیتە كردن ف قاطی كردن.

**تێكەڵ و پێكەڵ:** ئاڕێك، ئەتەكوز ف نامرتّب.

**تیكەلە:** وردە بەردو ڕەلم پێكەوە ف مخلوط شن و ماسە.

**تێكەڵی:** ١) تەڤ لهەڤی؛ ٢) ئاوێتەبی؛ ٣) بڕێنی لە دۆستایەتی و خزمایەتی ف ١) آشفتگی؛ ٢) آمیختگی؛ ٣) كنایه از دوستی و خویشاوندی.

**تێكەوتن:** ١) كەوتنە ناوەوە؛ ٢) ژێركەوتن و تێشكان لە وازیدا؛ ٣) بڕێتی لەمەلەكردن بۆ لابردنی لەش پیسی؛ ٤) بەهۆی نەزانینەوە توشی كارێك بون ف ١) افتادن توی؛ ٢) باختن در بازی؛ ٣) كنایه از غُسل؛ ٤) از روی بی‌اطّلاعی دست به‌كاری رفتن.

**تێكەولێكە:** بەرهەڵدایی، بێ‌سەرەو بەرەبی، كەس لەكەسی ف بلبشو.

**تێكەوەدان:** بەناڕێكی و بەرێتانی هاتن و چون ف پر بشان قدم زدن.

**تێكەوەهاویشتن:** تێكەوەدان ف پر بشان قدم زدن.

**تێك هەڕستن:** بەتوندی پاڵ پێكەوەدان ف محكم به هم چسبیدن.

**تێك هەڕیان:** لێك هاڵان بەبزوتنەوە ف بهم پریدن.

**تێك هەڵچون:** پێك هەڵپڕژان و تێكەوە گلان بۆشەڕ ف گلاویز شدن.

**تێك هەڵدان:** ١) شەڕەشەق، بەپێ لەیەكدان؛ ٢) شەڕكردنی ئاژەل بەسەر ف ١) لگد و تیپا زدن؛ ٢) شاخ بەشاخ شدن حیوان.

**تێك هەڵشێلان:** بەسەر یەكدا هەویركردن، دو دەرمان پێكەوە تێكەڵ كردن و شێلان ف درهم جلانیدن، معجون كردن.

**تێگڕا:** تێكڕا، گشت لەگشت ف نگا: تێكڕا.

**تێگڕابی:** بەگشتی، تێكڕابی ف عمومی، همگی.

**تێگرتن:** ١) بەرەوئیشانە هاویشتن؛ ٢) پینە بە لیباسدا درون؛ ٣) بەرد دەكون و جادەنان: (بەردی **تێ بگرە**) ف ١) هدف گیری؛ ٢) پینه‌زدن؛ ٣) سنگ در سوراخ نهادن.

**تێگرماندن:** لێ خوڕین، تێ خوڕین ف نهیب زدن.

**تێگوشین:** تێكوشین، تێ‌وڵین، نان تلیت كردن ف ترید كردن.

**تێگەشتن:** حاڵی بون ف فهمیدن.

**تێگەیاندن:** حاڵی كردن ف فهماندن.

**تێگەیشتن:** فامین، حاڵی‌بون ف فهمیدن.

**تێگەیشتو:** فامیدە، حاڵی بوگ: (خوایە بۆمان بنیری ئاوی لەقوڕ نەنیشتو / یان لاوی پێگەیشتو یان پیری تێگەیشتو) «وەهبی» ف فهمیده، دانا.

**تێگەیشتی:** تێگەیشتو ف فهمیده، دانا.

**تێگەیێن:** فامین، حاڵی‌بون ف فهمیدن.

**تێگەبو:** فامیدە، بەزانست ف فهمیده، دانا.

**تێ گیران:** گیركردن لەشتێكا، بێ دەرەنانی ف گیر كردن.

**تێگیركردن:** تێگیران ف گیرخوردن.

**تێگیریان:** تێگیران ف گیر كردن.

**تیل:** ١) ئاماڵ‌خوار؛ ٢) دەرپەڕیو: (**تیلی** كردوە باش دیارە)؛ ٣) قەڵەمەداری تازە تێبڕاو؛ ٤) سوچ، قوژبن؛ ٥) خێل، خوێل؛ ٦) كەلا، هەڵمات ف ١) كج، مایل؛ ٢) بارز، مُتشخّص؛ ٣) قلمهٔ تازه كاشته؛ ٤) گوشه، زاویه؛ ٥) لوچ؛ ٦) تپه.

**تێل:** ١) هەودای لەمس و ئاسن، سیم؛ ٢) بەرقییە، تێلگراف؛ ٣) ئاماڵ خوار، نۆزێ لار؛ ٤) لوس، ساف ف ١) سیم؛ ٢) تلگراف؛ ٣) كج، مایل؛ ٤) صاف.

**تێڵ:** توێڵ، هەنیە، ئەنی، ناوچاوان ف پیشانی.

**تیلا:** سوچ، گۆشە، قوژبن: (بە **تیلای** چاوی لێ‌ڕوانیم) ف گوشه.

**تیڵا:** داردەستی ئەستور، چۆماغ، پەیاغ ف كدنگ.

**تیلاترێن:** داركاری خەست و خۆڵ: (كەوتەگیانی **تیلاترێنی** كرد) ف بەشدّت كُتك‌زدن.

**تیلاگ:** لاسەر: (كڵاوی **بەتیلاگی** سەریەوە نابو) ف جانب سر.

**تیلاوتیل:** خوارەخوار، لەسەرلا ف كج و اریب.

**تیلایی چاو:** گۆشەی چاو: (**تیلایی چاوی** دامێ) ف گوشهٔ چشم.

**تیلكردن:** ١) خوار كردنەوە؛ ٢) تیشاندان لەلاوە ف ١) خم كردن؛ ٢) از

گوشه نشان دادن.

**تیلكه:** دیزەی چێشت ف دیزی.

**تیلماسك:** نیسماڵك، پارچەی باریك و درێژ ف نوار پارچه‌ای.

**تیلمه:** تیلماسك ف نوار پارچه‌ای.

**تیله:** ١) بێچوو سـەگ نوتكەكسوك. توله؛ ٢) سوچ، قوژبن؛ ٣) تیل، كەلا، هەڵمات ف ١) توله‌سگ؛ ٢) گوشه؛ ٣) تیله.

**تیله:** تاڵە، رەش تاڵە، ئەسمەر، گەنم رەنگ ف گندمگون، سبه‌فام.

**تیله‌كه:** كوڵ، كوڵەپشت ف كوله‌پُشت.

**تیله‌گه:** تیله‌كه ف كوله‌پُشت.

**تیله‌مار:** ١) بەچكە مار، جێلی مار؛ ٢) ماری باریك ف ١) بچهٔ مار؛ ٢) مار باریك.

**تیلی:** ناوی پیاوانەیە ف اسم مردانه.

**تیلین:** هەڵماتین، مەرمەرێن، كەلایین ف تیله‌بازی.

**تیم:** ١) لەمن‌دا؛ ٢) دەهێم، دێم، بەرانبەری دەرۆم ف ١) از من؛ ٢) می‌آیم.

**تیماج:** پێستی ئاژەڵی خۆش كراوی دەباغ دراو ف میشن.

**تیمـار:** ١) رنـەك كردنی بەكسم، شاڵو قاشـاغ كێشـان؛ ٢) خزمەت و ئاگاداری لە نەخۆش؛ ٣) گوندێكە لە كوردستان ف ١) شال كشیدن و تمیز كردن ستور؛ ٢) پرستاری و مراقبت؛ ٣) دهی در كردستان.

**تیمارخانه:** نەخۆشخانە، خەستەخانە ف بیمارستان.

**تیماركەر:** ١) بربن پێچ، یاریدەری حەكیم؛ ٢) خزمەتكاری نەخۆش؛ ٣) ربەك دەری بەكسم ف ١) پزشكیار؛ ٢) پرستار؛ ٣) مهتر اسب.

**تیمان:** ١) دامان، رامان، سەرگەردانی؛ ٢) دەناوماندا ف ١) سرگردانی و درماندگی؛ ٢) میان ما.

**تیمانج:** ١) تیماج، جۆرێ پێستەی ئەنك؛ ٢) برشتی باریك لەچەرم ف ١) میشن؛ ٢) نوار چرمی.

**تیماو:** داماو ف درمانده.

**تیمچه:** قەیسەری، بازاڕۆكە لەبازاری گەورەدا ف تیمچه.

**تیمروكان:** تێوروكان، كۆبونەوە بەدەوری شتێكا ف گِردآمدن.

**تیموم:** دەستویژكردن بەتۆز لەجیاتی ناو ف تَیمُّم.

**تیمیسك:** كرێژی لێو لە نۆبەتێوە ف تَبخال.

**تین:** ١) هێز، وزە، تاقەت، تابشت؛ ٢) گەرمای تاو یان ئاگر؛ ٣) ئاگردانی گەرماو، تون؛ ٤) تینێگ، تینو، تۆنی، تیهنی؛ ٥) بناغە، هیم ف ١) تاب و توان؛ ٢) گرمی خورشید یا آتش؛ ٣) گُلخن؛ ٤) تشنه؛ ٥) شالوده، اساس.

**تێن:** ١) لەنێـمەدا، دمـەدا؛ (تێن دابه دزی دەكـا)؛ ٢) دێن، بەرانبەری دەرۆن؛ ٣) تونی، تینـگ؛ ٤) تین، گەرمـای ئاگر ف ١) میان ما؛ ٢) می‌آیند؛ ٣) تشنه؛ ٤) حرارت و گرمای آتش.

**تێنان:** خستنەناو، تێخستنە هوندوێ، لەدوورنان ف گذاشتن تو ی.

**تینشـكی:** نەخۆشیـەكە، نەخۆش هـەرگیز تێـراو نـابێ، تینسقایی ف استسقاء.

**تیشیر:** تێوەساردو گەرم، شیلەتێن، شیرتین، شیلەوگەرم ف ولرم.

**تینك:** رابەڵی بو زو، راهەنگاونەی شاڵ ف تارهای افقی در شالبافی.

**تینـگ:** ١) تاڵو، بادامەی لای‌مل. لو زەتێن؛ ٢) تۆنی، تینو، تی ف ١) لوزتین؛ ٢) تشنه.

**تینگی:** تونیایەتی، تاوخوازی بۆوە خواردن، تینبەتی ف تشنگی.

**تینو:** ١) تینگ، تی؛ ٢) گەرو، قورگ ف ١) تشنه؛ ٢) گلو.

**تینۆ:** بەیتێكی بەناوبانگی جەنگ‌نامە ف داستانی حماسی و مشهور.

**تینو:** تینگ، تینو ف تشنه.

**تینواتی:** تونیایەتی، تینگی ف تشنگی.

**تینواره:** هەڵوەدا، ئاوارە، بێ‌ماڵ، رەبەن ف آواره.

**تینوارین:** تواشاكردن، لێ نهێرین ف تماشا كردن.

**تینوایەتی:** تونیەتی، تینگی، تینواتی ف تشنگی.

**تینوەتی:** تینواتی، تونەنی ف تشنگی.

**تینوێتی:** تینگی، تونبەتی ف تشنگی.

**تینەوین:** داهاتنەوە بۆ هەڵگرتن ف خم شدن برای برداشتن بار.

**تینی:** ١) تینـو، تینـگ، تی؛ ٢) نەفەس خواردنەوەی بلوێر ژەن ف ١) تشنه؛ ٢) نفس زدن سُرناچی.

**تێ‌نیشتن:** ١) دەست بەكاری كردن؛ ٢) سواری جوڵانە بون، لەجوڵانە تیلتین ف ١) دست بكار شدن؛ ٢) در تاب نشستن.

**تیوتی:** ١) لە گوشەو كەنارەوە؛ ٢) رەت بردن بە هەردولادا ف ١) از گوشه و كنار؛ ٢) تلوتلو.

**تیوتیوه:** تیف تیفه ف نگا: تیف تیفه.

**تیوتیوەدان:** تیف تیفەدان ف نگا: تیف تیفه‌دان.

**تێ وروكان:** تێمروكان ف نگا: تیمروكان.

**تێ وشین:** تێكوشین، تێ‌ولێن ف تر بد نان.

**تیوڵ:** ناسك و تەنك. لەگەڵ تەنكا دەڵێن: (تەنك و تیوڵه) ف نازك و لطیف.

**تیولــه:** ١) تەوێڵە، تەویله، پشـتێر، گەوەر، گەور؛ ٢) پۆ، تێوەدان ف ١) اصطبل؛ ٢) پود بافته.

**تیولین:** تێ‌گوشین، تلیت كردن ف تر بد كردن.

**تێوه:** لەتاویدا ف اندرونش.

**تێوەپێچان:** لێ هاڵاندن ف پیچیدن تو ی.

**تێوەچـون:** ١) كەوتـە ناو شتی ناتـەمبسـەوە؛ ٢) پێوە توسـان ف ١) فرو شدن؛ ٢) آغشتن.

**تێوەدان:** ١) تامبنـە كـردنی كەم بەزۆر؛ ٢) هەڵسـوان، ساوین؛ ٣) تالـودە كردن: (خـوێ قوراوی بوُ، منیشی تێوەدا)؛ ٤) پۆ، هەوالی رایەڵ؛ ٥) بۆ دەرایەڵ هەڵـكێشـان ف ١) آمیختن كم با زیاد؛ ٢) سابیدن؛ ٣) آلودن؛ ٤) پود؛ ٥) پود در تار كشیدن.

**تێوەردان:** ١) تێك وەردان، لێكدان؛ ٢) ئاودەدەفر گەڕاندن بۆ خاوێنی: (ئاوێك دەوقابە وەردە) ف ١) بهم زدن؛ ٢) آب در ظرف گردانیدن.

**تێوەژان:** تەقیزە تێ روكردن ف سیخونك زدن.

**تێوەژاندن:** تەقیزەلێدان ف سیخونك زدن.

**تێوەژەندن:** تەقیزەكونان ف سیخونك زدن.

**تێوەشان:** ڕاوەشاندنی جلك لە ئەندوردا. بۆ مۆرانە كوشتن [ف] لباس بر آتش گرفتن.

**تێوەشاندن:** جلك بەئاگر ڕاداشتن. بۆمۆرانە كوشتن [ف] لباس بر آتش گرفتن.

**تێوە كردن:** دەناو نان بەنهێم [ف] نپاندن.

**تێوە گلان:** تووش بوون بەكارێك لەخۆڕایی [ف] بی‌دلیل درگیر شُدن

**تێوە گلاندن:** گیروده كردن بەبێ ڕازی بوون [ف] بی‌اجازه درگیر كردن.

**تێوێل:** تووێڵ، ئەنی، ناوچاوان [ف] پیشانی

**تێە:** دیده، چاو [ف] دیده، چشم.

**تێه :** تونی، تینگ [ف] تشنه.

**تێه :** وشەی سەیرمان، تەح، تەحا [ف] حرف تعجب.

**تێهاتن:** ١) هاتنەناو؛ ٢) تێ ڕژان [ف] ١) تو آمدن؛ ٢) تو ریختن.

**تێهانین:** بەخت هێنان، هەل بۆ ڕەخسان [ف] شانس آوردن.

**تێهن:** تونی [ف] تشنه.

**تێهنی:** تونی [ف] تشنه.

**تێهەڵچوون:** ١) پێداچەقان: (دڕوێکم تێهەڵچوو)؛ ٢) چوونەناو بۆ كارێك [ف] ١) خلیدن؛ ٢) وارد كار شُدن.

**تێ هەڵچوونەوە:** بەسەر گرتنەوە، سەرلەنوێ كردنەوە: (بەكوردی دیسان زیندوو دەبمەوە / لەودنیاش بۆكورد تێ هەڵدەچمەوە) «هەژار» [ف] استیناف.

**تێ هەڵچەقان:** پێداچەقین: (دڕكێك دەڤاجم هەڵچەقا) [ف] خلیدن.

**تێ هەڵچەقاندن:** پێدا چەقاندن: (دڕكێكی تێ هەڵچەقاندم) [ف] خلاندن

**تێ هەڵچەقین:** تێ هەڵچەقان [ف] خلیدن.

**تێهەڵدان:** ١) دۆڵچە یان دەفر دەناوڕا كردن بۆ ناو هەڵێنجان؛ ٢) بەشەق لەبەكێك دان [ف] ١) آب را با ظرف برکشیدن؛ ٢) تیپازدن.

**تێ هەڵساوین:** پیاماڵین، پێداساوین [ف] مالیدن، اندودن.

**تێ هەڵسوون:** پیاماڵین، تێ هەڵساوین [ف] اندودن، مالیدن.

**تێ هەڵقوتان:** لاپرەسەنی، لەخۆوە خۆ دەكارگەباندن [ف] فضولی.

**تێ هەڵكردن:** بەقەودەنگ هەڵیدان لەگۆرانی [ف] آواز سردادن.

**تێ هەڵكەوتن:** بەناسەوە مژ لەمەمكی دایك‌دان [ف] با اشتیاق مُك به پستان مادر زدن.

**تێ هەڵكێش:** ١) خستنەناو بەكتر؛ ٢) شیعرێك دەناو شیعری بێگانەبەكدا [ف] ١) لا گذاشتن؛ ٢) بین اشعار شعر دیگری را آوردن.

**تێ هەڵكێشان:** ١) داو یا هەرشتێ دەناو شتێ خرێ: (ئەم داوەی تێ هەڵكێشە)؛ ٢) دەناو ترازنسان و هێنانەوە: (ئەو ناوە دەستە ببسەكەتی تێ هەڵكێشە) [ف] ١) لاگذاشتن؛ ٢) غوطەور كردن و درآوردن.

**تێ هەڵەنگان:** تێ هەڵەنگوتن، تووش بوونی شتێك و ساتمە پێ بردن [ف] سكندری خوردن.

**تێ هەڵەنگوتن:** ١) تێ هەڵەنگان؛ ٢) لەبڕ تووش‌بوون [ف] ١) سكندری خوردن؛ ٢) ناگهانی برخورد كردن.

**تێ هەڵێنان:** بركردنەوەی زبان، قەرەبوو دانەوە [ف] تلافی كردن.

**تێ هێنان:** سەركەوتن لەكارێكا، هەل ڕەخسان [ف] موفق شُدن.

# ج

**جا:** ١) جێگە، جێ؛ ٢) کەوابو، کەوابە: (**جابابێ، جا بابڕوا**)؛ ٣) ئینجا، لە ئاکاما: (**جا** چینیان کرد)؛ ٤) ئەوسا، ئەوجارە: (بانەو بڕوا**جا** وەرە بۆلامان)؛ ٥) پلەو دەرەجە: (بپاگێ **جا**دارە)؛ ٦) جێگەو بان، نوێن: (نەخۆشە لە**جا**دا کەفتوە) ف ١) جای؛ ٢) پس؛ ٣) در نتیجە؛ ٤) آنگاه؛ ٥) پایە و مقام؛ ٦) رختخواب، بستر.

**جائاستە:** بەجێ ماو، جێماو، دواکەوتو ف جاماندە.

**جاب:** جواو، بەرسڤ ف پاسُخ.

**جات:** پاشگری کۆ بە.تایبەتی بۆ میوەو سەوزی دەگوترێ: (**میوەجات، سەوزیجات**) ف پسوند جمع.

**جاترە:** نەعنا کێو بلکە ف مَرزۀ کوهی.

**جاتەنە:** جاڵ جاڵوکە، جۆڵانەنە، کاکڵە موشان ف عنکبوت.

**جاجر:** هەڵوابەکە لە کاکڵە گوێزو هەنگوین دەکرێ ف خوراکی از عسل و گردو.

**جاجك:** بنێشت، بەنوشت، شیلەی دارەبەن ف سقِّز.

**جاجکەتاڵە:** شیلەی دارەبەن کە هێشتا نەکولێندراوە، بنێشتە تاڵ ف سقِز تلخ.

**جاجکە خۆشە:** شیرەی دارقەزوانی کوڵ پێدراو، بنێشتە خۆشە ف سقِز شیرین.

**جاجگ:** جاجك ف سَقِّز.

**جاجم:** مەوج، ئەتراوێکە لەخوری، نوێنی نێوە دەپێچن ف جاجیم.

**جاجیك:** کاهوی هەنجناو لەناو ماستدا ف سالاد ماست و کاهو.

**جاچك:** جاجك ف سَقِّز.

**جاچکە:** جاجك ف سَقِّز.

**جاچکە تاڵە:** جاجکەتاڵە ف سَقِّز تلخ.

**جاچکەخۆشە:** جاجکەخۆشە ف سَقِّز خانبدنی.

**جاخ:** ١) دەسکێ لەگەڵای توتن؛ ٢) تورەکە یان، کیسەی پەڕو توتن کە سیغارکێش هەڵی دەگرێ؛ ٣) تامان، چەپەر؛ ٤) زێد، زێگەی منداڵی؛ ٥) قەبالەی موڵك؛ ٦) جێگەی ئاگر؛ ٧) کاکوڵی سەرتویڵ، گودلە ف ١) یك بستە از برگ توتون؛ ٢) توربۀ توتون و کاغذ سیگار؛ ٣) پرچین؛ ٤) زادگاه؛ ٥) سند مالکیّت؛ ٦) آتشدان؛ ٧) کاکُل.

**جادار:** ١) بەڕێزو حورمەت؛ ٢) جێ‌نشین، خەلفە؛ ٣) بەجێ و عاقڵانە ف ١) محترم و بُلندپایە؛ ٢) جانشین؛ ٣) معقول و بجا.

**جادوُ:** سیحر، سیعر ف جادو.

**جادوباز:** سیحر باز، جادوکەر ف جادوگر.

**جادوبەن:** نوشتەی جادو بەتاڵ کەر ف نعو یذ، باطل کُنندە سِحر.

**جادوبەند:** جادوبەن ف نعو یذ، دعای ضدِ سحر.

**جادوکار:** سیحر باز ف جادوگر.

**جادوکەر:** سیحر باز ف جادوگر.

**جادوگەر:** سیحر باز ف جادوگر.

**جادوگەری:** سیحر بازی ف جادوگری.

**جادە:** شەقام، کاروانەڕێ، ڕێگەی پان و پێکوت کراو ف خیابان.

**جار:** ١) دەحفە، هەل، کەڕەت؛ ٢) وەخت، کات ف ١) دفعە، ٢) گاە.

**جاڕ:** ١) پەڕێن، جێگەی دەخڵی دروێنەکراو؛ ٢) شوێنی گیابەکی تایبەتی: (ئەرگز **جاڕ**، کەما **جاڕ**)؛ ٣) لەوەڕگە؛ ٤) ڕاگەیاندن بەدەنگی بەرز: (**جاڕیان** کێشا)؛ ٥) زەوی نەکێڵدراو ف ١) زمین درو شدە؛ ٢) محلّ رُستن گیاهی مشخّص؛ ٣) مرتَفِع؛ ٤) اعلام عمومی؛ ٥) زمین شخم نزدە.

**جاران:** لەکاتی ڕابردودا، بەرلە ئێستە ف سابقاً.

**جاربەجار:** ١) کات لەدوای کات؛ ٢) کەڕەت لەدوای کەڕەت ف ١) گاەبگاە؛ ٢) دفعەبەدفعە.

**جارجار:** بەهەڵکەوت ف احیاناً.

**جارجارە:** لەزۆر کاتاندا کاتێك ف گاەگاە.

**جاڕچی:** ڕاگەبەن، قاوکەر بۆدەنگ و باسێك ف جارچی، مُنادی.

**جاڕدان:** ١) ڕاگەیاندن بەدەنگی بەرز؛ ٢) کۆکردنەوەی مەردم بۆکارێ ف ١) جارکشیدن؛ ٢) مردم را برای کاری، جمع کردن.

**جاڕ ڕاهێشتن:** خەبەرگوتن بەهەو ف جارکشیدن.

**جاڕز**: وەڕەز، عێذز، بێ‌مەعد، بێزار [فا] بیزار.

**جاڕزبون**: وەڕەزبون [فا] بیزارشدن.

**جاڕزکردن**: وەڕەزکردن [فا] بیزار کردن.

**جارس**: وەڕەز، تەلس [فا] بُکَر.

**جاڕکێشان**: جاڕ راهێشنن [فا] جارکشیدن.

**جارماز**: بەرماڵ، دوگرد، جانماز [فا] سجاده.

**جارنان**: جارجاره، جاربەجاری [فا] گاه‌بگاه.

**جاڕو**: ١) قسلاوو خوڵەمێش بۆ سواغدانی حەوزو...؛ ٤) گەسک، گێزک، گزک [فا] ١) ساروج؛ ٢) جارو.

**جاروبار**. جارنان [فا] گاه‌گاه.

**جاڕوبەند**: سواق دراو بەجاڕو، قسڵو خوڵەمێش تێهەڵسواو، شورباو ریژکراو [فا] ساروج اندود.

**جاروفلک**: گەسک [فا] جارو.

**جار وەجاری**: کانێ لەکانان [فا] گاه‌گاهی.

**جاره**: ١) جاڵــە، نونــوز، ناوێره بەرد، بەردی گلارەوەبــو لەکێف؛ ٢) ئامرازێکی موسیقابە [فا] ١) سنگ غلنیده از کوه؛ ٢) از آلات موسیقی.

**جاری**: ژنی برای مَیرد [فا] زن برادر شوهر.

**جاری**: ١) کاتێك؛ ٢) ئێستا بهێڵە، لێ‌گەڕێ: (جاری باوابێ) [فا] ١) یك وقت؛ ٢) بگذار باشد.

**جــاریتر**: ١) وەختێکی دیــکە؛ ٢) دەفعەیەکی تر [فا] ١) دیگرگاه؛ ٢) دیگربار.

**جاری جاران**: یەرلە ئێستا، لەپێشودا [فا] روزهای پیشین، درگذشته.

**جارێك**: ١) کەڕەتێك، هەڵێك؛ ٢) وەختێك، دەمێك [فا] ١) یکبار؛ ٢) یك زمان.

**جارێکان**: ١) وەختێ لە رابردودا؛ ٢) نەهێشتا [فا] ١) زمانی در گذشته؛ ٢) نه هنوز.

**جارێك لەجاران**: دەمێك لەدەمان [فا] وقتی از اوقات گذشته.

**جارێکیان**: جارێك لەجاران [فا] یکبار در گذشته.

**جاسوس**: شوفار، زوانگیر، خەوەردز [فا] جاسوس.

**جاسوسه**: مەگەزە، قونکەی سەرلولەی تفەنگ [فا] مُگَسك تُفنگ.

**جاش**: ١) بەچکەی کەر؛ ٢) پیاوێ زن بەواده مارەده‌کاو کرێ دەستێنێ؛ ٣) بریتــی لە خۆفــرۆش بەداگیر کەرانــی وڵات [فا] ١) کُرّه خر؛ ٢) مُحلل؛ ٣) کنایه از خودفروش به بیگانه.

**جاشك**: بەچکەکەر، دەحشك، جەحشك [فا] کُرّه‌خر.

**جاشکۆڵه**: بەجکەکەری ساوا [فا] کُرّه‌خر کوچولو.

**جاشولکه**: جاشکۆڵە [فا] کُرّه‌خر کوچولو.

**جاف**: ١) جلف، بەدنــەدا، نەگونــجــاو؛ ٢) ناوی عەشیرەتێکی زۆرو گەورەیە لەکــوردستان. *کەلە هۆزی گاوانی قەدیمەوە کەوتونەوە*؛ ٣) گیابەکە لەناودا دەڕوێ گوڵێکی وەنەوشی هەیە [فا] ١) جلف و بدادا؛ ٢) نام عشیره‌ای در کُردستان؛ ٣) گیاهی است آبزی با گُلهای بنفش.

**جافر**: سوکەلەناوی جەعفەر [فا] مُخفّف جعفر.

**جافری**: جەعفەری، بەقدەنوس، سەوزیە دەخورێ [فا] جعفری، یکی از سبزیجات.

**جافەتی**: مەڵبەندی جاف نشین [فا] منطقهٔ سکونت ایل جاف.

**جاکەش**: دەویت، هورمساخ، گەوواد [فا] قرمساق، دیوث.

**جاگرته**: دانیشتوی هەمیشەیی لەناوابیدا [فا] مُقیم.

**جاگه**: شوێن، جێگە [فا] مکان.

**جال**: بارنەفا، لەبەرانبەردا، لەتوڵەدا، قەرەبو [فا] در ازای، در عوض.

**جاڵ**: ١) جحێڵ، نوجوان، لاو؛ ٢) داو، داو لەهەودا مو بۆ مەل راو کردن [فا] ١) بُرنا، جوان؛ ٢) دام.

**جاڵجاڵوکه**: کاکڵەموشان، پس‌پسەکوڵە، پیرۆشك [فا] تارتنك، عنکبوت.

**جاڵه**: دار بان ئەختەی بەسەر روبار رابەڵ کراو بۆپەڕینەوە [فا] جوبی که بجای پُل بر آب نهند.

**جاڵه**: جاره، ناوێر، نونوز [فا] سنگ غلنان از کوه.

**جام**: ١) فاپ، زەرك، دەفری قوڵی جکۆڵە لەکانزا، ناس؛ ٢) شوشە؛ ٣) ناوێنە؛ ٤) جێگەی من، شوێنی من [فا] ١) طاس؛ ٢) شیشه؛ ٣) آینه؛ ٤) جای من.

**جاماڵ**: ماڵە گەوره، خانەدان [فا] خاندان.

**جامالگه**: هەواری چوڵ، زۆزانا کۆچەر لێ نەمابێ [فا] ییلاق خالی شده.

**جــامانه**: ئاغابانو، بارچەبێــکە پیــاوان دەیکەنە مێزەر [فا] نوعی دستار مردانه.

**جامباز**: ١) دەلاڵی ولاغ فرۆشتن؛ ٢) فێڵبازو دەسبڕ [فا] ١) دلال ستور؛ ٢) کُلاهبردار.

**جامبــازه**: دەست بڵندکرنو هەڵبەزینی ئەسپ بان وشتر [فا] ورجهیدن اسب یا شُتر.

**جامبــازی**: ١) دەلاڵی ولاخ فرۆشتن؛ ٢) دەسبڕی‌و فێڵبــازی [فا] ١) دلالی ستور؛ ٢) کلاهبرداری.

**جامچی**: شوشەبڕ [فا] شیشه‌بُر.

**جامخانه**: شوێنی رانانی شتی فرۆشتن [فا] ویترین.

**جاملوس**: روان لوس، ماسناوکەر، پیاوی بەکلکەسوتە [فا] چاپلوس.

**جامولکه**: زەرکی بچوك، تاسولکە [فا] طاسك.

**جامۆڵکه**: جامولکە [فا] طاسك.

**جامۆڵه**: جامولکە [فا] طاسك.

**جامەدانه**: ١) جامانە؛ ٢) مناڵدان [فا] ١) نگا: جامانه؛ ٢) زهدان.

**جامەدانی**: جامانە [فا] نگا: جامانه.

**جامەلوس**: دەونەڕی ربابازا [فا] چاپلوس.

**جامەمەرگ**: کفن، بەرگی مردو [فا] کَفَن.

**جامەك**: ناوێنە [فا] آینه.

**جامــەنــە**: ١) بەجێ‌ماو، جێ‌ماو، دواکــەونە؛ ٢) میرات، کەلەپور [فا] ١) بەجای مانده؛ ٢) میراث.

**جامێر**: ١) پیاگ خاس، خۆشمرۆ؛ ٢) ئازا، رەشید، بوێر [فا] ١) رادمرد؛ ٢) شجاع.

**جان**: ١) جوان، لەبەردڵان؛ ٢) گیان، روح؛ ٣) کان، مەعدەن: (گلەجان

لەنزیك خۆمانه)؛ ۴) باخچه ⓕ ١) باخچه ٢) زیبا؛ ٢) جان؛ ٣) معدن؛ ۴) باغچه.

**جانـانه:** ١) گراوی، ماشوقه، یاری مێوینه؛ ٢) ژنی زماندرێژو سازنەو سەلیته ⓕ ١) معشوقه؛ ٢) زن سلیطه.

**جانباز:** جامباز ⓕ نگا: جامباز.

**جانبازه:** جامبازه ⓕ نگا: جامبازه.

**جانبازی:** جامبازی ⓕ نگا: جامبازی.

**جانتا:** ١) خورجینی جکۆلەی سەرشانی گەرۆکان؛ ٢) چەمەدان، باولی ⓕ ١) کولەپشتی سیّاحان؛ ٢) جمدان.

**جاندار:** لشکرچی نرکان ⓕ سرباز تُرك عثمانی.

**جانـداران:** مەلبەندێك و گوندێکه لەنزیك سەردەشت لەکوردستان ⓕ منطقه و دهی در کُردستان.

**جاندارم:** پۆلیسی ناوشار، قۆلچی، داروغه ⓕ ژاندارم.

**جاندبەر:** جانەوەر، زیندو ⓕ جاندار، ذیروح.

**جانفاس:** ١) جۆرێك حەریر؛ ٢) جندراو لەگوش ⓕ ١) بافتهٔ ابریشمی؛ ٢) بافتهٔ کنفی.

**جانکوش:** مجێوری کلیسا، خزمەنکاری کلیسا ⓕ شماس.

**جانگ:** ١) پێنەسەر، بانی مەلاشو لەسەرەوە؛ ٢) کەنارەی دەم‌وچاو؛ ٣) کرواس، جاو، تەنراوی جولا لە دەزوەلۆکه: (سوفی و سەروەنزەر، من و نەگریجەو دەستار / من کوشتەیی لاجانگم و نەو کوشتەیی جانگه) «نالی» ⓕ ١) آهیانه؛ ٢) عارض، عذار؛ ٣) کرباس.

**جانگی:** جانگ ⓕ آهیانه.

جانماز: بەرمالّ، دوگرد، جارماز ⓕ جانماز.

**جانو:** بەچکه ئەسپ، جوانو، جانی ⓕ کُرّه اسب.

**جانو ئەسپ:** بەچکەی نێری ئەسپ ⓕ کُرّه اسب نر.

**جانومایین:** بەچکەی مێوینەی ئەسب ⓕ کُرّه اسب مادینه.

**جانـەر:** گوڵێکی سپی نامـاڵ بۆری بۆن خۆشه ⓕ گلی سفید مایل به خاکستری خوشبو.

جانەمەرگ: گوڵەنەورۆزه ⓕ گلی است نوروزی.

جانەوەر: ١) زیندەوەر، خاوەن گیان؛ ٢) حەیوانی دڕندەو ترسێنەر ⓕ ١) جانور؛ ٢) حیوان درّنده و مهیب.

**جانی:** جانو، بەچکەی ماین و ئەسب ⓕ کُرّه اسب.

**جاو:** ١) شانی لە داوەلـۆکـه، جانگ؛ ٢) کۆنەو شکاو: (ناسنجاو)؛ ٣) پاشگری بەواتا کەسێك کە شتێك لەناو دەمدا دەجوێ: (بنێشتجاو، لاجاکەجاو) ⓕ ١) کرباس؛ ٢) شکسته و از کار افتاده؛ ٣) پسوند بەمعنی خاینده.

**جاوبێچەك:** دارێ کەجولا جاوی تێ دەپێچێ ⓕ چوبی که کرباس بر آن بپیچند.

**جاوراو:** جۆراو، جاویاگ، لەدەمدا هاتوچو پێ‌کراو، وەك بنێشت ⓕ خاییده.

**جاوراوە:** ئاسنی فەلّس بردە ⓕ آهن ترك خورده.

**جاونـانەوە:** ١) رایەڵ کردنی داوی جرێشاوی بۆزو؛ ٢) برینی لە هاتو چوکـردنی زۆرو بەلـەز ⓕ ١) ردیف کردن تارهای شال؛ ٢) کنایه از آمدوشد با شتاب.

**جاوگ:** کرواس، جاو، جانگ ⓕ کرباس.

**جاوەجـا:** ١) گوێزانـەوەو دامـەزراندن؛ ٢) هەرئێسته، جێ‌بەجێ ⓕ ١) جابجاکردن؛ ٢) فوراً.

**جاوەرجا:** جێ‌بەجێ، دەس بەجێ، هەرئێسته ⓕ بیدرنگ، فوراً.

**جاوەلۆکه:** گیایەکه مەڕ بیخوا ماستی هەرەبانی دەبێ ⓕ گیاهی است.

**جاوەنه:** جێ راخستن، نوێن داخستن ⓕ رختخواب پهن کردن.

**جاوی:** ١) جیوه، جەوی، شیلەی داروگیا کە خۆی دەری دەکـا؛ ٢) کاری رابردە بەماناجوی، لەناو دەمی و لەژێر ددانیدا هاوردی و بردی ⓕ ١) انگم گیاهان و درختان؛ ٢) خایید، جوید.

**جاوینـەوە:** ١) دوبـارە جاوین، دیسـانـەوە جوین؛ ٢) برینی لە چەنـد پاتـەکـردنەوەی قسه؛ ٣) ددان بەسەر شتێ رەق‌دا هێنان: (ئەسپەکە لغـاوەکـەی دەجـاوێتەوە) ⓕ ١) دوباره جویدن؛ ٢) کنایه از تکرار مُکرّر سخن؛ ٣) دندان بر شیئی سخت نهادن.

**جاهاڵ:** لاو، جوان لەعومرا ⓕ بُرنا.

**جاهێل:** جاهاڵ، نۆجوان ⓕ نوجوان.

**جاهیل:** نەزان، نێ نەگەیشتو، دورەزانست ⓕ جاهل، نادان.

**جاینك:** لاجانگ، کەنارەی روا ⓕ گیجگاه.

**جببه:** جۆرە کەوایەکی پێش ناوالەی مەلایانەیه ⓕ جُبّه.

**جبۆ:** ١) سوکەڵەناوی جبرایل؛ ٢) فلانێ، کاورا ⓕ ١) مُخفّف جبرئیل؛ ٢) یارو، فلانی.

جبه: ١) جببه؛ ٢) سوکەڵەناوی جبرایل؛ ٣) ئەسپابی شەڕ ⓕ ١) جُبّه؛ ٢) مخفّف جبرئیل؛ ٣) جنگ‌افزار.

**جبەخانه:** ئەسپاباتی شەڕ، کەرسنەی جەنگ، کارخانەی کەرستەسازی شەڕ ⓕ زرّادخانه.

**جبەڵخانه:** جبەخانه ⓕ زرّادخانه.

**ججاڵ:** کەرسواریکی خەیاڵیە کەرۆژێك دنیا دەگرێ، جرجاڵ ⓕ دَجّال.

**ججحه:** دەنگ‌دانی مەڕ بۆ دەرکەوتن لە هۆڵ ⓕ حرف راندن گلّه از آغل.

**ججـو:** جوجـکەمەل لەزاراوەی منـاڵانـدا ⓕ جوجهٔ برنده به زبان کودکان.

**جخار:** خەم، کەسەر، کوڵ ⓕ غم، اندوه.

**جدا:** جیاواز، جگه ⓕ جُدا، سوا.

**جدەو:** ١) لەکار کەوتو؛ ٢) ولاخە بەرزەی پشت بریندار: (پشتی ریش و شانی زامـدارو جدەو بو، ناعیلاج / چەنـد قروشێکم هەبـو، بۆمدا بەنـەوت و عەنـزەروت) «شێخ رەزا» ⓕ ١) از کار افتاده؛ ٢) بارکش پُشت ریش.

**جڕ:** ١) بێ هێزی: (جڕم دەرهات)؛ ٢) دژواری: (بە جڕەجڕ رام کێشا)؛ ٣) دڕان و لەت بون: (بارجەکەم گرت و جڕم‌دا)؛ ۴) زڕت بۆ گاڵنە پێکردن ⓕ ١) ستوه؛ ٢) دشواری؛ ٣) جِر خوردن؛ ۴) شیشکی.

**جڕاجڕ:** شەڕەچەقه، شەڕه دندوکه، کێشەی زوانی ⓕ نزاع لفظی.

**جڕان:** ١) ناونگی بەردبن؛ ٢) بەنـدهـاتنی مێز: (بەمیزەوە دەجڕا) ⓕ ١)

هاون سنگی؛ ۲) بندآمدن ادرار.

**جربن**: دانەسەکناو، هەدانەدەر، نۆقرەنەگرتو فا بازیگوش، بی‌آرام.

**جربو**: جربن فا بازیگوش.

**جربوجوپ**: هەڵبەز دابەزی بێ‌فایدە فا بازیگوشی.

**جـرت**: ۱) جلـفو بێ‌شـەرم؛ ۲) زرت، شیز فا ۱) جلف، هرزه؛ ۲) شیشکی.

**جرتوفرت**: جربوجوپ فا بازیگوشی.

**جرتـە**: ۱) کەبەنك، باڵەی لباد؛ ۲) نیوەنۆزە: (هەر جرتەی دێ) فا ۱) فرجی؛ ۲) نالهٔ خفیف.

**جرتی فرتی**: دانەسەکناوی جلف فا بازیگوش جلف.

**جرج**: مشکە کوێرە، مشکی دەشتی فا موش کور، کلاك موش.

**جرجاڵ**: ججاڵ فا دَجّال.

**جرجرە**: جوێلە کۆکێکی جوانو دورەنگە فا جرخ ریسك.

**جرجۆنگانێ**: شەرانیو بەدفەڕو نەگونجاو فا ناهنجار و بداخلاق.

**جرد**: جرج فا کلاك موش.

**جردان**: دراندن، دادراندن فا دریدن.

**جرداهێشتن**: زرت کێشان، شیرداهێشتن فا شیشکی بستن.

**جرد اهێلان**: جرداهێشتن فا شیشکی زدن.

**جرنا**: قسەی بێ‌تامو خوێ فا جرند.

**جروجانەوەر**: شتی هیچو بوچ فا اشیاء بی‌ارزش.

**جرنگ**: دەنگی بەسەریەکدا کەفتنی زیو فا صدای برهم افتادن نُقره.

**جرنگو هوڕ**: دەنگی زۆری وێك کەوتنی کانزا فا درنگ درنگ، صدای برهم افتادن فلز.

**جرنگـەجرنگ**: دەنگی زۆری بەسەر بەکدا کەوتنی زیو فا صدای زیاد برهم افتادن نقره.

**جرو جیاز**: کەل پەلی ماڵ فا وسایل منزل.

**جروکە**: دەنگی خوێندنی جوجکە فا صدای جوجهٔ برنده.

**جرها**: وشەی گاڵتە پێکردن فا کلمهٔ تمسخُر.

**جرهاتن**: توشی تەنگانەبون، ناڕەحەت بون فا بەتنگ آمدن.

**جرە بەگزادە**: مەلێکی رەنگاو رەنگی جوانە فا برندەای رنگارنگ.

**جرەجز**: ۱) زەحمەتو دەرد؛ ۲) شەرەفسە فا ۱) درد و رنج؛ ۲) جَدَل.

**جریت**: جلیت، سوکەلە دارێك کەسواران لەمەیداندا بە یەکتریان دادەدا فا چوبی کوچك کە سوارکاران با آن بازی می‌کنند.

**جریتـان**: جـلیت بازی، گەمەی جـلیت فا بازی سوارکاران با چوب «جریت».

**جریتێن**: جریتان فا نگا: جریتان.

**جریك**: دەنگی جوێلەکە، خوێندنی جیشکە فا صدای گنجُشك.

**جریکە**: جریك فا صدای گنجشك.

**جریکەجریك**: دەنگی چوێلەکان بەزۆری فا صدای زیاد گنجشکان.

**جرینگە**: دەنگی بەسەریەکدا کەوتنی زێڕ و زیو فا صدای سکەهای زر و سیم.

**جریوە**: ۱) دەنگی جوێلەکـان؛ ۲) تروکەتروکی نەسنبرە فا ۱) صدای گنجشکان؛ ۲) سوسوی ستاره.

**جریوە جریو**: جریوەی زۆر فا «جریوه»ی زیاد.

**جز**: دەنگی رۆنی داغ یان ئاسنی سورەوەبو کەناوی ویکەوێ فا صدای روغن داغ و آهن تفته در تماس با آب.

**جزدان**: کیسە باخەڵ، کیسەی جەرمین بۆ پوڵ تێکردن فا کیف بغلی.

**جززە**: ۱) گۆشتی برزاو بەزمانی منالان؛ ۲) جز فا ۱) گوشت برشته در لهجه کودکان؛ ۲) نگا: جز.

**جزقە**: زەنگەنە، تلیسك فا تلسك.

**جزم**: ۱) بازێ لەسـی بازی قورعـان؛ ۲) جۆر، نەوع فا ۱) جزئی از قرآن؛ ۲) نوع.

**جزمە**: جەکمە، کەوشی لاسك درێژی تازێر ئەژنۆ فا چکمه.

**جزو**: ۱) بازێ لەقورعان؛ ۲) باژ لەکتێب فا ۱) جزء قرآنی؛ ۲) جزء کتاب.

**جزوبز**: جز فا جزولز.

**جزوبەند**: پێکەوە دانو درونی بازەکانی کتێب فا صحّافی.

**جزوە**: دەفری قاوە تێدا لێنان، قاوەجۆش، دەللە فا قهوەجوش.

**جزە**: ۱) دەنـگـی رۆنـی داغ؛ ۲) گۆشتی برزاو بەزوانی زارۆکـان؛ ۳) بنەگیایەکـە دەکـوڵێندرێو دەیخۆن فا ۱) صدای تفتن روغن؛ ۲) گوشت بریان به لهجهٔ کودکان؛ ۳) ریشهٔ خوردنی نوعی گیاه.

**جزبلك**: جزبلك، جزلێك، دۆگی سورەوەکراوی هەڵقرچاو فا جزغاله.

**جسن**: ۱) بنیچە، نەژاد؛ ۲) عەسڵ زادە، رەسەن فا ۱) نژاد؛ ۲) نجیب.

**جعێتنی**: جۆرێ نەسیی رەسەن فا نوعی نژادِ نجیب اسب.

**جعیدوك**: گیابەکە دزی مۆرانەی دار فا گیاهی است ضد موریانه.

**جغار**: جخار، خەم، خەفەت، مەبنەت، کەسەر، کوڵ فا اندوه.

**جغارە**: سیغار، جگەرە، تونتی دەکاغەزەوە پێجراو بۆ کێشان فا سیگار.

**جغارەخۆر**: نالودەی سیغار فا سیگاری.

**جغارە کێش**: جغارەخۆر فا سیگاری.

**جغارە کێشان**: کاری جغارەخۆر فا سیگار کشیدن.

**جغجغە**: شەقشەقە، قوتوی لەیستوك کە خرەخرێ دێت فا جغجغه.

**جغز**: خەتی بەدەورە، کێزی گرۆفەر فا دائره.

**جغزانێ**: گاڵتەی ناو جەغز فا نوعی بازی.

**جغزێن**: جغزانێ فا نوعی بازی.

**جغزینگ**: پەرگاڵ، نامرازی جغزکێشان فا پرگار.

**جغەرە**: جغارە فا سیگار.

**جغەرەچی**: جگەرەفرۆش فا سیگارفروش.

**جغەرەخۆر**: جغارەخۆر فا سیگاری.

**جغەرە کێش**: جغارەخۆر فا سیگاری.

**جفت**: ۱) تێکـولـێ بەرۆ؛ ۲) جوت بەرانبەری تاك؛ ۳) هاوتا؛ ۴) هەواڵ منـداڵ؛ ۵) زەوێ کێڵان بەگا؛ ۶) پێوە نوسـاو، پێکـەوە لکاو؛ ۷) زن بۆشو، شو بۆژن فا ۱) بوستهٔ بلوط؛ ۲) زوج مقابل فرد؛ ۳) همتا؛ ۴) زهدان؛ ۵) شخم با گاو؛ ۶) بهم جسبیده؛ ۷) همسر.

**جفت‌بون**: باڵ ویکدان، پێکەوە نوسان فا جُفت شدن، بهم جسبیدن.

**جفت قوشه**: ١) گای شاخ وه‌شێن؛ ٢) برینی له مرۆی نه‌حس و به‌دفه‌ڕ ف ١) گاو شاخزن؛ ٢) کنایه از آدم شوم و بدخلق.

**جفتـه**: ١) ماشـه‌ی ده‌م باریکی سه‌عـات سازان؛ ٢) له‌قـه، جوته؛ ٣) مێو ینه‌ی حه‌یوان و مه‌ل ف ١) موجین مانند ساعت‌سازی؛ ٢) جُفتک؛ ٣) جنس مادهٔ پستانداران و پرندگان.

**جفته‌پا**: هه‌ستان له‌به‌ربه‌کی به‌په‌له ف قیام سریع بخاطر شخصی.

**جفتـه‌وه‌شـانن**: له‌فه هاویشتن، له‌فه وه‌شاندن، لۆشك هاویشتن ف لگدپرانی.

**جفته‌وه‌شێن**: له‌فه هاوێژ، لوشك هاوێژ ف لگدپران.

**جفته‌هه‌لخستن**: له‌فه هاویشتن ف لگدپرانی.

**جفتیار**: زه‌وی کێڵ، جوتیار ف کنایه از کشاورز.

**جڤ**: بزاو، جوڵه، جوڵان ف حرکت.

**جڤات**: کۆبونه‌وه، کۆم بون ف گردهمایی.

**جڤاکی**: کۆمه‌لایه‌تی ف اجتماعی.

**جڤی**: دوانه، ئاواڵ دوانه ف دوقلو.

**جڤین**: ١) بزوتن ، جوڵان؛ ٢) دژوێن، دژنام، جنێو، جوێن؛ ٣) کۆبونه‌وه ف ١) حرکت؛ ٢) دشنام؛ ٣) اجتماع کردن.

**جڤینگه**: جێگه‌ی کۆبونه‌وه ف مرکز اجتماع.

**جق**: ئاماڵ، مه‌بله‌و ف فام، گونه.

**جقه**: ١) مه‌لبکـه نۆزێ له‌چێشکه مه‌زنتره؛ ٢) قبنکه‌ی پشت په‌نجه‌ی که‌ڵـه‌شێر؛ ٣) مه‌نجـه‌ڵ، به‌رۆش ف ١) پرنـده‌ای کمی بزرگتـر از گنجشك؛ ٢) برجستگی پُشت پای خروس؛ ٣) دیگ.

**جك**: میچ، قاب، جو، جگ ف شنالنگ.

**جگ**: ١) جك؛ ٢) قاپی له‌سه‌رپشت، ورگی جگ ف ١) شنالنگ؛ ٢) حالت بر پُشت افتادهٔ شنالنگ.

**جگا**: جیا، جودا، جیاواز ف جُدا.

**جگاجگا**: به‌ش به‌ش، جیاجیا ف جُداجُدا.

**جگاره**: جغاره ف سیگار.

جگانێ: گه‌مه به‌جك ف بازی با شنالنگ.

جگه‌ر: جه‌رگ، که‌زه‌ب ف جگر، کبد.

**جگه‌رێوتی**: گیابه‌که ده‌رمانی کۆکه ف گیاهی دارویی.

**جگه‌رچی**: جه‌رگ‌ودڵ فروش ف جگرکی.

**جگه‌رسوز**: دلۆڤان، غه‌مخۆر، دلسۆز ف غمخوار و دلسوز.

**جگه‌رسوتان**: بربنی له‌مردنی فرزه‌ند ف کنایه از مرگ فرزند.

**جگه‌رسوتاو**: متاڵ مردو ف فرزند مُرده.

**جگه‌رگۆشه**: بریتی له‌فرزه‌ند ف کنایه از فرزند.

**جگه‌ره**: جغاره ف سیگار.

**جگه‌ره‌چی**: جغاره‌فرۆش ف سیگارفروش.

**جگه‌ره‌خۆر**: جغاره‌خۆر ف سیگاری.

**جگه‌ره کێش**: جغاره‌خۆر ف سیگاری.

**جگێن**: جگانێ، میچێن، قاپێن ف بازی با شنالنگ.

**جل**: ١) به‌رگ و لیباس؛ ٢) که‌ل و په‌لی سه‌رپشتی باره‌به‌ر ف ١) لباس؛ ٢) جُل سُتور.

**جلبڕ**: که‌سێ شتومه‌ك ده‌برێ بۆ لیباس درون ف آنکه پارچه را برش زند.

**جلبڕان**: کۆ بونه‌وه بۆ لیباسی بوك برین و درون ف جشن بُرش و دوخت لباس برای عروس.

**جلبڕوکه**: مزراویلکه، شۆربای سماق و هێلکه ف اِشکنه با سُماق.

**جلبڕین**: جلبڕان ف نگا: جلبڕان.

**جلخۆز**: گێل‌ونه‌زان ف هالو.

**جلدان**: ١) به‌غـدانی جلکـان؛ ٢) جاروکـه‌ی سه‌رشان ف ١) صندوق لباس؛ ٢) رودوشی.

**جلدرو**: خه‌یات، به‌رگدور ف خیّاط.

**جلشتن**: شیو و کوڵ، بالاف ف رخنشویی.

**جلشۆر**: ١) بالاف که‌ر، به‌رگ‌و شمه‌ك شۆر؛ ٢) به‌باغی جل‌کونان ف ١) رخنشور؛ ٢) کدینه.

**جلشۆرك**: ١) جێگه‌ی بالاف، شوێنی که‌ل‌وپه‌ل لێ‌شوشتن؛ ٢) داری جل‌کوت ف ١) مکان رخنشویی؛ ٢) کدینه.

**جلف**: سوك و جروك، ناکار ناشیرین ف فرت، جلف.

**جلفز**: هه‌دانه‌ده‌ر و شێتوکه، گه‌للایی ف خُل و بی‌آرام.

**جلفـو**: پارچه‌یه‌کی سوره، به‌سه‌ر بازی‌دا ته‌دن تا که‌وی ده‌بێ ف پارچهٔ قرمزی که باز را با آن رام می‌کنند.

**جلفی**: هه‌رزه‌کاری و سوکی ف فرتی‌گری.

**جلق**: ١) قه‌لـب، بێ‌ره‌واج: (مـن که‌به‌ك پاره‌یی **جلقم** له ئه‌زه‌ل شك نه‌ده‌برد) «شێخ ره‌زا» ٢) ده‌سپه‌ڕ، مشته، شاوه‌ت هێنانه‌وه به‌ده‌ست ف ١) بی‌رواج، بُنجُل؛ ٢) استمنا.

**جلقاو**: ناوی ناخاوێنی شیو وکوڵ ف آب پس مانده از رخنشویی.

**جلقه**: ده‌نگی قوڕو لیته که پای تێده‌خه‌ن ف صدای پا در لجن و گل و لای.

**جلقێ**: دژوێنێکه ژنانه ف دُشنامی زنانه.

**جلك**: لیباس، که‌ل‌و په‌ل، جل، پۆشاك ف لباس.

**جلکار**: به‌رگی کارێ ف لباس کار.

**جلگا**: جۆرێك ماسی ف نوعی ماهی.

**جلنبۆر**: نه‌مه‌ڵ، ته‌وه‌زه‌ل ف بیکاره و تنبل.

**جلنگه**: ده‌نگی شکانی چینی ف صدای شکستن چینی.

**جلوا**: سیس و ژاکـاو: (**جلوا**بـۆی جه‌وجـه‌مێ دتـازه / ره‌نگێ سه‌مه‌نی به‌جای غازه) «خانی» ف پژمرده.

**جلوبه‌رگ**: که‌ل‌به‌لی ده‌به‌رکردن ف لباس.

**جلوجۆڕ**: به‌رگ‌و ئه‌سپابی ولاخی باره‌به‌ر ف پوشش باربر.

**جله**: ١) جانـه‌وه‌ریکی ناوی هه‌شت‌پایه له ده‌ریادا؛ ٢) جانــه‌وه‌ریکی خڕوپانه له‌ناودا، زینده‌وه‌ری چکۆله راوده‌کا؛ ٣) ره‌گ و ریشه‌ی وردی داره‌بی فه‌راغ ئاو که پێش به‌ئاو ده‌گرێ؛ ٤) گیابه‌که وه‌ك قه‌وزه سه‌رئاو ده‌که‌وێ‌و ده‌نه‌نێنه‌وه ف ١) اُختاپوس، هشت‌پا؛ ٢) حیوانی آبزی بالنسك مانند؛ ٣) ریشه‌های بید کنار آب؛ ٤) جل وزغ.

**جله‌شره**: گیای قه‌وزه ناسایی، جله ف جل وزغ.

**جلەو:** هەوسار، رەشمە، قامچی لغاو ف افسار، زمام.

**جلەودار:** ۱) هەوسارکێش؛ ۲) کەسێ لەپێش سوارانـەوە دەڕوا ف ۱) جلودار؛ ۲) راهنمای سواران.

**جلەوکێش:** جلەودار ف جلودار.

**جلەوگیر:** کۆسپی سەرڕێگە ف مانعِ سرِ راه.

**جلەوگیرە:** جلەوگیر ف مانعِ سرِ راه.

**جلیت:** جریت ف چوبدستی سوارکاران در مسابقهٔ سوارکاری.

**جلیتاو:** قوڕوچلپاو، قوڕاوی شل ف لای و لجن.

**جلیتانێ:** جربتبازی، جلبنین، گەمەی جلبت ف نگا: جربنان.

**جلیتێن:** جلبنانێ ف نگا: جربنان.

**جلیتبازی:** جلبنانێ: (دریغ بۆ ئەو زەمانە، ئەودەمە،ئەوحانە، ئەو رۆژە/ کە مەیدانی **جلبتبازی** لەدەشتی کانی ئاسکان بو) «شێخ رەزا» ف نگا: جربتان.

**جلیتقە:** سوخمەی بێ قۆڵی پیاوانە، سەدربە ف جلبقە.

**جلیسقە:** جلبتقە ف جلیقە.

**جلێق:** ۱) شیلان، درکێکە لەپابزا بەرێکی سوور دەگرێ؛ ۲) لبجق، لیلق ف ۱) نسترن کوهی؛ ۲) لزج.

**جلیقە:** جلیسقە ف جلبقە.

**جم:** بزاو، بزوتن، جوڵە ف جُنبش، حرکت.

**جمان:** بزوتن، جوڵان ف جنبیدن.

**جمحە:** جوحمە، هەینی ف جُمعه، آدینه.

**جمدان:** جوڵان، ئەکان خواردن ف جُنبش.

**جمس:** جوڵە، جم ف جُنبش.

**جمشت:** جمدان، جمس ف جُنبش.

**جمشیرگ:** جمگە، جومگە، بەندی نێوان دەست و باسك ف مُچ دست.

**جمك:** دوانە، هەواڵ دوانە، زگەدوانە ف دوقلو.

**جمکوت:** پڕایی زۆری خەلك، قەرەباڵغ ف ازدحام.

**جمگە:** جمشیرگ، جومگە ف مُچ دست.

**جمگەجمگە:** بەندبەندی ئەندام ف بندبندِ اندام.

**جمنای:** جوڵان، بزوتن ف جُنبش.

**جموجوڵ:** بزوتنی زۆر ف جُنب و جوش.

**جمە:** کۆمەڵ و پڕایی خەلك: (بازاڕە کە **جمەی** دێت) ف ازدحام.

**جمیان:** جوڵان، بزوتن ف جُنبش.

**جمین:** بزوتنی خەلکی زۆر ف حرکت انبوه مردُم.

**جمێن:** جنێو، دژوێن، سخێف، جوێن، دژمان ف دُشنام.

**جن:** جنۆکە، جندۆکە، عەجنە ف جن.

**جناوەر:** جانەوەر، دەعبا ف جانور.

**جنجیر:** ماری دورەنگ، ماری خاڵدار ف مار دورنگ، اَرقم.

**جنچـك:** ۱) دەنکی خورماو میوە؛ ۲) هەڵنوتەکان، قونەلنس‌دان ف ۱) هستە؛ ۲) چمباتمەزدن.

**جنچکان:** نوتەکان، هەڵنزوشکان، قونەلنس‌دان ف چمباتمەزدن.

**جنچکە:** هەڵنزوشکان ف چمباتمەزدن.

**جند:** جنۆکە، جن، عەجنە ف جن.

**جندۆکە:** جند ف جن.

**جندُوکە:** جند ف جن.

**جندە:** قاحبە، ژنی خۆفرۆش ف فاحشە.

**جندەباز:** پیاوی فاسق و ئاشنای قەحبە ف جندەباز.

**جندەخانە:** ماڵەجندە، قاحبەخانە، مەکۆی ژنانی خۆفرۆش ف محلّهٔ بدنام.

**جنـدی:** ۱) نازا، بەکار، رەشبد؛ ۲) جوان، سەهی؛ ۳) باش، چاك؛ ۴) جەکدار لە سوپادا ف ۱) شُجاع؛ ۲) زیبا؛ ۳) خوب؛ ۴) مسلّح در سپاه.

**جنسری:** گوڵێکی بەهێشوی سپی بۆن خۆشە ف گُلی است.

**جنك:** بەرگ و شمەك، جلك، کەلپەل، پۆشاك ف پوشاك، لباس.

جنکە: ئاتەواو هەنجراو ف کمی انجیدە شُدە.

**جنـگ:** ۱) جم، بزاو، جوڵە؛ ۲) شمـەك، کەلوپەل ف ۱) جُنبش؛ ۲) پۆشاك.

**جنگدان:** بزوتن، جوڵان ف جُنبیدن.

**جنگز:** شەڕانی، بەدفەڕ، ئەگونجاو ف ستیزەجو.

**جنگڵ:** گینگل، خۆبزاوتن، جوڵانەوە ف جُنبیدن.

**جنگن:** شەڕانی، دڕ، ئەگونجاو، جنگز ف ستیزەجو.

**جنگوجوڵ:** بزوتن و هەدانەدان ف جُنب‌وجوش.

**جننە:** جندە ف جندە.

**جننەباز:** جندەباز ف جندەباز.

**جننەخانە:** جندەخانە ف فاحشەخانە.

**جنۆکە:** جندۆکە ف جن.

**جنە:** جندە ف جندە.

**جنێ:** جندە ف جندە.

**جنیاگ:** هەنجناو، وردکراو بە چەقۆ ف انجیدە.

**جنیقین:** راپەڕین، لەپڕ وەخەبەرهانن ف پریدن از خواب.

**جنیك:** ۱) لاچانگ، قەراغ روومەت؛ ۲) گودلە، فڕ؛ ۳) بان مەلاشو ف ۱) عُذار؛ ۲) کاکُل بر پیشانی؛ ۳) آهیانە.

**جنێو:** جوێن، دژمان، سخێف ف دُشنام.

**جنێودان:** جوێن‌دان، سخێف‌گوتن ف دُشنام دادن.

**جنێوفرۆش:** زمان پیس، جوێن دەر، سخێف بێژ ف بدزبان.

**جنین:** هەنجنین، وردکردن بە چەقۆ ف انجیدن.

**جۆ:** ۱) جۆگە؛ ۲) دەغڵی هەواڵی گەنم، جە ف ۱) جوببار؛ ۲) غلهٔ جو.

**جۆ:** ۱) جۆگە، جۆبار، شوێنی ئاوپێداڕۆیشتن؛ ۲) جوڵەکە، موسایی؛ ۳) گیان، رۆح ف ۱) جوب؛ ۲) یهودی؛ ۳) جان.

**جواب:** پەرسف، جواو، وەرام دانەوە ف جواب، پاسُخ.

**جوابدان:** دەرکردن، قسەلێ نەبیستن ف راندن.

**جواب دانەوە:** پەرسف وەدان، جواب لێ وەگەڕاندن ف پاسخ گفتن.

**جوابکردن:** جوابدان، جواوکردن ف دست رد زدن.

**جوابنامە:** قاقەزی جوابدانەوە ف پاسُخنامە.

**جوابەجەنگی:** جواوجوی، بەدەم داهاتنەوە ف بەجَدَل جواب دادن.
**جوات:** ١) جڤات، کۆمەڵ؛ ٢) کۆبونەوە؛ ٣) مەجلیس، کۆمەڵگا ف ١) اجتماع؛ ٢) گردهمایی؛ ٣) انجمن.
**جوار:** جۆڕك، نۆری ئالك ف توربهٔ علوفه.
**جوال:** کیسەی دەغڵی گەورەی بەکەڵایی لەخوری چندراو، جەواڵە ف جوال.
**جواڵ:** جوال ف جوال.
**جواڵدوز:** شوژن، سوژن ف جوالدوز.
**جوامێر:** جامێر ف رادمرد، شُجاع.
**جوان:** ١) سپەهی، دەلال، قەشەنگ؛ ٢) جحێل، لاو، نازەپێگەیشتو؛ ٣) پەسند؛ ٤) ژوان ف ١) زیبا؛ ٢) بُرنا، جوان؛ ٣) پسندیده؛ ٤) میعاد.
**جواناو:** نارەقی سەرەمەرگ، خوەدانی نەخۆشی لەمردن ف عَرَق حالِ نزع.
**جوانچاك:** گەلەك سپەهی، خوشیك ف زیباروی.
**جوانچاڵ:** جوانچاك ف زیباروی.
**جوانخاس:** پیاوی زۆرجوان و رێكوپێك ف خوش تیپ.
**جوانکار:** ١) رازێنەوە، بوك جوانکەر؛ ٢) دەس رەنگین، بەهونەر ف ١) آرایشگر؛ ٢) هنرمند.
**جوانکە:** نۆجوان، نازەلاو ف نوجوان.
**جوانکەر:** رازێنەوە، وەرازێن ف آرایشگر.
**جوانکەلە:** چکۆلەی جوان و بەردڵ ف زیبای کوچولو.
**جوانکیلانە:** جوانکەلە ف کوچولوی زیبا.
**جوانمەرد:** جامێر ف رادمرد.
**جوانن:** بزواندن، جولانن ف جنباندن.
**جوانو:** جانو، بێچوە ئەسپ و ماین ف کُرّهٔ اسب.
**جوانو ئەسپ:** بەچکەی نێری ئەسپ ف کُرّهٔ نَر اسب.
**جوانولکە:** جانوی تازەزاو ف نوزاد اسب.
**جوانوماین:** بەچکەی مێوینەی ئەسپ ف کُرّهٔ مادینهٔ اسب.
**جوانەزوە:** عازەوی، زیبکەی دەموچاوی لاوی نازەپێگەیشتو ف عَزَبی، جوش صورت نوجوان.
**جوانەزەوە:** جوانەزوە ف نگا: جوانەزوە.
**جوانەگا:** گای سێ بەهارە، بەرجوت ف گاو نر سه‌بهار دیده.
**جوانەمەرگ:** بەگەنجی مردو، بێوەخت مردو ف جوانمرگ.
**جوانەمەرگی:** مردن بەلاوەتی، مەرگی بێوەخت ف مرگ در جوانی.
**جوانی:** ١) جوانو؛ ٢) خوشیکی، قەشەنگی؛ ٣) جحێلی، لاوی ف ١) کُرّهٔ اسب؛ ٢) زیبائی؛ ٣) جوانی.
**جواو:** پەرسف، جواب ف جواب.
**جواوجوی:** جوابەجەنگی ف بەجَدَل پاسخگوئی.
**جواودان:** ١) پەرسفوەدان؛ ٢) دەرکردن ف ١) پاسخگویی؛ ٢) اخراج کردن.
**جواهێر:** جەواهێرات، بەردی بەنرخ ف جواهر.
**جواهێر بەن:** گەوهەر بەند، بەجەواهێر رازێنراوەوە ف جواهر بند.

**جۆبار:** جۆگەی ئاوی زل ف جویبار.
**جۆبڕ:** مڵە، جانەوەرێکە رەگی گیا دەبڕێ ف آبدُزدك.
**جوبرایل:** ناوی فریشتەی وەڵام بەری خوابە ف جبرئیل.
**جوبڕك:** جۆبڕ ف آبدُزدك.
**جۆبڕك:** جۆبڕ ف آبدُزدك.
**حۆبڕکە:** حۆبڕ ف آبدُزدك.
**جۆبە:** جندەخانە ف محلهٔ بدنام.
**جۆت:** ١) بەرانبەری تاك، جفت؛ ٢) کڵاوی بەڕو؛ ٣) پێکەوە لکاو؛ ٤) نێوان خۆش؛ ٥) ژن بۆشو، شوبۆژن؛ ٦) کێڵانی زەوی؛ ٧) دوگا بۆ زەوی کێڵان ف ١) مقابل تاق، جُفت؛ ٢) کلاهك بلوط؛ ٣) بهم چسبیده؛ ٤) صمیمی؛ ٥) همسر؛ ٦) شُخم؛ ٧) دو گاو شخم‌زن.
**جۆت:** ١) کێلانی زەوی؛ ٢) حەیوانی زەوی کێلان ف ١) شُخم؛ ٢) حیوان شخم‌زنی.
**جۆتانە:** باجێکە ئاغا لەمسکێنی دەسێنێ ف مالیات ارباب از کشاورز.
**جۆت‌بون:** ١) پێکەوە لکان؛ ٢) هەواڵ بونی دوکەس ف ١) بهم چسبیدن؛ ٢) باهم ساختن.
**جوت بەندە:** ١) خاوەنی ئەسپابی زەوی کێڵان؛ ٢) وەرزێر ف ١) مالك وسائل کشاورزی؛ ٢) کشاورز.
**جوت‌قوشە:** پیاوی شوم و بێفەڕ ف آدم شوم و نحس.
**جوتك:** ئەو دوداری دەخرێنە سەرکاریتە بۆبن ئالودار ف دو الوار روی شاه‌تیر سقف.
**جوتکار:** جوتیار، کەسێ زەوی دەکێڵێ ف شخم‌زن.
**جوتکردن:** ١) پێکەوە نوساندن؛ ٢) زەوی کێڵان ف ١) برهم نهادن؛ ٢) شخم‌زن.
**جۆتکە:** جۆنە، لۆشك، لەقە هاوێژی ف لگدپرانی.
**جوتگرتن:** نێر دەگەڵ مێوینە پەك گرتن بۆ پێکەوەژین ف ازدواج.
**جۆتن:** جاوین، جۆن، لەناو دەم لەژێر ددانەدا هێنان و بردن ف جویدن.
**جوتنەوە:** برێنی لەچەند پاتەکردنەوەی قسە ف ژاژخایی.
**جۆتە:** ١) جوتکە، لۆشك؛ ٢) لفەدوانە، هەواڵ دوانە؛ ٣) هاونا، هاوسەنگ؛ ٤) ئەسپێ رەگی تویڵی زەقە؛ ٥) دوقرانی زێو، تارانی ف ١) لگدپرانی؛ ٢) دوقلو؛ ٣) همپایه؛ ٤) اسبی که رگِ پیشانی برجسته دارد؛ ٥) سکهٔ نقرهٔ دوریالی.
**جۆتەوەشاندن:** لۆشك هاوێژتن ف لگدپراندن.
**جۆتەوەشین:** لەفەوەشین ف لگدپران.
**جۆتەی سەران:** برێنی لە دوهەواڵی هەمیشە پێکەوە ف کنایه از دو دوستِ جانی.
**جۆتەی کەو:** دوبرالە، دونەستێرەی لێك نزیکن ف فرقدان.
**جۆتەی کەوان:** دوبرالە، جۆنەی کەو ف فرقدان.
**جۆتەی هەنجیران:** دونەستێرەی لای کلکی برجی دوپشك ف دو ستارهٔ دنبالهٔ برج عقرب.
**جوتیار:** جۆتکار، کەسێ کە خەریکی کێلانی زەمینە ف شخم‌زن.
**جوتیاری:** کاری زەوی کێلان ف شُخم‌زنی.

**جوتیارۆك:** گوڵێکە پایزی ف گل حسرت.

**جوتێر:** جۆنکار، جوت بەندە، وەرزێر ف شخم‌زن، کشاورز.

**جوجاگە:** ئێسکی پشت گوێ ف استخوان پُشت گوش.

**جوُجك:** چێشکە، مەلیچك، چولەکە، پاساری ف گُنجشك.

**جوجوش:** میوانی، ناردوروٚن کە بۆژنی زەیستان لێ‌دەنێن ف اوماج.

**جوُجە:** ١) جوجە مریشك؛ ٢) باڵداری پچوك لە زمانی منداڵاندا؛ ٣) جانەوەرێکی بانکەڵەی سورە لە فەڵشنە دیوار دەژی ف ١) جوجۀ مُرغ؛ ٢) برنده کوچك به زبان بچه‌ها؛ ٣) ساس.

**جوُجەقۆرە:** گۆشت فرۆجی بەبەرسیلە لێندراو ف آش جوجه با غوره.

**جوُجەڵە:** جوچکی مەل کەتازە درهاتوە ف جوجۀ برنده.

**جوُجیلە:** جُوجەڵە ف جوجۀ پرنده.

**جوُچك:** ١) بێچوی مەل؛ ٢) بێچوی مریشك ف ١) جوجۀ پرندگان؛ ٢) جوجۀ مُرغ.

**جوچکە:** ١) ئێسکی سمت؛ ٢) بێچوی مەل؛ ٣) کلك ف ١) دنبالچه؛ ٢) جوجه؛ ٣) دُم.

**جوُچکەبڕیاگ:** ١) دوابڕاو، لەزارو زیچ بێ‌بەش؛ ٢) کلك قرتاو ف ١) مُنقطعُ النسل؛ ٢) دُم بریده.

**جوچکەلەقێ:** بریتی لە مەرایی‌و زمان لوسی‌کردن ف کنایه از چاپلوسی.

**جوحتك:** لوُسك. جوتە. لەقەهاوێژی ف جُفتك.

**جوحمە:** جۆعمە، هەینو، رۆژانینێ ف جمعه.

**جۆخ:** فاستونیا، پارچەی لەخوری بۆ کەواوپانتۆڵ ف فاستونی.

**جۆخۆرە:** زەردی وەری ف پرنده‌ای کوچك.

**جۆخین:** خەرمان. بێدەر؛ ٢) خۆبان، کلۆنی گێرە کراوی کۆم‌کراو ف ١) خرمن گندم؛ ٢) خرمن کوبیده و توده شده.

**جودا:** جیا. جگە. جیاواز ف جُدا، سوا.

**جۆدار:** گیاندار، زیندو ف جاندار.

**جۆداس:** گیایەکە لەجۆ دەکا ف گیاهی شبیه جو.

**جۆدان:** ١) ددانێکی ئەسپ کەلەپیری‌دا لوس‌دەبێ؛ ٢) گۆخڵ ف ١) از دندانهای اسب؛ ٢) شالیکار.

**جۆدانە:** جۆدان ف نگا: جۆدان.

**جودایی:** ١) جیاوازی؛ ٢) لێك دور کەوتنەوە ف ١) تفاوت؛ ٢) فراق.

**جۆدرەو:** ١) مانگی جۆزەردان؛ ٢) هەرەتی جۆدروێنەوە ف ١) خُرداد ماه؛ ٢) موسم درو جو.

**جۆر:** ١) تەرز، نەوع؛ ٢) نەحر، ناوا، رەوشت ف ١) نوع؛ ٢) روش.

**جوُر:** جۆر ف نگا: جۆر.

**جۆڕ:** ١) لوڕ، بن جلێکی پوش تێ ناخنراوە دەخرێتە سەرپشتی بارەبەر لەبن سەرجلەوە: (جل‌وجۆڕی قانرەکە بێنە)؛ ٢) خورجێن؛ ٣) پارچە بەرەی کۆن ف ١) قسمت انتهائی پالان؛ ٢) خورجین؛ ٣) کُهنه پلاس.

**جوراو:** جاوراو، جیاوباو، جاویاگ. جونراو ف خائیده.

**جۆراو:** ١) گۆرەوی؛ ٢) حەوزێ، کلاشی بن چەرم ف ١) جوراب؛ ٢) نوعی گیوه که کفه‌اش چرم است.

**جورجور:** نەوع نەوع، چەندنەرح ف جورواجور.

**جورعەت:** وره، ویران، هێزی دڵ ف جرأت.

**جۆڕك:** ١) توری کاو ناڵیك؛ ٢) خورجێن ف ١) توربۀ علوفه؛ ٢) خُرج.

**جوُرکردن:** رێك خستن، دروست کردن ف جورکردن.

**جۆڕکە:** تورەکەی ناڵف ف توربۀ علوفه.

**جورنە:** خەزێنە. حەوزۆکەی حەمام کە ناوی گەرمی بۆ خۆشتن تێدەکەن ف خزینۀ حمام.

**جورە:** ١) چوێلەکۆکێکە رەنگ بۆری ناماڵ زەرد؛ ٢) بازی نێر ف ١) چکاوك؛ ٢) بازنر.

**جورەپۆپنە:** باڵدارێکە لەچۆلەکە گەورە ترەو کاکۆڵی هەبە ف چکاوك.

**جورەجورە:** جۆربەجۆر، نەوع نەوع ف جوراجور.

**جورەش:** جۆرێك جۆبە رەنگی رەشە ف جو سیاه.

**جورە کلاونە:** جورەپۆپنە ف چکاوك.

**جورەنان:** خەبەردان ف گُزارش.

**جورێ:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.

**جوریان:** ١) گۆزان؛ ٢) زمان بەهەڵەدا چون ف ١) تغییر؛ ٢) اشتباه لفظی.

**جوز:** جوُز ف نگا: جوُز.

**جۆز:** گوێز، گردەکان ف گردو.

**جوُز:** ١) بز، پەنجە بەقنگەوە کردن؛ ٢) دەنگی سەماوەر ف ١) انگُلك؛ ٢) صدای سماور.

**جوُزان:** گوێزان، تیغی مۆتاشین، مۆس ف اُسترە، تیغ.

**جوُزپێوە کردن:** پەنجە بەقنگەوە کردن، سوك پێوە کردن ف انگلك کردن.

**جوُزە:** دەنگی زۆر باریك ف صدای بسیار نازك.

**جۆزەرد:** هەرەتی دروێنەی جۆ ف موسم درو جو.

**جۆزەردان:** ١) سێهەم مانگی بەهار؛ ٢) هەرەتی جۆزەردبون ف ١) خردادماه؛ ٢) موسم دروجو.

**جوُزەڵە:** توُزەڵە. چوُزەڵە ف مزمار.

**جوستوجۆ:** بەشوێن‌دا گەڕان ف جستجو.

**جوستە:** پەراوێزی لێفە. قەراغ لێفە ف حاشیۀ لحاف.

**جوسوجۆ:** جوست‌وجۆ ف جستجو.

**جۆش:** ١) کوڵ، فوڵنی ناوی گەرم؛ ٢) لەحیم، پێکەوە نوساندنی کانزا بەقەڵایی؛ ٣) پشکۆژی دار؛ ۴) زیپکەی دەم‌وچاو ف ١) جوش آب؛ ٢) جوش فلزات؛ ٣) غنچۀ درخت؛ ۴) جوش صورت.

**جۆشان:** ١) وەکوڵ هاتن، هاتنەکوڵ؛ ٢) فیچقەی ناو لە زەوی، هەڵقوڵین ف ١) جوش آمدن. غلیان؛ ٢) فوران.

**جۆشانن:** کوڵاندن. کەلاندن ف جوشانیدن.

**جۆشانە:** دەرمانی لەناو ناودا کوڵاو ف جوشانده.

**جۆش‌خواردن:** پێکەوەنوُسان بەهۆی لەحیم کردن ف جوش خوردن.

**جۆشدان:** ١) بریتی لەزۆر بەتین کردنی سۆبە؛ ٢) لەحیم کردن؛ ٣) وەکوڵ هێنان ف ١) کنایه از بسیار گرم کردن بُخاری؛ ٢) لحیم زدن؛

٣) بەجوش آوردن آب.

**جۆش سەندن:** ١) جۆش خواردنی ناو؛ ٢) بریتی لە گەرم‌بونی کۆڕی بەزم‌و موسیقا ف ١) بەغلیان آمدن؛ ٢) کنایە از گرم شدن مجلس رامشگران.

**جۆشن:** خۆتێ هەڵقولتێن. خۆزێك خەر ف چرب‌زبان.

**جۆشەك:** دوشەك، رابەخی ناو تێ‌خراوی نەرم ف تُشك.

**جۆشیان:** جۆشان ف نگا: جۆشان.

**جۆشیرە:** فەریکەجۆ ف جو نارسیدە.

**جۆشیلە:** جۆشیرە ف جو نارسیدە.

**جۆشین:** ١) کولێن، جۆشان؛ ٢) جۆرێ جۆ کەرەنگی ناماڵ شینە ف ١) جوشیدن؛ ٢) نوعی جو کە رنگش مایل بەکبود است.

**جۆشیو:** ١) کولیو، کولاو، کەلانی، کەلی؛ ٢) فیچقەکردو ف ١) جوشیدە؛ ٢) فوران زدە.

**جوعمە:** هەینی، جمحە، نین ف آدینە، جُمعە.

**جوغز:** جغز، جەغز ف دایرە.

**جوق:** کۆمەڵ، دەستە ف دستە، گروە.

**جوُقن:** لاوازی بێ‌هێز، جبقن ف مُردنی و بیجان.

**جوقنە:** مەلێکی بچکۆلەبە لەچۆلەکە پچوکتر ف پرندەای کوچك.

**جوُقە:** هەست‌و خوست، دەنگ‌و بزاو ف سروصدا.

**جوُقەوار:** خاوەن گیان‌و بەهەست: (هەی **جوُقەوار**تان بزێ) ف ذیروح، جاندار.

**جوُك:** ١) سوُك، جوُز، کلك بەقنگا کردن؛ ٢) جوگەی بچوکی ناو؛ ٣) دەنگی بەچکەمەل ف ١) انگُلك؛ ٢) جوی کوچك؛ ٣) صدای جوجە.

**جوُکان:** دەنگ لێوەهاتنی بەچکە مەل ف جیك‌جیك جوجە.

**جوُکاندن:** جوُکان ف جیك‌جیك جوجە.

**جوُکانن:** جوُکان ف جیك‌جیك جوجە.

**جوُك بیوە کردن:** قامك بۆقنگ بردن ف انگُلك کردن.

**جوُکن:** بەبوڵەوپرتە، نوُزەنوُزکەر ف غرولندکُن.

**جوُکە:** ١) دەنگی باریك، نوُزە؛ ٢) دەنگی بێچوی باڵدار ف ١) صدای نازك؛ ٢) جیك‌جیك جوجە.

**جوکەجوك:** دەنگی زۆری باریك ف جیك‌جیك.

**جوُکەنە:** گیاندان، گیانەلاو ف حال نزع.

**جۆگا:** جۆگەلەی ناو، جۆ ف جوی آب.

**جۆگە:** ١) جۆگا؛ ٢) هێڵەگ، موخل ف ١) جوی آب؛ ٢) الك آردبیزی.

**جۆگەلە:** جۆگا ف جوی آب.

**جۆگەنمی:** موی رەش‌و سپی پێکەوە، موی ماش‌و برنجی ف موی جوگندمی.

**جول:** ١) رەوانی ناو؛ ٢) جلە بارەبەر؛ ٣) تەشکەبەرە، بەلاس ف ١) جاری؛ ٢) جُل باربر؛ ٣) پلاس.

**جوُل:** ١) کەرکەمەر، کەربابەز؛ ٢) گیای جاوەلوُکە ف ١) قسمتی از گلە؛ ٢) علوفەایست.

**جوُڵ:** بزاو، دەگەڵ جم دەبێن: (هەر جم‌و **جوُڵ**یانە) ف حرکت.

**جوُلا:** بو زوتەن، شاڵ‌باف ف جولا، بافندە.

**جوُلاتەنە:** داوی جاڵ‌جاڵوکە، تالی کاکلەموشان ف تارعنکبوت.

**جوُلان:** بزونن، نەکان خواردن، جولان ف جنبیدن.

**جوُلان:** جوُلان ف جنبیدن.

**جوُلاندن:** بزاونن، بزواندن، نەکان‌پێدان ف جنباندن.

**جوُلاندن:** جوُلاندن ف جنباندن.

**جوُلاندنەوە:** جوُلاندن ف جنباندن.

**جوُلانن:** جوُلاندن ف جنباندن.

**جوُلانە:** ١) دەیدبك، لانکی لەگوریس‌و بەرۆ؛ ٢) گوریسی بەدارەوە کراو بۆ لێ‌نیشتن‌و رازاندن، دبلەکانی ف ١) ننو؛ ٢) تاب.

**جوُلانەوە:** بزونن، جوُلان ف جنبیدن.

**جوُلانێ:** لەگوریس نیشتن ف تاب‌بازی.

**جوُلاو:** بزونو، بزاونو، نەکان پێدراو ف تکان خوردە.

**جوُلایی:** سنعانی بوُزوچن، شاڵ‌بافی ف بافندگی.

**جوُلایی کەرە:** کاکلەموشان، جاڵجاڵوکە، بەسپەسەکەرە ف عنکبوت.

**جوُلك:** جوجەلە ف جوجە.

**جوُلگ:** جوُلا ف بافندە.

**جوُلگی:** جوُلایی ف بافندگی.

**جوُللانە:** جوُلانە ف نگا: جوُلانە.

**جوُلە:** ١) بزوتن، نەکان خواردن، جوُلە؛ ٢) جو، موسایی ف ١) جنبش؛ ٢) یهودی.

**جوُلە:** بزونن، تەکان خواردن ف جنبش.

**جوُلەکە:** نومەتی موُسا پێغەمبەر، موسایی ف یهودی.

**جوُلەمەرەسێ:** جۆرێك لەجوُلانە نیشتن ف نوعی تاب‌بازی.

**جوُلیان:** جوُلان ف جنبش.

**جوُم:** ١) جام، تاس، زەرك، قاپی مس؛ ٢) بزونن، جموجوڵ؛ ٣) قسەو جواب، دەگەڵ لام دەگوترێ: (من هیچ لام‌و **جوُم**م نیە) ف ١) طاس؛ ٢) جنبیدن؛ ٣) سخن پاسُخ.

**جوم:** ١) ناودز، کەنداڵێ ناو دای دزبوە؛ ٢) دەحل، قوبی، قامیشەلێن ف ١) آبکند؛ ٢) نیزار.

**جومالْ:** خاوێن کردنەوەی جوُگە لەقوڕو لینە ف لای‌روبی جوی.

**جومبوش:** بزوننی زۆر، جولانەوەی زیاد ف جنب‌وجوش.

**جومزانە:** جمك، زگەدوانە ف دوقلو.

**جومـگە:** بەنـدی ئێسـك، جەمسەری دوئێسکی بەیەکتر گەیشتو ف مفصـل.

**جوملانە:** ناواڵ دوانە، جمك ف دوقلو.

**جوُمە:** کراس، گوملك ف پیراهن.

**جوُمەز:** جوُگەلەی نێوان تەختەو کەرد ف جوی میان کردوها.

**جومەرد:** جوامێر، پیاگ خاس، نازا ف جوانمرد، رادمرد.

**جوُن:** ١) جاوین، جوُنن؛ ٢) جوێن، دژمان، سخێف، جنێو؛ ٣) ناونگی بەردین‌و دارین؛ ٤) جوُلـەکەن؛ ٥) دەس ناونگ ف ١) جویدن؛ ٢) دُشنام؛ ٣) هاون سنگی؛ ٤) یهودی هستند؛ ٥) دستهٔ هاون سنگی.

**خەڵتانە:** گیای ددان ناژن. گیایەکە لاسک ناسک وشکی دەکەن بۆ ددان ناژنین ف گیاه خلال.

**خەلستن:** رزگاربوُن، دەرچوُن و نەجات بوُن ف رهایی یافتن.

**خەلسك:** زەنگەنە نرێ ف نلسك انگور.

**خەڵف:** لکی یەك ساڵە، لقەداری ئەمساڵ ف جوانه، شاخهٔ یك ساله.

**خەڵفە:** بەردەستی وەستای پیشەساز ف دستیار اُستادکار.

**خەڵق:** ١) مەردم، عالـەم؛ ٢) دانیشتوو، ئەهل: (**خەڵقی کوێی؟**)؛ ٣) کەسی دیتر ف ١) مردم؛ ٢) اهل، ساکن؛ ٣) دیگر کس.

**خەڵقنۆ:** ئەی مەردم ف ای مردُم.

**خەڵقۆ:** خەڵقنۆ ف ای مردُم.

**خەڵقوخوا:** هەموکەس ف همهٔ مردم.

**خەڵقی:** کەسانی تر ف دیگر کسان.

**خەڵقینە:** ئەی مەردم، خەڵقۆ ف ای مردُم.

**خەڵك:** خەڵق ف نگا: خەڵق.

**خەڵكوخوا:** خەڵقوخوا ف خلق خُدا، مردم.

**خەڵكی:** خەڵقی ف کسان دیگر.

**خەڵكینە:** ئەی مەردم ف ای مردُم.

**خەلو:** سوکەڵەناوی خەلیل ف مُخفّف خلیل.

**خەڵوا:** بەدەست بانەوەکراو ف با دست پهن شُده.

**خەڵوتە:** ئەشکەوڵەت، بنەدیزەو گۆزەی شکاو، جێ خۆراکی سەگ و... ف سُفال شکسته، ظرف غذای سگ و...

**خەڵوز:** رەژی، رەژو، زوخاڵ، کومر ف زُغال.

**خەڵوزان:** رەژیدان، جێگەی رەژی، زوخاڵدان ف انبار زُغال، زُغالدان.

**خەڵوزدان:** خەڵوزان ف زُغالدان.

**خەڵوزە:** بەلایەکە بۆ شینایی و دەخڵ. گەڵا رەش هەڵدەگێڕێ ف آفتِ نباتی سیاه شدن برگها.

**خەڵوڵ:** ١) میچـه گوێلك، جگـه گوڵـك؛ ٢) بریتی لەزەلامی ناقـوڵا. زەبەلاح ف ١) قاپ گوساله؛ ٢) کنایه از گُندهٔ بدقواره.

**خەڵوە:** چلەکێشی، تەنیا رابواردنی سوفی بۆ چلەکێشان ف چله‌نشینی.

**خەڵوەت:** جێگەی بەتیایی ف جای دنج، خلوت.

**خەڵوەتخانە:** جێگەی چلەکێشانی پیر ف جایی که در آن چلّه نشینند.

**خەڵوەتی:** وچخانە، زۆری ئەرزاق، عەماری پشت زۆری رونیشتن ف پستو.

**خەلە:** دانەوێڵە، دەخڵ، دەغل ف غلّه.

**خەڵـەت:** ١) جوێن، سخێف؛ ٢) هەڵـە، سەهو؛ ٣) فریو ف ١) فحش؛ ٢) اشتباه؛ ٣) فریب.

**خەڵەتان:** فریوخواردن ف فریب‌خوردن.

**خەڵەتاندن:** فریودان، هەڵ فریواندن، دەسخەروکردن ف فریب دادن.

**خەڵەتانن:** خەڵەتاندن ف فریب دادن.

**خەڵەتاو:** نەفرەدراو، فریودراو ف فریب‌خورده.

**خەڵەتێن:** فریو دەر، نەفرەدەر ف فریبنده.

**خەڵەف:** ١) تیکوڵی دار؛ ٢) گەڵای دەوری گوڵی دار؛ ٣) فریو؛ ٤) ناو بۆ پیاوان ف ١) بوسنهٔ درخت؛ ٢) برگهای اطراف شکوفه؛ ٣) فریب؛ ٤) نام مردانه.

**خەڵەفاگ:** هەڵخەڵەتاو، خەڵەتاو ف فریب‌خورده.

**خەڵـەفـان:** ١) خەڵـەتان، فریودران؛ ٢) خەرفان ف ١) فریب خوردن؛ ٢) خرفیدن.

**خەڵەفاو:** ١) فریودراو؛ ٢) خەرەفیو ف ١) فریب خورده؛ ٢) خرفیده.

**خەلەفرۆش:** دانەوێڵە فرۆش، عەلاف ف غلّه فروش.

**خەڵەفیاگ:** خەرەفیو ف خَرَف شُده.

**خەڵەفین:** خەرەفان ف خرف شدن.

**خـەڵـەك:** ١) گەو، ئاڵقە؛ ٢) موی لێـك هاڵاو، موی سەری بەپێچ ف ١) حلقه؛ ٢) موی فرفری.

**خەلەکان:** گونـدێکی کوردستانە کە بەعسی وێرانی کرد. زێدی *ابن خلکانی بە ناو بانگە* ف نام روستایی که بەوسیله بعثیها ویران شد. زادگاه *ابن* خلکان.

**خەلەکوان:** خوڵەکەوە، مشکی، نۆزینە، بوڵ ف خاکستر.

**خەلەکە:** بازنەیەکی دارینە لە هەوجاردا ف از ابزار خیش.

**خەڵەڵە:** ١) خڕی لوڵەیی، خڕی لوڵەبی؛ ٢) لەلەی کێری براو ف ١) اسنوانه‌ای؛ ٢) جای ختنهٔ پسران.

**خەلەندۆر:** ١) گندۆر، فەلەندۆر، دۆربە؛ ٢) فرۆ ف ١) گیاهی است؛ ٢) آغوز.

**خەلەنگ:** گەزگەسك، گەزگەزك، گیابەکە پیاو ئەگەزێ ف گزنه.

**خەلیان:** نرازانی ئێسکی لەش ف از جا در رفتن استخوان.

**خەلیت:** تەربقەو بنناوو باروُت و چەشنی و پەڕۆی تفەنگی رەشۆکی ف ابزار و مواد تفنگ سرپُر.

**خەلیتە:** قەلادەی سەگ و تاژی ف قلّادهٔ سگ شکاری.

**خەلیش:** دارستانی چوغر، لێڕەواری بڕوچڕ ف جنگل انبوه.

**خەلێف:** پلوره، ماڵی مێشـەنگوین کە لە شوڵ دەیەنەن ف کندوی از ترکه ساخته شده.

**خەلێفان:** ناوی چەند گوندێکە لە کوردستان ف نام چند روستا در کردستان.

**خەلیفە:** ١) راسپاردەی شێخی تەریقەت لە بریکاری شێخ؛ ٢) سەرۆکی موسوڵمانان ف ١) خلیفهٔ پیر طریقت؛ ٢) خلیفهٔ مسلمین.

**خەلیلان:** ناوی هۆزێك و ناوچـەیەکی کوردستـانـە ف نام طایفـه و منطقه‌ای در کردستان.

**خەلیلە:** گیای دان ناژن ف گیاه خلال.

**خەلێلە:** دودڵی، بێ باوەڕ بوُن ف بدگمانی، شك.

**خەلیلی:** ١) جۆرێ هەنگوری سپی کە زونر پێی دەگا؛ ٢) زنجیری لاقی زینـدانـی. دەگەڵ کوت دەگونـرێ: (**کـوت و خـەلـیـلی**) ف ١) نوعی انگور زودرس؛ ٢) زنجیر پای زندانی.

**خەم:** ١) غەم، کەسەر؛ ٢) چەم، چەماو ف ١) غم، اندوه؛ ٢) خم.

**خەمازە:** داری فولایی ماسیان ف چوب قُلاب ماهیگیر.

**خەمان:** ١) زۆر کوڵ و کەسەر؛ ٢) خاڵەخەمە، مامەخەمە، کەسێ دەخەمی هەموکەس دابە؛ ٣) سوکەڵەی ناوی رەحمان ف ١) غم بسیار؛ ٢) دلسوز و غم‌خور همگی؛ ٣) مُخَفَّف عَبدُالرّحمن.

**خەماوی:** ١) خەمبار، دڵ‌تەنگ؛ ٢) کار بان کارەسانێك کە بیاو خەمگین دەکا ف ١) دل‌تنگ؛ ٢) مایهٔ دلتنگی.

**خەمبا:** خانەبا ف وَرَم اندام.

**خەمبار:** دڵ‌تەنگ، خەمگین ف غمگین.

**خەمتین:** کزبوونی ئاگر ف کم سو شدن آتش.

**خەمجوور:** فەمجوور، پوشانەو سەرانەی ماڵات بۆ ئاغاو دەوڵەت ف مالیات بر دام.

**خەمخوار:** ١) دڵ‌تەنگ؛ ٢) کەسێ کە خەم لەبیاو دەخوا، دڵسۆز ف ١) غمگین؛ ٢) غمخواره.

**خەمخۆر:** خەمخوار ف نگا: خەمخوار.

**خەمخۆرك:** قەڵشی زەوین لەبەر بێ‌ناوی ف ترك خوردن زمین از بی‌آبی.

**خەمخۆرکە:** خەمخۆرك ف ترك خوردن زمین از بی‌آبی.

**خەمخۆرە:** ١) مشورخۆرە، سەربەرستی دڵسۆز؛ ٢) شاهۆ. مەلێکە ف ١) سرپرست دلسوز؛ ٢) پرندهٔ بوتیمار.

**خەمخۆری:** ١) خەمخواردن، دڵ‌تەنگ بوون؛ ٢) سەربەرسنی کردنی دڵسۆزانە ف ١) غُصّه خوردن؛ ٢) غم‌خوارگی.

**خەمخەموك:** گوڵی رەر، شکۆفەی داری مێو ف شکوفه درخت انگور.

**خەمخەموکە:** خەمخەموك ف نگا: خەمخەموك.

**خەمرك:** کانی و شیناییی لەناو بیابان‌دا ف واحه.

**خەمرە:** ١) قوڵکەی ناو تێدا وەستاو؛ ٢) کوبەی زۆر زەلام ف ١) گودال آب؛ ٢) خُم بزرگ.

**خەمرەوێن:** ناوەدەنگی، وەرویزکە ف غم‌زُدا، مونس.

**خەمری:** ١) بەرچۆکە. پرچی سەرنویڵ؛ ٢) نویڵ پیچ. نەنی‌بەند ف ١) زلف روی پیشانی؛ ٢) پیشانی‌بند.

**خەمزە:** ١) نازی بەجاوان؛ ٢) ناوی گوندێکە لەشار بازیری کوردستان ف ١) غمزه و ناز؛ ٢) نام دهکده‌ای در کُردستان.

**خەمسار:** گوێ نەدەر بەکار، خوڵەکار بوێر ف لاابالی در کار.

**خەمشە:** ١) گوێ‌نەدان بەکار، خۆ گێل کردن؛ ٢) شەرمی ژن ف ١) اِهمال؛ ٢) شرمگاه زن.

**خەمشەبیر:** تۆز و دوکەڵی زۆر داوەستاو ف غُبار و دود نیره و راکد.

**خەمشەسەری:** ١) کاری بەنەمەڵی. کاری نابەدڵ؛ ٢) نەمەڵ و خۆگێل کەر لەکار ف ١) انجام کار با اهمال؛ ٢) بی‌رغبت به انجام کار.

**خەمگین:** خەفەت‌بار، مەینەت‌بار ف غمگین.

**خەمل:** ١) خشڵ، زەنبەر؛ ٢) رازانەوە؛ ٣) فەرساندن، بەراوەردکردن ف ١) زیوَر؛ ٢) آرایش؛ ٣) برآورد کردن.

**خەمڵ:** خەمل ف نگا: خەمل.

**خەمڵان:** ١) رازانەوە؛ ٢) فەرسان، بەراورد ف ١) آرایش؛ ٢) ارزیابی.

**خەمڵاندن:** ١) رازاندنەوە بە خشڵ و جلکی جوان، جوان کردن؛ ٢) قەرساندن ف ١) آراستن؛ ٢) برآورد کردن.

**خەمڵاندی:** خشڵ و جلی جوان دەبەر کراو، رازاوە ف آراسته.

**خەمڵانن:** خەمڵاندن ف نگا: خەمڵاندن.

**خەمڵاو:** ١) رازاوە، جوان‌کراو؛ ٢) بەراوردکراو ف ١) آراسته؛ ٢) برآورد شُده.

**خەمڵ کردن:** بەراورد کردن، قەرساندن ف ارزیابی کردن، تخمین زدن.

**خەملی:** جوان‌کراو، رازاوە ف آراسته.

**خەمڵین:** خەمڵان ف نگا: خەمڵان.

**خەمڵێن:** ١) رازێنەوە، جوانکەر؛ ٢) قەرسێن، بەراوردکەر ف ١) آرایشگر؛ ٢) براوردکُننده.

**خەملینوك:** رازێنەوە ف آرایشگر.

**خەمڵیو:** خەمڵاو ف نگا: خەمڵاو.

**خەمناك:** خەمبار ف غمناك.

**خەمۆ:** ١) بەخەم بۆ هەموکەس؛ ٢) ناوەبۆ پیاوان ف ١) شریك غم دیگران؛ ٢) اسم مردانه.

**خەمۆر:** بەزی دەم‌وچاو سپی و رەش ف گوسفند رخسار سپید و سیاه.

**خەمۆش:** بێدەنگ، وسکوت ف خاموش، ساکت.

**خەمە:** خەمۆ ف نگا: خەمۆ.

**خەمەخۆرە:** شاهۆ، خەمخۆرە، شاوەشبنکە ف بوتیمار.

**خەمەگڕ:** خم‌خموك، فم‌قموك، سەرمازەلە ف وزغ.

**خەمیر:** هەویر، ناردی لە ناوکراوی شێلدراو بۆ نان ف خمیر.

**خەمین:** مەینەت‌بار، دڵ‌تەنگ ف غمگین.

**خەن:** ١) گەردن، مل، نەستۆ، نەوك؛ ٢) کەن، بێکەنین، کەنین، خەنە ف ١) گردن؛ ٢) خنده.

**خەنازیر:** کوانی زل کە لە مل دێن ف خنازیر.

**خەنازیل:** خەنازیر ف خنازیر.

**خەنان:** پشکوتو، بشکفتی ف شکفنه، بازشُده.

**خەناوك:** گەردن‌بەند، ملبوانە، ملوانە، ملوانکە، گەردانە ف گردن‌بند.

**خەناوکە:** خەناوك ف گردن‌بند.

**خەنجوك:** خەنجەر ف خنجر.

**خەنجەر:** کێردی درێژی خواری دەسك‌دار کە بیاوان دەبەر خۆیانی زادەکەن ف خنجر.

**خەنجەربازی:** گەمە بەخەنجەر کردن ف خنجر بازی.

**خەنجەرباڵە:** کەندەسمە، مێش خۆرە. مەلێکە باڵی لەخەنجەر نەکا ف پرنده‌ای با بالهائی شبیه به خنجر.

**خەنجەر دەم:** دارکونە، دارنەقێنە ف دارکوب.

**خەنجەردەمە:** خەنجەردەم ف دارکوب.

**خەنجەرە:** گیابەکە وەك فاسولیادەچێ کە لوی هەیە ف گیاهی است.

**خەنجەرەدەمە:** جۆرێ کولە، جسنە کللۆبەکە کلکی خوارو درێژە ف نوعی مَلَخ دم‌بُلند و کج.

**خەنجەلیس:** گیابەکە بنەکەی دەخۆن ف گیاهی است که پیاره‌اش را

می‌خورند.

**خەنجێر:** خەنجەر ف خنجر.

**خەند:** قەن، فەند، شەکری تۆلاّبەستو ف قند.

**خەندخەندوك:** کوکەزەشە، خروزەك ف خروسّك.

**خەندقان:** خنکان، پشو لێبڕان، هەناسە نەمان ف خفەشُدن.

**خەندقاندن:** خنکاندن، پشولێبڕ ین ف خفەکردن.

**خەندقین:** خەندقان ف خفەشدن.

**خەندۆر:** خەرەند ف نگا: خەرەند.

**خەندەران:** دەم بە پێکەنین و روخوش ف همواره شاد و خندان.

**خەندەق:** خەرەند، کەندالی هەلکەندراو ف خندق.

**خەندەق دانەوە:** هەلکەندنی خەندەك ف کندن خندق.

**خەندەك:** خەندەق ف خندق.

**خەندەك دانەوە:** خەندەق دانەوە ف کندن خندق.

**خەنزار:** نابڕوتکاو، شەرم نەماو ف رسوا.

**خەنزاری:** بەشوُرەیی، بێ نابڕوبی ف رسوایی.

**خەنزراندن:** هەلکزاندنی موی سەروپێ ف موی کلّەپاچە را بر آتش گرفتن.

**خەنزربن:** خەزربن ف نگا: خەزربن.

**خەنوك:** ۱) تاژی پیر کە ناگاتە کە رویشك؛ ۲) گوێ نەدەر بە کار ف ۱) تازی پیر کە بە شکار نرسد؛ ۲) اهمال‌کار.

**خەنۆل:** خەندەران ف بشّاش و خندان.

**خەنە:** ۱) کەن، پێ کەنین، خەنین؛ ۲) گیای رەنگی دەست و پێ و سەری ژنان ف ۱) خندە؛ ۲) حّنا.

**خەنەبەندان:** کوبوُنەوەی شەوی پێش بوُك بردن، کە خەنە دەگرنە دەستی بُوك و کیژان ف مراسم شب قبل از عروسی.

**خەنەتیفك:** کرێژەبەرد ف گُل سنگ.

**خەنەران:** خندەران ف همواره خندان.

**خەنەك:** ۱) خەندەك، خەرەند؛ ۲) خەنوك ف ۱) خندق؛ ۲) نگا: خەنوك.

**خەنەکچان:** برێنی لە داوێن پاکی، بێ گوناحی ف کنایە از پاك دامنی.

**خەنەل:** بزنی شان‌وپیل بەرەنگی خەنە ف بزی کە موهای شانەاش حنایی باشد.

**خەنی:** ۱) بەئارەزو گەیشتو، کامەروا؛ ۲) پێکەنی، کەنی ف ۱) کامران، کامیاب؛ ۲) خندید.

**خەنیسم:** ۱) دوژمن؛ ۲) دۆستی فاسقی ژنی کەسێك ف ۱) دشمن؛ ۲) معشوق زن شوهردار.

**خەنیکە:** ۱) قایشی تیر؛ ۲) شێوی شلەساواری ورد ف ۱) بوغ بند؛ ۲) آش بلغور ریز.

**خەنیلە:** پیرخەنیلە، چێشتی وردەساواری نراو ف آش بلغور ریز.

**خەنین:** کەن، کەنین، پێخەنین ف خندیدن.

**خەنینەوە:** تریقانەوە، پێکەنینی بەقەو ف خندە با صدای بُلند.

**خەو:** ۱) نوستن، دژی بێداری؛ ۲) خەون، شتێ کە لە خەوا دەیبینێ ف ۱) خواب؛ ۲) رؤیا.

**خەواتەمار:** خەوی زۆر گران ف خواب بسیار سنگین.

**خەوار:** ۱) کەسێ زۆر دەخەوێ، ئەوی زیاد دەنوێ؛ ۲) تەنبەل، تەمەل ف ۱) پرخواب؛ ۲) تنبل.

**خەوارە:** هۆزێکی کوردە لە کوردستان ف عشیرەای کرد.

**خەوالو:** چاو بەخەو، کەسێ لەخەو هەستابێ بەلام خەو بەری نەدابێ ف خواب‌آلودە.

**خەواندن:** ۱) نواندن، دەخەوکردن، خەفاندن؛ ۲) نەواندن، چەماندن ف ۱) در خواب کردن؛ ۲) بر زمین خوابانیدن.

**خەوبردن:** لەخەو کردن، خەولێ ساندن ف از خواب محروم کردن.

**خەوبردنەوە:** دەخەو ڕاچون، خەولێ کەوتن، بەرانبەری بێدارمان ف بەخواب رفتن.

**خەو بەسەرچوُن:** لەخەوالوبی فوناربون ف از خواب‌آلودگی رستن.

**خەوبینین:** خەو دیتن، لەخەودا دیتنی شت ف خواب دیدن.

**خەوپەڕین:** خەو بەسەر چوُن، نەمانی خەوالویی ف خواب از چشم پر بدن.

**خەوپەڕێن:** کارێ یان شتێ کە داهێزانی خەو ناهێلێ ف از بین برندهٔ خواب.

**خەوتن:** ۱) نوستن، چوُنەخەو، رازان؛ ۲) درێژبوُن، خولەگەزدان ف ۱) خفتن؛ ۲) دراز کشیدن.

**خەوتنان:** ماوەیەك دوای نوێژی شێوان، شەو کانی خەوتن ف عِشاء.

**خەوتوُ:** خەفتگ، نڤستی ف خوابیدە.

**خەوتە:** خەوخەو، خەوخوش ف خوش‌خواب.

**خەوتەقین:** خەوزڕان، خەوپەڕین ف خواب پر بدن.

**خەوڤخان:** وەرەزو ـــــت بون ف ـــت شدن.

**خەو خوش:** خەوگران، خوش‌خەو ف گران‌خواب.

**خەوخەو:** کەسێ زۆر دەخەوێ ف کسی کە زیاد می‌خوابد.

**خەوداگرتن:** خەو بەسەردا هانن، هێرش هێنانی خەو ف سخت خواب گرفتن.

**خەودیتن:** رابردەی دەمی نوستن ف خواب دیدن.

**خەور:** ۱) لێلایی؛ ۲) دنیای بەتەمو مژ؛ ۳) ژەنگی تەنکی سەر ئاوێنە ف ۱) کدر؛ ۲) فضای مه‌آلود؛ ۳) زنگار آینە.

**خەو روژك:** بەسەرهاتی بە درو گێڕانەوە ف تعریف سرگذشت دروغین.

**خەورەوین:** خەوپەڕین، خەوتەقین ف خواب‌پر بدن.

**خەورەوێن:** خەوپەڕێن ف سبب پر بدن خواب.

**خەو زڕان:** خەوپەڕین، لەخەو بێ‌بەش بوُن ف بی‌خواب شدن.

**خەو زڕین:** خەوزڕان ف بی‌خواب شدن.

**خەوزڕێن:** خەوپەڕێن ف سبب پر بدن خواب.

**خەوسوك:** لەخەوا لەسەر هەست، بەرانبەری خەوگران ف سبك خواب.

**خەوش:** ۱) عەیب، کەمایەسی، خەش: (وەك زێری بێ‌**خەوش** وایە)؛ ۲) دەنکی چروك و بێگانە لەناو دەغلدا؛ ۳) خنل، زەنبەر ف ۱) دَغل؛ ۲) دانەهای ناباب در غلّە؛ ۳) زبْر.

**خەوشێ**: ناوە بۆژنان ف نام زنانە.
**خەوقورس**: خەوگران، بەرانبەری خەوسوك ف سنگین خواب.
**خەوگا**: جێ‌خەو ف خوابگاه.
**خەوگران**: خەرخۆش، کەسێ کەدێر لەخەو هەڵدەسێ ف گران خواب.
**خەوگرتن**: ١) خەوداگرتن: ٢) خەولێ‌ساندن، بێ‌بەش کردن لە نوستن ف ١) سخت خواب گرفتن: ٢) از خواب محروم کردن.
**خەول**: گلار، گل، تل، خلۆر ف غلت، تلو.
**خەولان**: گلاربوونەوە، خلۆربوونەوە، تل‌خواردن ف غلتیدن.
**خەولاندن**: تلۆر کردنەوە ف غلتانیدن، غلت‌دادن.
**خەولێ**: زەحف، زاف، فربە، گەلەك، خەیلێ، فرە ف بسیار، خیلی.
**خەولێ کەوتن**: دەخەو ڕاچوون، نقستن، چاوچوونە خەو ف بەخواب رفتن.
**خەومەت**: خزمەت، کاربۆکردن ف خدمت.
**خەون**: شتانێ کە لە خەوا دەبینرێن ف رؤیا.
**خەونامە**: کتێبی خەون لێکدانەوە ف کتاب تعبیر خواب.
**خەون دیتن**: دیتنی شتان لە خەودا ف خواب دیدن.
**خەونوچکە**: وڕێنگ، وێڕینگ، وەنەوز ف بینکی.
**خەونی ئالۆز**: خەوی بێ‌سەروبەر، پەرێشان ف خواب پریشان.
**خەووك**: ١) خەوخەو، کەسێ کە هەمیشە کەیفی لە خەوتنە: ٢) گایەك کە لەکاتی کاردا دەخەوێ، خەفۆك ف ١) همیشە آرزومند خواب: ٢) گاوی کە هنگام شخم‌زنی بخوابد.
**خەوهاتن**: ئیشتیا لە نوستن بوون ف خواب‌آمدن.
**خەوەکوتکێ**: خەوەنوچکە ف بینکی.
**خەوەنوچکە**: خەونوچکە ف بینکی.
**خەی**: ١) وشەی خۆشەویستی، گیانە: ٢) وشەی هانەدان: (**خەی** ئەم‌کارە بکە)؛ ٣) چەند خۆشە، ئۆخەی: ۴) ئافەریم ف ١) کلمهٔ دوست‌داشتن: ٢) کلمهٔ تشجیع: ٣) چە خوش است: ۴) آفرین.
**خەبات**: جل‌دوو، بەرگ‌دوو ف خیّاط.
**خەباتە**: ١) گشتەکی ئاوریشم: (زولفت **خەیاتەی** خاوە): ٢) سوورەسافە، زەرنەقوونە، بەچکە مەلیچکی توك لێ‌نەهاتگ ف ١) نخ تاب‌دادهٔ ابریشمی: ٢) جوجە گنجشك پر درنیاوردە.
**خەباتەکێش**: دەرزی تایبەتی بۆ خەیاتە ف نوعی سوزن ویژهٔ نخ تاب دادهٔ ابریشمی.
**خەباتی**: پیشەی جل‌دوو ف خیّاطی.
**خەبار**: هاروێ، تارو، تاروێ ف خیار.
**خەیارچەمبەر**: بەری گیایەکە بۆدەرمان دەشێ ف از گیاهان دارونی.
**خەیارچەمەر**: خەیار چەمبەر ف از گیاهان داروئی.
**خەیار دیمی**: گوژاڵك ف هندوانهٔ ابوجهل
**خەبارشنگ**: خەبار چەمەر ف از گیاهان دارونی.
**خەیاروك**: قونێر، جۆرێ کوانە کە زۆرتر لەقون و لاڕان دێت ف نوعی دُمّل.
**خەیارە**: خەیاروك ف نوعی دُمّل.
**خەیارەك**: خەباروك ف نوعی دُمّل.
**خەیاڵ**: ١) فکر، بیر، هزر: ٢) شتی نەشیاو ف ١) فکر: ٢) محال.
**خەیالات**: ١) بیر و هزری زۆر: ٢) دەبیرەوە چوون: ٣) فکری دوور و نەشیاو ف ١) افکار زیاد: ٢) در فکر فرورفتن: ٣) امر محال و ناممکن.
**خەیاڵی**: شتێ کە نەبووە و بەخەیاڵ دروست‌کراوە: (ئەم چیرۆکە **خەیاڵیە**) ف خیالی، افسانە.
**خەیان**: غەبان، بەروالەت دۆستی ناڕاست ف خائن.
**خەیانن**: خاباندن، ماوەبردن ف گذشت زمان.
**خەیانەت**: ناڕاستی لە دۆستیدا، غەدر، غەبانی ف خیانت.
**خەیب**: ئیوار، نادیار ف غیب.
**خەیبی**: نادیاری، بەرئیوار، نەلەبەرچاو ف غیبی.
**خەید**: ١) تووڕەیی، رك، رق: ٢) دەی‌خا، ئەی‌خات ف ١) خشم: ٢) می‌اندازد.
**خەیدۆك**: هەمیشە تووڕە و رك هەستاو ف همیشە عصبانی.
**خەیدی**: تووڕە، رك‌هەستاو، قەڵس ف خشمگین.
**خەیدین**: تووڕەبوون، قەڵس‌بوون، رق‌هەستان ف خشمگین شدن.
**خەیر**: ١) جگە، بێجگە: ٢) نە، نا، نەخێر ف ١) جز: ٢) خیر، نە.
**خەین**: جگە، بێجگە، بەجگە، جیالە ف بجز.
**خەیوور**: بەناموس، ناموس پارێز ف غیرتمند، غیور.
**خەیویر**: هەویر، خەمیر ف خمیر.
**خی**: خەریك‌بوون، مژولی ف سرگرمی، اشتغال.
**خێ**: ١) هەشتەم پیتی ئەلف و بێکە: ٢) خوێ، خوا، نمەك: ٣) ئەریت، خوو: ۴) قێ، نەخۆشی خۆداری: ۵) ئارەقەی لەش، خوە ف ١) حرف «ح» در الفبا: ٢) نمك: ٣) خوی و روش: ۴) بیماری صرع: ۵) عَرَق بدن.
**خیا**: پێ‌دانی وشتر: (هێشترێ **خیا** بکە) ف بر زانو نشاندن شتر.
**خێ‌بەندان**: خوێڵێن، جێگەی خوێ لەدەم زەریا ف نمکزار.
**خیپ**: ١) کەل و بەلی قالگرەوە: ٢) بەردی نوك‌تیژی گەورە ف ١) ابزار رمّالی و فالبینی: ٢) صخرهٔ نُك‌تیز.
**خیپشنە**: کورتەبالای قەڵەو ف کوتولهٔ چاقالو.
**خیپشە**: باوەعەمرە، جلەتۆك، باواقورەت ف کوتولە.
**خیپك**: فالگرەوە، ئالحبین ف فالبین.
**خیت**: ١) جغز لە زەوی. بۆ سوێنددان *کە لەتاوبە زیدبە کاندا باوە*: ٢) تەریقی، خەجاڵەتی: ٣) خوێڕی، بێکارە ف ١) دایرهٔ بر خاك رسم شدە: ٢) شرمندگی: ٣) بی‌غرضە.
**خێت**: خەت، کێز، شوێن کێشان لەزەوی یان لە قاقەز ف کشە.
**خیتك**: وان، ئارەزو، هەوەس ف آرزو، هوَس.
**خیچ**: ١) فرو، زەکی کولاو: ٢) خەت لە قاقەز یان لە زەوی: ٣) هێڵی جووت، خەتی جووت: ۴) خوێل‌خێل: ۵) لار، خوار، چەوێل، چەوت، چەفت: ۶) خوشك، خوچ، خوار: ٧) بوج و بۆك: ٨) خیچ، بۆ لێخورینی مالاتی بەرز، ف ١) آغوز: ٢) کشە: ٣) اثر شخم‌زنی: ۴)

لوچ؛ ٥) کج؛ ٦) خواهر؛ ٧) پوك؛ ٨) واژه‌ای برای راندن گاو.

**خێچ**: لارو خوار، چەفت ف کج.

**خیچان**: دۆڕان لە کایەدا ف باختن بازی.

**خیچاندن**: بەزاندن لە کایە دا ف شکست دادن در بازی.

**خیچاو**: دۆڕاو، دەرکراو لە کایەدا ف بازنده.

**خیچك**: بەردی بازەڵێن، قوچك فەمچان ف شن‌های بەقول‌دوقول.

**خێچ‌وپاچ**: قیچەڵ‌فاچ، خوارو خێچ ف کج‌وکوله.

**خێچ‌وخوار**: خێچ‌وپاچ ف کج‌وکوله.

**خێخ**: زبر، زۆر، ناڵوس ف زبر.

**خیخك**: شبنوك، جۆری قەزوانی ورد ف نوعی چانلانفوش.

**خێدار**: فێ‌دار، نۆشی نەخۆشی فێ ف صرعی.

**خێ داری**: نەخۆشی فێ‌داری ف بیماری صرع.

**خێـر**: ١) کاری چاکـە؛ ٢) گـۆشتی بەخشینـەوە بەسـەر هەژارانـدا؛ ٣) وەرامی ناقابلی، نە، نا؛ ٤) قازانجی سەودا؛ ٥) خەت؛ ٦) سوێر ف ١) مُقابل شرّ، خیر؛ ٢) گوشت خیرات؛ ٣) نه، خیر؛ ٤) سود مُعامله؛ ٥) کشه؛ ٦) شور.

**خێرا**: ١) بلەز، بەپـەلە؛ ٢) بەبێ، خۆش‌ڕۆ لەرێگە؛ ٣) مەزبوت‌و چالاك لەکار ف ١) باعجله؛ ٢) بادپا؛ ٣) چُست‌وچالاك.

**خێرات**: ئەوشتانە بەچاکە لەڕای خودا دەدرێن ف خیرات.

**خێرات خانە**: هەژارخانە، جێ بە خێو کردنی بەك کەوتان ف نوانخانه.

**خێراتن**: بەخێرهێنان، بەخێرانن ف خوشامدگویی.

**خێراقك**: سوێراو، ناوی شۆر، کانیاوی سوێر ف آب شو

**خێراندار**: خاوەن چاکە ف صاحب احسان.

**خێراو**: ناوی ساردی خواردنەوە بە بەلاش ف آب سرد خیر به.

**خێرایی**: مەزبوتی، گورج‌و گۆڵی، بەگورجی ف چستی، چالاکی.

**خێرتە**: ١) بەباری فەت نە کێڵدراو؛ ٢) ناوی گوندێکە لە کوردستان ف ١) زمینی که هیچ وقت کاشته نشده باشد؛ ٢) نام روستایی است.

**خێرخوا**: چاکەکار ف خیرخواه.

**خێرخواز**: خێرخوا، چاکەکار ف خیرخواه.

**خێرخێر**: وێرێ، فوماشی خەت‌خەت ف پارچهٔ راه‌راه.

**خێردار**: بە بەرەکەت، بەقازانج ف دارای برکت.

**خێردانەوە**: بەهرەدان‌و زەوو زوکردنی ماڵانی کڕدراو ف سودبخشی دام خریداری شُده.

**خێردەرەوە**: ماڵـێکـی کڕاو کە بەهـرە زۆر بدات ف خریده‌ای که سودبخش باشد.

**خێردیتن**: بەهرە پێ‌گەیشتن ف سودبردن.

**خیرك**: خۆرە، نەخۆشیەکی پیسە ف بیماری آکله، خوره.

**خێرکار**: خێرەومەند ف نیکوکار.

**خێرکردن**: ١) بەخشین بەپیاوەتی‌و بێ قەرەبو؛ ٢) قازانج لەسەودا بردن ف ١) احسان کردن؛ ٢) سودبردن از معامله.

**خێرو**: خوێڕی، بێکارە، خۆڕێ، هیچ لەدەست نەهاتگ ف بیکارهٔ بی‌ارزش.

**خێرۆ**: خێرۆك ف نگا: خێرۆك.

**خێروبێر**: خێر و بەرەکەت ف خیر و برکت.

**خێرۆك**: دەخـڵێ لەنـوێی ڕژاوی پارهەڵی دابێنـەوە ف غلّه‌ای که از تخم‌های پراکندهٔ سال پیش روید.

**خیرە**: فالگرەوە، تالح‌بین، فاڵجی ف فالبین، رمّال.

**خێرهاتن**: بەخێرانن، خێرانن ف خوش‌آمدگویی.

**خیـرەت**: ١) ئازایی؛ ٢) پیـاوەتـی؛ ٣) نامـوس ف ١) شجـاعـت؛ ٢) مردانگی؛ ٣) ناموس.

**خێرەومەن**: چاکەکار، بەخشندە لەڕای خودا ف نیکوکار.

**خێرەومەند**: خێرەومەن ف نیکوکار.

**خێرەودەر**: خێر دەرەوە ف خریدی که سودبخش باشد.

**خێڕی**: خوێڕی، خۆڕی ف بیکاره و بی‌ارزش.

**خیز**: ١) زیخ، چەو، ورکەبەرد؛ ٢) حیز، گاندەر؛ ٣) ترسەنوك، ترسنۆك، ترسـونـەك؛ ٤) جۆرێ کڵاوی پیاوان؛ ٥) جێگەی خلیسکان ف ١) شن؛ ٢) نگا: گاندەر؛ ٣) ترسو؛ ٤) نوعی کلاه مردانه؛ ٥) جای لیز.

**خێـز**: ١) زۆرك، دەشتی بەکـەندو بڵنـدایی، زەوی بەگردولکەو قوڵکە؛ ٢) خشڵ‌و زەنبەر؛ ٣) نۆراو، زبر، زۆیر؛ ٤) نۆران، رەنجان، زیزبوُن؛ ٥) هێڵ، خەت، کێز؛ ٦) خۆشـانـدان: (خاڵان خێزیان کرد) ف ١) نیّماهور؛ ٢) زیور؛ ٣) رنجبده؛ ٤) رنجش؛ ٥) کشه؛ ٦) نمایان شدن، آشکارگشتن.

**خیزار**: گردەبڕ، شەقەمشار، هەرەی زەلامی دوکەسی ف ارّهٔ دونفره.

**خیزاف**: زوخاو، کێم‌و خوێنی برین ف ریم‌و خون زخم و دُمّل.

**خیزان**: خیزاف ف ریم و خون زخم و دُمّل.

**خێـزان**: ١) ماڵ‌و منداڵ؛ ٢) نان‌خۆری مـاڵ؛ ٣) کەبوانو، ژن بۆ مێـرد؛ ٤) هەژارو نەدار؛ ٥) حەکیمی فێ‌داران ف ١) زن و بچـه؛ ٢) افراد خانواده؛ ٣) زن نسبت به شوهرش؛ ٤) فقیر؛ ٥) طبیب بیماری صرع.

**خێزاندار**: خاوەنی نان‌خۆری زۆر ف عیالوار.

**خێزاو**: ١) هەڵکشـانی ناوی چەم‌و دەریا بەهۆی مانگەوە؛ ٢) شەپۆلی چکۆڵەی چەم ف ١) مدّ دریا و رودخانه؛ ٢) موج کوچك.

**خیزخـۆر**: بەسێن، گوێ چەم کە لاقـاوی لەسـەر کێشـاوەتەوە ف کنار رودخانه که سیل از آن فروکش کرده.

**خێزك**: جەغز، جغز ف دایره.

**خیزە**: ١) خبگە، هیزە، هێسنەی رۆن‌نێکودن؛ ٢) نبخە، دەنگ لەسنگەوە هاتنی نەخۆش ف ١) خبك؛ ٢) خش‌خش نفس بیمار.

**خیزەر**: لکی‌تازە دەرچوی دار ف شاخهٔ تازه برآمدهٔ درخت.

**خیزەرە**: هەڵاش، چرپی‌و پوشی سەرداری ڕاو ژێر قورەبان ف انبره.

**خیزەرە**: بەشـوێن بەکنـردا هاتنی زینـدوی لەش: (نـەسپێ خێزەرەی بەستبو) ف از... هی حشرات بر تن آدمی.

**خیزەلان**: شوێنێ کە زیخ‌و چەوی زۆرە ف شنزار.

**خێـزیـان**: ١) هەستان، ڕاستەوەبوُن لەبەر بەکێك، ئاخێز کردن، ڕابوُن؛ ٢) هەراس‌بوُن، بالاکردن ف ١) برخاستن؛ ٢) نمو کردن.

**خیس**: ۱) روگرژ، روناخوش؛ ۲) نیخەنیخ [ف] ۱) ترش‌رو؛ ۲) خش‌خش سینه.

**خیس**: ۱) دەم‌و لموس خوار؛ ۲) مل خوار [ف] ۱) کج دهان؛ ۲) گردن کج.

**خیسار**: خوُس، خوسار، زوقم [ف] بژ، سرماریزه.

**خیسکە**: یاری وردی جاندن [ف] بباز کاشتنی.

**خیسە**: ۱) بەگوشەی چاوڕوانین بەنوُرەیی؛ ۲) ناوڕدانەوە هەر بەمل [ف] ۱) چشم آغیل؛ ۲) سر برگردانیدن.

**خیسەخیس**: نیخەنیخ، خرخری سینە [ف] خش‌خش سینه.

**خیسەلان**: خلیسك، شوُناسەمتین [ف] لیزگاه.

**خیش**: ۱) شەنـەی دەم بەفـولاب کەشـنی گرانی لەلای سەرەوەبێ دادەگـرن؛ ۲) راکیشـان، بەزەویداکشـان؛ ۳) وە دەرەسـگ کەوىن [ف] ۱) جنگك مخصوص پائین آوردن جسم سنگین؛ ۲) بر زمین کشیده شدن؛ ۴) دیر شدن.

**خیشاندن**: وە دەرەنگ خستن، تەمەلی کردن [ف] اهمال کردن.

**خیشك**: نەختەی رێك‌و لوُس کردنی شیوەرد [ف] ماله صاف کردن شُخم، هبد.

**خیش کردن**: پیش خواردنەوە [ف] از شدت خشم لب فروبستن.

**خیش کردن**: بەسەر زەویدا راکیشان [ف] بر زمین کشیدن.

**خیشکە**: لەسەرقنگ خزین [ف] بر باسن حرکت کردن.

**خیشەخیش**: هەناسە سواری [ف] نفس‌نفس زدن.

**خیشەخیش**: بەنهێم کشان بەسەر زەویدا [ف] کشان‌کشان.

**خیشی**: خەشە، جەوالی لەمو [ف] جوال از کُرك بافته.

**خیف**: ۱) یالاکردن، هەراش بوُن؛ ۲) نوُبەرە، بالانە؛ ۳) شنی نادیاری؛ ۴) تالە [ف] ۱) رشد، بالندگی؛ ۲) نوبر؛ ۳) غیب، ناپیدا؛ ۴) طالع.

**خیفزان**: فالچی، تالح‌بین [ف] فالبین.

**خیفە**: نوُبەرە، خیف [ف] نوبر.

**خیڤ**: ۱) بیرتیژی بلیمەت؛ ۲) حیساب [ف] ۱) باهوش؛ ۲) حساب.

**خیڤزان**: حسابگەر [ف] حسابگر.

**خیڤك**: بیهوش و گێلوکە [ف] هالوی فراموشکار.

**خیڤە**: خیفە، خیف، بالاتە، نوُبەرە [ف] نوبر.

**خیگ**: ۱) هیزە، خیزە، پێستەی زوُن؛ ۲) بەراز، وەراز، خوُ [ف] ۱) خیگ؛ ۲) خوك.

**خیگوُلکە**: ۱) کودەلە، بەچکەوەراز؛ ۲) هیزەی بچوك [ف] ۱) بچه خوك؛ ۲) خیگ کوچك.

**خیگە**: هیزە، خیزە، پێستە بوزوُن [ف] خیگ.

**خیگەلە**: خیگوُلکە [ف] نگا. خیگوُلکە.

**خیل**: جاوخوار، خویل [ف] لوچ.

**خێل**: کوُمەلی هەوارچی؛ ۲) هوُز [ف] ۱) گروه چادرنشین؛ ۲) عشیرت.

**خێلات**: خێلی زوُر، رەوەند [ف] ایلات.

**خیلاف**: ۱) درو، ناڕاسـت؛ ۲) کیشەو نیوان ناخوشی [ف] ۱) دروغ؛ ۲) مُخالفت.

**خیلانـگ**: درکێکە بوُ ئاگر کردنەوەی دەبەن [ف] خاری است که برای سوزاندن مورد استفاده دارد.

**خیلتان**: ئەو گیابەی ددان تاژنی لێ دەکار دەکەن [ف] گیاهی است که از آن خلال دندان می‌سازند.

**خیلونگ**: خیلانگ [ف] نگا: خیلانگ.

**خێلی**: ۱) روُبەند، یەچە، پوُشی، روپوش؛ ۲) سێبەرو تەم؛ ۳) نەخوشی چاوخـواری؛ ۴) ئارای پوُك [ف] ۱) روبـنـد؛ ۲) سایه و مه؛ ۳) چشم‌چپی؛ ۴) پارچهٔ قرمزی که روی صورت عروس می‌کشند.

**خیم**: ۱) بنـاغە، هیم، بنچینەی خـانو؛ ۲) گـولمیخی لەدار، سنگ؛ ۳) رەچـەلـەك، بنچە، نوُرەمە، نەژاد، رەگەز [ف] ۱) اساس؛ ۲) میخ بزرگ چوبی؛ ۳) نژاد، اصل.

**خێم**: سەربەرە ژێری، سەرنشیو [ف] سر بزیر.

**خین**: خوین، خوُن، هوُن [ف] خون.

**خێن**: ۱) خین؛ ۲) پاشگری بەوانا، خویندەوارو خویندن: (دەرس خێن، رەش‌خێن)؛ ۳) جگە، بێجگە [ف] ۱) خون؛ ۲) پسوند به‌معنی خواندن و خواننده؛ ۳) بجُز.

**خینالی**: خویناوی [ف] خون‌آلود.

**خینج**: جگە، بل، غەیر [ف] بەغیراز، بەجز.

**خیندار**: خوینەخوُ، دژمنی خوینی [ف] دشمن‌خونی.

**خینژ**: جگە، جیالە، غەیرەز [ف] بجُز.

**خینگ**: خوشك، خویشك، خوار [ف] خواهر.

**خینگر**: خەنجەر [ف] خنجر.

**خینگە**: نەنگە نەسنور [ف] شکم گنده.

**خینی**: خیندار [ف] دشمن خونی.

**خینی**: خانو، مال [ف] خانه، سرا.

**خێو**: ۱) خاوەن، ساحیب؛ ۲) خودای کانی‌و ناوان، جنوکە؛ ۳) راهێنان و ژیاندن [ف] ۱) صاحب؛ ۲) رب‌النوع، جن؛ ۳) پرورش کردن.

**خێوانە**: بەرکوت، گەنمێ کە بەرلە هەرەتی دروێنە دەیدرون‌و گێرە دەکرێ بوُ خواردن [ف] پیشکوب غلّه.

**خێور**: خەرەف [ف] خرف.

**خێوران**: نوانەوە، بوُ ناواندنەوەی خوُراکی دەیلێن [ف] ذوب شدن. *برای خوراکی گویند.*

**خێوُلکە**: هیزەی بچوك، خیگەی جکوُلە [ف] خیگ کوچك.

**خێوت**: چادر، خەیمە، کوُن [ف] خیمه.

**خیوە**: نوبەرە، بالانە [ف] نوبر.

**خێوەند**: خاوەن، خودان، خێو، ساحەب [ف] صاحب.



**دْ**: *لە پێش وشـەوە دێت بەمـانای* : ١) دە، ئە، نیشانەی کردەی ئێستەو نابەنـدە: (دْچم، دْبێم)؛ ٢) پێشگـری دنـەدان، هان‌دان: (دْهـەرْە)؛ ٣) پێشگری دواندن بە تووڕەیی: (دْدەف زمن بەردە؛ ٤) جارجار زێدە لە پێویست دێت: (دْدو : دو، یەك‌و یەك) ف ١) *بەعنـوان پیشـونـد بەمعـانی*: ١) فعـل مضـارع؛ ٢) تشویق و تشجیع؛ ٣) خطاب عتاب‌آمیز؛ ٤) گاهی بدون داشتن معنی مستقل.

**دا**: *لەپێش وشە بەمانای* : ١) بەرەخوار: (**داکەوتن، داهێنان، داهێشتن**)؛ ٢) نوێ، تازە: (هەوایەك **داهاتوە** مامڵێ دەبڵێ)؛ ٣) هەتا، هەیا: (**دا** بۆ خۆم دێم هیچ مەکـە)؛ ٤) دەبـا، بلا: (**دابـزانـم** جیە)؛ ٥) مات، سەرگەردان: (**دامـابـوم**)؛ ٦) ئەی، هۆی: (**دا** کاك‌بیرۆت وەرە)؛ ٧) مەکە، وامەکە: (**دادەنگ** با گوێمان لێ بێ)؛ ٨) پێشگری خواستن: (**دابمـدەیە، داوەرە**)؛ ٩) وشـەی هان‌دان: (**دادەی** زامـەوەستن)؛ ١٠) وشـەی رێز لێ‌نان کچی شو نەکـردو: (**دامـریەم**)؛ ١١) بەواتا: بەخشین: (نـانی **دابـەمن**)؛ ١٢) عیلاجی نەخۆشین: (خەریکی **داو** دەرمانم)؛ ١٣) هاوارو شکایەت: (**دا** لەدەست ناغای زاڵم)؛ *لەپاش وشە بەمانای* : ١٤) لێدان: (لەمنی **دا**)؛ ١٥) دەفرایەتی: (ئەم جەواڵە جی‌تێ دا، پارە ها لە کیسەدا)؛ ١٦) بەمانای دایك، دێ ف پیشوند بەمعنی: ١) فرو، فرود؛ ٢) نو، تازە؛ ٣) تا؛ ٤) بگذار؛ ٥) سرگردان؛ ٦) آهای؛ ٧) نکن؛ ٨) خواستن و تقاضا کردن؛ ٩) حرف تشویق و تشجیع؛ ١٠) کلمـهٔ احتـرام بە دوشیزگان؛ ١١) بەمعنی بخشیدن؛ ١٢) مداوا، معالجە؛ ١٣) داد و شکایت؛ *پسوند بەمعانی* : ١٤) زدن، مضروب کردن؛ ١٥) ظرفیّت؛ ١٦) مُستقل بە معنی مادر.

**دائەنێم**: واحەساونەکەم ف چنین فکر می‌کنم.

**دائیخستن**: کردنەباو ف متداول کردن.

**دائینـان**: ١) رۆهێنتن؛ ٢) لەنـەبـوەچێ کردن؛ ٣) بەمنـار بڕینـەوە؛ ٤) ئەوی کردنی لکی‌دار؛ ٥) دەست پێداماڵین ف ١) فرو هشتن؛ ٢) ابداع کردن؛ ٣) با ارّە بریدن؛ ٤) کوتاه کردن شاخهٔ درخت؛ ٥) دست بر چیزی مالیدن.

**داب**: ١) عادەت، نەریت، داب‌و دەستـور؛ ٢) هوندراو لە داومووسك ف ١) عادت، رسم؛ ٢) تنیده از موی دُم اسب.

**دابا**: ئەگەر خۆی داهێناباوە ف اگر خم می‌شد.

**دابارا**: لەسەرڕا هاتەخوار: (میوە **دابارا**) ف فروریخت.

**داباران**: ١) بەرەوخوار هەڵرژان؛ ٢) لە هەموولاوە بۆهاتن: (هەرگوتم تری مشتەری **داباران**) ف ١) فروریختن؛ ٢) گردآمدن بر چیزی.

**داباراندن**: هەڵرژاندن لەسەرەوە بۆخوار ف فروریختن.

**دابارانن**: داباراندن ف فروریختن.

**دابارین**: داباران ف نگا: داباران.

**دابارێن**: کەسێ کە بەرەوخوار هەڵدەرێژێ ف فروریزندە.

**داباش**: بەشوێندا گەڕان، لێکۆڵینەوە، توێژینەوە ف پژوهش، جستجو.

**دابڕ**: کەرت، کەر، لەت، پارچە: (مەڕەکە **دابڕدابڕبو**) ف قطعەقطعە.

**دابڕان**: لەت‌بوون، لێك‌جیابوون ف از هم جداشدن.

**دابڕانێ**: ملە، کێ‌بەرکێ لە گوریس کێشاندا ف مسابقهٔ طناب‌کشی.

**دابڕستن**: شالاوبردن ف حملە‌بُردن.

**دابڕسکان**: پەلاماربردن بۆ ڕفاندن ف هجوم بەقصد ربودن.

**دابڕسکین**: دابڕسکان ف هجوم بە قصد ربودن چیزی.

**دابڕکـردن**: ١) جیاکردنەوەی کەم لە زۆر؛ ٢) بەزۆر گرتن‌و بردن ف ١) جدا کردن جزء از کُل؛ ٢) اشغال کردن.

**دابڕین**: ١) دابڕکردن؛ ٢) برینداربوون بەهۆی توندبوونی بەن لە ئەندام؛ ٣) لەلـەکردنی دار بەچەقۆ ف ١) جدا کردن جزء از کُل؛ ٢) زخمی شدن توسط طناب با ریسمان؛ ٣) اثر گذاشتن بر چوب با کارد.

**دابنارتن**: چە قاندنی ریشەو نەمام ف کاشتن ریشە و نهال.

**دابو**: هاتە سەردەستان، خۆی چەماندەوە ف خم شد.

**دابوون**: چەمینەوەیەکە دەست بگاتە سەرزەمین ف خم شُدن و دست بر زمین نهادن.

**دابە**: ١) بچەمێوە، کۆم‌بوەرەوە؛ ٢) عادەت وایە، ڕێ‌وشوێنە ف ١) خم شو؛ ٢) عادت چنین است.

**دابەڕزان:** هەڵمەت، هێرشی توند فا هجوم سریع.

**دابەڕزاندن:** هەڵمەت بردن بەرلە هەوالآن فا قبل از بقیه یورش بردن.

**دابەڕزین:** دابەڕزان فا یورش.

**دابەز:** بەرەوژێر دابەزین: (ئەم هەڵبەز دابەزەت لەجیە؟) فا پایین بریدن.

**دابەزین:** لەسەر سواری هاتنەخوار فا پیادە شُدن.

**دابەزێن:** ئەوی سواران دێنێنەخوار فا پیادە کُنندە.

**دابەستن:** ۱) قایم کردن، شەدانـدن، شەتەك‌دان: ۲) قامەت بەستن، دەست پێکـردنی‌ نوێژو نیەت: (نیەتی **دابەست**، نوێژی **دابەست**)؛ ۳) حەیوان لەمـاڵ راگرتن بۆ قەڵـەو بوُن؛ ۴) نێر و نامـور سەرملی گاخستن‌و نامـادەی جوُت بوُن: (جوتەکەم **دابەست**) فا ۱) محکم بستن: ۲) اقـامهٔ نماز کردن: ۳) نگهداری حیوان و فربه کردن آن: ۴) مُهیّا کردن ابزار شُخم.

**دابەستە:** حەیوانی لەماڵ راگیراو بۆ قەڵەو بوُن فا حیوان پرواری.

**دابەش:** بەش‌کردن، بەش‌بەش کردن فا تقسیم.

**دابەش دابەش:** پارچەپارچە، جیاجیا فا شرحه‌شرحه.

**دابەش بوُن:** جویَ‌جویَ‌و بەش‌بەش بوُن فا قطعه‌قطعه‌شُدن.

**دابەش کراو:** پارچەپارچە کراو فا شرحه‌شرحه شُده.

**دابەش کردن:** بەش‌کردن فا تقسیم کردن.

**دابەش کەر:** کەسیَ کەشتێ بەش‌بەش دەکا فا توزیع کننده.

**دابەشین:** دابەش‌کردن فا توزیع.

**دابەشینەوە:** دابەشین فا توزیع.

**دابەلاندن:** فوت‌دان، فویت‌دان فا بلعیدن، فرودادن.

**دابەلین:** دابەلاندن فا نگا: دابەلاندن.

**دابێژ:** دابێژەر، کەسیَ کەئارد یان دەخڵ بەهێڵەگ قەلبیردا دەکا فا بیزنده.

**دابێژان:** بێژتن فا ببختن.

**دابێژتن:** بێژتن فا ببختن.

**دابێژدابێژ:** کون‌کون وەك بێژنگ فا سوراخ سوراخ.

**دابێژراو:** بەبێژنگ بێژراو فا بیخته.

**دابێژە:** فرمان بە دابێژتن: (ئارد **دابێژە** بوُنان) فا ببخته کُن.

**دابێژتن:** بێژتن فا ببختن.

**دابین:** ۱) خوُمـان بچـەمێنین؛ ۲) توُقـرە گرتو، هێدی، داسەکنان، کار بێك‌هانـو؛ ۳) خاترجەم؛ ۴) ئارام، بێ‌کێشە فا ۱) خود را خم کنیم: ۲) آرام، قرار؛ ۳) خاطرجمع: ۴) اَمن و امان.

**دابین کردن:** بێك هێنان فا فراهم آوردن.

**دابینی:** ئارامی، هێمنایەتی فا آرامش.

**داپ:** داب فا عادت.

**داپـاچ:** کەسیَ بەتـەور یان بەتیغ شتیَ لەسـەرەوە بەرەوخـوار دەبڕیَ: (دارەکانی **داپاچی**) فا کسی که با تَبر یا تیغ چیزی را از بالا به‌پایین قطع کُند.

**داپاچەر:** داپاچ فا نگا: داپاچ.

**داپاچین:** داپاچ فا نگا: داپاچ.

**داپاچێن:** داپاچ فا نگا: داپاچ.

**داپـاڵین:** ۱) پالاوتن؛ ۲) بە تنـۆك چکـانـدن فا ۱) تصفیه کردن؛ ۲) قطره‌قطره چکاندن.

**داپچـڕان:** ۱) زەق‌و گوشـادکـردن: (زار **داپچـڕان**، چاو **داپچـڕان**)؛ ۲) لەسـەرەوە بوُخـوار دڕان فا ۱) بازشُدن چشم و دهان؛ ۲) از بالا به‌پایین پاره شُدن.

**داپچـڕانـدن:** ۱) داچەقاندنی دەم‌و زەق‌کردنی چاو؛ ۲) لەسەر بوُخوار دڕاندن فا ۱) باز کردن چشم و دهان؛ ۲) از بالا به‌پایین پاره کردن.

**داپچڕین:** داپچڕاندن فا نگا: داپچڕاندن.

**داپڕسکان:** داپەڕزین فا بەچیزی هجوم بُردن.

**داپـڕوزقـان:** روُت بوُنەوەی لکەدار یان هێشو لەگەڵاو دەنك فا لُخت شدن از برگ و بَر.

**داپـڕوزقـاندن:** روُت کردنەوەی لك یان هێشو لەگەڵاو دەنك فا لخت کردن درخت از برگ و بَر.

**داپڕوزقانن:** داپڕوزقاندن فا نگا: داپڕوزقاندن.

**داپڕوزقیان:** داپڕوزقان فا نگا: داپڕوزقان.

**داپڕوزقین:** داپڕوزقان فا نگا: داپڕوزقان.

**داپڕوسکان:** داپڕوزقان فا نگا: داپڕوزقان.

**داپڕوسکاندن:** داپڕوزقاندن فا نگا: داپڕوزقاندن.

**داپڕوسکین:** داپڕوزقان فا نگا: داپڕوزقان.

**داپژان:** بڵاوبونەوەی شتی ورد فا پاشیدن و پراکنده‌شُدن.

**داپژاندن:** بەرەو ژێر رشتنی شتی ورد فا پاشیدن.

**داپسکـان:** ۱) بەکـزی کـروشـمـەکـردن؛ ۲) فس‌خواردنی مریشك بوُ کەڵەشێر، داتسیان فا ۱) کِز کردن؛ ۲) حالت نشستن مُرغ در مقابل خروس.

**داپسـکیان:** داپسکان فا نگا: داپسکان.

**داپسیان:** داپسکان فا نگا: داپسکان.

**داپلاندن:** داپاڵین فا نگا: داپاڵین.

**داپلۆخان:** پێست فرێدان لەسوُتان فا سوختن و افتادن پوست.

**داپلۆخان:** داپلۆخان فا سوختن و از بین رفتن پوست.

**داپلۆخاندن:** سوتاندنی پێست فا پوست سوزاندن.

**داپلۆخاو:** پێست [illegible] بەسوُتان فا پوست انداخته از سوختگی.

**داپلۆخین:** داپلۆخان فا سوختن و از بین رفتن پوست.

**داپلۆخیو:** داپلۆخاو فا پوست انداخته از سوختگی.

**داپلۆسان:** دارکاری کردنی خەست‌و لەسەریەك فا کتك‌کاری سخت و پیاپی.

**داپلۆساندن:** داپلۆسان فا نگا: داپلۆسان.

**داپلۆستن:** داپلۆسان فا نگا: داپلۆسان.

**داپلۆسکان:** داپڕوزقان فا نگا: داپڕوزقان.

**داپلۆسکانن:** داپلۆسکان، داپڕوزقان فا نگا: داپڕوزقان.

**داپلۆسکیان:** روُتـەوەبوُنی لك یان هێشو لەگەڵاو دەنك فا لُخت شدن

شاخه با خوشه از برگ و دانه.

**داپلۆسین:** داپلۆسان ف نگا: داپلۆسان.

**داپۆش:** سەرپۆش دانەر ف سر پوش گذار.

**داپۆشان:** ۱) برینی لە تەواوکردنی خانو؛ ۲) وەشارنن بەهۆی سەرپۆش؛ ۳) پۆشینی سوڕو نهێنی خەڵـك ف ۱) کنـایه از تمـام کردن کار ساختمان: ۲) و ۳) سر پوش گذاشتن.

**داپۆشاندن:** داپۆشان ف نگا: داپۆشان.

**داپۆشانن:** داپۆشان ف نگا: داپۆشان.

**داپۆشراو:** وشارنو بەهۆی سەرپۆشەوە ف پوشیده.

**داپۆشەر:** کەسێ کە دادەپۆشێ ف پوشاننده.

**داپۆشین:** داپۆشان ف نگا: داپۆشان.

**داپەج:** قوت دەر ف بلعنده.

**داپەچنین:** قوت‌دان ف بلعیدن.

**داپەچین:** قوت جوێن ف فرو شدن در گلو.

**داپـەڕ:** ۱) بزوتنـەوە بەچـالاکی: ۲) چاوەنەترسان لەکار ف ۱) حرکت بانشاط: ۲) اقدام.

**داپەڕژاندن:** ئاو لە سەرەوە هەڵداشتن ف آب پاشیدن از بالا.

**داپەڕژنین:** هەڵ بەرناوتن، هەڵپاچینی لك و پۆپی دار ف هرس درخت.

**داپەڕین:** سەربەرەژێر پەلەزجون ف باشتاب فروآمدن.

**داپیتن:** هەڵ بەرتاوتن ف هرس درخت.

**داپێچ:** شەتەك‌دان، توندبەستن، جەڕەبابە ف محکم بستن و گره زدن.

**داپێچـانـدن:** ۱) داپێچ؛ ۲) ڕەپێچـەك‌دان، بەرخـوداون و زارفـاندن ف ۱) محکم بستن و گره زدن؛ ۲) با فشار به جلو راندن.

**داپێچانن:** داپێچاندن ف نگا: داپێچاندن.

**داپێچین:** داپێچان، داپێچاندن ف نگا: داپێچاندن.

**داپیر:** نەنك، دابکی دابك و باب، نەنە، نەنێ ف مادربزرگ.

**داپیرك:** داپیر ف مادربزرگ.

**داپیرۆشك:** ۱) جالجالۆکە، کاکڵەموشان: ۲) پیرابشۆکە، جانەوەریکی بۆری جکۆڵەیە، داپیرۆکە ف ۱) عنکبوت؛ ۲) خرخاکی.

**داپیرۆکـە:** پورایشۆکە، پیرابشۆکە، جانەوەریکی بۆرو خڕکەڵە یە گڵ لەسەر کونەکەی هەڵ‌دەدا ف خرخاکی.

**داپیرە:** داپیر ف مادربزرگ.

**دات:** ۱) کردەی رابردو لە: دان، بەخشین؛ ۲) پرسیاری‌دان بۆ رابردو: (نـاخـری دات بێ؟) ف ۱) ماضی مطلق از فعل دادن دوم شخص مفرد؛ ۲) آیا دادی؟.

**داتاش:** ناشەر ف تراشنده.

**داتاشان:** ناشران لەسەرەوە بۆخوار ف از بالا به‌پایین تراشیدن.

**داتاشین:** ناشین لەسەرەوە بۆخوار ف از بالا به پایین تراشیدن.

**داترۆسکان:** راچەنین لەترسان ف یکه‌خوردن.

**داترۆسکاندن:** راچەناندن ف شکه‌کردن.

**داترۆسکیان:** داترسکان ف یکه‌خوردن.

**داتسیان:** داهـاتو ن نزیك‌بە روخان: (نەودیواره داتسیاگە) ف کج شدن نزدیك به افتادن.

**داتسین:** داتسیان ف نگا: داتسیان.

**داتکان:** دڵۆ بەدڵۆ بە هاتنەخوار ف چکیدن.

**داتکاندن:** بەدڵۆپ رژاندن سەربەرەخوار ف چکاندن.

**داتکانن:** داتکاندن ف چکاندن.

**داتلیشان:** جڕخواردن لەسەرەوە بۆخوار ف شکافتن از بالا به‌پایین.

**داتلیشـانـدن:** لەسەرەوە بۆخوار دڕاندن، فەڵاشتن ف از بالا تا پایین شکافتن و دریدن.

**داتلیشانن:** داتلیشاندن ف نگا: داتلیشاندن.

**داتلیشاو:** دڕاو لەسەرەوە بۆخوار ف از بالا تا پایین شکافته.

**داتلیشیاگ:** داتلیشاو ف نگا: داتلیشاو.

**داتلیشیان:** داتلیشان ف شکافتن از بالا تا پایین.

**داتوڕاندن:** فیزاندن، توڕاندن، بەلەفیزەگرتن ف اسهال گرفتن.

**داتوروسکان:** داترسکان ف شکه‌شدن.

**داتوروسکانن:** داترسکاندن ف شکه‌کردن.

**داتولان:** تولانەوە ف نگا: تولانەوە.

**داتولاو:** لەبەریەك چوگ لەکولان ف از شدت پختن له شده.

**داتولین:** حالەتی داتولان ف لەشدن از زیاد پختن.

**داتـەپان:** ۱) قوپانی سەربان؛ ۲) کونانەوە بەپیل و هەرجی ف ۱) فرو رفتن بام: ۲) کوبیدن با بیل و...

**داتەپاو:** ۱) زەوی و گڵی قوپاو: ۲) کونێنراو ف ۱) زمین و بام فرورفته؛ ۲) کوبیده شده.

**داتەپکین:** دانەپان ف نگا: دانەپان.

**داتەپین:** دانەپان ف نگا: دانەپان.

**داتەقان:** بەپەلەپەل داپێژران ف باعجله بپختن.

**داتەقاندن:** داپێژنی بەپەلەپەل ف باشتاب بپختن.

**داتەکان:** ۱) سەربەرەوخوار راوەشان: ۲) بریتی لە والابونی دەفری وەك کیسـەو جەوالی بەهۆی راوەشاندن ف ۱) تکاندن؛ ۲) کنایه از خالی شدن محتوی کیسه بەدلیل تکاندن.

**داتـەکـانـدن:** ۱) لەسەرەوە بۆخوار راوەشاندن؛ ۲) بریتی لە هیچ تێدا نەهێشتن ف ۱) فرونکاندن: ۲) کنایه از خالی کردن کیسه بوسیله تکاندن.

**داتەکانن:** دانەکاندن ف نگا: داتەکاندن.

**داتەکاو:** راوەشاو لەسەرەوە بۆخوار ف فرونکانیده.

**داتەکیان:** دانەکان ف نگا: دانەکان.

**داتەکێ:** دانەکاو ف فرونکانیده.

**داتەکین:** دانەکان ف نگا: دانەکان.

**داتەکیو:** دانەکاو ف نگا: داتەکاو.

**داتەمریاگ:** دامرکاو، بێ‌دەنگ و ئارام دانیشتو ف آرام و ساکت نشسته.

**داتەمریان:** داسەکنان، دامرکان، هەدادان ف آرام و ساکت نشستن.

**داتەمین:** خەمباری، مەبنەتباری ف اندوهناکی.

**داجوین:** بزوتنەوە، حەرەکەت کردن ف جنبیدن.

**داچاندن:** ١) تۆو بەزەویەوە کردن؛ ٢) ئارد کەم‌کەم بەسەر رۆندا کردن ف ١) تخم بر زمین افشاندن؛ ٢) آرد بر روغن نفته ریختن.

**داچزان:** جزان، ئەندام بەویکەوتنی ئاگر سوُتان ف سوختن بدن از تماس مستقیم با آتش.

**داچزاندن:** داغ بە ئەندامی لەشەوە نان ف سوزاندن.

**داچکاندن:** هەڵواسین، داڵەقاندن ف آویختن.

**داچلەکان:** راچلەکین لەترسان یان لەخەبەری سەمەرە ف یکّه‌خوردن.

**داچلەکاندن:** بۆنەهۆی داچلەکان ف شُکّه کردن.

**داچلەکانن:** داچلەکاندن ف شُکّه کردن.

**داچلەکاو:** شڵەژاو، ئەندکاو لەرزیو لە ترسان یان لە خەبەری سەیرو سەمەرەو ناخۆش ف شُکّه شده.

**داچلەکیاگ:** داچلەکاو ف شُکّه‌شده.

**داچلەکیان:** داچلەکان ف یکّه‌خوردن.

**داچلەکین:** داچلەکان، داچلەکیان ف یکّه‌خوردن.

**داچلەکیو:** داچلەکاو ف شُکّه‌شده.

**داچناو:** زەوی تۆو پێوەکراو ف زمین بذر پاشیده.

**داچنراو:** داچناو ف زمین بذر پاشیده.

**داچنین:** ریزکردنی شت بەنەبنەت بەکەوە بە ریك‌وپێکی، لەسەریەك هەڵچنین: (دەوری و قاپەکان لەسەر سفرە **داچنە**، کتێبەکان لەسەر رفە **داچنە**) ف پهلوی هم چیدن و مُرتّب کردن.

**داچۆڕان:** ١) هاتنەخواری ئاوی کەم لەسەرەوەو ژێرەوە؛ ٢) خەلاس بوُنی ئاو لە دەفرا ف ١) چکیدن؛ ٢) خشکیدن آب چشمه و...

**داچۆڕاندن:** بەنال‌کردنی ئاو ف خُشکانیدن آب.

**داچۆڕانن:** داچۆڕاندن ف خُشکانیدن.

**داچۆڕیان:** داچۆڕان ف نگا: داچۆڕان.

**داچۆڕین:** داچۆڕان ف نگا: داچۆڕان.

**داچوُن:** ١) ئەوی بوُن‌و قوپان: (سەربانەکە **داچوە**، هەوبرەکە **داچوە**) ف فرورفتن.

**داچەقان:** ١) ئەکرانی دەف‌و... : (دەمی **داچەقاند**)؛ ٢) نیزاچوُن: (درك بەپاما **داچەقی**)؛ ٣) بەزەویدا چوُن: (دارەکە لەقوڕ **داچەقی**) ف ١) بازکردن دهن و...؛ ٢) خلیدن؛ ٣) فرورفتن در زمین.

**داچەقاندن:** کردەی داچەقان ف نگا: داچەقان.

**داچەقانن:** داچەقاندن ف نگا: داچەقان.

**داچەقاو:** بەرکاری داچەقان ف صیغهٔ مفعولی از مصدر «داچەقان».

**داچەقیاگ:** داچەقاو ف صیغهٔ مفعولی از مصدر «داچەقان».

**داچەقیاو:** داچەقاو ف نگا: داچەقاو.

**داچەقین:** داچەقان ف نگا: داچەقان.

**داچەقێن:** ئەوەی دادەچەقێنێ ف صیغهٔ فاعلی از مصدر «داچەقان».

**داچەکان:** سیس‌بوُن‌و مل‌کزبوُن ف افسردگی و پژمُردگی.

**داچەکاو:** سیس هەڵگەڕاو، مل‌داخستو لە کزیان ف افسرده و پژمرده.

**داچەکین:** داچەکان ف ضعف و افسردگی.

**داچەلاندن:** داڵەقاندن، بەرەوژێر هەڵواسین، شۆڕەوکردن ف آویختن.

**داچەندراو:** زەوینی تۆم پێوەکراو ف زمینِ بَذرپاشی شُده.

**داچەنراو:** داچەندراو ف زمین بذر پاشی شده.

**داچەندن:** تۆم‌پێدانی زەوی ف بَذرافشانی.

**داچەنن:** داچەندن ف بُذرافشانی.

**داچەنەچەن:** هێندە مەڵێ، چەقەمەکە، وسکوت‌بە ف خاموش باش.

**داچین:** دابزوبن ف بگذار بروبم.

**داچێن:** ئەوی تۆم ئەپاشێ ف بذرپاش.

**داچێندراو:** تۆم پێوەکراو، داچناو ف بُذرافشانی شُده.

**داچێنراو:** داچناو ف بذرافشانی شُده.

**داحبا:** ١) جانەوەری درندە؛ ٢) جانەوەرێ کە ناناسرێ، دەعبا، داعبا ف ١) دَدّ، دَرَنده؛ ٢) حیوان شناخته نشده.

**داخ:** ١) حەیف، مخابن؛ ٢) خەم، کەسەر؛ ٣) ئاسە، عەزرەت؛ ٤) زۆرگەرم؛ ٥) بەئاگر جزاندن، داغ؛ ٦) لەباش وشەی «شاخ» بەمانای: جیا، کێو: (لەوشاخ‌و **داخە** سەرکەوتبن)؛ ٧) دروشم ف ١) دریغ؛ ٢) غم، اندوه؛ ٣) حسرت؛ ٤) بسیار گرم، حار؛ ٥) سوزاندن با آتش؛ ٦) کوه؛ ٧) آرم.

**داخدار:** خەمبار، دڵ‌بکول ف اندوهگین.

**داخرا:** ١) بۆ دەرك‌و پەنجەرە دەڵێن. پێوەدرا، بەسرا، قفڵ‌درا؛ ٢) بۆ بەرەو نوبن دەڵێن. راخرا: (فەرش **داخرا**) ف ١) بسته شد، قُفل شد؛ ٢) پهن شد. *برای فرش و... گفته می‌شود*.

**داخراو:** ١) پێوەدراو، قفڵ‌کراو؛ ٢) راخراو ف ١) بسته‌شُده، قُفل شُده؛ ٢) پهن شده، گُسترده.

**داخرپان:** داخرپیان ف یکّه‌خوردن.

**داخرپیان:** دڵەکوتە، شڵەژان ف یکّه‌خوردن.

**داخریاگ:** داخراو ف نگا: داخراو.

**داخز:** شوێنی لێژ ف شیب.

**داخزان:** بەخشکە هاتنەخوار ف سُر خوردن و پائین آمدن.

**داخزاو:** بەخشکە داکەوتو ف سُر خورده و پائین آمده.

**داخزین:** داخزان ف سُر خوردن و پائین آمدن.

**داخزێن:** کەسێ کە بەخشکە شتێك بەرەوژێر دەبا ف کسی که چیزی را سُر دهد.

**داخستن:** ١) پان‌کردنەوە لەسەر زەوی، راخستن: (بەڕەکەم **داخست**)؛ ٢) پێوەدانی دەرك‌و پەنجەرە، قفڵ‌کردن؛ ٣) فڕێدانەخوار لە سەرەوە: (لکەدارەکانم **داخست**)؛ ٤) لەدەست کەسێ پاشتێکەوە کەوتنە سەر زەوبن؛ ٥) هەڵ‌کردنی ئەندورو کڵی دیزەو گۆزەو سوبە؛ ٦) خیم‌دانانی خانو: (بناغەم **داخست**)؛ ٧) ئەوی کردن: (لەخەجاڵەتی سەری **داخست**)؛ ٨) کۆکردن و دانان بۆ دواڕۆژ: (ئازوُقەم **داخست**) ف ١) پهن کردن و گُسترَدن؛ ٢) بستن در و پنجره؛ ٣) پایین انداختن؛ ٤) توسط کسی با چیزی زمین خوردن؛ ٥) برافروختن تنور و کوره؛ ٦) پی ریختن بنا؛ ٧) خم کردن و پایین آوردن؛ ٨) پس‌انداز و جمع‌آوری آذوقه.

**داخ‌کردن:** ١) بەئاسنی سوُرەوەبوُ جزاندن؛ ٢) جۆشاندنی رۆن؛

٣) بربنـــی له فربودان‌و زیان‌لێدان ف ١) داغ‌گذاری؛ ٢) تفـــبدن روغن؛ ٣) کنابه از فریب دادن.

**داخگه:** جێگه‌ی داخ کردنی مالاٚت ف مکان داغ‌گذاری.

**داخل:** ژوره‌وه، ناوه‌وه، ناو ف داخل.

**داخله:** قونوی دراوی دوکاندار ف صندوقچهٔ پول مغازه‌دار.

**داخ‌له‌دل:** تۆره له رووداوێ ف عصبانی و دل‌ریش.

**داخم:** حه‌یف، مخابن ف دریغا، افسوس.

**داخم‌ناچێ:** زۆرحه‌یف، به‌داخه‌وه ف متأسفانه.

**داخو:** ناباکو؟، نابا، تۆبێژی؟ ف آیا؟.

**داخوا:** داخو؟ ف آیا؟.

**داخواز:** ١) پێویست، بێداویستی؛ ٢) داواکار، خوازه‌ر ف ١) موردنیاز؛ ٢) نیازمند.

**داخوازی:** پێویستی ف موردنیاز بودن.

**داخواستن:** خواستن، ویستن ف طلبیدن.

**داخو دوخان:** خه‌م‌و خه‌فه‌ت، ده‌ردومه‌ینه‌ت، کوڵو که‌سه‌ر ف غم و غُصّه.

**داخ‌ووده‌رد:** داخو دوخان ف غم و غُصّه.

**داخـــوران:** ورده‌ورده که‌م‌بوونـه‌وه‌ی که‌نـداڵ له‌ده‌م ناو بان که‌م‌کردنی بنی‌دیوار ف تحلیل رفتن.

**داخوریان:** داخربیان ف یکّه‌خوردن.

**داخورباندن:** شڵه‌ژانی مرۆ به‌ترساندن یان به‌خه‌به‌ری ناخوش بێدان ف شُکّه کردن.

**داخورپیان:** داخربیان ف یکّه خوردن.

**داخورپین:** داخربیان ف یکّه‌خوردن.

**داخـوربـن:** ١) تێ خوڕبن؛ ٢) به‌خــۆ هه‌ڵگوتن ف ١) نهیب زدن؛ ٢) لاف‌زدن.

**داخۆزین:** هاتنه‌خوار له سواری، دابه‌زین، داوه‌زین ف پیاده شُدن.

**داخواستن:** داخۆزین ف پیاده شُدن.

**داخۆم:** داخو؟ ف آیا؟.

**داخوبان:** نوسراوی بێودان‌و ڕێوشوێن بۆ خه‌ڵك ف بیانیه.

**داخه:** ١) فه‌رمان به‌داخستن؛ ٢) گه‌رمه ف ١) امر به «داخستن»؛ ٢) گرم است.

**داخه‌ر:** که‌سێ کاری داخستن ده‌کا ف صیغهٔ فاعلی «داخستن».

**داخه‌که‌م:** به‌داخه‌وه، حه‌یفێ ف متأسفانه.

**داخی‌داخانم:** زۆر به‌داخه‌وه، حه‌یف‌و‌مخابن: (ئیمه ونمان نیوه ساداتن مه‌عاشنان نابڕن / **داخی داخانم** جه‌باری جۆن له نیوه‌شبان بڕی) «شیخ ره‌زا» ف با کمال تأسف.

**داخی‌گرانم:** داخی داخانم ف با کمال تأسف.

**داد:** ١) هاوار؛ ٢) حوکمی ڕه‌وا، عدالت ف ١) فغان، فریاد؛ ٢) عدالت.

**دادا:** ١) وشـه‌ی ڕێزلـێنان بۆ دایك؛ ٢) نابه‌ن، ژنی پیری سه‌رسپی-بیره‌ژن یوب چه‌رمگ ف ١) کلمـهٔ خطـاب احترام‌آمیـز به مـادر؛ ٢) پیرزن.

**دادان:** ١) ناشینی قه‌ڵـه‌م؛ ٢) فێرکردن؛ (ده‌رس **دادان**)؛ ٣) شان‌دان: (سه‌رمه‌شق **دادان**)؛ ٤) سه‌ره‌تا دامه‌زراندن: (تۆ گۆره‌ویه‌که‌م بۆ **داده** نا ببچنم)؛ ٥) کون‌و که‌لێـن به‌تـوێـه قـوڕ گـرتن: (دیـواره‌کـه‌م **داداوه**)؛ ٦) ده‌س پێکـــردنی بارش: (بـاران **دابدا**)؛ ٧) ده‌لانـدن: (ئه‌م‌کوپه ناو **دانه‌دا**، گۆزه‌که **دای داوه**)؛ ٨) به‌ردانه‌وه‌ی په‌رده؛ ٩) داخستنی ده‌رگاو په‌نجـه‌ره؛ ١٠) ده‌ست له‌سه‌ر زه‌وی نان: (هه‌ردوك ده‌ستی **دادابو**) ف ١) نراشیدن قلم؛ ٢) تعلیم؛ ٣) نشان دادن؛ ٤) گره‌هـــای اوّل بافتنی؛ ٥) نرمیم سوراخ و خرابی دیوار با گِل؛ ٦) شروع بارنـدگی؛ ٧) نشت کردن؛ ٨) انداختن پرده؛ ٩) بستن در و پنجره؛ ١٠) دست بر زمین نهادن.

**دادانـه‌وه:** ١) به‌ردانـه‌وه‌ی پـه‌رده؛ ٢) کـون‌و که‌لێـن به‌قوڕ گرتن ف ١) انداختن پرده؛ ٢) گرفتن سوراخ دیوار با گِل.

**دادبه‌ر:** گلی‌کار، شکایه‌ت‌که‌ر ف شاکی، دادخواه.

**دادپرس:** فرباره‌س، که‌سێ به‌هاواری بیاو ده‌گاو له شکایه‌تی ده‌پرسێ ف کسی که به شکایات دیگران می‌رسد.

**دادپه‌روه‌ر:** خاوه‌ن‌داد، عادل ف دادپرور.

**دادخوا:** دادبه‌ر ف دادخواه.

**دادخواز:** دادبه‌ر ف دادخواه.

**دادخوازی:** گلی کردن، شکایه‌ت کردن ف دادخواهی.

**دادخوایی:** دادخوازی ف دادخواهی.

**دادڕ:** زۆر دڕیاو: (کراسه‌که‌ی **دادڕێ**) ف پاره.

**دادڕان:** دڕان له‌باری درێژیه‌وه ف پاره‌شدن طولی.

**دادڕاو:** داتلێشاو ف پاره شده از طول.

**دادڕدادڕ:** ١) له‌چه‌ند جێوه دڕاو، شڕوڕ؛ ٢) له‌ت له‌ت‌بوونی زه‌وی له‌به‌ر ناوی ناوداشتن ف ١) پاره‌پاره شده؛ ٢) زمین قطعه‌قطعه شده توسط آب.

**دادرۆن:** دوشت به‌سه‌ریه‌کدا درون: (له‌چکی که‌واکه‌ی بۆ **دادروم**، ئه‌م بینه‌بم بۆ **دادرو**) ف بهم دوختن.

**دادره‌س:** هانا، فرباره‌س ف فریادرس.

**دادڕیاگ:** دادڕاو ف پاره‌شدهٔ طولی.

**دادڕین:** کاری دادڕان ف دریدن، پاره کردن.

**دادك:** دایك، داڵك ف مادر.

**دادگا:** مه‌حکه‌مه، جێگه‌ی شکات‌کردن ف دادگاه.

**دادگه:** دادگا ف دادگاه.

**دادگه‌ر:** دادپه‌روه‌ر ف دادگر، عادل.

**دادگێر:** دادگه‌ر ف دادگر.

**دادوبه‌سه‌ت:** مامله، سه‌ودا، کڕین‌و فرۆشتن ف معامله.

**دادوبێداد:** هاوار له‌ده‌ست ناحه‌قی که‌ر ف داد و بیداد.

**دادۆران:** دادرۆن ف به‌هم دوختن.

**دادۆرانن:** دادرۆن ف به‌هم دوختن.

**دادۆش:** ١) شیردۆش؛ ٢) بربنێ له‌که‌سێ که به‌گزی دۆسته‌و به‌هره ده‌با ف ١) شیردوش؛ ٢) دوست دغل.

**دادۆشین:** ١) دۆشین تا ناخردڵۆپ؛ ٢) بڕینێ له به‌هره‌بردنی نازه‌وای

دۆسنی گزی‌کار ف ۱) تا فطرهٔ آخر دوشیدن؛ ۲) کنایه از سوءِ استفادهٔ دَغَل‌دوستان.

**دادوفوغان:** دادوهاوار، هەراو هوریا ف فریاد و فغان.

**دادۆك:** نایەن، دابەن ف دایە.

**دادوەر:** ئەوی بەشکایەتان رادەگا ف قاضی.

**دادە:** ۱) فەرمان بە «دادان»؛ ۲) خوشکی گەورە؛ ۳) دالـك، دابك ف ۱) فعل امر از مصدر «دادان»؛ ۲) خواهر بزرگتر؛ ۳) مادر.

**دادەنگ:** فەرمان بە بێدەنگ‌بون: (**دادەنگ** بزانین چیبوە!) ف ساکت شو.

**دادێ:** ۱) نابزانم چۆن؛ ۲) خوشکی گەورەی ئەو؛ ۳) دایکی ئەو؛ ۴) وشەی هانەدان: (**دادەی کورگەل راکەن**) ف ۱) بگذار ببینم؛ ۲) خواهر بزرگتر او؛ ۳) مادر او؛ ۴) کلمهٔ تشجیع.

**دادی:** نایەن، دابەن ف دایە.

**دادێران:** راداشتن، داهێشتن، منداڵ بەسەردەستەوە گرتن بۆ زیاندن ف سرپا گرفتن بچّە.

**دادیلە:** وشەی دواندنی خوشکی چکۆلە ف کلمهٔ نوازش خواهر کوچکتر.

**دار:** ۱) درخت: (**داری، دارگوێز**)؛ ۲) چێو: (**دار دەست**)؛ ۳) قەلاشکەری، نێزنگ؛ ۴) قەناره: (**داری نیعدام**)؛ ۵) ریەی خوێ پێوان: (**دارێ خوێ بەچەند؟**)؛ ۶) سامان، ماڵ، دارایی: (**دارو نەدارم ئەوەندەبو**)؛ ۷) پاشگری بەواتا: خاوەن: (**خێزان دار، مەڕدار**) ف ۱) درخت؛ ۲) چوب؛ ۳) هیزم؛ ۴) دار اعدام؛ ۵) پیمانه نمك فروش؛ ۶) ثروت، دارایی؛ ۷) پسوند بەمعنی صاحب، خداوند.

**دارا:** ۱) دەولەمەند، بوودە، زەنگین؛ ۲) جۆرێ دەرمانی چاوئێشە؛ ۳) جۆرێ کوتاڵ؛ ۴) ناوێ پیاوانە ف ۱) ثروتمند؛ ۲) از داروهای چشم؛ ۳) نوعی پارچه؛ ۴) اسمی مردانه.

**دارارەش:** دارێکی لێرەوارەو زۆر ئەستوورو بلند دەبێ ف درختی است جنگلی.

**داراش:** دالاش ف لاشخور.

**داراغان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف روستایی در کردستان که به وسیله بعثیها ویران شد.

**دارانەوە:** بورانەوە، دڵ لەخۆچون، لەسەرخۆچوون ف غش کردن.

**دارایی:** ۱) کۆڵسوانە لەپسارچەی دارا؛ ۲) کارگێڕی باج‌ساندن ف ۱) چارقد؛ ۲) ادارهٔ دارایی.

**داربازێ:** تەتافبار، پەلهەوان ف بندباز.

**داربازە:** داربەست، تابوت ف تابوت.

**داربڕ:** ۱) دڕندەیەکی چکۆلەیە لەتیرەی پشیلە؛ ۲) کەسێ کە بە بیور داران دەبڕێ ف ۱) دَرّندەی از تیرهٔ گربەسانان؛ ۲) هیزم‌شکن.

**داربۆکردن:** برینی لە سزادان و تۆڵە لێ‌ساندنەوە ف کنایه از انتقام گرفتن.

**داربەس:** ۱) قایمەمیو؛ ۲) تابوتی مردو گویزانەوە؛ ۳) دارلێکدان بۆ سیمان تێ‌کردن ف ۱) داربست تاك؛ ۲) تابوت؛ ۳) داربست بنّایی.

**داربەست:** داربەس ف نگا: داربەس.

**داربەسەر:** ناوی سێ گوندی کوردستانە کە دواتی بەعسی ویرانی کرد ف نام سە روستا در کردستان.

**داربەند:** دارلێکدانی چیمەنتۆکاری ف داربست بنایی.

**داربەندەخوێن:** داردۆخین، دارێ کە هۆجەنەی نێدەخەن و لە دەرپێ رادەکەن ف وسیله‌ای که بدان بند تُنبان را در نیفه کشند.

**داربەنك:** دارەبەن، دار کەسکان ف درخت بنه.

**داربێڕ:** داری رایەڵ‌کراوی نێوان دوشراوو نەدۆشراو لەکاتی مەڕدۆشیندا ف چوب فاصل میان گوسفندان دوشیده و نادوشیده هنگام دوشیدن گلّه.

**داربیرە:** داربێڕ ف نگا: داربێڕ.

**دارپاچ:** نەرداس، نەورداس ف دهره.

**دارپشکێف:** بای وادەی نزیك بەهار ف سرآغاز باد بهاری.

**دار پۆچ:** داری پیری گەندەڵ ف درخت از پیری پوسیده.

**دارتاش:** نەجار ف درودگر، نجار.

**دارتاشخانە:** دوکانی نەجاری ف کارگاه نجاری.

**دارتو:** ۱) دارەتفێ؛ ۲) خلتەی شنی تراو، تلّپ ف ۱) درخت توت؛ ۲) دُردی.

**دارتورکنەك:** دارکونکە، دارکوت، دارتەقێنە، مەلێکە ف پرندهٔ دارکوب.

**دارتوفانە:** بوز، بەوز ف درخت پشه.

**دارتومەك:** سازو دنبەك بیکەوە، سازو دەوڵ ف ساز و ضرب.

**دارتون:** قرقرە، چرك ف قرقره.

**دارتەرم:** تابوت، داربەست ف تابوت.

**دارتەفن:** دەزگا ی تەونگەران، چوارچێوەی قالی چنین ف چارچو به دستگاه قالی‌بافی.

**دارتەقێنە:** دارکونکە ف دارکوب.

**دارتەل:** داری بەرز کە تەلەفونی بەسەردا رایەڵ کراوە ف عمود تلفن.

**دارتەون:** چوارچێوەی تەونگەری، دارتەفن ف چارچوبهٔ دستگاه قالی‌بافی.

**دارتێل:** دارتەل ف عمود تلفن.

**دارجغارە:** مۆدنە، دەمنە، پاسك ف چوب سیگار.

**دارجگەرە:** دارجغارە ف چوب سیگار.

**دارچك:** دەوەن، جلو ف درخت بوته‌ای.

**دارچین:** تویکڵەدارێکە تیزو بۆن‌خۆش ف دارچین.

**دارچینی:** دارچین ف دارچین.

**داردارۆك:** برینی لە نانی زۆر کۆن و رەق هەڵاتو ف کنایه از نان کهنه و خشك شده.

**داردان:** ۱) عەمباری نێزنگ؛ ۲) جێ‌ئەمام و بیشەی زۆر؛ ۳) لە قەنارەدان، لە سێ‌دارەدان ف ۱) انبار هیزم؛ ۲) نهالستان؛ ۳) بەدار آویختن، دارزدن.

**داردۆژەنگ:** داری ئەملاو ئەولای مەشکە، کە بەزمانە دەخرێتە *ناو لولەیەوە* ف دو چوب کنارهٔ مشك.

**ڕیوەڵ**: زەردەڵەی لاواز [ف] لاغر زردرنگ مردنی.

**ڕیوەلە**: ڕیوەڵ [ف] نگا: ڕیوەڵ.

**ڕیوەن**: باسکڵاو، کڵاوبن، بنی ڕێواس [ف] راوند، بیخ ریواس.

**ڕیوی**: ڕوڤی، ڕێڤی [ف] روباه.

**ڕێوی**: ١) ڕدێن، ئەڕدێن؛ ٢) ڕێڤی، ڕوڤی؛ ٣) ڕێبوار [ف] ١) ریش؛ ٢) روباه؛ ٣) رهگذار.

**ڕیوی کرن**: ١) ڕژاندن؛ ٢) بەڕێ کردن [ف] ١) ریختن؛ ٢) راهی کردن.

**ڕێوینگ**: ١) ڕان، میگەل؛ ٢) ڕێبوار [ف] ١) گله، رمه؛ ٢) رهگذار.

**ڕیه** : ڕدێن، ڕیش [ف] ریش.

**ڕیهتن**: ١) ڕژاندن؛ ٢) ڕژیان [ف] ١) ریزاندن؛ ٢) ریختن.

**ڕیەن**: ڕان، میگەل، ڕێن [ف] رمه.

**ڕیهەڤ**: هاوال، هاودەم [ف] همدم، رفیق.

# ژ

**ژ:** ١) لە، جە، ژ؛ ٢) پیتی بادانەوە ف ١) از؛ ٢) حرف عطف.

**زا:** ١) فرزەند: (کوڕەزا، ئامۆزا)؛ ٢) بێچوی مەڕو بزن: (**زا**و ماك تێکەڵ کراوە)؛ ٣) زان، منالْ بوُن: (لە زگ و **زا** کەوتوە)؛ ٤) منالْی بو، بێچوی بو: (مەڕەکە **زا** بەرخێکی بو)؛ ٥) تازە بەدنیاهاتو: (ئەو بەرخە دوێنێ **زا**)؛ ٦) کەوابە، دەی سا: (**زا** وەرە)؛ ٧) نۆبە لە قوماردا؛ ٨) وشك، زوها، زوا ف ١) فرزند؛ ٢) بچهٔ گوسفند و بز؛ ٣) زایش؛ ٤) زاد، زائید؛ ٥) تازه بەدنیا آمده؛ ٦) پس، حالا که اینطور است؛ ٧) نوبت در قمار؛ ٨) خشك.

**زاب:** سەکۆ، دکە ف سکو.

**زابت:** ئەفسەر ف درجەدار، افسر.

**زابرن:** بردنەوەی قومار ف برد در قمار.

**زابلۆق:** زۆخلەی ئەستور ف رودهٔ کلفت.

**زابوت:** زابت، خاوەن پلە لە سوپادا، ئەفسەر ف افسر.

**زابوق:** سەرانگوێلك، گۆفك ف جای ریختن سرگین.

**زابۆق:** ئاوبڕ، دادراوی لافاو ف درهٔ مسیل باران.

**زاپەند:** دەفتەری ناونوسینی تازەزاوان ف دفتر موالید.

**زاپ:** ١) لکی جۆم، لق لە جەم؛ ٢) چەوی بان و لوُس و ناسك کە منالْ گەمەی پێ دەکەن، سواب ف ١) نهر فرعی؛ ٢) شن صاف و نازك که بازیچهٔ کودکان است.

**زاپان:** گەمە بە زاپ، سواپێن ف بازی با «زاپ».

**زاپێن:** زاپان ف بازی با «زاپ».

**زات:** ١) هەبوُن، هەیەتی: (بە **زاتی** خودا)؛ ٢) وێران، نەترسان: (**زات** ناکەم بچم) ف ١) وجود، ذات؛ ٢) شجاعت، جرأت.

**زات‌بردن:** ترساندن ف ترساندن.

**زات‌چوُن:** ئەواو ترسان، تۆقین لە ترسان ف زهره‌ترك شدن، وحشت کردن.

**زاتدار:** بەزات، ئازا، نەترس ف متهوّر، شجاع.

**زات‌کردن:** وێران، نەترسان ف اقدام، نترسیدن.

**زاتۆرە:** تۆرەمە ف نوه و نبیره.

**زاتەنە:** زەڕینی کەر ف عرعر کشیدن.

**زاتیك:** جێژنێکی هەرمەنیانە ف از اعیاد ارمنیان.

**زاتیل:** نەوەچرك، نەوەو نەتیجە ف نوه و نبیره.

**زاج:** ١) کاکۆڵی منالْ؛ ٢) زاخ ف ١) موی پیشانی بچه؛ ٢) زاج.

**زاجلانەی:** ژانی ژن لە منداڵ بوندا ف درد زایمان.

**زاجلانی:** هەوەڵ ژانی ژن لە سەروبەندی زارۆ هاوردندا ف اولین درد زایمان.

**زاج‌وپەرچەم:** کاکۆڵ و موی ناوچاوانی منالْ ف کاکل و موی پیشانی بچه.

**زاخ:** ١) کوُل، کوێل، ئاغەڵی ناو کێو؛ ٢) شەب، زاج؛ ٣) گاشەبەرد؛ ٤) دنە، هانە؛ ٥) ـەوهەری تیخی خەنجەرو شمشێر؛ ٦) خەت، هێڵ ف ١) زاغه؛ ٢) زاج؛ ٣) صخره؛ ٤) تحریك، تشجیع؛ ٥) پرند؛ ٦) خط.

**زاخان:** بەردەلانی زۆر چەوُن ف سنگلاخ صعب‌العبور.

**زاخاو:** ئاواوی زاخ کە بۆ قایم‌کردنەوەی شتی لەق بە کار دەهێنرێ ف زکاب.

**زاخاودان:** ١) قایم کردن بە زاخ؛ ٢) بڕێنی لە تەخت کردنی کەیف: (**زاخاوی مێشکم دا**) ف ١) پیوند دادن با زکاب؛ ٢) کنایه از خوش گذشتن.

**زاخاودانەوە:** زاخاودان ف نگا: زاخاودان.

**زاخدار:** ١) تیخی جەوهەردار؛ ٢) بڕێنی لە مرۆی بەحونەر ف ١) تیغ جوهردار؛ ٢) کنایه از هنرمند.

**زاخڕ:** ١) سەرە ـڕی بەرداوی؛ ٢) کوُل، ئاغەڵی لە کێودا بڕاو ف ١) نشیب سنگلاخی؛ ٢) زاغه.

**زاخۆ:** ناوی مەڵبەندو شارێکە لە کوردستان ف نام منطقه و شهری در کردستان.

**زاخوڕ:** ڕەهۆڵ ف نگا: ڕەهۆڵ.

**زاخۆر:** ۱) بەردەڵانی رژدو بڵند؛ ۲) ئەشکەوت لە کێفدا ف ۱) صخره؛ ۲) غار.

**زاخـــۆران:** ۱) هۆزێکـــە لە کوردستـــان؛ ۲) تاڵانو برۆ: (زاخـۆران باخۆرانە) ف ۱) عشیرتی در کردستان؛ ۲) غارت و چپاول.

**زاخۆری:** پارچەیەکی لە ئاوریشم ژنان دەیکەنە لەچك ف پارچهٔ ابریشمی.

**زاخۆن:** ناخەڵەمەری لە کێو دابڕاو، کوڵ، کویل، زاخ ف زاغه.

**زاخە:** زاخۆن ف زاغه.

**زاخێ:** قشقەڵە، قەلەباچکە ف زاغجه.

**زاخێز:** زاخز ف نگا: زاخز.

**زاد:** ۱) توێشو؛ ۲) دەخڵو نان؛ ۳) مناڵبەیابوون: (زادو وەلەدیان زۆره) ف ۱) توشه؛ ۲) غلّه و نان؛ ۳) تولید بچه.

**زاددان:** توێشودان ف توشەدان.

**زادووەڵەد:** کوڕو کچ زیادبوون ف تولید و توالد.

**زادو وەڵەند:** زادووەڵەد ف تولید و توالد.

**زادە:** فرزەند، بێچوی بنیادەم: (نەجیبزادە) ف فرزند.

**زادەکان:** فرزەندان ف فرزندان.

**زار:** ۱) منـاڵ؛ ۲) دەم، دەف؛ ۳) دەرمـانی جانەوەرکوژ، ژەهر؛ ۴) کزو لاواز؛ ۵) پەرێشـــان و لێقەومـــاو؛ ۶) دەنـــگـی گریان؛ ۷) مۆرەی تەختەنەرد؛ ۸) پاشگری بەواتا: جێگە، جار؛ ۹) شێوەی زمان: (زاری کرمانجی)؛ ۱۰) تۆکەبەر؛ ۱۱) چێندراو: (زەویو زار)؛ ۱۲) زراو ف ۱) کودك؛ ۲) دهـان؛ ۳) سمّ؛ ۴) لاغر؛ ۵) پریشان‌حال؛ ۶) صدای گریه؛ ۷) مهـرهٔ نرد؛ ۸) پسوند بەمعنی جای؛ ۹) لهجه؛ ۱۰) موی زهار؛ ۱۱) زراعت؛ ۱۲) زَهره، ترس.

**زارا:** ۱) ناوە بۆ ژن؛ ۲) کەو، ژەرەژ؛ ۳) نـاوی شارێکە لە کـوردستان ف ۱) نام زنانه؛ ۲) کبك؛ ۳) نام شهری در کردستان.

**زاراخن:** زارەوانە، دەمەلێبێن ف نگا: زارەوانە.

**زارانج:** کەو، ژەرەژ ف کبك.

**زارانز:** ژەرەژ، زارانج، کەو ف کبك.

**زاراو:** ۱) دەرمـانی تراوی جانـەوەرکوژ؛ ۲) میز، مێز، گمێز؛ ۳) شێوەی ناخافتن؛ ۴) دەراوی دەم ف ۱) سمّ آبکی، زهـرابه؛ ۲) شاش، ادرار؛ ۳) لهجهٔ ویژه؛ ۴) شیوهٔ سخن گفتن.

**زاراوە:** ۱) شێوەی تایبەتی ناخافتن؛ ۲) دەراوی دەم، زاراو ف ۱) لهجهٔ ویژه؛ ۲) شیوهٔ بیان.

**زاربەست:** ۱) دەمبەست؛ ۲) دەمبێن ف ۱) دهان‌بند؛ ۲) دهانەبند.

**زاربێن:** دەمبێن، زاربەست ف دهانەبند.

**زاربێنك:** ۱) زاربێن؛ ۲) زاربەست ف ۱) دهانەبند؛ ۲) پوزەبند.

**زارخۆش:** ۱) دەمخۆش، ئافەرین بۆ گوتەت؛ ۲) دەمو کاوێژ خۆش ف ۱) آفرین بر گفتارت؛ ۲) شیرین زبان.

**زارخەن:** خەندەی ناڵ، کەنین لە نارەحەتیان ف خندهٔ تلخ، زهرخند.

**زارخەنە:** زارخەن ف خندهٔ تلخ، زهرخند.

**زاردزاو:** دەم دزاو، دەمشڕ ف دهن‌لق.

**زارزار:** لاسار، بێداگر، گوێ نەدەر ف لجوج.

**زارزارك:** دەمەلاسکە ف ادا درآوردن.

**زارشڕ:** تێدانەوەستاو ف دهن‌لق.

**زارقە:** ۱) دەمەلاسکە؛ ۲) زمان دەرێنان بۆ گاڵتە پێ‌کردن ف ۱) ادای کسی را درآوردن؛ ۲) زبان به تمسخر درآوردن.

**زارك:** دەمی هەمـــوشت جگـە لە جانـەوەر: (زارکی مەشکە، زارکی ئەشکەوت) ف دهانه.

**زارگا:** بەرگەدە، جێگەی تۆکەبەر لێ‌ڕوان ف رویشگاه موی زهار.

**زارگۆتن:** ستران، گۆرانی، قام، لاوك ف ترانه، آواز.

**زارنەرم:** زمانلوس، دەمتەڕ ف چرب‌زبان.

**زارۆ:** ۱) کرمێکـە بۆ خوێنی پیس لە لەش مژین دەکار دەهێنرێ، زەرو، زێڵو؛ ۲) زارو، مناڵ ف ۱) زالو؛ ۲) کودك، بچه.

**زارۆ:** ۱) فرزەند؛ ۲) منالی چکۆڵە ف ۱) فرزند؛ ۲) کودك.

**زارۆتی:** رۆژگاری منالی، زارۆکی ف دوران کودکی.

**زارۆوزێچ:** ژنو منال، خێزان بەگشتی ف خانواده.

**زارۆك:** زارۆ ف نگا: زارۆ.

**زارۆکی:** زارۆتی، رۆژگاری منالی ف دوران کودکی.

**زارۆڵە:** زارۆ ف نگا: زارۆ.

**زارە:** ۱) گەنمەکوتاو؛ ۲) زاراو، کیسەی زەرداوی لای جەرگ؛ ۳) موی بەرگەدە، زار ف ۱) گندم نیم‌کوبیده؛ ۲) زهره؛ ۳) موی زهار.

**زارەترەك:** برێتی لە زۆرترساو، توقیو لە ترسان ف زهره‌ترك.

**زارەچوون:** زارەترەك ف زهره‌ترك.

**زارەزار:** دەنگی گریان بێ برانەوە، زوزە زوز ف صدای گریهٔ متّصل، زارزار.

**زارەگا:** ۱) جێگەی ڕوانی تۆکەبەر، زارگا؛ ۲) گوڵێکە ف ۱) رویشگاه موی زهار؛ ۲) گل میمون.

**زارەمبێن:** دەمبێن، زاربێن ف دهانەبند.

**زارەوانـە:** تۆبـەلە بەرۆ یان دار کە دە دەمی دەفری زادەکەن ف گلولهٔ وەلە یا چوب که دهانەبند می‌شود.

**زاری:** ۱) گریانو شیوەن؛ ۲) زارۆڵە، منال ف ۱) شیون؛ ۲) کودك، بچه.

**زاریان:** شینو شەپۆرکردن، گریانی تازیەمانی ف شیون کردن.

**زارین:** گریانی بەدەنگی بەرز ف گریه با صدای بلند.

**زاز:** ۱) ئامرازی ژێداری موسیقی، ساز؛ ۲) نەوە ف ۱) ساز موسیقی؛ ۲) نوه.

**زازا:** ۱) مەڵبـەنـدێکـە لە کوردستـان؛ ۲) شێوە ناخـافتنێکی نزیك بە پەهلەوی؛ ۳) نەوەو نەتەوە ف ۱) منطقه‌ای در کردستان؛ ۲) یکی از لهجه‌های کردی؛ ۳) نوه و نبیره.

**زازاکی:** ئاخافتن بە شێوەی زازایی ف تکلم به شیوهٔ «زازا».

**زاغ:** خەتی خەتکێشـان، خەتی درێژ بۆ نێوانی مەبەست، کێز ف خط افقی و عمودی در خط کشی.

**زاغور:** زاخز، زاخێز ف نشیب سنگلاخی.

**زاغوور:** خەتکێش، ئامرازی خەتدان ف خط‌کش.

**زاف:** بڕ، زۆر، گەلێك، زەحف، زیاد، زێدە ▣ بسیار.

**زاف بیایش:** زاف بوُن ▣ زیاد شدن.

**زافت:** ئەفسەر ▣ درجەدار، افسر ارتش.

**زافتر:** زۆرتر، بِتر ▣ بیشتر.

**زاف راتایی:** زۆر کەم بوُنەوە ▣ بسیار کم شدن.

**زافران:** یەری گیابەکە رەنگ زەرد بۆ دەرمان و پلاو بەکار دێت ▣ زعفران.

**زافرانی:** بە رەنگی زافران ▣ زعفرانی رنگ.

**زافزاف:** فرەفرە، زۆر زیاد ▣ بسیار زیاد.

**زاف کەردش:** زیاد کردن، زێدە کرن ▣ زیاد کردن.

**زاف نەمەند:** کەم کردو، زۆر نەمان ▣ اندك شدن.

**زافەران:** ۱) زافران؛ ۲) ناوی گوندێکە ▣ ۱) زعفران؛ ۲) نام دهی است.

**زافەرانی:** زافرانی ▣ زعفرانی رنگ.

**زافەی:** فرەیی، زیادی، زێدەیی ▣ بسیاری، زیاده.

**زافی:** زافەی ▣ بسیاری، زیاده.

**زافێر:** زافتر، زۆرتر، زێدەتر ▣ بیشتر.

**زاڤ:** ۱) ئەستێرەیەکی گەڕیدەیە؛ ۲) زۆر، فرە ▣ ۱) ستارۀ عطارد؛ ۲) زیاد.

**زاڤا:** ۱) مێردی کچ یان خوشك؛ ۲) تازەمێرد ▣ ۱) شوهر دختر یا خواهر؛ ۲) داماد.

**زاڤابەندی:** ئەو شوەی لە ماڵی باوکی بوُکدا دەژی ▣ داماد سرخانه.

**زاڤانی:** شەوی جوُنی زاوا بوُلای بوُك ▣ شب زفاف.

**زاڤدان:** منداڵدان ▣ زهدان، رحم.

**زاڤر:** ۱) زات، وێران؛ ۲) زاره، کیسەی زراو ▣ ۱) یارا؛ ۲) زهره.

**زاڤراتانی:** زافرانایی، زیادە لە کەمی دان ▣ نگا: زافراتایی.

**زاڤزاڤ:** زۆر زیاد، فرەفرە ▣ بسیار زیاد.

**زاڤ نێ مەند:** زۆری نەما، لە کەمایەتی دا ▣ اندك شدن.

**زاڤ وزیج:** زاروزێچ ▣ نگا: زاروزێچ.

**زاڤ وزێج:** زاروزێچ ▣ نگا: زاروزێچ.

**زاڤەی:** زافی، زەحفی، فرەیی ▣ زیادی.

**زاڤی:** زافی، زەحفی، فرەیی ▣ زیادی.

**زاڤێر:** ژنی زازی لە گانی مێرد ▣ زن خوشنود از جماع شوهر.

**زاق:** ۱) قەلەرەشە؛ ۲) دەنگی قەلەرەشە؛ ۳) دەربەرزیو؛ ۴) کەوە، شینی کاڵ؛ ۵) دەنگی تیژی منداڵ؛ ۶) توُقین لە ترسان ▣ ۱) غراب، زاغ؛ ۲) صدای غراب؛ ۳) برجسته؛ ۴) آبی روشن؛ ۵) جیغ بچه؛ ۶) زهره‌ترك شدن.

**زاق وزروُق:** چەقەو هەرای منداڵان ▣ همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاق وزوُق:** زاق‌وزروُق ▣ همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاق وزیق:** زاق‌وزروُق ▣ همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاقە:** ۱) دەنگی تیژی منداڵ، زاق؛ ۲) دەنگی گریانی منداڵ ▣ ۱) جیغ کشیدن بچه؛ ۲) صدای گریۀ بچه.

**زاك:** ۱) لەتکە دەنکە قەیسی کە منداڵ کایەی پێ دەکەن؛ ۲) هەوەڵ دوُشراو لە زاو، ژەك، فرچك؛ ۳) قیژەی منداڵ ▣ ۱) نیم هستۀ زردالو که بازیچۀ بچه‌ها است؛ ۲) آغوز؛ ۳) جیغ بچه.

**زاك وزوُك:** زاق‌وزروُق ▣ همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاك وزیك:** زاق‌وزروُق ▣ همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاکوُن:** یاساو قانوُن: (ناغایەکی بەزاکوُن بو کەس نەی‌دەوێرا لە زێ لادا) ▣ قانون قاطع.

**زاکە:** جیوەجیوی بەچکەمەل ▣ جیك‌جیك جوجه.

**زاگ:** ۱) لەدایك بوگ؛ ۲) منداڵ بون؛ ۳) ژەك، هەوەڵ دوُشراو لە زاو؛ ۴) شەب، زاخ ▣ ۱) زاده؛ ۲) زادن؛ ۳) آغوز؛ ۴) زاج.

**زاگروُز:** ۱) زنجیرەچیایەك لە کوردستانـدا؛ ۲) ناوە بوّ پیاوان ▣ ۱) سلسله جبال زاگرس؛ ۲) نام مردانه.

**زاگروس:** زاگروُز ▣ نگا: زاگروُز.

**زاگوّر:** پەیاغ، توخماخ ▣ چوبدست کلفت، چماق.

**زاگە:** ۱) جێگـەی لە دایك‌بون؛ ۲) لەدایك بوە؛ ۳) بێچـوی دیوە؛ ۴) گەمەیەکی منداڵانە؛ ۵) منداڵدان ▣ ۱) زادگاه؛ ۲) از مادر زاییده است؛ ۳) بچه آورده است؛ ۴) یکی از بازیهای بچه‌ها؛ ۵) زهدان.

**زاڵ:** ۱) سەرکەوتـو بەسـەر مەبەستدا یان بە سەر دوژمندا؛ ۲) زبڵ: (زبڵ و زاڵ)؛ ۳) ناوە بوّ پیاوان ▣ ۱) چیره؛ ۲) آشغال؛ ۳) اسم مردانه.

**زاڵ بون:** سەرکەوتن بەسەر کاری سەختا ▣ چیره شدن.

**زاڵم:** دەست درێژکەر بوّ مافی رەوای خەڵك ▣ ستمگر، ظالم.

**زاڵمایەتی:** زاڵمـەتی ▣ ظلم.

**زاڵمکی:** نارەوا کاری ▣ ظلم.

**زاڵمەتی:** زاڵمایەتی ▣ ظلم.

**زاڵمەی:** زاڵم ▣ ظالم.

**زاڵمینی:** زاڵمایەتی ▣ ظلم.

**زاڵنە:** پێوەندی لە زنجیر ▣ زنجیر پای‌بند.

**زاڵو:** کیسەی زەرداو، زاره ▣ زهره.

**زاڵو:** زارو، کرمی خوێن‌مژ ▣ زالو.

**زاڵە:** زارو ▣ زالو.

**زاڵە:** ۱) دادو هاوار لە دەست کەسێ، گلەو داد: (هەمو کەس لە دەستی بەزاڵەیە)؛ ۲) کیسەی زەرداو، زاره، زراو ▣ ۱) داد و گله؛ ۲) زهره.

**زاڵی:** زارو، زەرو، زاڵو، زاڵی ▣ زالو.

**زاڵـی:** ۱) دەست رۆیشتـن، سەرکـەوتـوُیی؛ ۲) زارو ▣ ۱) چیرگی؛ ۲) زالو.

**زام:** ۱) برین، رێش؛ ۲) منالم بو؛ ۳) لە دایك بوم ▣ ۱) زخم؛ ۲) بچه آوردم؛ ۳) از مادر زادم.

**زاما:** زاڤا ▣ داماد.

**زامار:** ۱) بریندار؛ ۲) منداڵدان ▣ ۱) زخمی؛ ۲) زهدان.

**زامارکەفتن:** منداڵدان وەرگەڕان ▣ زهدان از جای در رفتن.

**زامایی:** زاوایەتی ▣ دامادی.

**زامت**: چڵکی برین، کێم، هەوا [ف] ریم، چرك زخم.

**زامدار**: برینداز [ف] زخمی.

**زامرۆت**: بەردێکی کەسکی بەنرخە [ف] زمرد.

**زامرۆتی**: بەرەنگی زامرۆت [ف] زمردی.

**زامرۆتین**: کەسك وەك رەنگی زامرۆت [ف] زمردی.

**زامرۆس**: گیابەکی بۆن خۆشەو بۆ بێنی دۆکەڵەکەی دەبسوتینن [ف] گیاهی است که مصرف بخور دارد، گیاەمر.

**زامق**: چەسپ، کەرستەی لکاندن [ف] چسب.

**زامق کەردە**: چەسپێنراو، نکێندرباگ [ف] چسبانبده شده.

**زامقی**: لکێن، پێوە نوسێن [ف] چسبناك.

**زامن**: دەستەبەر [ف] ضامن، کفیل.

**زامەت**: ۱) زامت؛ ۲) پیچ، کەم، هنـدك؛ ۳) ئەرکی گران، زەحمەت؛ ۴) دەردی ئەوین [ف] ۱) چرك زخم؛ ۲) اندك؛ ۳) مشقّت؛ ۴) رنج عاشقی.

**زان**: ۱) منـاڵ هێنان، بێجودیتن؛ ۲) لەدایك بون؛ ۳) پاشگری بەوانا: ئاگادار: (پیاوێکی زۆرزان بو، سیاسـەت **زانە**)؛ ۴) زەرەر: (ئەم سەگە زانـە خرۆیە)؛ ۵) زوان [ف] ۱) زابش؛ ۲) زادن از مادر؛ ۳) پسـونـد بەمعنی داننده؛ ۴) زیان؛ ۵) زبان.

**زانا**: ۱) دانا، شت‌زان؛ ۲) ئاگادار [ف] ۱) دانا؛ ۲) آگاه.

**زاناف**: لە بیچم‌دا تەواو وەکو یەکتر [ف] شبیه.

**زانـام**: ۱) تێ گەیشتم؛ ۲) خەبـەرم وەرگرت، زانیم؛ ۳) ئاگادارم [ف] ۱) فهمیدم؛ ۲) خبر یافتم؛ ۳) دانا هستم.

**زاناندن**: تێ گەیاندن [ف] فهمانیدن.

**زاناهی**: دانایی، ئاگاداری [ف] دانایی.

**زانایش**: زانست، ئاگاداری، لێ زانین [ف] دانش.

**زانابۆخ**: زۆر زانا، فرەزان [ف] علامە.

**زانایوخی**: فرەزانی، مەعلانی، بۆ ژن دەڵێن [ف] دانشمندی.

**زانایەنە**: زاناهی [ف] دانش.

**زانایی**: زاناهی [ف] دانایی.

**زاند**: مناڵ هێنان، زارۆ پەیابوُن [ف] زائیدن.

**زاندۆر**: ئەشکەوتی سەهۆڵخانە [ف] یخچال طبیعی.

**زاندە گونایش**: لاڵەپەنە، نور [ف] الکن.

**زانس**: زاناهی، زانایی [ف] دانایی، علم.

**زانست**: ۱) زانایی، عیلم؛ ۲) تێ گەیشت [ف] ۱) علم؛ ۲) فهمید.

**زانستان**: فێرگەی بەرز [ف] آموزشگاه عالی.

**زانستگا**: جیگەی خوێندنی بەرز [ف] دانشگاه.

**زانستگە**: زانستگا [ف] دانشگاه.

**زانستم**: تێگەیشتم [ف] دانستم.

**زانستی**: ۱) زانایی؛ ۲) تێ گەیشتی [ف] ۱) علمی؛ ۲) فهمیدی.

**زانق**: چەسپ، زامق [ف] چسب.

**زانق کەردش**: زامق کەردە [ف] چسبانبده شده.

**زانقلە**: زەنگەنە، تلیسك [ف] تلسك.

**زانقۆلە**: زانقلە [ف] تلسك.

**زانقی**: نوسەکی، کەرستەی لکاندن [ف] چسب.

**زانك**: زوانە چکۆلە، ئەلنگە [ف] زبان کوچك.

**زانکۆ**: جێ کۆبونەوەی زانایان [ف] مجمع دانشمندان.

**زانگە**: جێگەی مناڵ بون [ف] زابشگاه.

**زانو**: نانبشکە [ف] خم شدۀ لوله بخاری، زانو بی.

**زانۆ**: ئەزنۆ، زرانی [ف] زانو.

**زانەخرۆ**: سەگ بان ماڵانێك کە زبان بە هاوسابان دەگەبەنێ [ف] سگ با دام زبان‌رسان.

**زانەڤان**: پسپۆر، لەکار زان [ف] کارآمد.

**زانەوە**: ۱) ناودەرچو ن لە وشکانی: (ئەندوُرەکەمان **زاوەتەوە**)؛ ۲) ناو لە کوێرەکانی هەڵقوڵینەوە: (کوێرەکانی **دەزینەوە**) [ف] ۱) نراوش آب از خشکی؛ ۲) جوشیدن چشمۀ زاینده.

**زانەیش**: پێ زانین، ئاگادار بوُن [ف] آگاهی یافتن.

**زانی**: ۱) نانیشکە؛ ۲) تێ گەیشت؛ ۳) زرانی، ئەژنۆ؛ ۴) نارام، هێمن؛ ۵) تواشـاکـە؛ ۶) ناشێ، نابێت؛ ۷) دەزانی؛ ۸) زانبوتە [ف] ۱) خم شدۀ لولـە؛ ۲) فهمید؛ ۳) زانـو؛ ۴) آرام؛ ۵) نگـاه‌کن؛ ۶) نمی‌شود؛ ۷) می‌دانی؛ ۸) دانسته‌ای.

**زانیار**: دانا، زانا [ف] عالم.

**زانیاری**: زانست [ف] علم.

**زانیایش**: پێ‌زانین، ئاگادار بوُن [ف] آگاهی یافتن.

**زانیم**: ۱) تێ گەیشتم؛ ۲) ئەژنوم [ف] ۱) فهمیدم، دانستم؛ ۲) زانو بم.

**زانین گە**: بەشێکی نابیەتی لە زانستگە [ف] کالج.

**زاو**: ۱) مێوینـەی کە بەچـکـەی بوە؛ ۲) لەدایـك‌بوگ [ف] ۱) زایـیـده؛ ۲) متولد شده.

**زاوا**: زافا [ف] داماد.

**زاوابەندی**: زافابەندی [ف] نگا: زافابەندی.

**زاور**: ۱) ناقەت، زافر، زراو، ونـران؛ ۲) مناڵ، بێچـو [ف] ۱) بارا، زهره؛ ۲) بچه.

**زاوران**: مێوینە لە دەمی مناڵ‌بون‌دا، زەیسنان [ف] ر در حال زایمان، زانو.

**زاورچون**: ۱) زارەچون؛ ۲) بێچومردن [ف] ۱) زهره‌ترك شدن؛ ۲) بچه مردن.

**زاوزو**: بێچو بەدنیا هێنانی زۆر [ف] موالید زیاد.

**زاوزۆ**: زاوزو [ف] موالید زیاد.

**زاوزوە**: زاوزو [ف] موالید زیاد.

**زاوزێ**: زاوزو [ف] موالید زیاد.

**زاوق**: جیوە [ف] جیوه.

**زاوڵە**: زارۆ، زارۆك [ف] کودك، بچه.

**زاوما**: مەڕو بەرخ و بزن و کارلەی تێکەڵاو [ف] بره و بزغاله همراه مادران.

**زاوماك**: زاوما [ف] نگا: زاوما.

**زاوە**: ۱) ئەسێرەیەکە؛ ۲) مناڵی بوە؛ ۳) لە دایك بوە [ف] ۱) تیر، عطارد؛

٢) بچه آورده؛ ٣) متولد شده است.

**زاوەره:** ١) زارۆ، زارۆڵه؛ ٢) زاڤر ف ١) بچه؛ ٢) بارا، شهامت.

**زاویته:** ١) بای ساردی ڕۆژهەڵات؛ ٢) ناوی دۆڵێك و گوندێكه ف ١) باد سرد شرقی؛ ٢) نام دره و دهی است.

**زاویر:** رەحەت بونی ژن لە گان، زاڤیر ف نگا: زاڤیر.

**زاهیر:** بەرچاو، دیار، ئاشکرا ف ظاهر.

**زای:** ١) زاخ، شەب؛ ٢) مشتوماڵ؛ ٣) مناڵت بوٚ؛ ٤) لە دایك بوی ف ١) زاج؛ ٢) صیقل؛ ٣) بچه آوردی؛ ٤) از مادرزادی.

**زایا:** ١) نۆرەمە، وەچە، بەرە؛ ٢) ژنێ کە زۆر زگوزا دەکات ف ١) نگا: نۆرەمە؛ ٢) زنی که زیاد می‌زاید.

**زابانـــدن:** یاری‌کردنی دایك لە زان‌دا ف کمـك کردن مادر در زاییدن، مامایی کردن.

**زای‌باتی‌زای:** نەوەی برای باوك، نەوەی مام ف نوهٔ عمو.

**زای‌برازازای:** نەوەی برا ف نوهٔ برادر.

**زای‌خالی‌زای:** خاڵو زازا، نەوەی برای دایك ف نوهٔ دایی.

**زایش:** زان، بێچو هێنان ف زائیدن.

**زای‌عەم‌زای:** نەوەی خوشكی باوك ف نوهٔ عمه.

**زابف:** لاواز، کەنەفت، کز، لەڕ ف لاغر مردنی.

**زابڵە:** دەنگی شیوەن‌و گریان ف صدای گریه و شیون.

**زابن:** ١) بێچوهێنان؛ ٢) لەدایك بون ف ١) بچه آوردن؛ ٢) متولد شدن.

**زاینگە:** زانگە، ئەو شوێنەی مناڵی تێدا دێتە دنیا ف زادگاه.

**زای‌وارزای:** نەوەی خوشك، خوشكەزازا ف نوهٔ خواهر.

**زابە:** ١) بیزە، نۆڵ؛ ٢) مناڵی بوە؛ ٣) لە دایك بوە؛ ٤) لە کار کەوتو؛ ٥) برێتی لە مردو: (پیاوێکی لە دەستی زابە بوە)؛ ٦) گوم، ون، وندا؛ ٧) وەچە، نۆرەمە ف ١) جنین؛ ٢) بچه آورده؛ ٣) متولّد شده؛ ٤) از کار افتاده؛ ٥) کنایه از مرده، ضایع، تلف؛ ٦) گم، ناپیدا؛ ٧) نگا: نۆرەمە.

**زایەلە:** ١) زایلە؛ ٢) دەنگ دانەوە ف ١) نگا: زابڵە؛ ٢) انعکاس صدا.

**زابەنـە:** زابن، زان، بۆ ئاژەڵی دەکـار دێنن ف زائیدن، در مورد حیوان استعمال می‌شود.

**زای‌با بك زای:** نەوەی خوشكی دایك ف نوهٔ خاله.

**زابی:** زاو ف نگا: زاو.

**زابێ:** ژنێ کە زۆر زگوزا دەکا ف زنی که زیاد می‌زاید.

**زایین:** زان، زابن ف زائیدن.

**زباره:** ئاریکاری کۆمەڵ لە کاردا، هەرەوەز ف کار تعاونی گروهی.

**زبان:** ١) بلەگۆشتی سورو پانی بزۆز لە ناو دەمدا؛ ٢) جۆری ئاخافتنی خەڵك ف ١) زبان درون دهان؛ ٢) زبان مکالمه، لغت.

**زبر:** درشت لە دەست، دژی نەرم‌و لوس، زوور ف خشن، زبر.

**زبران:** کێڵگەی بەکلۆو بەردەلان ف زمین زبر و سنگلاخی.

**زبره:** ١) درشنەی ساوارو گەنمە کوتاو؛ ٢) درشنەی لەهێڵەگ دراو، کەپەك ف ١) دانه‌های درشت بلغور و گندم کوبیده؛ ٢) نخاله.

**زبڵ:** ١) شنی گەسك‌دراوی ماڵ؛ ٢) پەین‌وپاڵ ف ١) آشغال؛ ٢) فضلهٔ دام.

**زبڵچی:** کەسێ کە زبڵ فڕێ دەدا ف آشغالی.

**زبڵدان:** جێگەی لێ‌ڕشتن یان تێ ڕشتنی زبڵ ف آشغالدانی.

**زبڵ‌ڕێژ:** زبڵچی ف آشغالی.

**زبلگە:** جێگەی زبل لێ رژتن ف زباله‌دان.

**زبۆ:** سوکەڵەناوی زبێر، ناوی پیاوانە ف مخفف زبیر، اسم مردانه.

**زبە:** سوکەڵە ناوی زبێد، ناوی ژنانە ف مخفف زبیده، اسم زنانه.

**زبێ:** زبە ف نگا: زبە.

**زبیل:** پیسایی‌و پڕوپوشێ کە لە ماڵ وەدەر دەندرێ، زبڵ ف آشغال.

**زپ:** نژە ف مالامال.

**زپڕك:** زبیکە ف جوش پوست.

**زپرکە:** کوانی زۆروردیلە لەسەر پێست، زبیکە ف جوش پوست.

**زپك:** زپرکە ف جوش پوست.

**زپەڕ:** لە سەرپەڕ، لای پێش یان دوایی ڕیز ف اول یا آخر صف.

**زت:** ١) ڕاست، بێ خواری‌و لاری، ڕەپ؛ ٢) باوخوش. لەپێش لە کارو کابەدا؛ ٣) دژ؛ ٤) گەمەیەکە بە ورده‌بەرد ئەکرێ؛ ٥) ڕوت و قوت ف ١) راست برخـاسته؛ ٢) بالادست؛ ٣) ضدّ؛ ٤) نوعی بازی با شن؛ ٥) لخت و عریان.

**زت کەردش:** ڕوێنی کردو هەرچی بوی بردی ف هرچه داشت برد.

**زتم:** داخستنی دەرگاو پەنجەرەو... ف بستن در و پنجره و....

**زتمی:** داخراو، بەستراو ف بسته، مقابل باز.

**زج:** دژ ف ضد.

**زج:** جانەوەریکە بە ئاژەڵەوە دەنوسێ ڕەنگی سوره، قورنو ف جانوری که به دام می‌چسبد.

**زخ:** ڕەڵم، قوم، ڕەمل ف شن و ماسه.

**زخت:** نەقیزە ف سیخونك.

**زخدان:** جێگەی قومی فرە ف شنزار.

**زخره:** تفاقی ساڵ، زەخیرە، ئازوقە ف آذوقه.

**زخور:** جەو، وردکە بەرد ف سنگریزه.

**زدێ:** هێز، توانا، ناقەت ف توان.

**زڕ:** ١) دژی بچـوك، زل، گەپ؛ ٢) گوشاد، هەراو؛ ٣) ناعەسڵ، بەدەڵ: (زڕدایـك، زڕبرا)؛ ٤) داری بەر کە بەر نەهێنێ؛ ٥) وشك، بر بنگ؛ ٦) خوهەڵکێشانی بەدرۆ: (ئەو قسانە زڕن)؛ ٧) دەنگی کەر؛ ٨) نڕ؛ ٩) لاسـار ف ١) گنـده، بزرگ جثـه؛ ٢) فراخ؛ ٣) بدل؛ ٤) درخت بار نیاورده؛ ٥) خشـك؛ ٦) لاف بیهـوده؛ ٧) عرعر الاغ؛ ٨) باد مقعد، گوز؛ ٩) لج.

**زڕبـاب:** ١) زڕمـام، زڕبـرای باوك؛ ٢) برای باوەبیارە؛ ٣) شێت ف ١) ناعمویی؛ ٢) برادر پدرخوانده؛ ٣) دیوانه.

**زرار:** خوسار، زیان، زەرەر، زەرەد ف زیان.

**زراری:** ١) قۆبچە، دوگمە، قوبپە؛ ٢) هوزێکی کوردە لە کوردستان ف ١) دگمه؛ ٢) عشیره‌ای کرد در کردستان.

**زرازز:** گۆرانی گوتنی کەر ف عرعر.

**زراف:** باریك ف باریك.

**زراڤك**: زراو، کیسەی زەرداو ف کیسهٔ زهره.

**زراڤیك**: زۆرباریك ف بسیار نازك.

**زراق**: گزینگی هەتاو هەوەڵ شەوقی خۆر کاتی بەبانی ف اولین تابش آفتاب صبح.

**زران**: ١) بەخراپ دەرچون: (ناوزڕان، ناوی زڕاوە)؛ ٢) بڵاوبونی نهێنی؛ ٣) خەو پەڕین؛ ٤) تازە لك دەرکردنی دار ف ١) بد بر سر زبانها افتادن؛ ٢) فاش شدن راز؛ ٣) پریدن خواب؛ ٤) تازه جوانه دادن درخت.

**زڕاندن**: ١) درکاندنی نهێنی؛ ٢) خەوپەڕاندن ف ١) افشاکردن؛ ٢) خواب پراندن.

**زرانەوە**: دەنگ دانەوەی وێك کەوتنی کانزا ف صدای بهم خوردن فلزات.

**زرانی**: زانو، ئەژنۆ ف زانو.

**زراو**: ١) زارە، کیسەی زەرداو؛ ٢) زاتسر، توانای بەرانبەری، وێران ف ١) زهره؛ ٢) یارا، شجاعت.

**زڕاو**: ١) ناوی بەخراپ رۆیشتگ؛ ٢) خەوی پەڕیو؛ ٣) تازە لك‌دەرکردگ ف ١) نام بد در رفته؛ ٢) خواب پریده؛ ٣) تازه جوانه داده.

**زراوبردن**: ترساندن ف زهره‌ترك کردن.

**زراوبردو**: بڕینی لە زۆر ترساو ف زهره‌ترك شده.

**زراوتۆقین**: زارەچون ف زهره‌ترك شدن.

**زراوچون**: زراوتۆقین، زارەچون ف زهره‌ترك شدن.

**زراونەمان**: زراوتۆقین، زراوچون ف زهره‌ترك شدن.

**زڕابش**: ١) زەڕەزەڕ کردن؛ ٢) زەنازەنا و چەقەو کوڕە ف ١) عَرعَر کردن؛ ٢) شلوغ کردن.

**زرایەنە**: زڕابش ف نگا: زڕابش.

**زرب**: زبر ف زبر.

**زڕباب**: باوەپیارە، شوی دایك ف ناپدری.

**زڕبان**: زبران ف نگا: زبران.

**زڕباو**: زڕباب، باوەپیارە ف ناپدری.

**زڕباوك**: زڕباب، باوەپیارە ف ناپدری.

**زڕبرا**: برا هەر لە باوك یان هەر لە دایك ف برادر ناتنی.

**زرپ**: ١) قەبە، زەلام؛ ٢) زبر ف ١) گُنده؛ ٢) خشَن.

**زڕپك**: زیك ف جوش پوست.

**زڕپنگ**: زەپنگ، جۆرێ پنگەزۆر بلنددەبێ‌و ناشخورێ ف گیاه بدل بونه.

**زرت**: ١) تماشای بێ چاولێکدان؛ ٢) تەڕەی گۆشتن ف ١) نگاه خیره؛ ٢) لندهور.

**زڕت**: ١) زل، گەپ، زەلام؛ ٢) خۆهەڵکێشانی بەدرۆ؛ ٣) تڕدان بە دەم؛ ٤) هەڕەشە، گەف ف ١) گنده؛ ٢) لاف؛ ٣) شبشکی؛ ٤) تهدید.

**زڕت‌دان**: ١) خۆ هەڵکێشان بە درۆ؛ ٢) قسەی بێ‌تام کردن ف ١) تکبر کردن به دروغ؛ ٢) سخن بی‌مزه گفتن.

**زڕتك**: ١) زەلامی بێ ناوەز؛ ٢) خۆهەڵکێش؛ ٣) کونی قوُن ف ١) لندهور؛ ٢) متکبر؛ ٣) سوراخ مقعد، پیزی.

**زڕتلی**: شەشە، ئەوی شەش قامکی هەبە ف کسی که شش انگشت در یك دست دارد.

**زڕتۆ**: تەژەی خوێنتال ف تنومند بدقواره.

**زڕتۆك**: خۆهەڵکێش ف لافزن.

**زڕتۆل**: تبتۆل، بزگوڕ ف لتهٔ کهنه.

**زرته**: زرت ف نگا: زرت.

**زرتەبۆز**: ١) پیری تەژەی خوێنتال؛ ٢) کەلحۆ، زەلامی نافۆلا ف ١) پیر گندهٔ بدقواره؛ ٢) لندهور.

**زرتەزرت**: تماشای خێراخێراو بێ چاوترووکاندن ف خیره‌خیره نگاه کردن.

**زڕتەزڕت**: وەرامی کەسێ کە قسەی زۆر بێنام دەکا ف جواب خودستای ژاژخا.

**زرتەزەلام**: زلحورت ف لندهور.

**زڕتەك**: خۆهەڵکێشی بێ‌نام ف خودستای دروغ‌باف.

**زڕتی**: خوێڕی‌و بێکارە ف هرزه و هیچکاره.

**زڕجان**: ١) بەدرۆخۆهەڵکێش؛ ٢) جنێو فرۆش ف ١) لافزن؛ ٢) فحّاش.

**زرجك**: گیانەکە ف گیاهی است.

**زرچ**: ١) جیقنەی مەل؛ ٢) چەکەرەی تازە دەرهاتگ ف ١) چلغوز؛ ٢) جوانهٔ تازه.

**زڕچایش**: نەڕاندن، گوڕەوهەرا کردن ف داد زدن.

**زڕچایەنە**: زڕچایش ف نگا: زڕچایش.

**زرچك**: جۆنە، لوشکە، لەتەی کەر ف جفتك.

**زڕچۆنە**: بێ‌نرخ، نەهێژا ف بی‌ارزش.

**زرخ**: زرێ، کراسی ئاسنی شەڕکەران ف زره.

**زڕخۆسسی**: زڕخەسۆ، زڕدایکی هاوسەر ف نامادری همسر.

**زڕخوشك**: خوشکی هەر لەباب یان هەر لەدایك ف خواهر ناتنی.

**زڕخوەه** : زڕخوشك ف خواهر ناتنی.

**زڕخۆینك**: زڕخوشك ف خواهر ناتنی.

**زڕخەزوُر**: زڕبابی ژن یان مێرد ف پدرخواندهٔ همسر.

**زڕخەسو**: زڕدایکی بوك یان زڕدایکی مێرد ف نامادری زن یا شوهر.

**زڕداك**: باوەژن ف نامادری.

**زڕدایك**: زڕداك ف نامادری.

**زڕدەلو**: نێرینەی مرۆڤی شێت‌و دەبەنگ ف مرد دیوانهٔ خول.

**زڕدەلوی**: مێوینەی شێت‌و دەبەنگ ف زن دیوانهٔ خول.

**زڕدەلی**: زڕدەلو ف نگا: زڕدەلو.

**زڕەك**: هەفەمەق، نەزان، نەفام ف احمق، کم فهم.

**زرز**: زیز، زوُیر، قەلس ف عصبانی.

**زڕزڕ**: دەنگی گربانی زبر و بەقەو ف صدای گریهٔ ناهنجار.

**زڕزڕە**: خڕخاسە، خشخشە ف خشخشه اسباب بازی.

**زڕزۆپ**: بێ ئابڕو، بێ شەرم ف بی حیا.

**زرزی:** نوزه‌بی ف عصبانیّت.

**زرفستق:** بادامه‌زه‌مینه ف بادام زمینی.

**زرقتك:** جانه‌وه‌ریكی چكۆله‌ی جزوداره پێوه ده‌دا، زه‌رگه‌نه، زه‌رده‌واله ف زنبور زرد خرد، موسه.

**زرقتكی:** زرقتك ف نگا: زرقنك.

**زرقتی:** زرقنك ف نگا: زرقتك.

**زرك:** ۱) به‌هۆش، چوست، چالاك؛ ۲) ناسۆكه ف ۱) چالاك؛ ۲) طاس مسین.

**زرك:** حه‌نجوێ خرجه. گندۆره‌ی كاڵ، قه‌ره خرجه ف خربزهٔ نارسیده.

**ژركان:** ناوی هۆزێكی كورده ف نام طایفه‌ای از كُردها.

**زركتك:** ۱) زرقتك؛ ۲) باڵداریكی زه‌ردی چكۆله‌یه له فه‌ناری ده‌كا ف ۱) نگا: زرقتك؛ ۲) پرنده‌ای زرد كه به فناری شبیه است.

**زركچ:** كچی مێرد بۆ باوه‌ژن یان كچی ژن بۆ باوه پیاره ف دخترخوانده، نادختری.

**زركۆ:** گیای گێره‌كراو، گزره ف گیاه كوبیده، پرس.

**زركوڕ:** كوڕی ژن بۆ زڕباب یان كوڕی پیاو بۆ زڕداك ف پسرخوانده، ناپسری.

**زركوزینگ:** وریاو چالاك. چوست‌و مه‌زبوت ف جست و چالاك.

**زركه:** خرجه ف خربزهٔ كال.

**زركه‌تاڵ:** گوژالك، كاله‌كه‌مارانه ف هندوانهٔ ابوجهل.

**زركه‌تی:** زرینگانه‌وه، ده‌نگی كه‌وتنی كانزا ف صدای افتادن جسم فلزی.

**زركه‌چ:** كچ حه‌لی، زركچ ف نگا: زركچ.

**زركینك:** ۱) زرقتك؛ ۲) زركنك ف نگا: ۱) زرقتك؛ ۲) زركنك.

**زرگویز:** ۱) داریكه له گوێز ده‌كاو به‌ر ناهێنێ؛ ۲) گوندێكه له كوردستان ف ۱) درختی گردوسان بی‌ثمر؛ ۲) نام روستایی در كردستان.

**زرگویزه‌له:** گوندێكی كورده به‌عسی ویرانیان كرد ف نام روستایی در كردستان.

**زرگه‌زوك:** ۱) گه‌زگه‌زك؛ ۲) ناوی گوندێكه له كوردستان ف ۱) گیاه گزنه؛ ۲) نام روستایی در كردستان.

**زرگێزه‌ر:** گیایه‌كی ده‌شته بنه‌كه‌ی له گێزه‌ر ده‌كا ف گیاهی است شبیه هویج.

**زرگێزنوك:** گیایه‌كه جانه‌وه‌ر بیخوا پێی ده‌مرێ ف گیاه شوكران.

**زرم:** ده‌نگی كه‌وتنی شتی نه‌رم‌و گران ف صدای افتادن جسم سنگین نرم.

**زڕماك:** زڕداك، باوه‌ژن، زردایك ف نامادری.

**زڕمام:** بروانه‌بو: زڕناب ف نگا: زڕناپ.

**زرم‌وكوت:** زرمی زۆر ف نراب و تروپ.

**زرمه:** زرم ف نگا: زرم.

**زرمه‌زلێ:** هه‌ڵبه‌زین‌و مل ده‌به‌ریه‌ك نان بۆ گاڵته ف گلاویزشدن و پابكوبی به‌قصد شوخی.

**زرمه‌زلیتانی:** زرمه‌زلێ ف نگا: زرمه‌زلێ.

**زرمه‌زلیته:** زرمه‌زلێ ف نگا: زرمه‌زلێ.

**زڕنا:** ئامرازێكی مۆسیقایه فوی پێدا ده‌كرێ، زوڕنا ف سرنا.

**زرنای:** له‌خه‌و راپه‌ڕین ف پریدن از خواب.

**زرنگ:** ۱) زرك، وریا، وشیار، مه‌زبوت؛ ۲) ده‌نگی مس‌و زێڕو زیو؛ ۳) ڕۆنی تاواوه، ڕۆنی زه‌نگ ف ۱) زرنگ؛ ۲) صدای مس و طلا و نقره؛ ۳) روغن تفیده.

**زرنگان:** ۱) ده‌نگ دانه‌وه‌ی مس‌و زێڕو زیو؛ ۲) بڕیتی له بێ‌قه‌دربون ف ۱) صدا دادن مس و طلا و نقره، درنگ؛ ۲) كنایه از بی‌احترام شدن.

**زرنگانه‌وه:** ۱) ده‌نگ دانه‌وه‌ی مس‌و زێڕو زیو؛ ۲) دره‌نگ بون كه بۆ شه‌و ده‌گوترێ: (شه‌و **زرنگایه‌وه** یا بنو بن)؛ ۳) ده‌نگ له گوێ هاتن: (گوێم **زرنگایه‌وه**)؛ ۴) بندر بونه‌وه؛ ۵) دو جار له كلدا سوربونه‌وه ف ۱) صدا دادن فلزات؛ ۲) درنگی وبزهٔ شب؛ ۳) زنگ زدن گوش؛ ۴) نیم خشك شدهٔ نر؛ ۵) دوباره در كوره سرخ شدن سفال.

**زرنگه:** ده‌نگی وێك كه‌وتنی كانزا ف صدای به‌هم خوردن فلزات. درنگ.

**زرنگوهوڕ:** زرنگه‌ی زۆر ف درنگ درنگ.

**زرنگه‌زرنگ:** زرنگه‌ی زۆر ف درنگ درنگ.

**زرنگی:** چالاكی، مه‌زبوتی، چوستی ف زرنگی.

**زرنگین:** زرنگه ای‌هاتن ف صدای درنگ دادن.

**زڕنه:** زه‌نگ لێدان ف زنگ اخبار زدن.

**زڕنه‌ڤان:** زوڕنازه‌ن، زوڕنالێ ده‌ر ف نوازندهٔ سُرنا.

**زڕنه‌قوته:** به‌چكه چێشكه‌ی نوك لێ نه‌هاتو ف جوجه گنجشك پر درنیاورده.

**زرو:** ۱) زبر؛ ۲) گیایه‌كی گه‌ڵاباریكه ف ۱) زبر، خشن؛ ۲) گیاهی است.

**زروبی:** كولێره‌ی ته‌نكی له‌ڕۆندا هه‌ڵقرچاو، ناوساجی ف نوعی نان روغنی.

**زروق:** ۱) ترس‌و له‌لانه ده‌ربه‌ڕینی نێچیر؛ ۲) [illegible] ه‌ی كه‌نی ساوا ف ۱) ترس و رمیدن نخچیر؛ ۲) صدای خندهٔ بچ[illegible]

**زروقان:** ۱) بازره‌بون؛ ۲) ترپقه‌ی پێكه‌نینی منداڵی ساوا ف ۱) منواری شدن نخچیر از ترس؛ ۲) هرهر خندهٔ نوزاد.

**زروقانه‌وه:** تریقانه‌وه‌ی منالی ساوا ف هرهر خندیدن نوزاد.

**زروقاو:** بازره‌بوگ ف نخچیر از ترس منواری شده.

**زروكه:** ۱) جروكه، ده‌نگی مه‌لی بچوك؛ ۲) جیكی مشك ف ۱) صدای گنجشكان؛ ۲) ماژ موژ موش.

**زروكه زروك:** جروكه‌جروك ف صدای گنجشكان.

**زروه:** ۱) زبره؛ ۲) گیایه‌كه ف ۱) زبر است؛ ۲) گیاهی است.

**زروی:** زروێ ف جوبك.

**زروێ:** نه‌سپوێن ف جوبك لباسشویی، اشنان.

**زرویی:** زروێ ف جوبك.

**زره:** سه‌ركه‌وای له ئاسن هۆنراو كه بۆ شه‌ڕ ده‌به‌ر ده‌كرا ف زره.

**زڕه:** ۱) ده‌نگی زاتله‌كانی زنجیر؛ ۲) گۆرانی گوتنی كه‌ر؛ ۳) زن به‌ده‌ڵ ف ۱) جرنگ؛ ۲) عرعر الاغ؛ ۳) بدل.

**زڕەباوێشك:** باوێشکی زل وزۆر ف خمیازه متوالی و طولانی.

**زڕەبلبل:** مەلێکی بۆری پچوکە دەنگی وەك بلبلە ف پرنده‌ای است کوچك خوش آواز.

**زڕەپنگ:** زڕپنگ ف نگا: زڕپنگ.

**زڕەزڕ:** دەنگی زڕەی زۆر ف صدای زرزر بسیار.

**زڕەق:** زڕوڤ، تریقەی ساوا ف صدای خندهٔ بچه.

**زڕەقیان:** کەنینی ساوا بە دەنگ ف خندیدن بچه با صدای بلند.

**زڕەك:** ناتەی سەر چاوی بەکسم و ماڵات کە لە بروسکەوە نوشیان دێت ف لکهٔ چشم حیوانات از اثر برق.

**زڕەك:** ١) هەقمەق؛ ٢) شەڕفرۆش؛ ٣) وشکاو، کەم کردن: (گوهانێ چێلەکێ زڕەکان) ف ١) احمق؛ ٢) ستیزەجو؛ ٣) خشك شدن.

**زڕەکادەروێشی:** تایفەیەك لە مەنگوڕان ف طایفه‌ای از ایل منگور.

**زڕەکەو:** باڵداریکە بۆرو لە کەو پچوکتر ف پرندهٔ کبك‌سان حلال گوشت.

**زڕەمار:** ماری زۆرزل ف مار بسیار بزرگ.

**زڕەمێر:** پیاوی بە هەبکەلو فەلافەت ف لندهور.

**زرهوك:** گوڵابانون، ئەو شربتە رەنگینەی کە ملی عابای پێ دەرەنگێنن ف گلابنون.

**زڕێ:** ١) زرە؛ ٢) دەلیا، دەریا: (زرێبار) ف ١) زره؛ ٢) دریا.

**زڕێ نامایش:** ١) زەڕاندن؛ ٢) زەنازەنا کردن؛ ٣) بێ‌شەرم و شوڕەبێ بون ف ١) عرعر کردن؛ ٢) شلوغ کردن؛ ٣) بی‌حیا بودن.

**زریا:** دەلیا، بەحر ف دریا.

**زڕیاگ:** ١) زڕاو؛ ٢) زنجیری زاتلەکاوی دەنگ لێ‌هانگ؛ ٣) زروقاو، بازرە ف ١) نگا: زڕاو؛ ٢) جلنگیده؛ ٣) حیوان متواری شده.

**زربان:** بای باشوڕ، بای قوبلە ف باد جنوب.

**زڕیان:** زڕان ف نگا: زڕان.

**زڕبانەوە:** دەنگی زنجیر لە بزوتنا ف جرنگیدن.

**زرێبار:** ١) رەخی دەلیا؛ ٢) وەك دەلیا؛ ٣) دەرباچە، گۆل؛ ٤) دەرباچەیەکە نێزیکی مەریوان ف ١) کرانهٔ دریا؛ ٢) دریاسان؛ ٣) درباچه؛ ٤) دریاچه‌ای در مریوان.

**زرێپۆش:** ١) کەسێ کە زرێی دەبەردابە؛ ٢) هەرجی گوللە نابڕێ ف ١) آنکه زره بر تن دارد، زره‌پوش؛ ٢) آنچه ضدگلوله است، زره‌پوش.

**زڕیچ:** قەلایی، ئەو کانزا نەرمەی مسی پێ سپی دەکەنەوە ف قلع.

**زرێچ:** چرنش، ئەسرێلك، سرێش ف سر بشم.

**زرێچە:** دەرباچە، زرێبار، گۆل ف دریاچه.

**زڕێدار:** زرێ‌پۆش ف نگا: زرێ‌پۆش.

**زریز:** درکەزی، جۆرێ دەوەنی زۆر بەدرکە ف نوعی درختچهٔ خاردار.

**زڕیزانە:** گیایەکە لە ناو گەنمدا دەڕوێ و بۆ گەنم زیانی هەبە ف گیاهی است آفت گندمزار.

**زڕیزە:** زنجیروکەی زۆر باریك ف زنجیر بسیار باریك.

**زریسك:** داریکی کەم‌باڵا بە بەریکی رەش‌سوری ترش دەگرێ و بەکاڵی و بەکولبوی دەخورێ ف زرشك.

**زربشك:** زربسك ف زرشك.

**زریك:** هاواری تیژ و باریك ف جیغ.

**زریکان:** زریك ف جیغ.

**زریکاندن:** ١) بە دەنگی تیژو باریك هاوار کردن، قیژاندن؛ ٢) مچورك بێ داهاتنی ئەندام ف ١) جیغ کشیدن؛ ٢) نیرکشیدن اندام.

**زریکە:** ١) زریك؛ ٢) مچورك ف ١) جیغ؛ ٢) نیرکشیدن اندام.

**زریمزروك:** جۆرێ چۆلەکەی دەشت ف گنجشك سانی است.

**زڕین:** زڕان ف نگا: زڕان.

**زرینچك:** زەرداوی دەمی برین ف زردابهٔ دهانهٔ زخم.

**زرینچکاو:** زرینچك ف زردابهٔ دهانهٔ زخم.

**زرینگ:** زرنگ ف نگا: زرنگ.

**زرینگان:** زرنگان ف نگا: زرنگان.

**زرینگانەوە:** زرنگانەوە ف نگا: زرنگانەوە.

**زرینگە:** زرنگە ف نگا: زرنگە.

**زرینگین:** زرینگان ف صدای برخورد دوجسم فلزی.

**زرێوار:** زرێبار ف نگا: زرێبار.

**زرێوان:** کەسێ لە سەر دەریا کار دەکا ف کارگر در دریا.

**زریوە:** ١) تروکەی ئەستێرە: (ئەستێرە زریوە زریویانە)؛ ٢) جریوەی چۆلەکە ف ١) سوسو زدن ستاره؛ ٢) جیك‌جیك گنجشکان.

**زریوەزریو:** زریوەی یەك لەدوی یەك ف «زریوه»ی پیاپی.

**زریە:** دەلیا ف دریا.

**زسان:** سێ‌مانگەی پاشینی ساڵ، کۆی سەرماوسۆڵە ف زمستان.

**زستان:** زسان ف زمستان.

**زستانە:** شتێ کە تایبەتی زستانە ف زمستانی.

**زستانەزێ:** بەرخێ کە لەزستاندا لە دایك بوبێ ف برهٔ متولد در زمستان.

**زستانەوار:** جێ ژیانی کۆچەر لەزستاندا، گەرمەسێر ف قشلاق.

**زستانەیی:** زستانە ف زمستانی.

**زستانی:** زستانە ف زمستانی.

**زشت:** ١) ناپەسند؛ ٢) ناحەز ف ١) و ٢) زشت.

**زغاڵ:** رەژی، رەژو، خەڵوز، رێژی ف زغال.

**زغاڵدان:** رەژیدان ف اشبو، زغالدان.

**زغاڵدو:** زغاڵدان ف اشبو، زغالدان.

**زغرك:** بەردەورنکە ف سنگر بزه.

**زفت:** جۆرێ قیلی کانزا کە بۆ دەرمان دەشێ ف نوعی قیرمعدنی.

**زفتك:** زیپکەی عازەوی کە لە روی تازەلاوان پەیدا دەبێ ف جوش غرور.

**زفتی:** پیاوی داروغە ف مأمور شهربانی.

**زفر:** وردەو پردەی پەرژبوی ورکە نان و گرار ف ریزهٔ نان و غذای باقیمانده در سفره.

**زفقیل:** سەردەرانەی ماڵ ف سَر دَر خانه.

**زڤار:** بزگور، تیتوڵ ف پارهٔ نواری از قماش.

**زڤارزڤار:** شڕ و وڕ، لەت و پەت ف لت‌وپار.

**زڤاف:** ١) جۆرێ گاسن؛ ٢) ناوی گوندێکه ف ١) نوعی گاوآهن؛ ٢) نام دهی.

**زڤان:** جوجەڵە مریشك، بەچکەمامر ف جوجهٔ مرغ.

**زڤـڕ:** ١) خول، سوڕ؛ ٢) گەڕانـەوە، بەرەو دوا هاتنـەوە ف ١) چرخ، چرخش؛ ٢) برگشت.

**زڤڕان:** ١) خول خـ واردن، ٢) بەرەودوا هاتنـەوە ف ١) چرخـیدن؛ ٢) برگشتن.

**زڤـڕك:** جانـەوەرێکی سوورو زەردی چزو دارەو لە زەرگەتـە زلتـرە. ژەنگەسوورە، سێو ف زنبور سرخ درشت.

**زڤڕین:** زفڕان ف نگا: زڤڕان.

**زڤستان:** زسان ف زمستان.

**زڤل:** سەرانگوێلك، جێ ریخو شباکه ف انبار پهن.

**زڤنگ:** ١) ئەشکەوت؛ ٢) ناوی گوندێکە؛ ٣) زستانه هەوار ف ١) غار؛ ٢) نام دهی است؛ ٣) قشلاق.

**زڤبر:** عاجز، نارەحەت ف افسرده، ناراحت.

**زڤیرك:** گێژەلوکه ف گردباد.

**زق:** ١) خوس، خوسـار، سبخـوار، خوێس، زوقم، خوبز؛ ٢) سەرمـاو بەستەلـەك؛ ٣) رەقو بەرجەستە ف ١) یخ، سرماریزه؛ ٢) سرما و یخبندان؛ ٣) برجسته.

**زقاف:** خێشك، نامرازێکه شێوەردی پێ لێكو لوس دەکەن ف ماله برای صاف کردن زمین زراعی.

**زقاق:** کوچە، کوڵان، تاخ ف کوچه.

**زقاو:** تەڕەزن، ناوێ کە لە قەراغ مێرگ دەدەلێ ف آب اضافی که از کنارهٔ چمنزار به بیرون می‌تراود.

**زق بیایەنە:** قیت و قنج ویستاوە ف راست ایستاده.

**زقل:** فسل، کلس ف آهك.

**زق و زوا:** زۆر زۆر وشك، فرە زوها ف تمام خشك.

**زقوم:** زۆر تاڵ وەك ژەهری مار ف بسیار تلخ.

**زقـوم نابش:** بە قوزەلقـورت بوُن، نۆش نەبـون ف مقابل نوش‌جان شدن، کوفت شدن.

**زك:** ١) لە خوار دەفەی سنگەوە تاران، زگ، سك؛ ٢) نوُل، پیزه: (براژتم زکی هەبە) ف ١) شکم؛ ٢) جنین.

**زك ئێشە:** دەردی ناو زك ف شکم‌درد.

**زك بەردان:** برێتی لە زۆر خواردن ف کنایه از پرخوری.

**زك بەل:** ورگن، تەنگە نەسنوُر ف شکم گُنده.

**زکپڕ:** حامله، زگپڕ ف حامله، باردار.

**زك پێ سوُتان:** بەزه پێدا هاتنەوە ف متأثر شدن.

**زك پێ شەوتین:** زك پێ سوُتان ف نگا: زك پێ سوُتان.

**زك تێر:** نەبرچی ف سیر، مقابل گرسنه.

**زك تێر:** زۆر خۆر ف پُرخور.

**زك چك:** والایی لەناو دڵدا ف فراخنای قلب.

**زك جوُن:** بەلەفیرە ف اسهال.

**زکـدڕاو:** ١) برێتی لە زۆرخۆر؛ ٢) ناوی گوندێکە لە کوردستان ف ١) کنایه از پرخور؛ ٢) نام دهی است در کردستان.

**زك دێلك:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.

**زك ڕۆین:** زك چوُن ف اسهال.

**زکڕەش:** دەبنەوەبڕ، زکوُنی، ڕق لەزك ف بدنهاد، کینه‌ای.

**زك ڕەقی:** نەخۆشیەکی حەسنەمە ف کزاز.

**زکزل:** ورگن ف شکم گنده.

**زکسوُتان:** برێتی لە منداڵمردن ف کنایه از مرگ فرزند.

**زکسوُتاو:** فرزەند مردگ ف فرزند مرده.

**زك شەوات:** زك سوُناو ف فرزند مرده.

**زك شەواتی:** زك سوُتان ف مردن فرزند.

**زك کردن:** منداڵ هێنان، دزی نەزوکی ف بچه آوردن، مقابل نازایی.

**زك کوُر:** چلێس، بەرچاوبرسی ف حریص در خوردن.

**زك کێشکی:** لە سەر زگ خزین ف برشکم خزیدن.

**زك گرتی:** قەبز، دژی زگ رەوان ف یبوست.

**زك گیری:** قەبزابەنی، دژی ڕەوانی ف یبوست.

**زك لە وەڕاندن:** چلێسی، ماڵەوماڵ کردن بۆ خواردن ف سورچرانی.

**زك لەوەڕین:** چلێس ف سورچران، طفیلی.

**زکماك:** هەر کە لە دایك بوە: (کوێری **زکماك**) ف مادرزاد.

**زکمانگ:** زکماك ف مادرزاد.

**زکن:** چلێس، زۆرخۆر ف سورچران، شکم‌پرست.

**زکوزا:** زاوزێ ف موالید.

**زکوزاکەر:** ژنێ کە لە زان ناوەستێ ف زنی که از زاییدن بازنمانده.

**زکوُن:** چلێس، زك کوُر ف حریص در خوردن.

**زکوُنی:** چلێسی ف شکم‌پرستی.

**زکەشۆرە:** بەلەفیرە ف اسهال.

**زکەشۆرێ:** زکەشۆرە ف اسهال.

**زکەماسێ:** نەخۆشی ناوبەند. نبسقایی ف بیماری استسقا.

**زکی پێ:** قوڵایی ناوەندی بەری پا ف قوس پا.

**زکین:** زکوُنی، چلێس ف شکم‌پرست.

**زگ:** بڕوانە «زك»و هەرچی لەدوای ئەم وشە هاتوە ف نگا: «زگ» و متفرّقاتش.

**زگار:** ١) زبارە، هەرەوەز؛ ٢) کزو کەنەفت و دڵ بەخەم؛ ٣) ورکە بەرد ف ١) تعاون کشاورزان؛ ٢) ملول و افسرده و لاغر؛ ٣) سنگریزه.

**زگانە:** ژیاندن بە نانەزگ ف نگهداری کردن با غذای بخوررو نمیر.

**زگ شێلان:** برێتی لە زۆرمیوان بوُنی کەسێك ف کنایه از زحمت مهمان شدن.

**زگـورد:** ١) ڕەبـەن، سەڵت، پیـاوێ کە ژنی نەهێناوە؛ ٢) بێچـارە ف ١) مجرّد، نامتأهل؛ ٢) بیچاره.

**زگەڕۆ:** زکدڕاو ف کنایه از پرخوری.

**زل:** ١) درێژو نەسنـور، گەورە؛ ٢) پابەبەرز، بەدەسەڵات؛ ٣) تواشا بە چاودەرپـەڕیوی: (**زل زل** تواشـای کردم)؛ ٤) پوُشکـەی باریکی

لاسكی گیا؛ ۵) ئەستێرەكە، ئەستێرەی ڕۆژێ؛ ۶) مینكەی مێو بنە؛ ۷) چیتك ف ۱) بزرگ‌جثه؛ ۲) بلندپایه؛ ۳) نگاه خیره؛ ۴) ساقهٔ لخت و كندهٔ گیاه؛ ۵) ستارهٔ سحری؛ ۶) چچول؛ ۷) نی.

**زلاقونك**: پۆش بەقنگە، زل‌بەقونە ف سنجاقك.

**زلام**: ۱) گەپ، زل؛ ۲) نۆكەر؛ ۳) پیاوی بێ‌ناو ف ۱) بزرگ‌جثه؛ ۲) نوكر؛ ۳) مرد بی‌نام و نشان.

**زلان**: ۱) زربان؛ ۲) باهۆز، گێژەڵۆكە ف ۱) باد جنوب؛ ۲) گردباد.

**زلبری**: بیجەك، نۆزولكە، كەموسكە، برۆكە ف كمتر بن مقدار.

**زلبوون**: ۱) لە پچوكی دەرچوون، بالاكردن؛ ۲) بابە بەرەژوورچوون ف ۱) نموكردن؛ ۲) بلندپایه شدن.

**زلبەقونە**: جانەوەریكی چوارباڵی فنگ درێژە لەنێوان بەپولەو كلۆدا، پۆش‌بەقنگە ف سنجاقك.

**زلپاتە**: زلبری ف نگا: زلبری.

**زلپك**: زیك، زیركە ف جوش صورت.

**زلچە**: دەنگی شتی نەرمی نەرم كە پای لێ نێن بان بە دەست بیگوشن: (كەوشەكەم هەر **زلچەی** دێ، پلاوەكە هەر **زلچەی** دێت) ف صدای جسم تر نرم كە با پا یا دست فشرده شود.

**زلچەزلچ**: زلچەی لە دوی یەك ف «زلچە»ی پیاپی.

**زلحۆ**: نەژەی ناقوڵا ف لندهور بدقواره.

**زلحۆرت**: زلحۆ ف نگا: زلحۆ.

**زلزل**: تماشاكردنی بە چاودەرپەڕاوی ف خیره‌خیره نگاه كردن.

**زلزلە**: كێم و هەوای بربن، چلكی بربن ف ریم، چرك زخم.

**زلف**: زڵف ف زلف.

**زڵف**: پرچ، كەزی، بسك، دەستە نۆكە سەری سەر لاجانگ ف گیسو، موی برعذار، زلف.

**زڵفنج**: ۱) گیابەكی ناڵ و ژاراوی كە نۆژەكەی دەرمانی گیانداری كرمێ‌بە؛ ۲) جوێنێكە وەك سندان، قوزەڵقورت ف ۱) گیاهی است ضد كرمو بی دام؛ ۲) كلمه‌ای بەجای كوفت و زهرمار.

**زلفنچك**: چلك و كێم لە بربن ف چرك زخم.

**زلفۆ**: ۱) پیاوی بەسەرو پرچ و كاكوڵ؛ ۲) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) مرد موی سر و كاكل‌دراز؛ ۲) نام مردانه.

**زلق**: بزوز و هار و هاج ف بازیگوش، ناآرام.

**زلق**: ۱) سەوزیەكە خەرمی چۆنەر گەلای بۆ دۆلمەو ناش دەبێ؛ ۲) حەری و لبنەی خلبسك ف ۱) نوعی سبزی از تیرهٔ چغندر؛ ۲) گل و لای لبز.

**زلقاو**: ۱) قوڕو لبنە، حەڕیا نراو؛ ۲) ناشی سلق ف ۱) منجلاب؛ ۲) شلهٔ گیاه «زلق».

**زلقتی**: ۱) مۆزە زەردە؛ ۲) زەرگەتە، زەردەواڵە ف ۱) نوعی مگس كە بە حیوانات نیش می‌زند؛ ۲) زنبور زرد.

**زلك**: زڕو زەلام ف تنومند گُنده.

**زلكوڕ**: كەسێ كە چاوی بەدیمەن ساغەو ناش‌بینێ ف نابینایی كە عیب در چشمش ظاهر نیست.

**زلكوێر**: زلكوڕ ف نگا: زلكوڕ.

**زلكە**: ۱) جۆری ترێ؛ ۲) جۆری سلق ف ۱) نوعی انگور؛ ۲) گیاهی از تیرهٔ چغندر.

**زللك**: ۱) بەلۆكە؛ ۲) دەنكە شەمچە ف ۱) چچوله؛ ۲) چوب كبریت.

**زللە**: ۱) بە پانایی دەست لەلارومەت دان، شەق، شەقام، شەپەلاخە؛ ۲) گاڵتەجار ف ۱) سیلی؛ ۲) مسخره.

**زڵم**: نارەوایی ف ظلم.

**زڵمبۆ**: گەزۆ، شیلەی دار مازو كە وەك شەونم دەبارێ ف شیرهٔ درخت مازوج.

**زلمزۆ**: گەزۆ ف گز قنادی.

**زلۆبی**: زرۆبی، ناوساجی ف نگا: زرۆبی.

**زلۆبیا**: جۆری شیرنی لە شیرنی‌خانە ئەیكەن، لە ڕەگەزدا واتا: شباوی پارولێ گرتن ف زلوبیا، زولبیا.

**زلووت**: ۱) ڕۆنی باریك؛ ۲) سەربێ مو؛ ۳) ڕووت و قووت ف ۱) لخت باریك؛ ۲) سر طاس؛ ۳) عریان.

**زلۆر**: قەسەڵی ناو ناخور، كای درشنی بەرماوی ماڵات ف پس‌ماندهٔ كاه در آخور.

**زلۆرە**: زلۆر ف نگا: زلۆر.

**زلۆق**: زەق، مولەق: (چاقی ڤێ **زلۆق** مان) ف چشم خیره و برآمده.

**زلۆك**: ۱) چیلكەی كورتی باریك؛ ۲) دەنكە شەمچە ف ۱) چوب كوتاه باریك، خلال؛ ۲) چوبك كبریت.

**زلۆكە**: زلۆك ف نگا: زلۆك.

**زلە**: ۱) پیاوی نەژە، زل: (كابرابەكی **زلە** هانە لام)؛ ۲) شەقام، زللە ف ۱) تنومند؛ ۲) سیلی.

**زڵە**: چەقەو هەرا، چەقەچەق ف همهمه و جنجال.

**زڵەزڵ**: زڵەی زۆر ف جنجال زیاد.

**زڵهە**: زڵە ف نگا: زڵە.

**زلی**: ۱) زلامی، ئەستوری و درێژی؛ ۲) پابە بەرزی ف ۱) گُندگی و درازی؛ ۲) بلندپایگی.

**زلێ**: سوكەڵەناوی زلێخا ناوی ژنانە ف مخفف زلیخا نام زنانه.

**زلیناو**: چلپاو، قوڕو لبتە ف لای و لجن.

**زلێخا**: ناوی ژنەكوێخابەكی فیرعەونی میسر بوە كە وسو پێغەمبەری كرێوەو خۆشی ویستوە ف زلیخا.

**زلیقۆ**: دەموكانە، جۆری چەسپە ف مو بزك، نوعی چسب.

**زم**: سەرما، ساردی ف سرما، سردی.

**زما**: سەرما، زم ف سرما.

**زماك**: نزار، نسار، شوێنێ لە چیا كە ناوی وێ ناكەوێ ف جای همیشه سایه در كوه.

**زماكی**: زمانی دایكی ف زبان مادری.

**زماگ**: نسار، زماك ف جای همیشه در سایه.

**زمان**: زبان ف نگا: زبان.

**زمان‌بەد**: جنێوفرۆش ف بدزبان.

**زمان‌تەڕ:** دەم‌تەڕ ف چرب‌زبان.

**زمانپاك:** جوێن‌نەدەر ف پاك زبان.

**زمانپیس:** زمان‌بەد ف بدزبان.

**زمانتاڵ:** دەمتاڵ ف تلخ سخن.

**زمـانـدار:** ١) چەقـەسـرو، چەنـەبـاز؛ ٢) دەم راست، رەوان‌بێـژ ف ١) زبان‌دراز، پرگو؛ ٢) فصیح.

**زماندرێژ:** زماندار ف زباندراز.

**زمان‌رەش:** دەم‌پیس، قسەرەق ف بددهن.

**زمان‌زان:** کەسێ کە شێوەی غەوارە لە گەلی خۆی دەزانێ ف کسی کە زبان بیگانە داند.

**زمان‌شڕ:** زارشڕ ف دهن‌لق.

**زمان‌شکان:** زمان لە گۆچون لە نەخۆشی یان لە سەرمان یان لە تینگی ف زبان از حرکت افتادن.

**زمان شیرن:** قسەخۆش ف شیرین زبان.

**زمان شیرین:** زمان شیرن ف شیرین زبان.

**زمان کێشان:** برێتی لە تینگی فرە کە مرۆ دەکەوێتە هەناسەدان ف کنایە از منتهای تشنگی.

**زمانگا:** گوڵی گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ، زوانەگا ف گل‌گاوزبان.

**زمانگر:** ١) مرۆی لاڵەپەتە کە قسەی باش بۆنایە؛ ٢) شوفار، جاسوس ف ١) الکن؛ ٢) جاسوس.

**زمان‌گران:** نور ف الکن.

**زمـان‌گرتن:** ١) لاڵە پەتەبوون؛ ٢) جاسوسی کردن؛ ٣) فێرە قسەبوونی منداڵ ف ١) الکن شدن؛ ٢) جاسوسی کردن؛ ٣) زبان باد گرفتن بچە.

**زمان‌گەز:** نۆن، تێژڵەچێژەدا ف تُندمزە.

**زمان گەستن:** برێتی لە پەژیوانی: (**زمانی** خۆم **گەست** کە بۆ ئەم کارەم کرد) ف کنایە از پشیمانی.

**زمانگیر:** زمانگر ف نگا: زمانگر.

**زمان‌گیران:** قسەبۆنەهاتن ف بە تتەپتە‌افتادن، زبان بند آمدن.

**زمان لوس:** دەم تەڕ ف چرب‌زبان.

**زمـان لیـدان:** ١) برێتـی لە فوبیـداکـردن، تاریـف کردنی بە درۆ؛ ٢) خاپاندن‌و هانەدان ف ١) مدح دروغین؛ ٢) فریب و تحریك.

**زمـانـوك:** ١) زمـانـەچکۆڵە، نەلەنگە؛ ٢) زمانەی زەنگۆڵە ف ١) زبان کوچك؛ ٢) زبانۀ زنگوله.

**زمانە:** ١) قینکەی باریك لە ناو شتی درێژدا: (**زمانەی** قایشی پشتێندو کەوش، **زمانەی** نەرازو)؛ ٢) گڕی ئاگر ف ١) باریکۀ برجسته میان چیزدران، زبانه؛ ٢) زبانۀ آتش.

**زمانە چکۆڵە:** نەلەنگە ف لهات، زبان کوچك.

**زمانـە چویلەکە:** گیایەکە بۆ ئاش‌و دۆخەوا باشە ف گیـاهی است خوراکی.

**زمایش:** دەنگی گریان‌و ناڵاندن ف صدای گریه و ناله.

**زمبێل:** سوێل، سمبێل ف سبیل.

**زمبێل بۆق:** سوێل فەوی، سمێل زل ف سبیل کلفت.

**زمبێل قەیتان:** برێتی لە کەسێ کە سمبێلی رەش‌وبریقەدارە ف کنایە از کسی کە سبیل سیاه و براق دارد.

**زمبێلن:** بە سمبێل ف دارای سبیل.

**زمبێلی:** زمبێلن ف دارای سبیل.

**زمبەرە:** بەردە سماتە، سمانە ف سنبادە.

**زمرق:** چزو ف نیش عقرب و زنبور و...

**زمروت:** گەوهەرێکی بەنرخی زۆر کەسکە ف زمرّد.

**زمسان:** زسان ف زمستان.

**زمسانە:** زسنانە ف زمستانی.

**زمسانی:** زسنانە ف زمستانی.

**زمستان:** زمسان ف زمستان.

**زمستانی:** شیاوی زمسان ف زمستانی.

**زمستانین:** شیاوی زسنان لە بەرگ‌و نازوخە ف لباس و آذوقۀ زمستانی.

**زمستو:** زمسان ف زمستان.

**زمستون:** زمسان ف زمستان.

**زمسو:** زسنان ف زمستان.

**زملیق:** دەگەڵ زەرد دیڵێن واتا: لوس‌و نەرم: (زەردو **زملیق**) ف با «زەرد» بە معنی صاف و نرم.

**زمنای:** ئەزموون، ناقی کردنەوە ف آزمون.

**زمودە:** ئەزمو، ناقیەوە کراو ف آزموده.

**زموون:** زمنای ف آزمون.

**زمونگە:** شوێنی ئەزموون ف محل آزمایش.

**زمە:** ١) ناقی کەرەوە: (مێردە**زمە** وانا: پیاوان تاقی دەکاتەوە)؛ ٢) شیش‌و بەنی لولەتفەنگ خاوێن کردنەوە؛ ٣) ئاسنی باریکی بەپێچی نوك تیژ بۆ کون‌کردنی دار ف ١) آزما، آزمایش کننده؛ ٢) سنبه؛ ٣) منه.

**زمهار:** ئاردی نازوخەی زسنان ف آرد آذوقۀ زمستانه.

**زمهەر:** زمهار ف نگا: زمهار.

**زمی:** دەنگی گریان و ناڵاندن ف صدای گریه و ناله.

**زمێل:** سمبێل ف سبیل.

**زمیلی:** ١) سمبێل؛ ٢) چەند سمبێلك ف ١) سبیل؛ ٢) چند سبیل.

**زمین:** ١) زموون؛ ٢) گریان و ناڵاندن ف ١) آزمودن؛ ٢) گریه و نالیدن.

**زمی و ناله:** گریان و ناڵاندن ف گریه و زاری.

**زمیهتـن:** ١) گاڵـەو ناڵـە؛ ٢) دەنـگ دانـەوەی زۆر کەس پێکەوە ف ١) فریاد و ناله؛ ٢) صدا بازگشتن گروه.

**زن:** ١) دوای وشە بەواتا: دەڵێن، تەڕەشوع کەر، دانەوەی ناو: (نەڕە**زن**)؛ ٢) پاشگری بەواتـا: بێژەر: (**درۆزن**) ف ١) پسوند بەمعنی تراوش؛ ٢) پسوند بەمعنی گوبنده.

**زنار:** ١) بەردی زۆرگەورە؛ ٢) شاخ، نینە ف ١) صخرۀ عظیم؛ ٢) کوه سنگی.

**زنازنا:** هەراو هوریا، چەقەو گوڕە ف همهمه و غوغا.

**زنالو:** خاڵوژن ف زن‌دایی.

**زناو:** زەمینێ کە هەمیشە تەڕو شلەو ناو دەدانەوە ف نکاب، زمین تراونده.

**زنتوت:** نبز، وشەی گاڵتە پێ کردن ف کلمهٔ مسخره کردن.

**زنتۆل:** زەلامی قەڵەو، تەژەی نەستور ف تنومند.

**زنج:** ١) چارداغی لە قامیش؛ ٢) حەوشی لە چەپەرو قامیش بۆ ماڵات تێ کردن؛ ٣) چەنــاگە؛ ٤) دو شتی زەردی پان و پەل کە نامــرازی موسیقان؛ ٥) کوتەك ف ١) کوخ از نی؛ ٢) حیاط مانندی از نرکه و نی برای نگهداری دام؛ ٣) چانه، زنخ؛ ٤) سنج از آلات موسیقی؛ ٥) چماق.

**زنجار:** ژەنگی سەر پاقر، ژەنگی مس کە بە رەنگی کەسك دیار دەکا ف زنگ مس.

**زنجاف:** پەراویزی عاباو کەوا ف سجاف.

**زنجك:** جوَنە، لوشکە ف لگدپرانی.

**زنجەلە:** ئامرازێکی کەوانی بۆ ماڵۆ کە دەگەڵ ماڵوکێش لێك بدرێ ف از وسایل کشاورزی برای صاف کردن کشتزار.

**زنجی:** ١) کەپــو، کەپ، لوت؛ ٢) پاژێك لە گۆشت ف ١) دمــاغ؛ ٢) پاره‌ای گوشت.

**زنجیر:** جەند ئاڵقە ئاسنی تێکخراو ف زنجیر.

**زنجیرلەمە:** یەك بەشوێن بەکا ف یکی بعد از دیگری.

**زنجیره:** ١) بەرێزو بەك بەتــەنبشت بەکــەوە: (**زنجیره کێو**)؛ ٢) زبری و لەلــەی کەنــاری پارەی لە سکــەدراو: (ئــەم لیره بە سواوە **زنجیرەی** نەماوە) ف ١) تسلسل؛ ٢) برش دور مسکوکات.

**زنجیرەدان:** بەنەنبشت بەکەوە رێزبوون ف به تسلسل واقع شدن.

**زنجیله:** زنجیر ف نگا: زنجیر.

**زنــچــك:** ١) تەڕایی کەم؛ ٢) کێمو هەوای برین ف ١) تــراوش آب؛ ٢) چرك زخم.

**زنچکاو:** زەرداوی برین ف زردابهٔ چرك زخم.

**زنخ:** گەنیو، گەنی ف فاسد بو گرفته، گندیده.

**زندق:** ١) دوڕو، روبین؛ ٢) خوا نەناس ف ١) منافق؛ ٢) کافر.

**زندو:** ١) دژی مردو، لەژیاندا؛ ٢) برێنی لە کێچ و سپێ: (**زندوم تێدایە**) ف ١) زنده؛ ٢) کنایه از کك و شپش.

**زندەومردە:** قوڵکەی بە پوش و پەلاش دا پۆشراو بۆ خۆتێدا شاردنەوە ف چالهٔ سر پوشیده با خس و خاشاك.

**زنژ:** لوت، کەپو ف بینی.

**زنگ:** دەنگی زەنگۆلە ف صدای زنگوله.

**زنگازنگ:** دەنگەدەنگی زەنگولە ف صدای جرس.

**زنگایش:** دەنگی زەنگولە ف صدای زنگوله.

**زنگایەتە:** زنگایش ف نگا: زنگایش.

**زنگرین:** تۆپین، کەوتین ف مرگ حیوان پلید، سقط شدن.

**زنگل:** زەنگولە ف زنگوله، درای.

**زنگڵزاوا:** کژن، جۆرە دەغڵێکە گای پێ قەڵەو دەبێ ف گاودانه.

**زنگلك:** زەنگولەی پچوك ف زنگولهٔ کوچك.

**زنگلی:** جۆرێ کولیچە ف نوعی کلوچه.

**زنگەزنگ:** دەنگی زەنگی زۆرو بە دوی یەکدا ف صدای پیاپی زنگوله.

**زنگی:** ١) دەنگی وێك کەوتنی ددانــان لە سەرمان؛ ٢) لاسایی دەنگی زەنگولە بە زمان ف ١) صدای دندانها از سرما؛ ٢) با دهان صدای زنگوله را در آوردن.

**زنگین:** دەنگی زەنگولە ف صدای جرس.

**زننو:** زندو ف زنده.

**زننه:** زندو ف زنده.

**زنه:** ١) چیمەنی ناودەڵێن؛ ٢) زندو ف ١) چمن آبزا؛ ٢) زنده.

**زنەکێش:** گاسنێ کەقوڵ دەکێڵێ ف گاوآهنی که عمیق شخم می‌زند.

**زنەگی:** ژیان ف زندگی.

**زنەیی:** زنەگی، ژیان ف زندگی.

**زنێر:** ١) جۆرێ ماسی؛ ٢) نوکــەســەر لێك هاڵاوی چڵکن؛ ٣) شاخی سەخت ف ١) نوعی ماهی، زردماهی؛ ٢) زولیده موی کثیف؛ ٣) کوه سنگی سخت.

**زنینەوە:** هەستانەوەی دوای مردن ف رستاخیز.

**زۆ:** ١) گیایەکی بۆن خۆشە؛ ٢) قوڵکەی چاو، زەقایی چاو؛ ٣) تاك، یەك ف ١) گیاهی خوشبو؛ ٢) کاسهٔ چشم، برجستگی چشم؛ ٣) تك، یك.

**زو:** ١) پەلە، لەز؛ ٢) سەرەتای کات و دەم؛ ٣) دێر زەمان، لەمێژینە؛ ٤) زا، بێچو: (زاو زو)؛ ٥) تاك، یەك ف ١) شتاب؛ ٢) اول وقت؛ ٣) دیر زمان، سابقاً؛ ٤) زاده، بچه؛ ٥) تك.

**زوا:** ١) وشك، دژی تەڕ؛ ٢) ڕەق، توند ف ١) خشك؛ ٢) سفت.

**زوار:** هەژار، بێچارە ف بینوا.

**زوالــە:** ١) پارچەیەکی بڕیاو لە چەرم؛ ٢) گزموڵەقوڕ ف ١) برشی از چرم؛ ٢) گلولهٔ گلین.

**زوان:** ١) بڕوانە زمان بە هەمو لك و پۆپەوە، زبان؛ ٢) دەنکێ ڕەشە لە ناو گەنم پەیدا دەبێ، زریزانــە، زریزان ف ١) نگــا: «زمــان» و فروعش، زبان؛ ٢) دانهٔ سیاه در گندمزار.

**زوانــگ:** زوهانگ، قاقەزی مرەکــەف مژ، نوسراو وشکەوکــەر ف خشك‌کن.

**زوانگیر:** زمانگر ف نگا: زمانگر.

**زوانمەلیچك:** داری بناو ف درخت زبان گنجشك.

**زوانه:** زمانه ف زبانه.

**زوانی ماری:** زمانی زکماك ف زبان مادری.

**زوانیمایێ:** زوانی زکماك ف زبان مادری.

**زۆبالمە:** وردە ساچمەی تفەنگی ڕاو ف ساچمهٔ ریز تفنگ شکاری.

**زوبزو:** یەك بە یەك ف یك به یك.

**زوبون:** جۆرێ قوماشە ف نوعی پارچه.

**زۆبون:** چاوزەقی، چەم دەرپەڕیوی ف جشم برجستگی.

**زوبه:** پەلە بکە، بلەز ف عجله کن، زود باش.

**زوبەرد:** زمروت ف زمرّد.

**زوبینا:** جگە لەو یەکە ف بجز آن.

**زۆپ:** ١) قبت، دەرپەڕیو، زەق؛ ٢) داردەستی نەستور؛ ٣) برێتی لە کێر؛ ٤) نەستــورو ڕەق؛ ٥) گاشــەبەرد ف ١) برجستــە، از دور نمایــان؛

۲) چماق؛ ۳) کنایه از آلت مرد؛ ۴) ستبر و سخت؛ ۵) خرسنگ.

**زۆپـا:** ۱) داردەستی ئەستوور؛ ۲) کوورەی ئاگر لە کانزا ف ۱) چماق؛ ۲) بخاری فلزی.

**زۆپ ئەستوور:** برێتی لە دەسەڵات داری زاڵم ف کنایه از فرمانروای ستمگر.

**زۆپ زۆپ:** گەمەی چاو شارکێ لە ناو زاڕۆکان ف بازی قایم باشك بچەها.

**زۆپك:** داردەستی ئەستوور. یەباغ. نیلا ف چماق.

**زۆپۆ:** زلامی تەنبەڵ و نەوەزەل ف تنومند بیکاره.

**زۆپە:** ۱) زۆپا. کوورە؛ ۲) بە دەستی زۆر؛ ۳) کوتەکی سەر زل؛ ۴) مزراح. مەزرەق ف ۱) بخاری؛ ۲) قهراً؛ ۳) گرز. چماق؛ ۴) گردنا.

**زوت:** روتوقوت. رەلووت ف عریان.

**زوتا:** لەبەر ئەوە، بۆیە، سەبارەت ف از آن جهت.

**زۆتا:** گیایەکە لە ڕیحان دەکا گوڵی شینە ف گیاهی است شبیه ریحان با گلهای بنفش.

**زوتك:** زۆتك ف نگا: زۆتك.

**زۆتك:** لێواری کونی قنگ: (مناڵەکەم **زۆتکی** زامار بوه) ف کنارهٔ مقعد.

**زوتۆر:** دڵناسك، کەسێ کە لە هەموو شت نۆرە دەبێ ف زودرنج.

**زوتی:** نفرە، دوعای نەباش ف نفرین.

**زوچ:** گەمەیەکە بە وردەبەرد ئەکرێ، زت ف نوعی بازی با شن.

**زۆحەل:** خواردەمەنیەك کە زۆ هەزم دەبێ ف خوراك زودهضم.

**زۆخ:** ۱) توانـاو بەکـار؛ ۲) توانـابی. هێـز؛ ۳) خوێن و کێم تێکەڵ ف ۱) توانا؛ ۲) یارا؛ ۳) چرك و خون مخلوط.

**زۆخ:** زۆخ ف نگا: زۆخ.

**زوخـاڵ:** ۱) زەزی. زەزو. خەڵوز؛ ۲) نیـلا. داردەستی ئەسـتوور ف ۱) زغال؛ ۲) چماق.

**زۆخاو:** زاخاو، مشت و ماڵدانی تیغ ف صیقل تیغ.

**زۆخاو:** کێم و خوێنی تێکەڵاو ف چرك و خونابهٔ مخلوط.

**زوخره:** وردکەبەرد ف شن.

**زوخرۆك:** زوخرە ف شن.

**زوخرۆنەك:** شوێنی زۆر وردکەبەرد ف شنزار.

**زوخم:** ۱) زق، ناڵشت. خوێن. خوسـار. خوس؛ ۲) بنی گیایەکی تاڵی بۆن خۆشە ف ۱) سرماریزه؛ ۲) بن گیاهی تلخ و خوشبوی.

**زوخمە:** جلبقە، کولەجەی بێ قۆڵ. نێلەك ف بلك.

**زوخور:** وردکەبەرد ف شن.

**زۆخۆر:** لەخواردنا پەلەکەر، بلەزاخوارن ف کسی که تندتند غذا بخورد.

**زۆخی:** وەستای شیرگەر، کەسێ تیغ زاخاو دەدانەوە ف صیقل گر.

**زۆر:** ۱) بۆش، فرە. گەلێك؛ ۲) هێزو توانا، تابشت، تاقەت؛ ۳) ناهەقی؛ ۴) هێـز بەکار هێنان: (بەزۆری پێم دەکەن) ف ۱) بسیـار؛ ۲) نیرو؛ ۳) ظلم؛ ۴) زور و فشار.

**زۆڕ:** دەنگی زبری گریان. دەنگی گڕی گریان ف صدای خشن گریه.

**زۆر:** ۱) زبـر؛ ۲) هێز. تاقـەت؛ ۳) بۆش. دژی کەم؛ ۴) زلم و ناهەقـی؛ ۵) تەپـۆڵکـەی پچـووکی زۆنـەن لە دەشتایی‌دا؛ ۶) خەمبار و کز؛ ۷) ناقابل، تۆراو؛ ۸) تماشاکردنـی بە چاوی زەق ف ۱) زبر؛ ۲) قوت، نیرو؛ ۳) بسـیار؛ ۴) ستـم؛ ۵) بلك تپــه در دشـت؛ ۶) غمگین؛ ۷) ناخشنود؛ ۸) خیره نگاه کردن.

**زۆراب:** ناوە بۆ پیاوان ف سهراب، نام مردانه.

**زۆراب:** کەسێ بەیانی زو لەخەو رادەبێ ف سحرخیز.

**زۆرات:** ۱) هەرزنـەگەورە؛ ۲) گەنمە شامـی ف ۱) ارزن خوشـه‌ای؛ ۲) بلال. ذرت.

**زۆراتی:** ۱) بەشی هەرەزۆر لە کۆمەڵ. پتری خەڵك؛ ۲) بە زەبری هێز ف ۱) اکثریت؛ ۲) زورکی. جبراً.

**زورار:** ۱) زن برا، زنی برا؛ ۲) ناوی مەڵبەندو هۆزێکە ف ۱) زن برادر؛ ۲) نام منطقه و عشیرتی است.

**زوراری:** سەر بە خێڵی زورار ف منتسب به ایل «زورار».

**زۆران:** نێکەوە گلانی دو کەس بۆ بەکتر لە زەوی‌دان، ملانە، ملانێ ف کُشتی.

**زۆران:** ۱) زەوینـی زبـر و بەرداوی؛ ۲) دەشتـی بەتەپۆڵکەی زۆت ف ۱) زمین زبر و سنگلاخ؛ ۲) دشت دارای تپه‌های کوچك و لخت.

**زۆرانباز:** کەسێ کە کاری ملانێ کردنە ف کشتی گیر ماهر.

**زۆران بازی:** ملانێ ف کُشتی گیری.

**زۆران گرتن:** ملانێ، زۆرانبازی ف کشتی گیری.

**زۆرانــەوە:** خورووی بەژانـەوە کە پێست هەستی پێ دەکـا ف احساس سوزش در پوست.

**زۆرانی:** زۆران ف کُشتی.

**زۆرانی گر:** زۆرانباز ف کُشتی گیر.

**زۆرانی گرتن:** زۆرانبازی ف کُشتی گیری.

**زۆرباك:** بای زۆر بەهێز، ڕەشەبا ف تُندباد.

**زۆربردن:** دەرەقەت هاتن. قەوەت بێ‌شکان ف زور جر بیدن.

**زۆربرن:** زۆربردن ف زورچر بیدن.

**زۆربـگیر:** زەبگیر ف بسیج زورکی.

**زۆربڵێ:** چەنەباز ف پرحرف.

**زۆربون:** زوانین بەچاوزەقی ف خیره نگاه کردن.

**زۆربۆهاتن:** کەوتنە تەنگانەوە ف زیر فشار واقع شدن.

**زوربە:** ۱) زۆرانی؛ ۲) فرە، زۆر؛ ۳) زاڵ بوون ف ۱) اکثریّت؛ ۲) بسیار؛ ۳) جبرگی.

**زوربەت:** بەزۆری ناچارکردن ف وادار کردن.

**زوربەساندن:** ۱) زۆرهێنان؛ ۲) بە ئەرزێکی داگر بەبدابوون ف ۱) فشار آوردن؛ ۲) فراگیرشدن.

**زوربەسـەندن:** زوربەساندن ف نگا: زوربەساندن.

**زۆربێژ:** زۆربڵێ ف پرگو.

**زۆرچك:** گردۆڵەی ڕەملی یچوك ف تپهٔ ماسه‌ای کوچك.

**زورچـە:** ۱) چێشتی بەنیری وشك کە لە ناودا دەیکوڵێنن؛ ۲) چێشتی کەشکاو ف ۱) آش پنیر؛ ۲) آش کشکاب.

**سەرخۆ:** ١) سەربەخۆ؛ ٢) لەسەرخۆ هێدی، نارام ف ١) آزاد و مستقل: ٢) آرام.

**سەرخوار:** بەرفەرمان ف مطبع.

**سەرخواس:** کەسێ کە هیچی لەسەر نەبەستوە ف سر برهنە.

**سەرخۆبوُن:** خۆی بوُن، نازادی تەواو ف استقلال، آزاد شدن.

**سەرخـوچوُن:** ١) بوُرانەوە، بێهوٚش بوُن: ٢) بابی بوُن ف ١) از حال رفتن، بیهوش شدن: ٢) مغرور شدن.

**سەرخوٚر:** ١) دەردو بەلای خوایی: ٢) بریتی لە منالی شوم و بی فەڕ ف ١) بلای آسمانی؛ ٢) کنایە از کودك بدقدم.

**سەرخـوٚش:** ١) لە بادەخـواردنەوە وەکەیف هاتگ. مەس، مەست؛ ٢) وشەی جوابی دەس‌خوٚش ف ١) مست می؛ ٢) کلمەای در جواب دست‌خوش.

**سەرخوٚشی:** ١) دلشادبوُن بە بادە خواردنەوە. مەستی؛ ٢) برسە ف ١) مستی؛ ٢) تسلیت گفتن.

**سەرخولانەوە:** گێژبوُن ف گیج شدن.

**سەرخولی:** گێژی ف گیجی.

**سەرخوٚنك:** بولبول ف بلبل.

**سەرخوٚهاتن:** لە کزی و نەخوٚشی رزگاربوُن ف سرحال آمدن.

**سەرخەت:** سنوُر. کەوشەن، حدود، سەرحەد ف مرز.

**سەرخەر:** لاسار، لا، گوێ‌نەبیس ف حرف نشنو، لجباز.

**سەرخەو:** سوُکەلەخەو ف خواب سبك موقتی.

**سەرخەوشکاندن:** نوٚزك نوسنن ف کمی خوابیدن.

**سەرخەوکردن:** سەرخەوشکاندن ف کمی خوابیدن.

**سەرخێل:** سالاری هوٚزی کوٚچەر ف ابلخان.

**سەرد:** سارد ف سرد.

**سەردا:** لەبالاوە، لەبلندەوە ف از بالا.

**سەرداتاژوتن:** بەسەرداداں، هێرش بوٚ بردن ف یورش بردن.

**سەرداخستن:** لەشەرمان سەردەبەرخوٚنان ف از شرم سر باپین آوردن.

**سەردار:** سالار، رەئیس ف سردار.

**سەردارعیل:** گەورەی هوٚز ف ابلخان.

**سەرداری:** ١) سالاری، رەئیسی؛ ٢) جوٚری بالاپوٚش: ٣) برێشکەی گەنمەشامی ف ١) ریاست؛ ٢) لباس سرداری؛ ٣) چس‌فیل.

**سەرداف:** سارداو ف سرداب.

**سەرداگرتن:** ١) زوٚربوٚهێنان: ٢) لەبڕو نەکاو گرتن ف ١) فشار آوردن: ٢) ناگهان گرفتن.

**سەردان:** ١) دیەنی، دیدەنی؛ ٢) بریتی لە خوٚ دەبێنـاونـان: ٣) گوٚلـك مژانـدن لەگوان بچەژبن بوٚ شیرداداني چێل: ٤) سەرەنناز ف ١) دیدنی؛ ٢) کنایە از سر بـاختن؛ ٣) گذاشتن و بازگرفتن گوسالە از پستان بە قصد شیردە کردن گاو؛ ٤) لحاف و پتو.

**سەردانان:** خوٚبەخت کردن، خوٚبەکوشت‌دان ف سر باختن.

**سەرداندن:** لە کەو دان، بە بێژنگی کون هەڵە دابێژنن ف الك کردن.

**سەردانەواندن:** سەرچەماندن ف سرخم کردن.

**سەرداو:** سەرداف ف سرداب.

**سەرداهاوردن:** ١) سەربەشانەکردن: ٢) سەرباس دامەزراندن ف ١) شانە زدن موی سر؛ ٢) سرسخن باز کردن.

**سەرداهێنان:** سەربەشانەکردن، سەر داهاوردن ف شانە زدن سر.

**سەردرێ:** ١) جلکێ کە لەسـەرەوە دەبـەر دەکـرێ بوٚ پاراستنی جلکی باشتـری بنـەوە، بەرگر؛ ٢) نەنراو، جوٚلایی کراو: (وەکو جوٚلاێ کە زازی نەبێ بە سەردرێی خوٚی / مەلێن فەساحەنی کوردی بە فارسی ناگا // بەلاغەتێکی هەبە هیچ زمانی نابگانێ / لە بێ تەعەسسوبی کوردانە بێ‌رەواج و بەها) «حاجی فادر»؛ ٣) بەرگی نوێو تازەدوٚراو ف ١) لباس بالایی کە لباس زیرین را حفظ کند؛ ٢) تنیدە، منسوج؛ ٣) لباس نو دوختە.

**سەردزانە:** دەسخوٚشانەو یاداشتی شاگردجلدروف انعام شاگرد خیاط.

**سەردرو:** دروُنێ کە تەقەلەکان لە دەرەوە بن ف رودوزی، سردوزی.

**سەردل:** جوٚرێ نەخوٚشیە. گرفت ف نوعی بیماری.

**سـەردوٚس:** گونـدێکی کوردسـنـانە بەعسی وێرانی کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان ویران کردند.

**سەردوٚشەك:** پارچەیێ کە بەسەر دوٚشەکی هەڵدەکێشن ف روتشك.

**سەردوکردن:** ساردکردنەوە ف نگا: ساردکردنەوە.

**سەردوگەرم:** ساردوگەرم ف نگا: ساردوگەرم.

**سەردوٚل:** جێگەی رژانی ناوی ناسیاو لە دوٚلاش‌دا ف جای ریزش آب در ناو آسیا.

**سەردولکە:** بەندی بەمردن هەڵگوتن، پەسنی مردو بە دەنگی گوٚرانی ف نوحە.

**سەردولکەبێژ:** کەسێ کە بە گوٚرانی بەسنی مردوُ دەدا ف نوحەخوان.

**سەردوٚلە:** سفرەی جەرمی نانکەر ف سفرهٔ چرمین نانوایی.

**سەردەدوُنـــان:** دوای شتـێ کەونـن بە غار: (تـــاژی سەری دەدوٚی کەروێشك نا) ف تعقیب کردن باشتاب.

**سەردەرابات:** گوندێکە لە کوردستانی موکوریان ف از روستاهای کردستان.

**سەردەراقی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەردەراقێ:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەردەرانـە:** ١) داری سەروُی چوار چێوەی دەرگا؛ ٢) هەڵچنـدراوی سەر دەرگا ف ١) آستانە: ٢) بالابیهای در.

**سەردەرچوُن:** ١) تێگەیشتن. فامین؛ ٢) رزگاربوُن لە بەلا ف ١) درك کردن: ٢) رستن از بلا.

**سەردەرکردن:** سەردەرچوُن ف نگا: سەردەرچوُن.

**سەردەرهێنان:** ١) پەیابوُن: (گیا سەری دەرهێناوە، سەری لە پەنجەرە دەرهێنا)؛ ٢) سەردەرچوُن، تێگەیشتن ف ١) پیدا شدن: ٢) درك کردن.

**سەردەری:** سەردەرانە ف نگا: سەردەرانە.

**سەردەرینان:** سەردەرهێنان ف نگا: سەردەرهێنان.

**سەردەس:** جلکی جومگەپۆش ف آستین.

**سەردەست:** سەردەس ف آستین.

**سەردەستان:** ژنێ کە خەریکی زانە ف زنی کە دارد می‌زاید.

**سەردەستە:** ۱) سەرداری کۆمەڵێک؛ ۲) برێتی لە بژاردە ف ۱) رئیس گروه؛ ۲) کنایە از برگزیدە.

**سەردەستەکی:** بەپێوە: (سەردەستەکی نفەنگی هاوێشت) ف ایستادە کاری کردن کە معمولاً نشستە یا خوابیدە انجام می‌دهند.

**سەردەسێر:** زۆزان ف سردسیری.

**سەردەشت:** شارێکە لە کوردستان ف نام شهری است، سردشت.

**سەردەفتەر:** ۱) بژاردە، یەکەم؛ ۲) کەسێ کە لە دەزگای دەوڵەت بەسەر نوسەران زادەگا ف ۱) گزیدە، یگانە؛ ۲) سردفتر.

**سەردەق:** ۱) نەژاکاو؛ ۲) دەس لێ نەدراو ف ۱) پژمردە نشدە؛ ۲) دست نخوردە.

**سەردەق شکاندن:** بەر لە خەڵک دەست بەکارێ کردن ف پیش از دیگران بە کاری دست زدن.

**سەردەم:** کات، وەخت ف اوان، هنگام.

**سەردەمە:** دەم‌پۆشی ساوا لە بێشکە دا ف دهن‌پوش نوزاد در گهوارە.

**سەردەمێ:** لەرۆژگارێکا ف یک وقتی.

**سەردەمی:** کاتی، وەختی، نەهەمیشەیی ف موقّتی.

**سردەمێك:** سەردەمێ ف یك‌وقتی.

**سەردەن:** دەرخونەی کوبە ف نهنبان خم.

**سەردەنشت:** سەرزەنشت، لۆمە ف سرزنش.

**سەردەوبوُن:** ساردبوُنەوە ف نگا: ساردبوُنەوە.

**سەردەوکردن:** ساردکردنەوە ف نگا: ساردکردنەوە.

**سەردی:** ساردی ف نگا: ساردی.

**سەر دیلان:** سەرچۆپی ف شخص پیشرو در رقص کردی.

**سەردینان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**سەررا:** ۱) ژنوێ؛ ۲) لەژوُوراُ؛ ۳) بەوحاڵەش، دەگەڵ نەمەشا؛ ۴) سەررێگە ف ۱) از نو؛ ۲) از بالا؛ ۳) علاوە بر این، با اینهمه؛ ۴) سر راه.

**سەرراست:** ۱) راستەوراست؛ ۲) دەسپاك، بێ خواری و لاری، نەمین؛ ۳) کارامەو لێزان ف ۱) مستقیم؛ ۲) امین؛ ۳) ماهر.

**سەرراستی:** نەمینی، بێ گزی و دزی ف درستکاری.

**سەرّراف:** سەزاف ف صرّاف.

**سەررشتە:** ۱) سەرنا، سەرتاڵ؛ ۲) لەکار زانین ف ۱) سرنخ؛ ۲) مهارت در کاری.

**سەرروُت:** ۱) کەسێ هیچی لەسەر نەبەسنبێ؛ ۲) برێتی لە منداڵی خوێندەواری شار ف ۱) سر برهنە؛ ۲) کنایە از بچە مدرسەای.

**سەرروشتە:** سەررشتە ف نگا: سەررشتە.

**سەررەش:** ۱) برێتی لە ژن؛ ۲) مەلێکی پچوکە سەری رەشە؛ ۳) کەسێ نوخشانەی خراب نەدا ف ۱) کنایە از زن؛ ۲) پرندەای است؛ ۳) کسی کە نفوس بد می‌زند.

**سەررەشە:** سەررەش ف نگا: سەررەش.

**سەررەو:** بڕتاو، لنگ‌دانی نوند ف برتاب، دو سریع.

**سەررەق:** سەرسەخت ف سرسخت.

**سەررێداچو:** لەرێ لادەر، رێ‌گوم‌کردو ف گمراه.

**سەرریژ:** دەفری زۆر بڕ کە جێگەی تری لێ نابێنەوە ف لبریز.

**سەرریژکردن:** لێ‌رژان لەبەر بڕی دەفر ف لبریز کردن.

**سەرزارەکی:** قسەی بەدەم نە بەکردەوە ف سخن بدون عمل.

**سەرزاری:** سەرزارەکی ف سخن بدون عمل.

**سەرزڤران:** ۱) گێژبوُن؛ ۲) سەرسوُرمان ف ۱) سرگیجە؛ ۲) متحیّر شدن.

**سەرزڤراندن:** سەربادان ف کنایە از اظهار ناخشنودی کردن.

**سەرزڤرین:** سەرزڤران ف نگا: سەرزڤران.

**سەرزڤرین:** شتی عەجایب، سەمەرە، مایەی سەرسورمان ف مایۀ تعجب.

**سەرزگە:** لەرزینی زۆربەنەوژم لەترسان ف لرزۀ شدید از ترس.

**سەرزل:** ۱) سەرزەلام، کەسێ سەری گەورە بێ؛ ۲) وشەیەکە بە گاڵتە بان بۆ سەرزەنشت دەیڵێن ف ۱) سرگندە؛ ۲) کلمەای است کە بە شوخی یا عتاب گویند.

**سەرزەدە:** ۱) بێ پرس‌وراُ؛ ۲) پارێ بچوك لە خشت ف ۱) سرزدە؛ ۲) قطعەای از خشت.

**سەرزەنش:** سەردەنشت ف سرزنش.

**سەرزەنشت:** سەردەنشت ف سرزنش.

**سەرزەیە:** ۱) سەربزێو؛ ۲) سەربزێوی ف ۱) گردنکش؛ ۲) گردنکشی.

**سەرزیقکرن:** سەردەرینانی روەك بان زیبکە ف بردمیدن گیاە با جوش.

**سەرزین:** زین‌پۆش ف سرزین.

**سەرزیوارە:** سەرئێوارە ف عصر هنگام.

**سەرژان:** بەکەم‌زانی بێجوبوُن ف آغاز درد زایمان.

**سەرژمار:** ۱) مرۆ یان ناژەڵ ژماردن؛ ۲) کەسێ کە گیانداران دەژمێرێ ف ۱) آمار؛ ۲) آمارگیر.

**سەرژماری:** بژاردنی مرۆ یان ناژەڵ ف سرشماری.

**سەرژمێر:** سەرژمار ف نگا: سەرژمار.

**سەرژمێری:** سەرژماری ف سرشماری.

**سەرژنانە:** پیاوێ کە کرداری ژنانە دەکا ف مرد زن‌نما.

**سەرژنانیلە:** سەرژنانە، ژنانیلە ف مرد زن‌نما.

**سەرژنك:** پیاوێ کە لە ماڵە خوێدا چروك و رژدە، نەنگوتك بژێر ف مردی کە در خانوادۀ خود خسیس است.

**سەرژنکاتی:** سەرژنك ف نگا: سەرژنك.

**سەرساخی:** سلامەتی، ساغی ف سلامت.

**سەرساغی:** سەرساخی ف سلامت.

**سەرساڵ:** جەژنی سەرەتای خاکەلێوە، نەوروز ف نوروز.

**سەرسام:** داماو، سەرسورماو، واق وڕبوگ ف مات و متحیر.

**سەرسامە:** نیشانەی عەجایبمان لە نووسیندا: (!) ف علامت تعجب.

**سەرسبە:** بەری بەبانی ف کلهٔ سحر.

**سەرسپاردن:** هاتنە بەرفەرمان ف سرسپردن.

**سەرسپی:** ژنی پیری بەرێزو نەگبیرکەر لە ناوایی‌دا ف گیسوسفید کدخدامنش.

**سەرسڤك:** ١) کەم نەرك؛ ٢) ناسوودە ف ١) کم کار؛ ٢) آسودە.

**سەرسڤکی:** ١) کەم‌نەرکی؛ ٢) ناسوودەیی ف ١) کم‌کاری؛ ٢) آسودگی.

**سەرسکلی:** سەربەل، نانێ کە لەسەر پەنگر ببرژێ ف نانی کە بر اخگر پزند.

**سەرسم:** ڕەنی بەکسم ف سکندری خوردن ویژهٔ ستور.

**سەرسم بردن:** ڕەت دانی بەکسم ف سکندری خوردن چهارپا.

**سەرسم دان:** سەرسم بردن ف سکندری خوردن چارپا.

**سەرسم کرن:** سم تراشین ف سُم تراشیدن.

**سەرسنگ:** شارۆکێکی زۆر هەواخۆش و هاوبنەوار بوو بەعسی وێرانی کرد ف شهرکی تابستانی و باصفا که بعثیان ویران کردند.

**سەرسوالکەر:** خوازەلۆك، خازۆك ف گدامنش.

**سەرسوت:** بزۆت ف نیمسوز.

**سەرسور:** بێ‌دابك و بێ‌سەرپەرست ف یتیم بی‌سرپرست.

**سەرسوڕ:** سەرسام ف مات و متحیر.

**سەرسوور:** ١) وەشارتنو، نهێنی، وشەیەکە لە جۆرێ گەمەی شەوانەدا دەبلێن: (سەرسووری من لەکوێیە واتا: مەبەستم بان وەشاردوەکەم چیەو لەکوێیە)؛ ٢) بڕینی لە نەرکی پیاو، کێر ف ١) پوشیده، نهان شده؛ ٢) کنایه از آلت مرد.

**سەرسورمان:** دامان، سەبرمان ف متحیّر شدن.

**سەرسوری:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەرسوری بن دراو:** لە دور جوانی لە نزیك ناحەز ف زیبانمای زشت.

**سەرسوری بن‌دڕای:** سەرسوری بن دراو ف زیبانمای زشت.

**سەرسوری بن‌شڕ:** سەرسوری بن دراو ف زیبانمای زشت.

**سەرسوورێن:** سەرزڤرێن ف مایهٔ تحیّر.

**سەرسوك:** سەرسڤك ف نگا: سەرسڤك.

**سەرسوکبون:** خەلاس بوون لە کار ف فراغت از کار.

**سەرسوکی:** سەرسڤکی ف نگا: سەرسڤکی.

**سەرسەخت:** سەرڕەق ف سرسخت.

**سەرسەر:** بای ساردی بەنەوزم ف باد صرصر.

**سەرسەرخانە:** بڕینی لە خانوی زۆر سارد ف کنایه از خانه بسیار سرد.

**سەرسەری:** ١) چەورە، خوێڕی و بیکارە؛ ٢) سەرچڵ، بێ‌بیر کردنەوە؛ ٣) هەردەم لەسەر خەیالێك، وازوازی ف ١) ولگرد هرزه؛ ٢) سطحی، بدون تأمل کردن؛ ٣) هردم بر فکری، دمدمی مزاج.

**سەرسەکە:** کۆزی باریکەڵە لە خەیارو گندورەو هەنی‌و... ف قاچ نازك از خیار و هندوانه و...

**سەرسەنگ:** ١) بارسەنگ، سلاودانەوەی تەرازو؛ ٢) لاسار، گوێ نەبیس؛ ٣) گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف ١) خاطرانه کمی گران کشیدن ترازو؛ ٢) خشك سر؛ ٣) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەرسەوز:** نێرەمراوی ف مرغابی نر.

**سەرسینگ:** نێوان هەردومەمکان ف بین دو پستان زن.

**سەرشار:** ١) سەری مەیدانی گەمە؛ ٢) ئاخری مەیدانی گەمە ف ١) آغاز زمین‌بازی؛ ٢) پایان زمین‌بازی.

**سەرشان:** ١) ملەی کێو؛ ٢) نیشتوی ژێ؛ ٣) نیشتودان؛ ٤) بەشێ لە جل کە شانی مرۆ دەگرێ ف ١) ستیغ؛ ٢) نوشە؛ ٣) نوشەدان؛ ٤) سرشانهٔ لباس.

**سەرشانە:** سەروك، بەرانبەری بنوك ف بخش مرغوب پشم شانه کرده.

**سەرشف:** سەرتل، بژاردە ف گزیده.

**سەرشکەستی:** خەجالەت ف شرمنده.

**سەرشکێن:** بەسەرچڵی کارکردن ف سرسری انجام دادن کار.

**سەرشکێنە:** پاشماوەی بەش دابەش کردنەوە ف باقیماندهٔ تقسیم را قسمت کردن.

**سەرشو:** جێگەی خۆشتن لەماڵدا، شۆرکە ف جای آب‌تنی در خانه.

**سەرشۆر:** دەلاکی گەرماو ف دلاك حمّام.

**سەرشۆڕ:** خەجالەت ف شرمسار.

**سەرشۆڕکردن:** سەرداخستن لە شەرمان ف سر بەزیر افکندن از خجالت.

**سەرشۆرکە:** سەرشو ف نگا: سەرشو.

**سەرشۆڕی:** شەرمەزاری، حەباچوون ف شرمساری.

**سەرشوك:** ١) باڵداریکە جکۆڵە؛ ٢) حەمام، جێگەی خۆشتن ف ١) گنجشك‌سانی است؛ ٢) گرمابە.

**سەرشە:** سەرشانە، سەروکی خوری و مو کە بەسەر شانەوە دەمێنێ ف تکه پشم یا مویی که بر شانه می‌ماند.

**سەرشەق:** ١) پێش‌دەستی لەکاردا؛ ٢) سەرسەخت ف ١) پیشدستی در کار؛ ٢) سرسخت.

**سەرشەه:** سەرشە ف نگا: سەرشە.

**سەرشێت:** ١) بزۆزو دانەسەکناو؛ ٢) حۆل و گێل؛ ٣) وڕو گێژ ف ١) ناآرام؛ ٢) خل، نیم‌دیوانە؛ ٣) گیج.

**سەرشیر:** توێ‌شیر، سەرنوێ، سەرنو ف چرابە، سرشیر.

**سەرشیفوك:** باڵداریکە ف پرنده‌ایست.

**سەرشین:** بڕینی لە ژنی پێ‌ڕەش و شووم ف کنایه از زن نحس و بدقدم.

**سەرشینك:** مەلێکی بچووکە بەقەد چۆلەکە دەبێ و سەری شینە ف پرنده‌ای کوچك اندازهٔ گنجشك.

**سەرشینکە:** بۆپەرەشە، نەخۆشی مریشکانە ف وبای مرغی.

**سەرشیو:** ناوی مەڵبەندێکە لە کوردستان ف نام ناحیه‌ای در کردستان.

**سەرشێو:** ١) کاتی نانی بەیانی؛ ٢) کاتی ڕۆژوکردنەوە ف ١) هنگام چاشت؛ ٢) هنگام افطار.

**سەرشێوان:** دامان، سەرسام‌بوون [ف] شوریدگی، گیجی، سراسیمگی.

**سەرعێل:** سەرخێل [ف] ابلخان.

**سەرف:** خەرج، مەزیخ، بەخت [ف] خرج.

**سەرفترە:** باجی ثابتی لە گەنم بان دانەوێڵە بەرانبەر بە هەر موسولمانێ [ف] زکات فطر، فطریه.

**سەرفراز:** سەربڵند [ف] سرفراز.

**سەرفە:** لای سەرو [ف] طرف بالا.

**سەرقاپ:** سەرپۆشی دەفر [ف] سرپوش ظرف، در ظرف.

**سەرقاپ‌نانەوە:** داپۆشینی دەفر [ف] سرپوش گذاشتن بر ظرف.

**سەرقال:** زۆر خەریکی کار [ف] بسیار مشغول.

**سەرقژن:** ۱) کەسێ کە موێ سەری ئالۆزو نیکەڵ بێکەڵە؛ ۲) بربنی لە جنۆکە [ف] ۱) ژولیده موی؛ ۲) کنایه از جنّ.

**سەرقژیلکە:** سەرقژن [ف] نگا: سەرقژن.

**سەرقفلانە:** پارەدان بۆ چوڵ‌کردنی دوکان و خانوی نیجارە [ف] سرقفلی.

**سەرقفلی:** سەرقفلانە [ف] سرقفلی.

**سەرقۆپ:** دوند، نروێك [ف] بالاترین نقطه، قلّه.

**سەرقوت:** کوتانی گەنم نە بەتەواوی [ف] نیم‌کوبی گندم بلغور.

**سەرقوت:** سەررووت، سەرخواس [ف] سر برهنه.

**سەرقوتان:** جوێنەدباری شت [ف] دیدار، وارسی.

**سەرقوتی:** سەرخواس [ف] سر برهنه.

**سەرقوتین:** سەرقوت [ف] سر برهنه.

**سەرقوش:** قەیاسە، هەیاسەی جەرم [ف] نگا: قەیاسە.

**سەرقول:** جێگی ناو دوپەنجەی منال کە لە جگێن‌دا یە پیروزی دەزانێ: (**سەرقول** دەرهات، دەجگان روهات) [ف] شنالنگی که در بازی برای یمن نگه می‌دارند.

**سەرقوڵ:** ۱) سەردەستەی داروغە؛ ۲) سەردەس، جلکی جومگەپۆش [ف] ۱) سرنگهبان؛ ۲) سرآستین.

**سەرقولە:** جۆرێ نرێ [ف] نوعی انگور.

**سەرقوڵە:** سەرقوڵ [ف] نگا: سەرقوڵ.

**سەرقەبران:** قەبرستان [ف] گورستان.

**سەرقەبلاندن:** سەرفترەدان [ف] دادن زکات فطر.

**سەرقەپاغ:** سەرپۆشی دەفر و سنوق [ف] پوشش ظروف.

**سەرقەتار:** ۱) پێشەنگی کاروان؛ ۲) رەنبسێی کاروان [ف] ۱) پیشاهنگ کاروان؛ ۲) قافله‌سالار.

**سەرقەل:** نروێك، دوند [ف] قلّه، قلّهٔ کوه.

**سەرقەلانگ:** خەلەی نیبوی سەرلەنیوان جەماو [ف] ساقهٔ از بی‌آبی خم شده.

**سەرقەلەم:** گەورە نوسەری میری [ف] منشی‌باشی.

**سەرقەلەمانە:** هەقدەستی نوشتەنوس [ف] مزد دعانویس.

**سەرقەوی:** سەرزل [ف] سرگنده.

**سەرك:** سەر فەپاغ، سەرپۆشی دەفرۆکە [ف] سرپوش ظرف کوچك.

**سەرك:** ۱) زز، سهر، بەدەڵ؛ ۲) قونکەی سەر لولەی تفەنگ [ف] ۱) بدل؛ ۲) مگسهٔ تفنگ.

**سەرکاب:** ناوالْ کراس، دەریێی ژنان [ف] دامن.

**سەرکار:** کاربەدەستی ئاغا، کەسێ لە لابەن ئاغاوە بە خەلەو خەرمان رادەگا [ف] نمایندهٔ ارباب برای رسیدگی به امور غلّه.

**سەرکارانە:** باجێ کە رایەت دەیدا بە سەرکار [ف] مزدی که رعیّت به مباشر ارباب می‌دهد.

**سەرکان:** هوزێك کە زۆرنبرەی لێ جیابوونەوە [ف] عشیره‌ای که تیره‌های مختلف از آن جدا شده است.

**سەرکانی ثیلی:** سەرەك هوز، سەرکۆمار [ف] پیشوا.

**سەرکاوان:** سەلان، سەران [ف] کوهساران.

**سەرکردن:** ۱) تەخمین، بەراوردکردن؛ ۲) بێ‌ڕاگەبشنن؛ ۳) لەئامانج بلندتر لێدانی تیرو گولله؛ ۴) لانەرازو لە لاکەی تر گران‌تر بون: (کەس نەڵێ مەحبوبە خێل و قبچە مەبلی شەر دەکا / خێل و قبچە بان تەرازوی نازی نەختێ **سەر دەکا**) «نالی» [ف] ۱) برآورد؛ ۲) رسیدگی؛ ۳) از هدف بالاتر رفتن تیر؛ ۴) سنگینی یك کفهٔ ترازو.

**سەرکردن بە گوما:** سەربەگوماکردن [ف] کنایه از از میان بردن.

**سەرکردنەسەر:** سەرخستنەسەر [ف] سر به‌سر گذاشتن.

**سەرکردنەوە:** ۱) ترس لە دەست‌دانە کارێك؛ ۲) جوش دانەوەی سەری نامرازی کول‌بوی کانزا: (گاسنەکەم **سەرکردەوە**) [ف] ۱) واهمه از انجام دادن کاری؛ ۲) نکه جوش دادن بر سر ابزار فلزی کند شده.

**سەرکردە:** فەرماندەی لەشکر [ف] فرماندهٔ سپاه.

**سەرکرن:** دەمەزەر کردنەوەی گاسن [ف] مرمّت لبه‌های گاوآهن.

**سەرکرنیك:** ۱) جندۆکە؛ ۲) بەدفەر، شوم، جوت‌قونشە [ف] ۱) جنّ؛ ۲) نحس.

**سەرکرێ:** مزەی پتر لە مزی روژانە یا مانگانە [ف] اضافه‌حقوق.

**سەرکز:** ۱) خەمگین؛ ۲) لارەمل [ف] ۱) غمگین؛ ۲) سرافکنده از غم.

**سەرکزوڵە:** پوتەکە [ف] لاغر بی‌نمود.

**سەرکزی:** لارەملی و خەمباری: (چو بومە بەزمی خاسی برازا عەزیزەکەم / دوێشەو بە سەد نەوازوع و نیخلاس و **سەرکزی**) «شێخ رەزا» [ف] گردن‌کجی و غمگینی.

**سەرکل:** ۱) جفتی دەرگا داخستن لە ژوورەوە؛ ۲) نەرسەقول، قارسەقول [ف] ۱) چفت در؛ ۲) مدفوع الاغ.

**سەرکڵ:** سەرناورگە: (**سەرکڵی** جەهەندەم) [ف] بالای آتشدان اجاق.

**سەرکلاو:** ۱) ماشێنەی جێ پلیتەی لامپا؛ ۲) کلاوی خوری بۆ دەمی بەفر و باران [ف] ۱) جای فتیله در چراغ نفتی؛ ۲) کلاه پشمی بارانی.

**سەرکلاوە:** سەرکلاو [ف] نگا: سەرکلاو.

**سەرکلوم:** سەرکل [ف] چفت در.

**سەرکلە:** سەرکل [ف] جفت در.

**سەرکۆ:** ۱) گەنمی سەرەوەی خەرمان؛ ۲) سەردەنشت [ف] ۱) گندم بالایی تودهٔ خرمن؛ ۲) سر زنش.

**سەرکۆپ:** کرنوش، داهاتنەوە بۆ ریزلێنان [ف] تعظیم.

**سەرکۆت:** سەربێژنگ لە کانی دەغل گێژەوکردندا [ف] قشر بالایی در

غربال کردن غلّه.

**سەرکوتیلك:** گیابەکە بۆ لەوەڕ ف علفی است.

**سەرکورکردن:** سەرناشبن. برچ بڕبن ف سر نراشیدن.

**سەرکوزر:** گوڵەخەڵەی بەرگیرە نەکەوتوی درشت ف کوزر درشت مانده.

**سەرکوزوڵە:** سەرقژن ف زولیده سر.

**سەرکوزەر:** سەرکوزر ف کوزر درشت مانده.

**سەرکول:** قەرسەفول، ڕباوی کەر ف مدفوع الاغ.

**سەرکوڵ:** بەرکوڵ ف نگا: بەرکوڵ.

**سەرکوڵ:** ۱) سەرقوت: ۲) باجەکوڵە: ۳) داری نیوان نەسنوون و بان ف ۱) سر برهنه: ۲) نوعی کلنگ لبه کند: ۳) سرسنون.

**سەرکوما:** گەنمی سەرەوەی خەرمان. سەرکۆ ف گندم بالایی توده خرمن.

**سەرکومار:** ۱) کار بەدەست و دەسەلات داری چەند هۆز و عەشیرەت: ۲) ڕەئیس جمهور. *گەورەی وڵاتێ کە بۆ ماوەی چەند ساڵ لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێ* ف ۱) سردار چندین تیره و طایفه از مردم: ۲) رئیس جمهور.

**سەرکونە:** سەرزەنشت، سەرکۆ ف سرزنش.

**سەرکویر:** دەبەنگ، نێ نەگەیشتو، نازبرەك ف کودن.

**سەرکوێر:** سەرکوزر ف نگا: سەرکوزر.

**سەرکەتن:** ۱) بەرەژورچون: ۲) بەکام گەیشتن لە دۆز و مەبەستا ف ۱) بالا رفتن: ۲) کامیاب شدن.

**سەرکەش:** سەربزێو ف سرکش.

**سەرکەشی:** ۱) سەربزێوی: ۲) بێ‌داگەیشتن ف ۱) تمرّد: ۲) رسیدگی.

**سەرکەف:** ۱) ناویاوەی سەرکەوتوی پیو لە سابون چێکردندا: ۲) خوێی هەرە سپی و جوان لە خوێڵێن ف ۱) گداختهٔ پیه بالا آمده در کار صابون‌سازی: ۲) نمك صاف طبقهٔ بالا در نمکزار.

**سەرکەفتن:** سەرکەتن ف نگا: سەرکەتن.

**سەرکەل:** سەری چیا ف بالای کوه.

**سەرکەڵ:** دەستەکی جیغ قایم‌کردن ف چوبی که جیغ را نگه می‌دارد.

**سەرکەللە:** ۱) بەشی سەرەوەی ڕەشمە کە بە دەوری سەر و ژێر چەنەی بەکسەدا دێت: ۲) پارچەیەك لە ڕەشماڵ کە کورنابی تەواو کا ف ۱) جای بند افسار که پیرامون کلّه ستور گیرد: ۲) تکه‌ای از چادر که کوتاهی را جبران کند.

**سەرکەلە:** سەرکەللە ف نگا: سەرکەللە.

**سەرکەند:** گوندێکی کوردستانە بەعسی ویرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەرکەنە:** گوریسی دابەستنی سەر عەڕەبانە بۆ کلۆش کێشان ف ریسمانی که در ساقه‌کشی به‌کار آید.

**سەرکەوتن:** سەرکەتن ف نگا: سەرکەتن.

**سەرکەوتو:** بەکام گەیشتو، تورەفی کردو ف به‌کام رسیده، ترقّی کرده.

**سەرکەوتە:** سەرکەوتو ف نگا: سەرکەوتو.

**سەرکێش:** سەرکەش ف نافرمان. سرکش.

**سەرکێشان:** ۱) سەرەنانکێ کردن، روانین بەدزیەوە: ۲) کارگەیشتنە بارێکی دیاری: ۳) هەوساری بارە بەرگرتن لە ریگادا ف ۱) فضولانه و دزدکی نگاه کردن: ۲) بەحدّی رسیدن کار: ۳) افسار ستور کشیدن در راه.

**سەرکێشك:** ڕەنبسی نێشك گران ف سرکشیك.

**سەرکێشی:** سەرکەشی، سەربزێوی ف سرکشی، نافرمانی.

**سەرکێف:** سەرچیا ف بالای کوه.

**سەرگ:** لای ژوروو ف طرف بالا.

**سەرگاویلك:** گیابەکە دەخورێ ف گیاهی خوردنی.

**سەرگر:** ۱) کەسێ حەیوانی مێوینە بۆ جوت بون دەگەڵ نێر دەگرێ: ۲) برینی لە گەواد ف ۱) کسی که حیوان ماده را برای جفتگیری می‌گیرد: ۲) کنایه از جاکش.

**سەرگران:** ۱) نەمەڵ، نەوەزەل: ۲) سەرخۆش: ۳) بریتی لە نەسپی زانەهێنراو ف ۱) تنبل: ۲) مست: ۳) کنایه از اسب تعلیم ندیده، رام نشده.

**سەرگرتن:** ۱) بێك هاتنی کار: ۲) تەواوکردنی خانو: ۳) گرتنی مێوینە بۆ گانی نێر: ۴) بریتی لە گەوادی ف ۱) انجام شدن: ۲) تمام کردن بنا: ۳) گرفتن حیوان ماده برای جفتگیری: ۴) کنایه از جاکشی.

**سەرگرتنەوە:** پەیداکردنەوەی گوم بوگ و دزراو ف دوباره یافتن.

**سەرگرتە:** خلیسکاو ف لیز خورده.

**سەرگندان:** داماو، پەشێو ف سرگردان.

**سەرگو:** ۱) سەرانوێلك: ۲) تەپاڵدان: ۳) سەری جێگای خر: (سەرگوی مەمك) ف ۱) سرگینگاه: ۲) نپالەدان: ۳) انتهای گردی.

**سەرگورز:** سەرزل ف سرگنده.

**سەرگورزی:** ۱) سەرسەخنی: ۲) نوزەیی، نوسنی ف ۱) لجاجت: ۲) تندخوبی.

**سەرگورشتە:** چیروکی رابوردە ف سرگذشت.

**سەرگوروشتە:** سەرگورشتە ف سرگذشت.

**سەرگوری:** قوربان. فیدایی ف فدایی.

**سەرگوزەشتە:** سەرگورشتە ف سرگذشت.

**سەرگوشاد:** سەرناواڵە. بێ سەرپوش ف سرگشاده.

**سەرگوڵ:** ۱) هەوڵ جیا لە جادان: ۲) جاکترین. هەڵبژاردە ف ۱) اولین جای از قوری: ۲) بهترین، برگزیده.

**سەرگوم:** بێ سەروشوێن ف گم بی اثر.

**سەرگوم:** گیسکی ڕبوەڵە ف بزغالهٔ لاغر بدنمود.

**سەرگوم کردن:** شێوان، بەشێو بون ف خبط، پریشانی.

**سەرگوێلك** سەرانگوێلك ف شوله، سرگینگاه.

**سەرگەز:** سیسارگ ف کرکس.

**سەرگەرد:** ۱) بەلاگەردان: ۲) قوربان ف ۱) بلاگردان: ۲) قربان.

**سەرگەردان:** پەشێو، داماو ف سرگردان.

**سەرگەرم:** ۱) خەریکی کار: ۲) توڕە و توسن: ۳) سەرخۆش ف ۱)

مشغول کار؛ ٢) تندخوی؛ ٣) مست.

**سەرگەشتە:** نارازی، بێمەیل ف ناخشنود.

**سەرگەڤار:** رەئیسی خێزانی ماڵ ف رئیس خانواده.

**سەرگەڤاز:** سەرگەڤار ف رئیس خانواده.

**سەرگەلا:** سەربەنك ف نگا: سەربەنك.

**سەرگەلە:** رەمکێش، پێشەنگی مێگەلەمەز ف نخراز، پیشاهنگ گلە.

**سەرگەورە:** ١) سەرگەڤار؛ ٢) سەردەستە ف ١) رئیس خانوادە؛ ٢) سردستە.

**سەرگێجە:** سەرگێژی ف سرگیجە.

**سەرگێر:** حەوشێکی لە نامـــان بۆ ماڵات تێ کردن ف حصـــار برای نگهداری دام.

**سەرگێرە:** گای پێشەوە لە گێرەدا ف گاو سردستە در خرمن کوبی.

**سەرگێز:** ناوی گوندێکە ف نام روستایی است.

**سەرگین:** ١) نەوی لە باڵا، بڵندتر؛ ٢) سنێر، شباکە، ریخ ف ١) بالایی؛ ٢) سرگین.

**سەرلق:** ١) لکەداری سەرەوە؛ ٢) فەرماندەی سەد بێشمەرگە؛ ٣) جۆرێ هەنار ف ١) شاخهٔ بالایی؛ ٢) فرماندهٔ صد مرد مسلّح؛ ٣) نوعی انار.

**سەرلك:** لکی سەرەوی دار ف شاخهٔ بالایی.

**سەرلـە:** هەر لە دەست پێکـرانـەوە: (**سـەرلە بەیانی. سەرلە نگورێ. سەرلە هەوەڵەوە**) ف شروع هنگام.

**سەرلەپ:** جەپۆکانی ئەسپ ف سرپا ایستادن اسب.

**سەرلەپك:** پەتی زاربێنی خێگە ف بند دهانەبند خیگ.

**سەرلەشکر:** سەرکردە، فەرماندەی لەشکر ف فرماندهٔ سپاه.

**سەرلەنوێ:** زنو ف از نو.

**سەرلێ بادان:** سەرزفراندن ف اظهار ناخشنودی کردن.

**سەرلێ تێکچوُن:** بەرێشان بوُن، دامان ف راه جاره گم کردن.

**سەرلێ تێکدان:** وە سەر هەڵەخستن ف بەاشتباه انداختن.

**سەرلێ خوران:** نارەزوُکردنی کارێك ف هوس کردن.

**سەرلێدان:** دیەنی کردن ف دیدنی کردن، سر زدن.

**سەرلێدانەوە:** چوُنەوە دیدەنی کەسێك ف بازدید کردن.

**سەرلێ دەرچوُن:** تێ گەیشتن ف فهمیدن.

**سەرلێ دەرکردن:** سەرلێ دەرچوُن ف فهمیدن.

**سەرلێ سەندن:** سەرلێ تێکدان ف به اشتباه انداختن.

**سەرلێ شێوان:** بەشێو بوُن ف پریشان و سرگردان شدن.

**سەرلێ شێواندن:** سەرلێ تێکدان ف به اشتباه انداختن.

**سەرلێ کردن:** ترس لە دەست بەکارێ کردن ف واهمە از انجام دادن.

**سەرما:** دژی گەرما، نەو دەمانە کە مرۆ بە جلك و ناگر ناتاجە ف سرما.

**سەرمابردگ:** شتێ یان کەسێ کە سەرما زیانی پێ گەیاندوە ف سرمازدە.

**سەرمابردن:** سەرما کارلێ کردن ف سرمازدگی.

**سەرمابردو:** ١) سەرمابردگ؛ ٢) برێتی لە کەسێ کە بە سەرمایە فەڵسە ف ١) سرمازدە؛ ٢) کنایە از کسی کە تاب مقاومت سرما ندارد.

**سەرمابردە:** سەرمابردو ف نگا: سەرمابردو.

**سەرمابردەڵ:** سەرمابردو ف نگا: سەرمابردو.

**سەرمابردەڵە:** کەسێ کە ناتوانێ خۆی لەبەر سەرما راگرێ ف کسی کە مقاومت سرما ندارد.

**سەرمـابـوُن:** ١) نەخۆش کەوتن لەسەرمان؛ ٢) لەش هەست بەسەرما کردن ف ١) سرماخوردگی؛ ٢) احساس سرما کردن.

**سەرمازەڵە:** خەمەگرۆ، جۆرێ مارمێلکە ف جلپاسە.

**سەرماوسۆڵ:** دەمی زۆر ساردو سەرما، سەرماو بەستەڵەك ف سرما و بخبندان.

**سەرماوسۆڵە:** سەرماوسۆڵ ف سرما و بخبندان.

**سەرماوەز:** نۆهەمین مانگی ساڵ ف آذرماه.

**سەرمایە:** دەسمایە ف سرمایە.

**سەرمایەدار:** دەوڵەمەند ف سرمایەدار.

**سەرمایی:** سەرساخی ف سلامت.

**سەرمژانە:** دارێکی کورتە لەنێوان نیر و ناموردا ف جوبکی رابط خیش و یوغ.

**سەرمك:** سەرجەم ف همە باهم.

**سەرملە:** زینوُ، ملەی کێو ف گردنهٔ کوه.

**سەرملەگیر:** ریگر، جەتە ف راهزن.

**سەرمەلا:** رەئیسی گاڵتەو گەمە ف ادارە کنندهٔ بازی.

**سەرمۆر:** سەربەمۆر ف دست نخوردە، سر بەمُهر.

**سەرمەرزە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەرمەزد:** سەردەستەی گەمەکەران ف رئیس تیم بازیکنان.

**سەرمەزن:** ١) سەرزل؛ ٢) سەرگەورەی هۆز ف ١) سر گُندە؛ ٢) رئیس ایل.

**سەرمەس:** سەرخۆش ف سرمست.

**سەرمەست:** سەرمەس ف سرمست.

**سەرمەستی:** سەرخۆشی ف سرمستی.

**سەرمەشق:** نموُنە بۆ فێرکردن ف الگو، سرمشق.

**سەرمەشقانە:** شەرمەشکانە. *دیاریەکە زاوا دەیدا بە بوُك کە نارا لەسەر رووی لابەرێ* ف رونمای عروس.

**سەرمەشقانێ:** سەرمەشقانە ف رونمای عروس.

**سەرمەشکانە:** سەرمەشقانە ف رونمای عروس.

**سەرمەقولات:** بەسەرسەردا خۆناوەژۆ کردنەوە ف پشتك.

**سەرمیان:** سەرمابە، دەسمابە ف سرمایە.

**سەرمێکوتە:** ١) جانەوەرێکی بچوُکی سەر خڕە لە زەلکاودا دەژێ؛ ٢) کەجکەقولەی بۆق ف ١) حشرە ابست مردابزی؛ ٢) تخم قورباغە.

**سەرمێوژە:** جۆرێ ماری بۆرەلۆکەی باریکە ف نوعی مار.

**سەرنـــاز:** بەسـەردادراو، بەخـۆ دادەر، هەرپـارچـەیە کە بەسـەر شت هەڵدەکشێ ف سرانداز.

**سەرناس:** بەدەنگ‌وناو، بەرێز لە ناو خەڵکا ف نامی، سرشناس.

**سەرنامە:** ١) دەست پێکی نوسین؛ ٢) پێناس ف ١) شروع نامە؛ ٢) شناسنامە.

**سەرنانەسەر:** سەرخستنەسەر ف سر بەسر گذاشتن.

**سەرنانــەوە:** ١) دابــوشینی دەفــر: (**ســەری مەنجــەڵەکە بنێوە**)؛ ٢) ئاوارەبوُن؛ ٣) برینی لە مردن؛ ٤) برینی لە خەوتن ف ١) سرپوش بر ظرف گذاردن؛ ٢) آوارە شدن؛ ٣) کنایە از مردن؛ ٤) کنایە از خفتن.

**سەرناو:** لەقەم. ناوێك دەگەڵ ناوی منداڵی ف لقب.

**سەرناوکانە:** باداشتی مامان کە ناوکی ساوا دەبڕێ ف انعام بە ماما برای بریدن ناف نوزاد.

**سەرنج:** وردەوەبوُن، بەزینی روانینی شتێك ف دقّت.

**سەرنجدان:** لێ وردەوەبوُن ف دقّت کردن.

**سەرنج دەر:** وردەکارو بیرکەرەوە ف پژوهندە.

**سەرنجە:** ١) سەرنج؛ ٢) سەربەرەژێر ف ١) دقّت؛ ٢) نشیب.

**سەرنخوُن:** ژێروژوُر، قلْب ف سرنگون، نگون.

**سەرنزم:** سەرشوڕ ف سرافکندە.

**سەرنسوف:** سەربەرەژێر، سەرنشێو ف سراشیبی.

**سەرنشێڤ:** سەرنسوف ف سراشیبی.

**سەرنڤوبس:** چارەنوس ف سرنوشت.

**سەرنڤیسی:** ١) سەرژماری خەڵکی ولاَت؛ ٢) نوسینی وتاری سەرەکی ف ١) سرشماری؛ ٢) نوشتن سرمقالە.

**سەرنقبسار:** سەرەك نوسەر ف رئیس هیأت تحریریه.

**سەرنڤیشت:** چارەنوُس ف سرنوشت.

**سەرنقوُت:** سەرەونخون. بوٚ *خنکاو لە ئاودا* دەڵێن ف غرق شدە.

**سەرنگوُم:** سەرنخوُن ف سرنگون.

**سەرنوخوُن:** سەرنخوُن ف سرنگون.

**سەرنوگە:** رەئیسی داروغە ف سرداروغە.

**سەرنوُس:** سەرژمێر ف آمارگر، سرشمار.

**سەرنەخت:** سەرقەڵەن، هەرچی زیاد لە شیربایی بوٚ بەشودان بدرێ ف آنچە کە اضافە بر شیربها دادە می‌شود.

**سەرنەخوُن:** سەرنخوُن ف سرنگون.

**سەرنەخوُنك:** گوڵەشلیرە ف نگا: گوڵەشلیرە.

**سەرنەخوین:** سەرنخوُن ف سرنگون.

**سەرنەمە:** سەرشوڕ، سەرنزم ف سرافکندە.

**سەرنەوق:** جنگن، روُهەڵماڵاو، بێ‌شەرم‌و شورەبی ف ستیزەجو، بی شرم و حیا.

**سەرنەوەر:** سەرنزم، سەرشوڕ ف سرافکندە.

**سەرنەوی:** سەرشوڕ، سەرنزم ف سرافکندە.

**سەرنێ:** سەردوڵ ف نگا: سەردوڵ.

**سەرنیا:** دەمەزەرد ف نگا: دەمەزەرد.

**سەرنیان:** برینی لە رویشتن‌و ئاوارە بوُن ف کنایە از متواری و آوارە شدن.

**سەرو:** بیرێك کە لە نادیارەوە بە دڵ دەگا ف الهام.

**سەروُ:** ١) لای ژوُرو؛ ٢) دارێکی راست‌و بێ‌بەروٚ گەڵادەرزیە ف ١) طرف بالا؛ ٢) درخت سرو.

**سەروا:** پاشلی شێعر. قافیە ف قافیهٔ شعر.

**سەرواداَن:** سەربادان ف نگا: سەربادان.

**سەروار:** سەربار ف نگا: سەربار.

**سەرواز:** ١) سەرنــاوانــە؛ ٢) چەکداری دەوڵەت؛ ٣) سەرریژ: (نیمنەو نەنیابی جەستــەی زەبوُنم / دیســان **سەرواز** کەرد دڵـەی پرهوُنم) «مەولەوی» ف ١) سرگشادە؛ ٢) سرباز؛ ٣) لبریز.

**سەروازخانە:** سپاگە. بنکەی چەکدارانی دەوڵەت ف پادگان.

**سەروازگیری:** سەربازگرتن ف سربازگیری.

**سەروازی:** سەربازی ف سربازی.

**سەروبن:** ١) ژێروژوُر؛ ٢) لەم سەر تا ئەو سەر: (بــازارم **سەروبن** کرد گیر نەکــەوت)؛ ٣) نەخــوٚشی منــاڵان کە سەری مانگ‌و بنی مانگ دەبگــرن ف ١) زیر و زبر؛ ٢) از ابن‌سو تا آنسو؛ ٣) نوعی بیماری کودکان کە در سلخ و غرّهٔ ماە عود کند.

**سەروبــەر:** ١) بەنــەواوی، تەواو: (جبنەکە **سەروبەر** بەشی کرد)؛ ٢) سازی‌وناسودەبی لەژیاندا ف ١) کاملا بدون نقص؛ ٢) سر و سامان.

**سەروبەند:** چاخ، دەم، تاف: (لەو **سەروبەندە**دا جوان بوُم) ف اوان، هنگام.

**سەروبەندبەستن:** کارتەواوکردن، ئامادە کردن ف آمادە کردن.

**سەروبەندگرتن:** سەروبەندبەستن ف آمادە کردن تمام.

**سەروپا:** پەل‌و سەری حەیوان ف کلّەپاچە.

**سەروپاچك:** پەل‌و سەری ئاژاڵ بەبرژاوی ف کلّەپاچە.

**سەروپــوٚتــراك:** ١) نەخــرودبدار؛ ٢) دیمــەنی سەرپێچ‌و مێزەر ف ١) سروسیما؛ ٢) منظر عمامە و کلاە.

**سەروپوٚتلاك:** سەروپوٚتراك ف نگا: سەروپوٚتراك.

**سەروپوٚتەلاك:** سەروپوٚتراك ف نگا: سەروپوٚتراك.

**سەروپوٚرت:** بوٚ هەرکەسێ کەمێك ف سهم اندك برای هر کسی.

**سەروپوٚرتك:** سەروپوٚتراك ف نگا: سەروپوٚتراك.

**سەروپەچك:** سەروپوٚتراك ف نگا: سەروپوٚتراك.

**سەروپێ:** سەروپا ف نگا: سەروپا.

**سەروپێچ:** پارچەی لەسەر بەستراو ف دستار.

**سەروتــاوە:** گونــدێکی کوردستــان کە بەعسی ویرانی کرد ف از روستاهای کردستان کە بعثیان ویران کردند.

**سەروُتر:** ژوُرو، بلندتر ف بالاتر.

**سەروُترە:** سەرفترە، زەکەتی سەرانە کە دوای روٚژوی رەمەزان بە فەقیر دەدرێ ف زکات فطر.

**سەروچاو:** دەم‌وچاو، روُ، روخسار ف رخسارە.

**سەروچاوە:** ١) سەرچاوە؛ ٢) ناوی گوندێکە بەعسی ویرانی کرد ف ١) سرچشمە؛ ٢) نام دهی کە بعثیها ویران کردند.

**سەروچاوێ:** ١) سەرچاوە؛ ٢) ناوی گوندێکە ف ١) سرچشمە؛ ٢) نام دهی.

**سەروخوار:** هەردو ئالی بالاو پابن [ف] بالایی و پایینی.

**سەرودەر:** زانین، تێ‌گەیشتن: (لەم کارە سەرودەر دەرناکەم) [ف] درك، فهم.

**سەرودەرۆ:** سەرودەر [ف] درك، فهم.

**سەروزمان:** ١) ئاپشتی زۆرکەم: (بێ سەروزمان کەوتوە)؛ ٢) زمان باراوی: (پیاویکی بە سەروزمانە) [ف] ١) رمق، نا؛ ٢) زبان‌آوری.

**سەروزو:** سەروزمان [ف] نگا: سەروزمان.

**سەروزوان:** سەروزمان [ف] نگا: سەروزمان.

**سەروزیاد:** بەشی تەواو [ف] کافی و زیادە.

**سەروژێر:** ١) سەرو خوار؛ ٢) پێلاوی پینە لێ‌دراوی سەرتازە؛ ٣) دو لە بزاوەکانی سەر پیتی نوسراو؛ ٤) سەرنخوون؛ ٥) ژێروژوور، کاول، وێران [ف] ١) بالایی و پایینی؛ ٢) کفش پینـەزدە؛ ٣) زبر و زیر اعراب؛ ٤) نگون؛ ٥) ویران.

**سەروساخت:** ساخت‌وپاخت، کەبن‌وبەبن [ف] تبانی.

**سەروسەکوت:** تەرح‌و دیدار، پیچم [ف] سروسیما.

**سەروسەنەمە:** پێوفەدەم: (ئەم ئاغایە سەروسەنەمەی باش نەبو) [ف] بمن.

**سەروسیما:** سەروسەکوت [ف] سروسیما.

**سەروشك:** ١) نەزان، تێ‌نەگەیشتو، نازیرەك؛ ٢) سەرسەخت؛ ٣) ئەسپی رانەهێنراو [ف] ١) کودن، نفهم؛ ٢) سرسخت؛ ٣) اسب رام نشدە.

**سەروشوێن:** شوێنـەوار، ئاسەوار: (وفایی ئاخری خبری بێ دەمێکە بێ سەرو شوێنە) [ف] رد، اثر.

**سەروشەدە:** سەرپێچ [ف] دستار.

**سەروقلخ:** سەروسەکوت [ف] ریخت، سروسیما.

**سەروقوون:** پێچەوانە [ف] برعکس، وارونە.

**سەروك:** ١) سەراك، کولکەی شانەکراو؛ ٢) سەردار، سەرگەورە، رەئیس؛ ٣) شتێ کە مەلـەوان لەسـەر سەری دادەنێ بۆ پەڕاندنەوە؛ ٤) دۆکی رونی داغ کراو [ف] ١) نگا: سەراك؛ ٢) رئیس؛ ٣) چیزی کە شناگر برای عبور دادن بر سر گذارد؛ ٤) کف روغن داغ شدە.

**سەرۆك:** دەسماڵی سەری ژنان [ف] روسری.

**سەروکار:** پەیوندی، ئاشنایەتی [ف] سروکار.

**سەروکانی:** ١) سەرکانی، سەرچاوە؛ ٢) ناوی گوندێکە [ف] ١) سرچشمە؛ ٢) نام دهی.

**سەروکایەتی:** سالاری، سەرداری [ف] ریاست.

**سەروگوێ:** لك‌و چوکلەی دار [ف] پرزە و شاخە درخت.

**سەروگوێ کردن:** هەڵپـەرناوتن، قەبچی کردنی دار، پەرناونن [ف] پیراستن درخت، هرس.

**سەروگوێلاك:** سەروپۆتراك [ف] ریخت و قیافە.

**سەرومال:** برێتی لە هەرچی هەیەو خۆشـەویستە: (سەرومالم بەفوربانی ئازادی) [ف] کنایە از هستی و مُتعلقات آدمی.

**سەرومڕ:** تەواو، بێ کەم‌و زیاد، سەرو زیاد [ف] کافی، بدون کم‌و کاستی.

**سەرومیت:** وشەیەکە لە یازی کەلابێن‌دا [ف] اصطلاحی در تیلەبازی.

**سەرومێزەر:** سەروپێچ [ف] سرودستار.

**سەروناو:** وشەیەکە لە یازی سنجۆقێن‌دا [ف] اصطلاحی در بازی «سنجوقین».

**سەروە:** ١) دولکـە، سەردولکـە، بەمـردو هەڵگـوتن؛ ٢) سەربە: (ئێمە سەروە عەشیرەتی جافین)؛ ٣) سەرڤە، لای سەرەوە [ف] ١) نوحە؛ ٢) منسوب بە؛ ٣) بالایی.

**سەروهار:** سەرنزم، سەرداخستو، برێتی لە خەجاڵەت [ف] سرافکندە، کنایە از شرمسار.

**سەروەر:** سەرگەورە، سەردار، سالار [ف] سرور.

**سەروەری:** پایەبەرزی، سەرداری [ف] سروری.

**سەروەستا:** ١) سەرۆکی وەستاکاران؛ ٢) لای وەستا، لجەم هۆستا؛ ٣) نزیك بە مردن: (زۆر نەخـۆشـە لە سەروەسـتـایە) [ف] ١) رئیس استادکاران؛ ٢) نزد استادکار؛ ٣) بیمار مردنی.

**سەروەسەر:** مامڵەی یەك‌بەیەك گۆڕینەوە [ف] پایاپای.

**سەروەسەرە:** سەربەسەرە [ف] نگا: سەربەسەرە.

**سەروەسەرێ:** سەربەسەرە [ف] نگا: سەربەسەرە.

**سەروەسیەت:** سەرەوگرد [ف] وصی، قیّم.

**سەروەش:** سەرخۆش [ف] شاد، مست.

**سەروەشێن:** شاخـداری کە بە شاخ دەخـەڵـك هەڵـدەدا؛ ٢) تاڤگـە، سوڵاف، ئاوهـەڵدێر؛ ٣) ئێکەم بەرهەمی کونجی [ف] ١) شاخ‌زن؛ ٢) آبشار؛ ٣) اولین محصول کنجد.

**سەرە:** ١) گوێزی دەسکـە للا؛ ٢) نۆبـە، پاو، هەل؛ ٣) کارامـە، بۆ ژن دەڵێن، کابـان؛ ٤) دوبـەهارە بۆ مریشك؛ ٥) گازەنـی سەرجۆیی لە گێرەدا، بەرانبـەری بنە: (بنەی خۆی ناکاو لە سەرەی خەڵك خێرایە)؛ ٦) بۆشانە، سەرانە لە ئاژەڵی رەعیەت ساندن [ف] ١) گردویی کە بجای تیلە باشد؛ ٢) نوبت؛ ٣) کدبانوی مجرّب؛ ٤) مرغ دو بهار دیدە؛ ٥) حیوان سردسنە در خرمن کوبی؛ ٦) باج از حیوانات رعیّت گرفتن مالك.

سەڕە: زەڕە، هاوار کردنی کەر [ف] عرعر.

**سەرهات:** بەسەرهات، رۆداو، رۆدای [ف] رویداد.

**سەرهاتن:** سەرهات [ف] رویداد.

**سەرهاتن:** لەخۆشیان‌دا سەر لێ شێوان [ف] از فرط راحتی راه و رسم زندگی را فراموش کردن.

**سەرهاتی:** سەرهات [ف] رویداد.

**سەرهار:** بزۆز [ف] بازیگوش، ناآرام.

**سەرهاڕ:** بەردی سەروی ئاسیاو، بەرداشی سەرەوە [ف] سنگ آسیای بالایی.

**سەرەبزووت:** بزووت، بزوت، بسوت [ف] نیمسوز.

**سەرەبەهار:** رۆژانی تازەبەهار [ف] نوبهار، اوایل بهار.

**سەرەت:** پێژنگی کون گەورە، کەو [ف] سرند.

**سەرەتا:** ١) ئێکەم سەری دەزو؛ ٢) دەست پێك، پێش‌ونار [ف] ١) سرنخ؛

۲) آغاز، شروع.

**سەرەتـاتکێ:** سەرکێشـان، سەرقونان، روانین بەدزیەوە ف فضولانه و دزدکی نگاه کردن.

**سەرەتایی:** بەرایی، پێشوتەی هەرشتێ ف مقدمانی.

**سەرەتەشی:** داریکی خڕی کونە لەکن نوکە تەشیەوە ف کلّه دوك نخ ریسی.

**سەرەتیر:** نوکی سێ سوچو تیزی تیر ف سر پیکان، ناوك.

**سەرەجە:** نەخۆشیەکی ولاخە کە سەرو لەشی دەماسێ ف نوعی بیماری دام و ستور.

**سەرەچەرم:** ۱) چەرمی سەری رەشەماڵ؛ ۲) برێتی لە زەرەرو زیان ف ۱) چرم سر دام؛ ۲) کنایه از زیان.

**سەرەچەرم دان:** زەرەردان، زیان وێکەوتن ف کنایه از زیان کردن.

**سەرەخۆ:** هێدی، بەسەبر ف شکیبا.

**سەرەخوّرە:** منالێ کە زوّ باوکی بمرێ، وانا پێ و قەدەم شوم ف نوزادی که پدرش بمیرد، کنایه از بدقدم.

**سەرەخولێ:** ۱) سەرگێژی؛ ۲) نەخوشی سەرسامی ف ۱) سرگیجه؛ ۲) بیماری سرسام.

**سەرەخەر:** ۱) برێتی لە خوێنتالی کارتێك دەر؛ ۲) سەرناز، بەخوّدادەر ف ۱) کنایه از مزاحم گرانجان، سرخر؛ ۲) رخنخواب.

**سەرەخەری:** گەگری، پێ‌چەقاندن، پەلپ‌گرتن ف لجاجت، لجبازی.

**سەرەد:** سەرِەت، سەرِەد، کەو ف سرند.

**سەرِەد:** سەرِەت، کەو ف سرند، غربال درشت.

**سەرەدوگ:** سەرەتەشی ف کلّه دوك نخ‌ریسی.

**سەرەدەر:** ۱) دەرەنان؛ ۲) سەرودەر ف ۱) راه نجات، مفر؛ ۲) فهم، درك.

**سەرەدەنگ:** ۱) بوگێڕانەوەی گورانی؛ ۲) بەستەی دوای گورانی درێژ ف ۱) بازگفتن مقطعی از ترانه؛ ۲) تصنیف بعد از آواز.

**سەرەڕا:** سەرڕا، دەگەڵ ئەوەشا ف علاوه بر.

**سەرەڕم:** نوکەنێزەی درێژ ف سرنیزهٔ بلند.

**سەرەڕوّ:** ۱) کەسێ کە بێ بیرکردنەوە کارێ دەکا؛ ۲) بارەبەرێ کە پێش کاروان دەکەوێ و دور دەکەوێتەوە ف ۱) کسی که خودسر و بی‌تدبیر کار می‌کند؛ ۲) ستوری که از کاروان جلو افتد و دور شود.

**سەرەڕوّیی:** کاری سەرەڕوّ ف عمل «سەرەڕوّ».

**سەرەڕێ:** بانڕا، سەری ڕێگێ ف سر راه.

**سەرەڕێگە:** سەرەڕێ ف سر راه.

**سەرەژن:** ژنی ماڵداری کارامە، کەبوانوی خاس ف زن خانه‌دار کدخدامنش.

**سەرەژێر:** بەرەوخوار ف سرازیر.

**سەرەژێرە:** سەربەرەوخوارە، سەربەرەوژێرە ف سرازیری.

**سەرەستورکە:** جوّرێ کرمی ناوزگ ف نوعی کرم شکم.

**سەرەسوّدرە:** مایەفیتنە، ئاژاوەچی ف فتنه‌انگیز.

**سەرەسوّرە:** سەرەگێژە ف سرگیجه.

**سەرەسوڕێ:** سەرەسوّرە، سەرەگێژە ف سرگیجه.

**سەرەسەبیلە:** سەرێکە لە کانزای زەرد دەکرێ بو سەبیلی توتن‌کێشان ف سرچپق از فلز.

**سەرەشك:** سەروّشك ف نگا: سەروّشك.

**سەرەشکێنە:** سەرشکێنە ف نگا: سەرشکێنە.

**سەرەفراز:** سەربلند، خاوەن ئابڕو ف سرفراز.

**سەرەفڕاز:** بەرەوبڵندایی، ئەفرازی ف سربالایی.

**سەرەقەندە:** ۱) سەرەسەبیلە؛ ۲) سەری قلیان‌ئاوی ف ۱) سرچپق؛ ۲) سر قلیان.

**سەرەقەنگە:** سەرەقەندە ف نگا: سەرەقەندە.

**سەرەقەنە:** سەرەقەندە ف نگا: سەرەقەندە.

**سەرەك:** ۱) سەروّك؛ ۲) درشنەی سەربێژنگ؛ ۳) داری دوفلیقانەی دڕك کوکـردنـەوە ف ۱) نگا: سروّك؛ ۲) بر غربال باقیمانده؛ ۳) چوب دوشاخهٔ خار جمع‌کنی.

**سەرەگێژە:** سەرگێژی، سەرەسوّرە ف سرگیجه.

**سەرەمر:** مریشکی دوبەهاردیتو ف مرغ دو بهار دیده.

**سەرەمریشك:** سەرەمر ف نگا: سەرەمر.

**سەرەمژانە:** سەرمژانە ف نگا: سەرمژانە.

**سەرەمەرگ:** دەمی ئاویلکەدان ف حالت نزع.

**سەرەمەقەست:** برشنی لە جلك بڕین باقی‌مـ[illegible]ـرش باقیمانده از قیچی‌بری.

**سەرەمێر:** پیاوی کامڵ و لەچل ساڵ بە باڵا ف سره‌مرد، مرد میانسال.

**سەرِەن:** سەرِەت، سەرەد، کەو ف سرند.

**سەرەنـاز:** ۱) سەرنـاز؛ ۲) لاکێش، مافـورەی درێژوکـە، کەناره ف ۱) سرانداز؛ ۲) قالی کناره.

**سەرەند:** سەرِەت، سەرەد ف سرند.

**سەرِەند:** سەرِەت، سەرەد ف سرند.

**سەرەنداز:** سەرەناز ف نگا: سەرەناز.

**سەرەنگا:** ۱) بالگە، باڵشت؛ ۲) لای سەرو ف ۱) بالش؛ ۲) طرف بالایی.

**سەرەنگرێ:** ۱) زەت بردە، هەڵەنگوتە؛ ۲) زەت بردن، هەڵەنگوتن ف ۱) سکندری خورده؛ ۲) سکندری.

**سەرەنگیا:** بالگە ف بالش.

**سەرەنوێڵك:** سەرانگوێلك ف سرگبنگاه، شوله.

**سەرەنیك:** دەسماڵێکی حەریری ژنەبازێر باتە ف نوعی پارچه است.

**سەرەو:** بەرەوبان، لای ژوّرو ف طرف بالا.

**سەرەوار:** سەربەرەوژێر ف سرازیر، فرود.

**سەرەوارە:** سەربەرەوژێرە ف سرازیری.

**سەرەوچێر:** سەربەرەولێژایی، بەرەوخوارە ف سراشیبی.

**سەرەوخوار:** سەر بەرەوژێر، سەرەوار ف سرازیر.

**سەرەوخوار کردنەوە:** ۱) بەرەو بەرەوژێر بردن؛ ۲) نخوّن کردنەوەی دەفر ف ۱) سرازیر کردن؛ ۲) وارونه کردن ظرف.

**سەرەوخوارە:** سەربەرەژێرە ف سرازیری.
**سەرهۆز:** سەرۆك عەشیرەت ف سردار ایل.
**سەرەوژوور:** سەربەرەژوور ف سربالایی.
**سەرەوژێر:** سەربەرەژێر ف سرازیر.
**سەرەوژێرە:** سەربەرەژێرە ف سرازیری.
**سەرهوستا:** سەروەستا ف استادباشی.
**سەرەوکار:** سەرکار ف نگا: سەرکار.
**سەرەوکو:** بەرەوژوورە، سەرەو ژوورایی ف سربالایی.
**سەرەوگرد:** کەسێ کە پاش مردگ بەسەر ماڵو منالی رادەگا ف وصی. قیّم.
**سەرەولێژ:** ناماڵ سەرەوژێر ف مایل بە سرازیری.
**سەرەولێژە:** سەربەرەژێرە ف سرازیری.
**سەرەولێژی:** سەرەولێژە، سەربەرەژێرە ف سرازیری.
**سەرەوناو:** سەرەولێژ. ناماڵ سەرەوژێر ف سراشیبی اندك. مایل بە سرازیری.
**سەرەوناوە:** سەرەوناو ف سراشیبی اندك.
**سەرەونخوون:** سەرنخوون ف سرنگون.
**سەرەونگوم:** سەرنخوون ف سرنگون.
**سەرەونگوون:** سەرنخوون ف سرنگون.
**سەرەوگــرد:** کەسێ کە لەپــاش مردو بەســەر ماڵو منــالی رادەگا، سەرووسبەت ف وصی، قیّم.
**سەرەوە:** لای سەرو. بەرانبەری لای خوارو ف سمت بالایی.
**سەرەوێسنت:** سەرۆسنت ف نگا: سەرۆسنك.
**سەرهەڵدان:** پەیدابوونی دوای ونبوون ف پیدا شدن بعد از گم شدن.
**سەرهەڵگرتن:** ۱) دەربەزین و راکردنی ئەسپ بێ دەسەلاتی سوار؛ ۲) برینی لە ناوارەبوون ف ۱) لجام گسیختن اسب؛ ۲) کنایە از آوارە شدن.
**سەرهــەڵێنــان:** ۱) سەر بەرزەوەکــردن؛ ۲) سەربــزێوی؛ ۳) برینی لە چاکتر بوونی نەخۆش ف ۱) سر بلند کردن؛ ۲) تمرّد؛ ۳) کنایە از بهتر شدن بیمار.
**سەرهــەنــگ:** ۱) داکی مێشــەنگوینــان، شاهــەنــگ؛ ۲) پلەبەکە لە سەروازی؛ ۳) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) زنبــور مادر، ملکــۀ زنبــوران؛ ۲) سرهنگ؛ ۳) اسم مردانە.
**سەرهەنگاوتن:** دەست لەبان سەردانان بۆ رێزگرتنی کەسێ ف دست بر سر نهادن برای احترام.
**سەرهیچك:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.
**سەرهیشك:** سەرۆشك ف نگا: شەرۆشك.
**سەری:** ۱) نۆبــە؛ ۲) پاژ؛ ۳) کۆمــەڵ، ئابــورە؛ ۴) یەکێن. سەلــك: (**سەری** پیازەکە کوا؟، **سەری** سیرم خوارد) ف ۱) نوبت؛ ۲) قسمت، سهم؛ ۳) تودە؛ ۴) واحدی برای سیر و پیاز و...
**سەریاڵ:** ۱) زبنو، ملەی کێو؛ ۲) کەنارەی کێو ف ۱) گردنە؛ ۲) ستیغ.
**سەری پیری:** رۆژگاری پیری ف پیرانەسر.

**سەریت:** ساقەنەی دەخڵ، کلۆش ف ساقۀ غلّه.
**سەرێش:** نامرازی جووت بە نێکرایی ف ابزار شخم‌زنی عموماً.
**سەرێشان:** ۱) ژانەسەر؛ ۲) دەردی سەر ف ۱) سردرد؛ ۲) دردسر.
**سەرێشە:** سەرێشان ف نگا: سەرێشان.
**سەریلۆك:** گۆرانیو ناهەنگی نابەنی بۆ بەهارهاتن ف ترانۀ مخصوص رسیدن بهار.
**سەرین:** ۱) بالگە، باڵشت؛ ۲) شباکە، ربخ، سنێر ف ۱) بالش؛ ۲) سرگین.
**سەرێن:** ماوەی ژیان: (لە سەرێن خۆبا وەسیەتی کردبو) ف دوران زندگی.
**سەرینگا:** ۱) بالگە؛ ۲) سەرانوێلك ف ۱) بالش؛ ۲) شولە.
**سەرێنی:** ماوەی ژیان ف دوران زندگی.
**سەریەك:** ۱) تێکڕایی؛ ۲) لەبان یەك ف ۱) رویهم؛ ۲) بالای همدیگر.
**سەعات:** سەحات ف نگا: سەحات.
**سەعبانە:** ئانی بەیانی ف صبحانە.
**سەعدانی:** سادانی، جۆرێ نرێ ف نوعی انگور.
**سەعــداوا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدە کردستان توسط بعثیان.
**سەعلەب:** گیای سارمە ف گیاهی است.
**سەعۆ:** سوکەلەناوی سەعبد ف مخفّف نام سعبد.
**سەعە:** سەعۆ ف مخفّف نام سعبد.
**سەعەند:** سەحەند ف نشت کوچك.
**سەعی:** ۱) تەقالا، کوششت؛ ۲) سوکەلە ناوی سەعبد ف ۱) کوشش؛ ۲) مخفف نام سعید.
**سەغبیری:** چاولێ بوون. سەرپەرستی ف نگهداری
**سەغدە:** سەدەقە. خێرلەڕای خوادا ف صدقە.
**سەغلەت:** سەخڵەت ف نگا: سەخلەت.
**سەغی:** سەخی، دلاوا ف سخی. دست و دلباز.
**سەغیر:** سەخیر. سێوی. منالی بێ باب ف بتیم.
**سەف:** ریز، زنجیرە، شتی بەپاڵ بەکەوە ف صف. ردیف.
**سەفا:** ۱) دیمەنی جوانو هەواخۆش: (ولاتێکی باسەفایە)؛ ۲) ئاشتی ف ۱) منظرۀ دشت زیبا و خوش آب و هوا؛ ۲) صلح. آشتی.
**سەفاخانە:** ناوچەیەکە لە کوردستان ف ناحیەای در کردستان.
**سەفان:** زنجیرەی چیا ف سلسلەجبال.
**سەفت:** ۱) لە دەفتەری میریدا نووسینی بســولــەی ملکو... ناپوو؛ ۲) کۆڵەکەی نەسنوروبەڵند ف ۱) ثبت؛ ۲) ستون بلند و قطور.
**سەفتــە:** لەســەریەك دانــان: (قافەزەکان **سەفتە** بکە) ف برهم نهادن، برهم چیدن.
**سەفدر:** بوێر. نازا لە شەڕا، نەترس. بەجەرگ ف شجاع. رزم‌آور.
**سەفرا:** زەرداو ف صفرا.
**سەفۆر:** سموورە ف سمور.
**سەفۆری:** سموورە ف سمور.

**سەفەر:** لە ناوابیەکەوە بۆ ناوابیەکی تر رۆیشتن [ف] سفر.

**سەفەربەر:** رەشیگیر [ف] بسیج عمومی.

**سەفی:** ۱) کەم ناوەز، حۆل؛ ۲) ناوە بۆ ژنان [ف] ۱) خل، سفیه؛ ۲) اسم زنانە.

**سەفیچ:** کەم ناوەز، سەفی [ف] خل، سفیه.

**سەفیك:** ۱) هەبوانۆکە؛ ۲) پالوێنە [ف] ۱) نراس کوچك؛ ۲) صافی.

**سەفین:** ۱) سەفـان؛ ۲) ناوی چیایەکی بەرزە لە کوردستان؛ ۳) ناوی پیاوانە [ف] ۱) رشە کوه؛ ۲) نام کوهی در کردستان؛ ۳) نام مردانە.

**سەفیە:** ناوی ژنانە [ف] نام زنانە.

**سەڤی:** سەبەتە [ف] سبد.

**سەق:** ۱) داربەڕوی زۆر تەسنور؛ ۲) ساوینی تیغ بۆ تیژکردن [ف] ۱) تنهٔ بلوط بسیار فطور؛ ۲) سوهان زدن تیغ.

**سەقا:** ۱) ناوکێش؛ ۲) تەکوز، ریكوپێك؛ ۳) تێراوی [ف] ۱) آبکش، سقّا؛ ۲) نظم، ترتیب؛ ۳) سیراب شدن.

**سەقادان:** تەکوزکردن، ریكوپێك خستن [ف] ترتیب و تنظیم دادن.

**سەقـاقوش:** کەلەك، مەلێکی گەورەی دندوك زلی سپی بۆرە بەرچێلەی شوژەو ماسی خۆرە [ف] پرندەای ماهیخوار، پلیکان.

**سەقـــام:** ۱) تەکـوزی، ریكوپێکی؛ ۲) بەرقـەراری، پایەداری [ف] ۱) تنظیم، ترتیب؛ ۲) پایداری، ثبات.

**سەقامگیر:** بەرقەرار، جیگرتو [ف] پایدار.

**سەقـاو:** ۱) نەخـۆشی تیسفـایی یەکسم؛ ۲) ناوی جۆرێ رمب، رمبی سەقاو [ف] ۱) نوعی بیماری ستور؛ ۲) نوعی نیزە.

**سەقـاهـەڵگرتن:** تێراوبوونی زەوی لە باران، پەڵەدان [ف] سیراب شدن زمین از باران.

**سەقر:** مەلێکی ڕاوە لە باز پچوکتر [ف] چرغ، پرندەای شکاری.

**سەقز:** شارێکە لە کوردستان [ف] شهری در کردستان.

**سەقلاو:** ناوی جۆرێ رمب، رمبی سەقلاو، رمبی سەقاو [ف] نوعی نیزە.

**سەقـەت:** ۱) مردارەوبـوی یەکسم؛ ۲) عەیبدار، زەدەدار؛ ۳) خەتەر، بقە: (بیاوێکی **سەقەتە** ناوێرم بچمە لای)؛ ۴) وشەی گاڵتە پێ کردن لە نەنجام نەدانی کارێ، نەڕ: (**سەقەت** نەهاتی، **سەقەت** نەت کرد)؛ ۵) ناسنجـاو [ف] ۱) مردار ستور؛ ۲) زدەدار، معیوب؛ ۳) خطر؛ ۴) کلمهٔ تمسخر و کنایە؛ ۵) قراضهٔ آهن.

**سەقـەت‌فرۆش:** کەسـێ کاسـبەکـەی ناسنجـاو فرۆشتنـە [ف] قراضەفروش، سقط فروش.

**سەقـەر:** ۱) بەسنەڵەك؛ ۲) گوندێکی کوردانە لەلای دیاربەکر [ف] ۱) نگا: بەستەڵەك؛ ۲) نام روستایی است.

**سەقەم:** سەرماو سۆڵەی زۆر دزوار [ف] سوز و سرمای سخت.

**سەقەمی:** جۆرێ نەخۆشی یەکسمە [ف] از بیماریهای ستوران.

**سەقی:** جۆرێ بەردی مەرمەری زەردە [ف] نوعی سنگ مرمر زردرنگ.

**سەقیل:** رەزیل، رژد، چکوس، دەس قوچاو [ف] خسیس.

**سەك:** سرکە [ف] سرکە.

**سەکار:** ۱) ساقوژ؛ ۲) جۆرێ کورنانی راست و ساف [ف] ۱) سبد بزرگ کاهکشی؛ ۲) نوعی پالان.

**سەکت:** مرداربوونەوەی یەکسم، سەقەت [ف] مردار شدن ستور.

**سەکتە:** مەرگی لەپڕو نەکاو، مەرگی مفاجا [ف] سکتە، مرگ ناگهانی.

**سەکتە کردن:** لەنەکاومردن [ف] سکتە کردن.

**سەکتە گرتن:** شەپڵەلێدان [ف] سکتهٔ ناقص کردن و زمینگیر شدن.

**سەکتین:** مردنی یەکسم، سەقەت‌بوون [ف] مردن ستور، سقط شدن.

**سەکـر:** ۱) داخستن، پێوەدانی دەرك و...: (دەرگاکـە **سەکـر** بکە)؛ ۲) هۆزێکی کوردە [ف] ۱) بستن و برهم آوردن در و پنجره؛ ۲) نام عشیرتی.

**سەکران:** ۱) ناوچەیەکە لە کوردستان؛ ۲) ناوی کێوێکە لە کوردستان [ف] ۱) ناحیەای در کردستان؛ ۲) کوهی در کردستان.

**سەکرە:** زەرك، پیان [ف] ظرف آبخوری.

**سەکسار:** ۱) جۆرێ مەیمون؛ ۲) جوێنێکە واتا: وەك سەگ [ف] ۱) نوعی بوزینە؛ ۲) دشنامی است.

**سەکنی:** بەپێوە، راوەستاو [ف] ایستادە.

**سەکنین:** ۱) راوەستـان، بەپێوەبـوون؛ ۲) داسـەکنان، نارام‌بوون [ف] ۱) ایستادن بر پا؛ ۲) آرام گرفتن.

**سەکۆ:** دکە، بەرزایی لە حەرێ چێکراو بۆ لەسەر دانیشتن [ف] سکو.

**سەکوت:** نەحر، ببجم: (لە سەرو سەکوتی برۆانە) [ف] ربخت و سیما.

**سەکوم:** سەکوت [ف] ربخت و سیما.

**سەکەت:** سەکت، سەقەت [ف] ستور مردار شدە.

**سەکەماتی:** چەورەو خوێری و بێکارە [ف] ولگرد و هرزە، اوباش.

**سەکین:** ناڵ‌بونەوەی ددان بەترشی [ف] کرخ شدن دندان از ترشی.

**سەگ:** سە، سیەڕ، سپلۆت [ف] سگ.

**سەگاف:** جانەوەرێکە لە ناوا دەژی و کونی لە دم ناوە کەولی بەنرخە [ف] سگلاب، سگ آبی.

**سەگاڤی:** سەگاف [ف] نگا: سەگاف.

**سەگالا:** سەگاف [ف] نگا: سەگاف.

**سەگان:** زۆرسەگ [ف] سگها.

**سەگانە:** برێتی لە کاری فێڵاوی و حیلەبازی [ف] کنایە از حیلەبازی.

**سەگاتی:** حیلەباز [ف] حقەباز.

**سەگاو:** سەگاف [ف] نگا: سەگاف.

**سەگاوی:** سەگاف [ف] نگا: سەگاف.

**سەگابەتی:** برێتی لە فێڵبازی و ناراستی [ف] کنایە از حقەبازی و دغلی.

**سەگ‌بەحـەسـار:** ۱) برێتی لە هێنان و بردنی بێ‌فایدە؛ ۲) دارکاری و فێزەوهەرا [ف] ۱) کنایە از بیهودە این‌سو و آن سو بردن؛ ۲) کتك‌کاری و دعوا.

**سەگ‌بەحەوش:** سەگ بەحەسار [ف] نگا: سەگ‌بەحەسار.

**سەگ‌پاسوتیاگ:** برێتی لە ماڵانگەری هەدانە دەر [ف] کنایە از ولگرد.

**سەگ‌پسینکـە:** برێتی لە کەروێشکی بەهارەزێ لە پا بزدا [ف] کنایە از خرگوش بهارەزاد در پائیز.

**سەگ دەس:** چارەوێ کە لە رۆیشتنا نەژنۆی وێك دەکەون [ف] سگدست.

چارپایی که هنگام راه‌رفتن زانوهایش را بهم می‌زند.

**سەگ‌دەست:** سەگ دەس ف نگا: سەگ دەس.

**سەگ‌ڕەو:** حەپەی سەگ ف پارس سگ.

**سەگ‌ڕەوین:** ١) حەپە کردن؛ ٢) ئەوەی سەگ لێی بترسێ و بکشێتەوە ف ١) پارس کردن؛ ٢) آنچه سگ را بترساند.

**سەگ‌ڕەوێنەوە:** کەسێ کە سەگ لێی دەترسن ف کسی که سگها از او می‌ترسند.

**سەگسار:** ١) ناحەز، پیچم ناشیرین؛ ٢) جوێنێکە واتا: وەك سەگ پیس ف ١) بدقیافە؛ ٢) دشنامی است.

**سەگلاو:** ١) سەگاف؛ ٢) جوێنێکە. سەگی پیس ف ١) نگا: سەگاف؛ ٢) دشنامی است.

**سەگلاوك:** سەگلاو واتا: سەگی گلاو، جوێنە ف دشنامی است، سگ نجس.

**سەگلاوی:** جۆرێ ڕەسەنی ئەسپ ف نوعی نژاد اصیل اسب.

**سەگلوُر:** دەنگ درێژ کردنەوەی سەگ، حەپەی درێژی بێ‌بڕانەوە، لوُرە ف زوزهٔ سگ.

**سەگ‌ماسی:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی، سگ ماهی.

**سەگمان:** ئاماج، نیشانە، ئامانج ف آماج تیراندازی.

**سەگمەرگ:** کەسێ کە لەمردنەو نامرێ: (مەپرسە بۆ لە دووری تۆ نەمردم / کەمن سەگمەرگم‌و گیان سەخت‌و دڵڕەق) «شێخ ڕەزا» ف جان‌سخت.

**سەگ‌مەرگی:** دەردو ئازاری زۆر ف درد و رنج زندگی.

**سەگو:** سەگان ف سگها.

**سەگۆ:** ئەی سەگ! ف ای سگ.

**سەگوان:** تیرهاوێژی زاناو زەبردەست، نیشانەنەنگێو ف تیرانداز ماهر، تك تیرانداز.

**سەگ‌وەڕ:** حەپەحەپی سەگان ف پارس گروهی سگها.

**سەگ‌وەن:** ناوی هۆزێکی کوردە ف نام عشیرتی کرد.

**سەگە:** ئەی‌سەگ، وشەیەکە واتا: هەی فێڵباز ف کلمهٔ خطاب به معنی ای حیله‌باز.

**سەگەبوڕ:** سەگە، برێتی لە فێڵباز ف نگا: سەگە.

**سەگەسەگە:** خۆگێل کردن‌و خۆ بەستەزمان نیشان‌دان ف خود را به موش‌مردگی زدن، تظاهر به سادگی.

**سەگەناز:** سەبنێسی ف بیماری کشندهٔ سگ.

**سەگەناس:** سەگەناز، سەبنێسی ف بیماری کشندهٔ سگ.

**سەگەوان:** ئاگاداری سەگ ف سگبان.

**سەگی بێ‌سوتاو:** برێتی لە ماڵانگەری هەدا نەدەر ف کنایه از ولگرد.

**سەگیتی:** سەگایەتی ف نگا: سەگایەتی.

**سەگینی:** سەگایەتی ف نگا: سەگایەتی.

**سەگی‌هار:** ١) سەگێ کە نەخۆشی هاری گرتبێ؛ ٢) برێتی لە مرۆڤی شەڕفرۆش ف ١) سگ هار؛ ٢) کنایه از آدم ماجراجو.

**سەگیەتی:** سەگایەتی ف نگا: سەگایەتی.

**سەل:** ١) تەلاشەبەرد، تلیشەبەرد؛ ٢) بەردی پان‌و تەنك؛ ٣) خڕ: (سەڵك واتا: خڕی چکوُلە)؛ ٤) دەفری پانی لەتوُلەبی تەنراو، ئانەشان: (سەڵك واتا: سەلەی چکوُلە) ف ١) پلمه از سنگ؛ ٢) سنگ پهن و نازك؛ ٣) مدّور؛ ٢) آبکش بافته از ترکه، سبد پهن، سبد طبقی.

**سەلا:** ١) ڕۆژا پساتێ، ڕۆژی هەستانەوەی دوای مەرگ، پەسڵان: (ئەیرۆ سەلام لێ ڕابو)؛ ٢) پاڕانەوە بە دەنگی بەرز بۆ پارشێوکردنی مانگی ڕەمەزان، مناجات؛ ٣) سلا ف ١) روز قیامت؛ ٢) مناجات سحری ماه رمضان؛ ٣) بلندیها.

**سەلاخ:** کەوڵ کەر ف پوست کن، سلاخ.

**سەلار:** سەرەژن ف کدبانوی محترمه و کدخدامنش.

**سەلارە:** ١) سەلار؛ ٢) جوان‌و خوشیك ف ١) نگا: سەلار؛ ٢) زیبا و دلکش.

**سەلارێ:** سەلار ف نگا: سەلار.

**سەلاقوُچکە:** خۆهەڵگێڕانەوە ف پشتك.

**سەلاقوُچکانێ:** سەلاقوُچکە ف پشتك.

**سەلالیك:** ڕەوڕەوە ف چرخ راه رفتن یاد دادن بچه، کمك مادر.

**سەلان:** سلا، بەرزاییەکان ف بلندیها.

**سەلایە:** دەسکی ئاونگ ف دستهٔ هاون، یاور.

**سەلبەند:** ڕێگەی بەردتێ‌گیراو ف راه سنگفرش شده.

**سەلپ:** ١) بێڵی کەڵەك لێ خوڕین؛ ٢) جۆرێ دارەبی ف ١) چوبی که بدان کلك را هدایت کنند؛ ٢) نوعی درخت بید.

**سەڵپ:** بێڵی بەلەم لێخوڕین، سەوڵ ف پاروی قایقرانی.

**سەڵپاندن:** پاروُلێدان ف پاروزدن.

**سەڵپی:** سەڵپ ف نگا: سەڵپ.

**سەڵت:** ١) ڕەبەن، بێ‌ژن؛ ٢) لاشە گۆشتی جگە لە دەست‌و ڕان؛ ٣) پیادەی بێ‌هاوڕێ: (بەسەڵتی هاتم، سەڵت بوُم) ف ١) مجرّد؛ ٢) لاشهٔ گوشت بدون دست و ران؛ ٣) پیادهٔ تنها.

**سەڵتە:** ١) سەرجلێکە لە سەر کەوای ئاو دامێنەوە دەبەر دەکرێ؛ ٢) تەنیا: (سەڵتە سوار) ف ١) نوعی کت کوتاه که روی قبای روحانیّت می‌پوشند؛ ٢) تنها.

**سەڵتەزەلام:** پیادەی تەنیا ف پیادهٔ تنها.

**سەڵتەنە:** ناوی ژنانە ف نام زنانه.

**سەڵتەنەت:** شایەتی، حکومەت، پادشایی ف سلطنت.

**سەلڤی:** داری سەرو ف درخت سرو.

**سەلك:** ١) سەری بنیادەم‌و حەیوان؛ ٢) هەرشتێ خڕ هەڵدراوی پڕ بەمشت: (سەلکە ترخێنە، سەلکە ڕەژی، سەلکەپەنیر)؛ ٣) بنەگیای خڕو درشت: (سەلکەپیاز، سەلکە چەوەندەر) ف ١) کلّه؛ ٢) گلوله شده با دست؛ ٣) پیاز یا ریشه‌های غده‌ای گیاهان.

**سەڵك:** سەبەتەی پچوُك، تریان ف سبد کوچك.

**سەڵکدار:** گیای بن‌خڕ ف گیاه پیازدار.

**سەلکە:** ١) جۆرێ نەخشی مافوُرە؛ ٢) پیوازەی گیا؛ ٣) برێتی لە بنیادەمی سەرزل ف ١) نوعی گل قالی؛ ٢) پیازهٔ گیاه؛ ٣) کنایه از

**قەوز:** پسوڵەی حەساو، رەسید، قەبز [ف] رسید، قبض.

**قەوزە:** ١) قوزە، جلەشبنەی سەر ئاو؛ ٢) قرێژە بەرد [ف] ١) خزه؛ ٢) گل سنگ.

**قەوس:** ئاخرمانگی پایز [ف] آذرما.

**قەوساو:** ئاودانی باغ لە ئاخر پایزدا بۆ پەنای باغ قرکردن [ف] آبیاری باغ در آذرماه برای دفع آفات.

**قەوساوە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قەوسەل:** مەتولۆکە [ف] چیستان.

**قەوسەلە:** ١) قسەی بەزیبك؛ ٢) قسەی بەهیما [ف] ١) سخن منلك‌آمیز؛ ٢) سخن رمز و اشاره.

**قەوش:** کلۆشی سەر خۆبان [ف] ساقه‌های جمع‌آوری شدهٔ سر خرمن.

**قەوغا:** ١) زۆر ئاوەدان؛ ٢) خێزانی زۆر لەماڵدا [ف] ١) آباد؛ ٢) خانوادهٔ پرجمعیّت.

**قەول:** بەڵێن، بەیمان، شەرت، مەرج [ف] پیمان، عهد.

**قەوڵ:** ١) قەول؛ ٢) قەبڵ [ف] ١) نگا: قەول؛ ٢) نگا: قەبڵ.

**قەوڵان:** قەبڵان [ف] نگا: قەبڵان.

**قەوڵاندن:** قەبڵاندن [ف] ارزیابی کردن.

**قەوڵك:** تۆرەکەی بچوکی وردەشت [ف] توبرهٔ خرت و برت.

**قەولوبڕ:** قەرارداد، شەرت و پەیمان [ف] توافق بر کاری.

**قەولوبڕی:** قەولو بڕ [ف] توافق.

**قەولەق:** ١) سورمەدان، کلتوور؛ ٢) تورەکەی چکۆلە [ف] ١) سرمه‌دان؛ ٢) توبرهٔ کوچك.

**قەولەك:** قەولەق [ف] نگا: قەولەق.

**قەوم:** قوم [ف] نگا: قوم.

**قەوما:** روی دا، پێش‌هات [ف] اتّفاق افتاد، پیش‌آمد.

**قەومار:** بەسەرهات و رووداوی ناخۆش و دڵتەزێن [ف] حادثهٔ دلخراش.

**قەومان:** ١) خزمان؛ ٢) روودان، بەسەرهات، قومان؛ ٣) پیر و زوورهان، پیری لەکارکەوتە [ف] ١) خویشان؛ ٢) پیشامد؛ ٣) پیر ازکار افتاده.

**قەوماندن:** ئاژاوە و پشێوی نانەوە [ف] حادثه‌آفریدن.

**قەوماو:** رووداوی ناخۆش [ف] رویداد ناگوار.

**قەومك:** کەدوسەراوی، کوڵەکەسەراوی [ف] نوعی کدو.

**قەومی:** ١) قەوما؛ ٢) رەچەڵەکی، گەلی [ف] ١) نگا: قەوما؛ ٢) ملّی.

**قەومیان:** قومیان، قەومان [ف] اتّفاق ناگوار افتادن.

**قەومین:** قومبان [ف] اتّفاق ناگوار افتادن.

**قەووڕك:** کاکڵەگوێزو بادامی قەربك [ف] مغز بادام و گردوی هنوز نرسیده.

**قەوە:** تابشت، توانا، تاقەت [ف] نیرو.

**قەوەت:** ١) قەوە؛ ٢) وشەیەکە وەك نۆخەی: (**قەوەت** دە ووره لام) [ف] ١) نیرو؛ ٢) کلمه‌ای است نشانهٔ دوستی، جانم.

**قەوی:** ١) ئەستوور: (مل **قەوی**)؛ ٢) بە تاقەت؛ ٣) دەسەڵاتدار؛ ٤) ساغ ودوست؛ ٥) خورت، بەهێز؛ ٦) قریە، قرە، گەلەك [ف] ١) ستبر؛ ٢) باتحمل؛ ٣) بانفوذ؛ ٤) صحیح و سالم؛ ٥) نیرومند؛ ٦) فراوان.

**قەویت:** ١) سەرپەرشتی خێزانی مردگ؛ ٢) راسپێر [ف] ١) قیّم؛ ٢) سفارش کننده.

**قەویتی:** ١) کاری قەویت؛ ٢) راسپێری [ف] ١) قیّمی؛ ٢) سفارش.

**قەویل:** قبوڵ: (**قەویلتە قەویلت** نیە وەهیچ) [ف] قبول.

**قەویلە:** ١) خڕی قوڵەی قەڵەو؛ ٢) قەبیلە، بەرەباب؛ ٣) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) کوتاه‌قدچاق؛ ٢) قبیله؛ ٣) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قەوین:** قەوی [ف] نگا: قەوی.

**قەوینتی:** راسپێری [ف] سفارش.

**قەهبك:** جندە، قەحبك، قاحبە [ف] فاحشه.

**قەی:** ١) قەد؛ ٢) بۆچی؛ ٣) کەوابە، کەوابو؛ ٤) وشەیەکە بەواتا: مانع: (**قەی** ناکا، **قەی** چیە؟)؛ ٥) ئەدی؛ ٦) رشانەوە: (شیرەکەی **قەی** کردگەسەو) [ف] ١) نگا: قەد؛ ٢) چرا؛ ٣) پس، که اینطور؛ ٤) مانع، اشکال؛ ٥) آری؛ ٦) قی.

**قەیا:** ناوە بۆ پیاوان [ف] نام مردانه.

**قەیاخ:** ١) گیابەکە؛ ٢) بەلەمی پان و زل بۆ بارو پەڕینەوە [ف] ١) گیاهی است؛ ٢) قایق باربری.

**قەیاخەوان:** قەیاخ‌ئاژۆ [ف] قایقران.

**قەیار:** ١) تیتۆکی درێژی بەکسم کە نەبناشن؛ ٢) پنجەگیا؛ ٣) سوکەناوی قادر؛ ٤) قەراغ، کەنار؛ ٥) پنجی درزی دیزەو گۆزە [ف] ١) ناخن نراشیدنی سنور؛ ٢) بونە گیاه؛ ٣) مخفّف نام قادر؛ ٤) کنار، گوشه؛ ٥) چسب درز ظرف سفالین.

**قەیارە:** قەدارە [ف] غداره.

**قەیاسە:** باربەندی پان لە چەرم [ف] باربند پهن چرمی.

**قەیاسەدین:** ناوی ئاوایی‌یەکە [ف] نام روستایی است.

**قەیاغ:** ١) بەلەمی بارپەڕاندنەوە، قەیاخ؛ ٢) گیابەکی بالابەرزی تەقەقەقە [ف] ١) قایق باربری؛ ٢) گیاهی است.

**قەیبڕ:** قەدبڕ [ف] راه میانبر.

**قەیتان:** شریت [ف] رشتهٔ بافتهٔ باریك.

**قەیتوڵ:** ناوی ناوچەیەکە لە کوردستان [ف] ناحیه‌ای در کردستان.

**قەیتوڵی:** ١) ناوە بۆ پیاوان؛ ٢) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) نام مردانه؛ ٢) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قەیتەران:** ١) گیابەکی لاسکەزەشە؛ ٢) ناوی پاڵەوانێکی چیرۆکە: (قارەمان و **قەیتەران**) [ف] ١) گیاهی است؛ ٢) نام گردی باستانی.

**قەیچی:** تۆرنۆ، مەقەس [ف] قیچی.

**قەیچی‌بڕ:** بەتۆرنۆبڕ بن [ف] قیچی‌بر.

**قەیچی کردن:** بڕناوتن بە قەیچی: (لە کوڵمت هەرچی خارج بێ سەری نەگریجە **قەیچی**کە/بلێن با سەربڕ بنی خارجی بۆ ڕەونەقی دبن بو) «سالم» [ف] با قیچی بریدن.

**قەی چیە:** چعەیبی هەیە؟، مانع چیە؟ [ف] چه مانعی دارد؟.

**قەید:** ١) قەی، عەیب‌و مانع؛ ٢) ئاڵقەی ئاسن؛ ٣) ئاڵقەگوریسی تابار بە نابارەوەدان؛ ٤) جومگەی بەکسم؛ ٥) هەوای گۆرانی ف ١) مانع؛ ٢) حلقهٔ آهنی؛ ٣) ریسمان حلقه‌شده را به لنگه‌بار چسباندن؛ ٤) مچ سنور؛ ٥) آهنگ ترانه.

**قەیدك:** ١) جومگەی بەکسم، قەید؛ ٢) زنجیری پەل‌بەندی یەکسم؛ ٣) پەراوێز لە دەورو ژێر پەڕاو نوسین ف ١) مچ سنور؛ ٢) زنجیر پای سنور؛ ٣) حاشیهٔ نوشتار.

**قەیدێ:** ماوەیەك لەزەمان: (قەیدێ باوابێ بەڵام ڕۆژی نەبێ منداڵی کورد) «حەمدی» ف مُدتی.

**قەیر:** ئەندازە، قەدەر ف اندازه.

**قەیران:** ١) بەڵێن بۆ کاتدیاری‌کردن: (**قەیران**مان سەری مانگ بێ)؛ ٢) جەنگەی تونـدو تیژی نەخـۆشی: (ئـەم نەخـۆشبە چواررۆژ **قەیرانبەتی**)؛ ٣) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ١) میعادزمانی؛ ٢) بحران بیماری؛ ٣) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قەیرە:** ١) بەتەمەن‌تر لە جەنگەی جوانی‌و لاوەتی: (**قەیرەکچە، قەیرەپیاوە**)؛ ٢) لەکاردەرهاتگ: (ئەسپەکە **قەیرەبە**)؛ ٣) بەرانی پەنج ساڵە ف ١) مسن‌تر از عنفوان جوانی؛ ٢) کارکشته؛ ٣) قوچ پنج ساله.

**قەیسەك:** ١) عاسا، دارەکاز؛ ٢) مشتوی خەنجەرو دەسکی شیر؛ ٣) باگردێن، بانگلێر ف ١) عصا؛ ٢) دستهٔ شمشیر و خنجر؛ ٣) بام غلتانك.

**قەیسەر:** ١) تەزو، قوفل، قەفل، سڕی؛ ٢) پاڵشای زەلام ف ١) کرخ از سرما؛ ٢) پادشاه.

**قەیسەربوُن:** لەسەرمان سڕبوُن ف کرخیدن از سرما.

**قەیسەرقو:** چاوەنوارێی زیاد ف انتظار زیاد.

**قەیسەری:** ڕاستەبازاڕ، گوزەر ف راستەبازار.

**قەیسی:** ١) زەردالو؛ ٢) دەنکەخۆشەی زەردالو ف ١) زردالو؛ ٢) هستهٔ شیرین زردالو.

**قەیسیل:** قەرسیل ف نگا: قەرسیل.

**قەیش:** قایش ف چرم ورنی.

**قەیفە:** قەدیفە ف نگا: قەدیفە.

**قەیفەیی:** ڕەنگی ناڵ ف قرمز روشن.

**قەیقەناخ:** هێلکەوڕۆنی بەدۆشاو، خاوڕۆنیٚ بەشوٚك ف خاگینه با شیرهٔ انگور.

**قەیك:** بەلەم، قەیاغ ف قایق.

**قەیل:** ١) بڵند، بەرز؛ ٢) سەرعێل ف ١) بلند؛ ٢) سردار ایل.

**قەیلۆك:** داوەڵ، داهوڵ ف مترسك.

**قەیلە:** گۆشتی وشکەوبوی لەهەمانەدا بۆزستان ف قورمه.

**قەیم:** ١) قەدیم، پێشونە، لەمێژینە؛ ٢) تونەو قایم ف ١) قدیم؛ ٢) محکم.

**قەیمـاخ:** ١) توێژی سەر ماست‌و شیر؛ ٢) ناردو ڕۆنی سوُرەوە کـراو، میوانی ف ١) سرشیر، چربی بالای ماست؛ ٢) کاچی.

**قەیماغ:** توێژی سەر شیر و ماست ف سرشیر، چربی روی ماست.

**قەیمی:** قەدیمی، کۆنە ف قدیمی.

**قەیمین:** ڕەق‌بوُنی ئەندامی لەش ف سفت وسخت شدن اندام.

**قەینا:** نەدی نا، بۆچی وانیە؟ ف مگر نه اینطور؟.

**قەینات:** قنیات، سەبوُری، ڕازی‌بوُن بە بەشی‌خودا ف قناعت، شکیبایی.

**قەیناخ:** گیایەکە ف گیاهی است.

**قەینـاغ:** قامکـەدەسکێشی چەرمی دروێنەوانان، قامکەوانە ف انگشت پوش چرمی دروگر.

**قەی‌ناکا:** عەیبی نیە، نەتشنە ف مانعی ندارد، باشد.

**قەینتر:** قەنتەرە، قەمتەرە، پردی لە ناو گوێژەنەوە ف قنطره.

**قەی‌نە:** مەگەرنە؟، مەگین‌وانیە؟ ف مگر نه؟

**قەیوان:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**قیا:** سەلا، پەسڵان، قیامەت، ژیانەوەی دوای مەرگ: (دەستی من دامەنی تۆ ڕۆژی **قیا**) «نالی» ف رستاخیز.

**قیامەت:** قیا ف رستاخیز.

**قیبلە:** ڕوگە، قوبلە ف قبله.

**قیبلەنوما:** ئامرازێکە لا دیاری دەکا ف قبله‌نما.

**قیپ:** ١) بەلەك‌نەسنوُر؛ ٢) لاسك‌نەسنوُر؛ ٣) بەلەکی پا؛ ٤) لەڕو لاواز ف ١) ساق کلفت؛ ٢) ساقهٔ کلفت؛ ٣) ساق پا؛ ٤) لاغر.

**قیپ‌بوُن:** لەڕبوُن، گۆشتی‌لەش کەم‌کردن ف لاغرشدن.

**قیت:** ١) قنج، بڵندوڕاست، ڕاست ڕاوەستاو؛ ٢) زۆپ، زەق؛ ٣) خێڵ؛ ٤) ڕۆنێ کە شوانکارە دەیدا بەخاوەن‌پەز؛ ٥) پاژێکی بچوُك لە بڕشتی‌دار بە ئەور؛ ٦) لقی‌دار ف ١) راست و بلنـد؛ ٢) برجسته؛ ٣) لوچ؛ ٤) روغنی که شبـان به گلّه‌دار می‌دهـد؛ ٥) تراشـهٔ کوچـك چوب؛ ٦) شاخهٔ درخت.

**قیتك:** ١) بەلۆکە؛ ٢) کەشکەزرانی؛ ٣) لقی بچوُکی دار، لقی ناسك ف ١) چوچوله؛ ٢) کاسهٔ زانو؛ ٣) شاخهٔ نازك درخت.

**قیتکە:** ١) قیتك؛ ٢) زۆپی بچوُك ف ١) چوچوله؛ ٢) برجستهٔ کوچك.

**قیت‌وقۆز:** بەژن‌ڕاستی جوان ف بلندبالای زیبا و خوش تیپ.

**قیتە:** ١) کاورای قیت؛ ٢) هەردوشاخ ڕاست هەڵچوبۆ بزنی دەڵێن ف ١) باروی بلندبالا؛ ٢) دامی که شاخ‌های راست و عمودی دارد.

**قیتەقیت:** بریتی لە جەجێڵابەنی، هاتوچۆ بۆ حەزلێ‌کردوُیی ف کنایه از رفت و آمد و حرکات عاشقانه.

**قیتەڵ:** چکۆڵەی زەق‌و زۆپ ف کوچولوی برجسته.

**قیچ:** ١) کەسێ چاوێکی لە چاوێکی پچوُکترە؛ ٢) بڵند، قوُچ؛ ٣) خوار، خێچ؛ ٤) سپی زۆرسپی؛ ٥) پیچ، کەمـوسکە ف ١) کسی که یکی از چشمانش کوچکتر است؛ ٢) بلندمخروطی؛ ٣) کج؛ ٤) بسیار سفید؛ ٥) اندك.

**قیٚچ:** جانەوەرێکی چکۆڵەی ڕەشی ئاماڵ‌سوُرە خوێنی زیندەوەر دەمژێ، کێچ ف کك.

**قیچ‌قیچ:** قرژقرژ، دەنگی کوڵینی ئاو بەنهێم ف صدای غلغل زیاد آب.

**قیچك:** ١) قینکە، بەلوکە؛ ٢) زەردی ناجوخ ف ١) چوچوله؛ ٢) زرد روشن.

**قیچ کردنەوە:** ١) چاوێك تۆچاندن و بە چاوێك ڕوانین؛ ٢) لە دوورەوە بڵند هاتنە بەرچاو ف ١) با یك چشم نگاه کردن و چشمی را بستن؛ ٢) از دور بلند دیدن.

**قیچمەز:** ١) نابڕونکاو، بێ‌شەرم؛ ٢) ناکارخراپ ف ١) بی‌آبرو؛ ٢) بدرفتار.

**قێچی:** قەیچی، دوێرد، نۆرنۆ، مقەست، مەقەس ف قیچی.

**قێخا:** تۆخا ف کدخدای ده.

**قێد:** ناڵەی ئاسن ف حلقۀ آهنی.

**قیدقید:** قدقدی مامر ف قدقد مرغ.

**قیدنینە:** قەیدی‌نیە، قەی‌ناکا ف اشکالی ندارد.

**قیر:** کانزایەکی ڕەشە لە شوێنی چاڵەنەوتی کۆندا دەس ئەکەوێ. قیل ف قیر.

**قیڕ:** ١) پڕنـاو، چوارناڵە؛ ٢) لەنەکاو بێ دەنگ و سەدا: (قیڕ گرتم)؛ ٣) دەنگی مر بشك لەترسان ف ١) ناخت؛ ٢) ناگهان بدون سر و صدا؛ ٣) صدای مرغ از ترس.

**قیڕ:** قوڕ، گون شوڕ ف فتقی.

**قیرا:** بولێلە، بەرەبەیان ف اوّل بامداد.

**قیرات:** ١) پاژێك لە سی‌و شەش پاژی مسقـاڵ؛ ٢) نامرازێکە جیوەی تێدا دەگەڵ گەرما بەرز دەبێتەوە و دەگەڵ سەرما دادەکشێ، گەرماپێو ف ١) قیراط؛ ٢) دماسنج.

**قیراج:** ١) پەراوێزی نوسراو؛ ٢) موی سەری بەرژوبڵاوی شانەنەکراو ف ١) حاشیۀ نوشته؛ ٢) موی ژولیده.

**قیراخ:** کەسێ کە دەلنگ یان قوڵی هەڵماڵیوە ف پاچەورمالیده.

**قیران:** زیقەی مر بشك لەترسان ف جیغ مرغ از ترس.

**قیراندن:** زیقاندنی مر بشك ف جیغ کشیدن مرغ.

**قیرانن:** قیراندن ف نگا: قیراندن.

**قیرپاچ:** توڕپاچ، فەمچی، قامچی، نازیانە، شەلاخ ف تازیانه.

**قیرتاو:** قیرتێدراو، بەقیر داپۆشراو ف قیراندود، اسفالته.

**قیرتەبەق:** جۆرێ نانەسانی لەتوڵ‌نەنراوی قیلەناوکراوە ف سبد قیراندود.

**قیرچان:** سیرەسیر لە ددان هاتن ف صدای برهم ساییده‌شدن دندانها.

**قیرچاندن:** سیرەسیر لە ددان هێنان ف صدا از دندانها درآوردن.

**قیرچین:** قیرچان ف نگا: قیرچان.

**قیرسیچم:** ١) بێ‌جەقێن، نەساز؛ ٢) ڕەزیل، ڕژد ف ١) لجباز؛ ٢) خسیس.

**قیرسیچمە:** قیرسیچم ف نگا: قیرسیچم.

**قیرقاج:** خوارەکەو بێچەکە ف اریب.

**قیرقاچ:** قیرقاج ف اریب.

**قیڕقیڕ:** هەراو زەنازەنا: (کوڕو نەوچ قیڕقیڕاتەبە) ف هەو و جنجال.

**قیڕوسیا:** چش، هەرچی نەبێ با ببێ ف هرچه باداباد.

**قیروقاج:** قیرقاج ف اریب.

**قیروقاچ:** قیرفاج ف اریب.

**قیڕە:** ١) قرەی بۆق؛ ٢) زیقەی باڵدار؛ ٣) کەوتنی دەنگ لە زیقەدا ف ١) صدای قورباغه؛ ٢) جیغ پرنده؛ ٣) گرفتگی صدا از جیغ زیاد.

**قیڕە:** قوڕ، گون پەنەماو ف فتقی.

**قیڕەبوون:** دەنگ‌کەوتن لەبەر زیقاندن ف خفه‌شدن صدا از جیغ زیاد.

**قیرەتاو:** قیرتاو ف قیراندود، اسفالته.

**قیڕەقیڕ:** زیقەو هەرای زۆر ف جیغ و فریاد زیاد.

**قیڕە گون:** کەسێ لە زیڕاندنی زۆرەوە قوڕ بوبێ ف کسی که از جیغ زیاد فتقی شده.

**قیڕە گون:** گون قوڕ ف فتقی.

**قیری:** ڕەش بە ڕەنگی قیر ف مشکی، سیاه همرنگ قیر.

**قیرین:** قیری ف سیاه به رنگ قیر.

**قیڕین:** ١) زیقاندن؛ ٢) بەرەنگی قیر ف ١) جیغ کشیدن؛ ٢) به رنگ قیر.

**قیرینە:** قیرتێ‌هەڵسواو ف قیراندود.

**قیز:** ١) دۆت، قز؛ ٢) بێز ف ١) دختر؛ ٢) حال از دیدن چیزی بهم خوردن.

**قێز:** ١) بێز، دڵ‌تێکچـوون لە دیتنی شتێ؛ ٢) وشـەیەکـە لە بازی‌دا واتا: تەسلیم ف ١) دل بهم آمدن از دیدن چیزی؛ ٢) اصطلاحی در بازی به معنی تسلیم.

**قیزبوون:** ١) تەسلیم‌بوون لە بازی‌دا؛ ٢) ناشیرین‌بوون ف ١) تسلیم شدن در مسابقه؛ ٢) زشت شدن بعد از زیبایی.

**قیزبوونەوە:** دڵ‌شێوان لە دیتنی شتێ ف دل بهم آمدن از دیدن چیزی.

**قیزشێوان:** قیزبوونەوە ف نگا: قیزبوونەوە.

**قیزشێوبان:** قیزبوونەوە ف نگا: قیزبوونەوە.

**قیزشێویانەوە:** قیزبوونەوە ف نگا: قیزبوونەوە.

**قیزك:** دارێکی لیرەوارە ف درختی است جنگلی.

**قیزکردن:** قیزبوونەوە ف نگا: قیزبوونەوە.

**قیزکردنەوە:** قیزبوونەوە ف نگا: قیزبوونەوە.

**قیزوبیز:** قیزکردن ف دل بهم‌آمدن.

**قیزۆك:** پوکاوڵە، چەموڵە، چەمبوڵە ف ام کردن، پنجه‌گذاشتن.

**قیزە:** تاشبرین ف زشت.

**قیزەون:** قیزەون ف نگا: قیزەون.

**قیزەون:** ١) شتێ کە مرۆ بێزی لێ دەکـا؛ ٢) مرۆی بەبێز کە کەم شت دەخوا، دژخۆر ف ١) چیزیکه حال آدم را بهم می‌زند؛ ٢) کسی که زود دلش بهم می‌خورد.

**قیژ:** ١) دەنگی تیژ، زیڕە؛ ٢) قاژو ف ١) جیغ؛ ٢) زغن.

**قیژاندن:** زیڕاندن ف جیغ کشیدن.

**قیژانن:** قیژاندن، زیڕاندن ف جیغ کشیدن.

**قیژقیژۆك:** زاروکێ کە زۆر دەزیقێنێ ف بچۀ جیغ جیغو.

**قیژك:** قەلەڕەشە ف كلاغ.
**قیژلاندن:** وەچۆقەچۆق خستنی ڕۆن ف گداختن روغن.
**قیژۆك:** باڵداریكی كەسكە لە ڕیشۆلە زلترە ف پرندهٔ سبزقبا.
**قیژوواژ:** زەنازەنا ف داد و فریاد.
**قیژ ووژ:** هەراهەرا، زەنازەنا ف جیغ و داد وفریاد.
**قیژوهوڕ:** قیژووژ ف جیغ و داد.
**قیژە:** قیژ، زیقە ف جیغ.
**قیژەقیژ:** ١) زیقەی زۆر؛ ٢) فەرمان بە بێدەنگ بوون: (توخوا قیژەقیژ) ف ١) جیغ زیاد؛ ٢) فرمان به خاموشی سروصدا.
**قیژە كردن:** زیڕە كردن ف جیغ كشیدن.
**قیژین:** قیژاندن ف جیغ كشیدن.
**قیس:** دەرفەت، هەل، فرسەت: (لە قیسم چو، لە **قیسی** خۆم دا) ف فرصت بدست آمده.
**قیسپ:** داریكە بۆ بەرزین دەچەقێندرێ، قسپ ف چوب ثابت دیوارهٔ برچین.
**قیست:** ١) گیابەكە؛ ٢) فەرزدانەوەی پاژپاژ ف ١) گیاهی است؛ ٢) قسط وام.
**قیسك:** جیكڵدانە ف ژاغر، چینەدان.
**قیسكە:** ١) قیسك؛ ٢) منالی جكۆلەی پۆنەكە ف ١) ژاغر، چینەدان؛ ٢) كودك لاغر و فسقلی.
**قیش:** ١) بانو، بانە، بان، دەشتی بلندتر لە دەوروبەری خۆی؛ ٢) فوڕ، حەزێ؛ ٣) فەلسی لیو ف ١) فلات؛ ٢) گل؛ ٣) ترك لب.
**قیشاف:** ١) قوراو، لینە، جلپاو؛ ٢) لێوی قەلشیو ف ١) لجن؛ ٢) لب ترك برده.
**قیفار:** دركێكی سپیە ف خاربنی است سفید.
**قیفەرێ:** گوندێكی كوردستانە بەعسی كاولی كرد ف نام روستایی در كردستان كه توسط بعثیان ویران شد.
**قیڤار:** قیفار ف نگا. قیفار.
**قیق:** ١) داڵگۆشت، زەعیف؛ ٢) مل باریك ف ١) لاغر؛ ٢) گردن باریك.
**قیق لوقی:** دەنگی خوێندنی كەڵەباب ف بانگ خروس.
**قیقی:** ١) داركونكە؛ ٢) قوقوی كەڵەشێر؛ ٣) برێنی لە مریشك ف ١) داركوب؛ ٢) صدای خروس؛ ٣) كنایه از ماكیان.
**قیقی داوكە:** باڵداریكە ف پرنده‌ای است.
**قیل:** ١) قوڵ؛ ٢) كەڵبی درندە، ددانی پێشەوەی درندە؛ ٣) قیر ف ١) ژرف؛ ٢) دندان ناب درنده؛ ٣) قیر.
**قیل:** گوانی ناژەڵی شیردەر ف پستان دام شیرده.
**قیلكە:** ١) جیلكە؛ ٢) حیلكەی پێكەنین ف ١) سافه و چوب كوچك خلال مانند؛ ٢) هرهرخنده.
**قیلە:** خزم، قەوم ف خویشاوند.
**قیلەتاو:** قیرناو ف اسفالته.
**قیلەوقاچ:** قیرقاچ ف اُریب.
**قیلەوقانج:** قیرقاچ ف اریب.

**قیم:** ١) ڕازی بوون: (قیما من نایە)؛ ٢) بەس و كیفایەت ف ١) رضایت؛ ٢) بس، كافی.
**قیم ئانین:** ڕازی بوون ف راضی بودن.
**قیم پێ ئانین:** پێ ڕازی بوون، پێ قابل بوون ف روا دیدن.
**قیمە:** گۆشتی ئەنجندراو ف گوشت خردشده، قیمه.
**قیم هاتن:** ڕازی بوون ف راضی شدن.
**قیمەت:** نرخ، بایی ف قیمت.
**قیمەت دار:** ١) بەجەوهەرو هونەر؛ ٢) گران ف ١) هنرمند؛ ٢) قیمتی.
**قیمە كردن:** ئەنجنینی گۆشت ف چرخ كردن گوشت.
**قیمە كرن:** قیمەكردن ف چرخ كردن گوشت.
**قیمە كێش:** سانۆری چەماوی گۆشت‌وردكردن: (ڕوت وەكو ئاگر موژەت وەك شیش و ئەبروت **قیمەكێش** /میژوەحەت زلفو كەبابت جەرگی پارەی ناری بە) «ناری» ف ساتو ر قیمه‌كش.
**قیمیش:** ڕەوادیتن ف روادیدن.
**قین:** ١) قن، قنگ؛ ٢) رق، توڕەیی، قەلسی، ڕك، قار ف ١) كون؛ ٢) كینه.
**قینات:** قنیات، سەبووری ف شكیبایی.
**قیناوی:** ڕكۆنی ف كینه‌ور.
**قین ئەستوور:** كەسێ كە درەنگ لە توڕەیی خاوەد بێنەوە ف كسی كه خشمش دیر فرونشیند.
**قین بنە:** گیابەكی بەهاربەو دەبخۆن ف گیاهی است خوردنی.
**قینجك:** قونجك ف دنبالچهٔ مبوه.
**قین جواندن:** ڕك هەلساندن ف خشم برانگیختن.
**قین جوین:** ڕك هەلسان ف سرکین آمدن.
**قینچك:** قونجك ف دنبالچهٔ مبوه.
**قین خواردنەوە:** ڕك لەبیرخۆبردنەوە، پیش خواردنەوە ف خشم فروخوردن، كین در دل نهفتن.
**قین دار:** بەقین، دڵ بڕ ڕك ف خشمگین.
**قین كێشان:** ڕك هەلگرتن ف كینه‌توزی، كین به دل گرفتن.
**قینگ:** قن، قنگ: (زۆر بە ئەعرزو كینابە لە بنی سینگت بەم/بەگ ئەفەندی بە سەراحەت لە كونی **قینگت** بەم) «شێخ ڕەزا» ف كون.
**قین گرتن:** كەوتنە سەرڕك، بێ‌جەقاندن ف بافشاری از سر لج، لج كردن.
**قین لەبەر:** ڕكۆنی، قین لەدل ف كینه‌توز.
**قین لەدل:** ڕكۆنی ف كینه در دل، كینه‌ور.
**قین لەسك:** قین لەدل، ڕكۆنی ف كینه دردل.
**قین لەقنە:** كلك هەڵتەكێنە، دوهەژێنك ف دُم جُنبانك.
**قین لێ بوون:** خۆش نەویستن، ڕك لێ بوونەوە ف دوست نداشتن.
**قین لێ هەستان:** لێ توڕە بوون ف از كسی به خشم آمدن.
**قین لێ هەڵستان:** قین لێ هەستان ف از كسی به خشم آمدن.
**قین لێ هەڵگرتن:** توڕە بوون و چاوەنۆڕی هەل بۆ تۆڵە ف كینه از كسی در دل گرفتن.

**قین ون:** قبناوی [ف] کبنه ور.

**قینه به ری:** رکه به ری [ف] هم چشمی.

**قینه ون:** قین ون، قبناوی [ف] کبنه ور.

**قین هه ستان:** رك هه سنان [ف] خشمگبن شدن.

**قین هه ستاندن:** رك هه سناندن [ف] خشم برانگیخنن.

**قین هه ڵسان:** رك هه ڵسان [ف] بخشم آمدن.

**قین هه ڵستاندن:** رك هه سناندن [ف] خشم برانگیختن.

**قین هه ڵگرتن:** رك له دڵا هێشتنه وه [ف] کبنه دردل گرفتن.



**ك:** ١) لەپێش وشەدا بە مانای کە، بۆنەوە: (من وانم **کنەچی**)؛ لەپاش‌وشەدا ٢) ناك، تەنیا: (گاك پەمانای‌تاقەگابەك)؛ ٣) هێمابۆناسیاوێ کە ناتەوێ ناوی بەری: (**مێرك، ژنك**)؛ ٤) ئامرازبۆن دەگەبەنێ: (کو تك، خێنك)؛ ٥) بۆبچوك‌ساندانە: (کنك، کورك)؛ ٦) **بەمانای‌زۆرزۆر**: (**خەموك**، گربنوك) فا ١) بە عنوان پیشوند بە معنی برای اینکه؛ بە عنوان پسوند ٢) بکی، یك دانه؛ ٣) اشارە بە مشارالیه شناخته شده؛ ٤) پسوند ابزار؛ ٥) پسوند تصغیر؛ ٦) بە معنی بسیار زیاد.

**کا:** ١) کوا، لە کوە؟؛ ٢) بازی پچوکی لاسکە دەخلێ؛ ٣) پاشگری بەواتا: یەکدا: (لە بڕێکا، لە ڕۆژێکا)؛ ٤) وشەی ڕێزلێ نانی براگەورە: ( **کا** حەسەن)؛ ٥) بکات: (خوا روحم **کا**)؛ ٦) دادەی، ئابزانم: ( **کا** وەرە، **کا** ببینم)؛ ٧) بلا، با، بهێڵە: (**کا بچێ بزانم چی دەکا!**) فا ١) کو؟، کجا است؟؛ ٢) کاه؛ ٣) پسوند بە معنی در بکی؛ ٤) اصطلاح احترام بە برادر بزرگتر، داداش؛ ٥) کناد، کند؛ ٦) ببینم، بدانم؛ ٧) باشد، بگذار.

**کائین:** قاویچ، قاویش فا نشخوار.

**کاب:** ١) قاپ، میچ، جگە، چوٚ؛ ٢) فاپ، گوێزنگ فا ١) شنالنگ، قاپ؛ ٢) فوزك پا.

**کابا:** جگ، میچ، دەق، قاپ، کاب فا قاپ.

**کابان:** ١) ژنی ئاگاداری ماڵ؛ ٢) ناوە بۆ ژنان فا ١) کدبانوی خانە؛ ٢) نام زنانە.

**کابانەتی:** ماڵڕاگرتنی بەچاکی، بناوانی فا خانەداری کردن.

**کابانی:** کابانەنی فا خانەداری کردن.

**کابانێ:** ١) جگێن، میچێن؛ ٢) ئەی کابان فا ١) قاب‌بازی؛ ٢) ای کدبانو.

**کابچك:** جومگەی دەست فا مُچ دست.

**کابرا:** ١)فلان، کەسێ کە ناوی نابەن: ( **کابرا** تۆ کێی)؛ ٢) کەسێ کە نای ناسن: ( **کابرا** بەکەم دبت) فا ١) بارو، فلان؛ ٢) کسی کە ناشناس است.

**کاپرەش:** ١) قاپرەش، کوێتی داوین تاریك؛ ٢) شوم جوت‌فۆشە فا ١) کمبت پا سباه؛ ٢) نحس.

**کابگر:** ١) برێتی لە جنێوفروش: ٢) برێتی لە پاش‌ملەبێژ فا ١) کنایە از دُشنام‌دهندە؛ ٢) کنایە از غیبت‌گوی.

**کابوٚخ:** بەشە چێندراوێ کە لە هاوساکانی ئبراوتر و گەش ترە فا بخشی از محصول کە از بقیە پُربارتر باشد.

**کابوٚك:** ١) باڵدارێکە کبوی.حەمابەت دەبێ، لە کەو بچوکترەو گۆشتی دەخورێ بە زۆر ڕەنگان هەیە، کۆتر، کەفوك؛ ٢) جێگەی سانەوەو خانبکردنی باڵدار، لانە، هێلانە فا ١) کبوتر؛ ٢) آشیانە.

**کابە:** ١) خانەی خودا، رۆگەی ئیسلام؛ ٢) میچ، کاب؛ ٣) کەشکەژنۆ؛ ٤) جومگەی‌دەست و پا؛ ٥) قەسەڵ، کای‌درشتی بەرماو لە ئاخوردا فا ١) کعبە؛ ٢) قاپ؛ ٣) کاسهٔ زانو؛ ٤) مُچ دست و پا؛ ٥) کاه درشت ماندە در آخور.

**کابەشاك:** بەخت‌و ئیقباڵ فا بخت و اقبال، شانس.

**کابەك:** ١) کەشکەزرانی؛ ٢) جومگەی دەست‌و پا؛ ٣) قەسەڵ فا ١)کاسهٔ زانو؛ ٢) مُچ دست و پا؛ ٣) کاه درشت ماندە در آخور.

**کابهوٚر:** برێتی لە کورتەباڵا، کنك فا کنایە از قد کوتاه، کوتولە.

**کابەی:** میچێن، کاپێن، کابانێ، قاپێن فا قاپ بازی.

**کاپ:** قاپ، جگ، میچ، چوٚ فا شنالنگ، قاب.

**کاپان:** ١) ڕێگەی نەسك‌و تەنگەبەر؛ ٢) جگێن؛ ٣) کونی فرەوان لە میچی خانودا؛ ٤) نەغمەی بن‌دیوار کە پیاوی پێدا بچێ فا ١) راهرو تنگ؛ ٢) قاب‌بازی؛ ٣) سوراخ گشاد در سقف خانە؛ ٤) نقب کف اطاق.

**کاپانێ:** کابانێ، جگێن فا قاب‌بازی.

**کاپچك:** جومگەی‌دەست فا مُچ دست.

**کاپك:** ١) پەنك، پەت، پارچەگوریس؛ ٢) جگی چکۆڵە فا ١) رسن پارە، ریسمان کوتاه؛ ٢) قاب کوچك.

**کاپۆ**: ١) خانوی باڵدار، هێلانە، هێلین، لانە؛ ٢) بێقل ف ١) آشیانە؛ ٢) بینی.

**کاپـوخ**: ١) پوش‌و گیای گێرە کراو، گیای نەنجناو؛ ٢) کەسێ گیا ورد دەکا ف ١) گیاه کوبیده؛ ٢) کسی که علوفه می‌کوبد.

**کاپۆر**: تووتنی زۆر خراپ، رەشکەتووتن ف توتون بد سیاهرنگ.

**کاپۆك**: ١) کاپۆك؛ ٢) پێوەندی ئەسپ لەزنجیر ف ١) نگا: کاپۆك؛ ٢) پابند زنجیری است.

**کاپـۆل**: ١) قاپێلك؛ ٢) قاپێلکەسەر، ٣) گیای وردکراو، گزرە؛ ٤) قەسەڵ؛ ٥) کای‌رەگەڵ حەزی‌بۆ بان‌سواخ‌دان ف ١) پوستهٔ توخالی؛ ٢) جمجمه؛ ٣) علوفهٔ کوبیده؛ ٤) کاه درشت مانده درآخور؛ ٥) کاهگل.

**کاپۆڵ**: ١) قاپێلکەسەر؛ ٢) بێقل، پت ف ١) جمجمه؛ ٢) بینی.

**کاپۆلك**: کاپۆل ف نگا: کاپۆل.

**کاپۆلە**: کاپۆلە ف پیمانهٔ کوچك آسیابان.

**کاپۆلە**: قەپۆلە، قەپۆبلە ف پیمانهٔ کوچك آسیابان.

**کاپەك**: کەپەك، سقی، کرپك ف کفك.

**کاپێچ**: نەخۆشیەکی زەسەولاخە لە کای زۆرخواردنەوە تووشی دێ ف نوعی بیماری دام.

**کات**: ١) دەم، سات، تاو؛ ٢) خێرۆك؛ ٣) زەمین، قاد: (شۆرە کات)؛ ٤) کەللەسەر؛ ٥) پشت‌مل ف ١) وقت؛ ٢) نگا: خێرۆك؛ ٣) زمین؛ ٤) کلّه، جمجمه؛ ٥) پس گردن.

**کاتـا**: ١) لەکـوێ؟؛ ٢) لەکـام‌لا؟؛ ٣) جۆرێ کولێرە کە لەبن ژێلەمۆدا دەبرژێ ف ١) کجا؟؛ ٢) کدام طرف؟؛ ٣) نوعی گرده نان.

**کاتات**: ١) قەحف، کەللەسەر؛ ٢) پشت‌مل ف ١) کلّه، جمجمه؛ ٢) پس گردن.

**کاتار**: پۆپەی کەڵەشێر ف تاج خروس.

**کاتب**: ١) حیسـابگـەر؛ ٢) نوسەر؛ ٣) سەرژمێر ف ١) حسابدار؛ ٢) نویسنده؛ ٣) سرشُمار.

**کاتبەش**: کاربێ‌سپێراوی سەرژمێری ف مسؤول سرشماری.

**کات‌ژمێر**: دەم‌ژمێر، سەعات ف ساعت.

**کاتك**: کەللەسەر، قەحف، کات ف جمجمه، کلّه.

**کاتـۆر**: ١) لەوەڕگای لەوەڕ لێ نەمـاو: (تـەواو کاتۆر بوە)؛ ٢) پۆپەی کەڵەشێر، کاتار ف ١) چراگاه لخت‌شده؛ ٢) تاج خروس.

**کاتـە**: ١) لکی تازە پاش سەرچن کردن، وەچ: (کـاتـەی تووتن)؛ ٢) خێرۆك؛ ٣) برێتی لە گورگ؛ ٤) پێشە، ئێسقان، هەستی ف ١) جوانهٔ نو بعد از اخته کردن گیاه؛ ٢) نگا: خێرۆك؛ ٣) کنایه از گرگ؛ ٤) استخوان.

**کاج**: ١) دارێکی گەڵادەرزی جەنگەڵە؛ ٢) زۆرك ف ١) درخت کاج؛ ٢) تپهٔ ماسه‌ای.

**کاجین**: کامە؟، کێهە؟ ف کدامین؟.

**کاجینە**: زۆرکان، دەشتێ کە تەپۆڵکە تەپۆڵکەی بچوکی تێدا ف دشت ماهوری.

**کاچ**: ١) ئامـرازی سەرقـوڵی دەسـك داری پچوك بۆ شێوپێ‌خواردن، کەچی، کەفچی، کەوچك؛ ٢) قاچ، لنگ؛ ٣) شتی بێ‌نرخی ناوماڵ؛ ٤) خزگەمـاسی ف ١) قاشق؛ ٢) پا؛ ٣) خرت و پرت بی‌ارزش؛ ٤) پناهگاه ماهی در زمستان.

**کاچاخ**: بەچکەگامێشی دوبەهار دیتو، قاچاخ ف گوسالهٔ دوساله.

**کاچانی**: دەفر و ئامان، قاپ‌و قاجاخ ف ظروف آشپزخانه.

**کاچك**: کاچ، ئامرازی شێوپێ‌خواردن ف قاشق.

**کاچوکولۆز**: خرت و پرتی بێ‌قیمەت ف خرت و پرت بی‌ارزش.

**کاچوکولۆسك**: کاچوکولۆز ف خرت و پرت بی‌ارزش.

**کاخ**: ١) قەسـر، کۆشـك؛ ٢) بژار؛ ٣) لۆدەکـای دەشت کە بۆ زسـتـان گڵەبان دەکرێ ف ١) کاخ؛ ٢) وجین؛ ٣) کاهی که برای زمستان در دشت نگهداری می‌شود.

**کاخلی**: قاخلی ف کاجیره.

**کاخیل**: ١) سەوزەی چیمەن؛ ٢) پوشی دەشت کە لەگیشە دەدرێ ف ١) سبزهٔ چمن؛ ٢) خس و خاشاك دشت و صحرا که جمع شده باشند.

**کاد**: ١) قاد، عەرد، زەمین، زەوی؛ ٢) مەیدان: (کـادا شەڕێ) ف ١) زمین؛ ٢) میدان.

**کادان**: ١) عەماری کاتێکردن؛ ٢) ناوی دێ‌یەکە؛ ٣) فەرەنجی ف ١) کاهدان؛ ٢) نام دهی است؛ ٣) پالتو نمدی.

**کادانە**: رەسەنەئەسپێکە دەڵێن لەروسیاوە هاتگە ف نژادی از اسب است که گویا از روسیه آمده.

**کادر**: شەنەی ئاسن ف افشون آهنی.

**کادز**: سپیایی ناوەنـدی عاسمـان لەشـەودا، کاکێشـانی عاسمـان ف کهکشان، مجره.

**کادك**: بابۆڵە، تیکەی درێژ ف ساندویچ.

**کادو**: دۆکەڵ، دوکێل، دو ف دود.

**کادە**: کولیچە ف کلوچه.

**کادی**: کادو، دۆکەڵ ف دود.

**کادین**: کادان، عەماری کاتێکردن ف کاهدان.

**کادێن**: کادان، عەماری کا ف کاهدان.

**کادێن‌مێشی**: شوێنی خلێفـەمێشـان، جێگـەیەك کە پلورەهـەنگی لێ داندراون ف کندوی زنبور عسل.

**کادینەمێش**: خەلێف، پلورە ف زنبور عسل.

**کار**: ١) شۆل، خەبـات؛ ٢) توانـا، تاقەت: (ئەز کار م تە نکاری)؛ ٣) بالـوکـە؛ ٤) بەچکەبزنی چکۆلەی تازەزاو؛ ٥) میوەی نەگەیشتو؛ ٦) نەکـولاو، خاو؛ ٧) کەسێ خەریکی خەبـاتە: (کرێکار)؛ ٨) چاندن: (دێمـە کـار، تەڕە کـاری)؛ ٩) دەسکـرد: (کـاری ئەسنەمولە)؛ ١٠) قازانجی سەودا؛ ١١) بەچکـەی ئاسك؛ (کارماز)؛ ١٢) رودا؛ ١٣) زجە، کۆرەڕێ؛ ١٤) خوێلێن، کانی‌خوێ ف ١) کار؛ ٢) توان، تاب؛ ٣) زگیل؛ ٤) کهره، بزغالهٔ نورسیده؛ ٥) کال، میوهٔ نارس؛ ٦) ناپخته؛ ٧) کنندهٔ کار؛ ٨) کشت؛ ٩) ساخته؛ ١٠) سودبازرگانی؛ ١١) بچهٔ آهو؛ ١٢) حادثه؛ ١٣) کوره‌راه؛ ١٤) چشمهٔ آب شور.

**کارا:** ١) زۆر شوڵکەر؛ ٢) کوچك، بەرد ف ١) کاری، فعّال؛ ٢) سنگ.

**کاراد:** کەوەر، کەوەرگ، لەسەوزیحات ف تره.

**کاراژ:** شوێنی راگردنی ترومبیل لە خانوودا ف گاراژ.

**کاراس:** کارەوش، گیابەکە ف گیاهی است.

**کاراك:** زەمینێ کە ئەسپابی پێویستیی ژیانی تێدایەو دەیدەنەوە، کان ف معدن.

**کارامە:** کارزان، جێ، راهاتوو لە کار ف کارامد.

**کارامەد:** کارامە ف کارامد.

**کارامەیی:** زانایی لە کار، ئەزدەستی ف مهارت.

**کاران:** چەندکار ف کارها.

**کاڕان:** دەنگی بەقەوی مەڕو بەرخ ف صدای بلند بره و میش.

**کارانە:** ١) مزی حەقی‌دەست؛ ٢) شمرنەشوانی بەخێوکەری بەچکەبزن ف ١) مُزد؛ ٢) مُزد چوپان برای مراقبت از بُزغاله‌ها.

**کاربان:** کاروان، قافلە ف کاروان.

**کاربـڕ:** ١) حاکم، میر، کەبخـودا؛ ٢) بنیادەمی زۆر ئازا لە کار ف ١) حاکم؛ ٢) کارگر خوب، کاربر.

**کاربرا:** هاوبەشی لە کاردا، هاوکاری ف همکاری.

**کاربوڕان:** ناوردو، ناردو، سوتەمەنی ف سوخت.

**کاربەدەس:** دەسەڵات‌دار ف مصدر کار، در رأس کار.

**کاربەدەست:** کاربەدەس ف نگا: کار بەدەس.

**کاربەردان:** وازلەکارهێنان ف دست از کار کشیدن.

**کاربەند:** ١) پیشە، سنعات؛ ٢) دۆز، مەبەست‌و مەرام ف ١) پیشه، شغل؛ ٢) مقصود و مرام.

**کاربین:** پسپۆڕ، زانالەکار ف کاردان.

**کاربینی:** کارزانی، پسپۆڕی ف کاردانی.

**کاربـوچ:** ١) خشتی سوور؛ ٢) کەسێ کە کاری بێ‌بەهـرە دەکا ف ١) آجر؛ ٢) بیهوده‌کار.

**کارپیچ:** کاربوچ ف نگا: کاربوچ.

**کارپێچ:** زۆر خەریکی کار ف بسیار سرگرم کار.

**کارپێسپاردن:** قەوینتی کردن بۆ کارێك ف سفارش کاری به کسی.

**کارت:** ١) کاتە، کات، خێرۆك؛ ٢) چارەك، بەشێك‌لەچوارباز؛ ٣) بەتە، بسوڵە ف ١) نگا: کاتە، کات، خێرۆك؛ ٢) رُبع، یك چهارم؛ ٣) کارت.

**کارتش:** چاندن، تۆم‌وەشاندن ف بذرافشانی.

**کارتك:** مرمەند، بڕبەند ف سوهان.

**کارتموك:** جاوەگا ف گیاهی است.

**کارتموڵ:** گیابەکە گوڵێکی درشتی زەرد دەکا، بابۆنەی جاوەگا ف بابونۀ گاوچشم.

**کارتوڵ:** یەنانە، سێفەزەمینە، سێفەزەمینی ف سیب زمینی.

**کارتە:** کاتە ف نگا: کاتە.

**کارتەن:** کارتش، تۆم‌وەشاندن ف بذرافشانی.

**کارتی:** بڕبەندی بچووكو نەرم ف سوهان کوچك و نازك.

**کارتیخ:** کارتی ف نگا: کارتی.

**کارتیلك:** ١) کارتی؛ ٢) سەروەسیەت ف ١) نگا: کارتی؛ ٢) قَیِّم.

**کارتێکردن:** تاسیرلێکردن ف تأثیر کردن در چیزی.

**کارتێکەر:** تاسیر بەخش ف مؤثر.

**کارتێ کەوتن:** کار بەکەسێ بوون ف باکسی کار داشتن.

**کارتیموك:** کارتموك ف بابونۀ گاوچشم.

**کارتیموڵ:** کارتیموڵ ف بابونۀ گاوچشم.

**کارتێنك:** جاڵجاڵۆکە، جوڵانەنە، کاکڵەمۆشان ف عنکبوت، تارتنك.

**کارتێنە:** ١) کارتێنك؛ ٢) یەنانە، سێفەزەمینە ف ١) عنکبوت؛ ٢) سیب‌زمینی.

**کارجف:** دامودەزگای هاوبەشی لە بازرگانی‌دا ف شرکت سهامی.

**کارچك:** هەرمێ، هەمرۆ ف گُلابی.

**کارچو:** جەقۆ ف چاقو، کارد.

**کارچین:** جۆرێ هەرمێ کە بەکاڵی لێ‌دەکرێنەوە ف نوعی گلابی.

**کارخانە:** ١) جێگەی کاری پیشەسازان؛ ٢) برێنی لە جندەخانە ف ١) کارخانه؛ ٢) کنایه از فاحشه‌خانه.

**کارخانەچی:** برێنی لە دەویت ف کنایه از جاکش.

**کارخستن:** خستنەخەبات ف به کار انداختن.

**کارخونە:** جێگەی پیشەسازی ف کارخانه.

**کارخەزاڵ:** کارمامز، بەچکەئاسك، ئاسکۆڵە ف آهو بچّه.

**کارد:** جەقۆ، نبخی بەدەسکی بچووك ف کارد.

**کاردا:** ئەوکاری کراوە، بەهرەی کار ف کارکرد.

**کاردانك:** زێدان، بزدان، مناڵدان ف رحم.

**کاردانەوە:** بەهرەوەرگرتن، لە کار ف حاصل کار.

**کاردروس:** کارامە ف کاردان، کارامد.

**کاردروست:** کاردروس، کارامە ف کاردان.

**کاردش:** ١) سازدان؛ ٢) کردن، کرن ف ١) مُهیّا کردن؛ ٢) انجام دادن.

**کاردك:** مرمەندی بچوك، بڕبەندی گچکە ف سوهانك.

**کاردوو:** ١) گیابەکی، گەڵابانە لەناو سماقاوا زەردی دەکەن‌و بە جێشتی لێ‌دەنێن؛ ٢) تۆمی گیابەکە لە گەنم دەکاو رەنگی رەشە ف ١) گیاهی است؛ ٢) بذر گیاهی است شبیه گندم.

**کاردوپەنیر:** برێنی لە دوژمنایەتی دایمی‌و بێ‌برانەوە نێوانی دو دژ ف کنایه از دشمنی دائمی.

**کاردوخ:** ١) ناوێکـی کۆنـی کوردە؛ ٢) چیابەکی بەرزە ف ١) نام باستانی کرد؛ ٢) نام کوهی است.

**کاردوخی:** هۆزێکە لەکوردستانی‌دا دەژین ف نام طایفه‌ای از کُردها.

**کاردوژە:** ١) دارکـولـین بە نبخ؛ ٢) برێنی لە جلێس‌و زۆرخـۆر؛ ٣) کەمکۆڵ، گوێزی نەرز ف ١) کنده‌کاری چوب؛ ٢) کنایه از برخور؛ ٣) گردوی نارسیده.

**کاردوغـە:** وشـەیەکـە بۆ بوچ‌بوونـەوەی شۆمی دەڵێن: (فـەڵ فراندی کاردوغە) ف اصطلاحی است برای باطل کردن نحوست گفته می‌شود.

**کاردوك:** ناوێکی کۆنی کوردە ف نام باستانی کرد.

**کاردوەڕەشە:** جۆرێ گیای کاردوو ف نوعی «کاردو».

**کاردوەکوڕانە:** کاردوی یەنێرنك ف نوعی «کاردو».

**کاردوەمارانە:** جۆرێ کاردوی خراپ ف نوعی «کاردو»ی نامرغوب.

**کاردەپەلە:** ١) بەڕسپلکە؛ ٢) نەخۆشی زیپکەدەرکردن بە سەرما ف ١) چلچلە؛ ٢) نوعی بیماری جوش زدن پوست از سرما.

**کاردەستی:** سنعانێ بە دەس کرابێ، دەسکار ف کاردستی.

**کاردی:** کاردوو ف نگا: کاردو.

**کاردبتو:** راهاتوو لە کار ف بانجر بە در کار.

**کاردیتی:** کاردبنو ف باتجر بە در کار.

**کاردبدە:** کاردبنو ف بانجر بە در کار.

**کاردی کەردش:** ١) چەقۆسازدان؛ ٢) وەسنای چەقۆیان ف ١) چاقو ساختن؛ ٢) استادکار چاقوساز.

**کاردبە:** کاردبنو ف بانجر بە در کار.

**کارراست:** ١) کار دروست؛ ٢) کار پێکهاتو: (یاخوا **کارت راست بێ**) ف ١) دُرُستکار؛ ٢) کار بر مرام.

**کارزان:** فامبدە لە کار ف کاردان.

**کارزۆر:** ١) بێگار؛ ٢) کەسێ شوڵێ وی گەلەکە ف ١) کار اجباری؛ ٢) برکار.

**کارزۆرەکی:** بێگار ف کار اجباری.

**کارژ:** نویژەمار ف پوستەای کە مار می اندازد.

**کارژۆلە:** بەچکەبزنی ..اوا ف کهرە، بزغالە.

**کارژەلە:** کارژۆلە ف بزغالە.

**کارژیلە:** کارژۆلە ف بزغالە.

**کارس:** ١) زورات، هەرزنەگەورە؛ ٢) هەرزن ف ١) گاورس، ذُرّت؛ ٢) ارزن.

**کارســاز:** ١) کەسێ کار بۆ کەسێ پێك دێنێ؛ ٢) ناوە بۆ خوا ف ١) جارەساز؛ ٢) نامی برای خدا.

**کارسازی:** ١) پێکهێنانی کار؛ ٢) خۆ ئامادەکردن ف ١) فراهم کردن؛ ٢) خود را مهیّا ساختن.

**کارڤانکوژ:** ئەستێرەکە، کاروان‌کوژە ف ستارە سحری.

**کارك:** ١) پێنـاوی جەرمی خاو؛ ٢) کارژۆلە؛ ٣) جێگەی دانەوێڵە کە لە قوڕی دەکـەن، کەنـدو؛ ٤) ئەگەبشنو، کار؛ ٥) باریکەرێ بۆ جۆنەناو باغچەی پەرژین کرباو ف ١) جارق؛ ٢) بزغالە؛ ٣) کندوی غلّە، انبار گلی غلّە؛ ٤) کال؛ ٥) راە باریك برای عبور در باغچە.

**کارك:** قارچ ف قارچ.

**کارکـردن:** ١) خەبتین؛ ٢) بەهـرەدانی دەرمان؛ ٣) رەوانی زگ ف ١) کارکردن؛ ٢) اثر بخشیدن دارو؛ ٣) اسهال.

**کارکردە:** ١) کاردبدە؛ ٢) شتی دەکارکراو ف ١) کارازمودە؛ ٢) مستعمل.

**کارکرن:** ١) خۆسازو نەبار کردن؛ ٢) قازانج لە سەودا کردن ف ١) مُهیّا شدن؛ ٢) نفع بردن در معاملە.

**کارکری:** ١) سازو ئامادە؛ ٢) قازانج کردو ف ١) مُهیّا و امادە؛ ٢) سود بردە در معاملە.

**کارکو:** ١) کاری بەهرەدەر؛ ٢) کارا ف ١) موثر، اثر بخش؛ ٢) کارا، فعّال.

**کارکەتن:** کارتێ کەوتن، کارپێ بوون ف کار آدم بە دست کسی افتادن.

**کارکوشتە:** کارامە ف کارامد.

**کارکون:** دەرمانی رەوانی زگ ف داروی مسهل.

**کارکەر:** خەباتچی، شوڵکەر ف کارگر.

**کارکەنار:** هەڵپەسیراو لە کار، لەکار لادراو ف از کار برکنار شدە.

**کارکەناری:** موچەی هەڵپەسیراوی لەکار ف حقوق بازنشستگی.

**کارکەو:** راوەکەوی بە کۆمەڵ لە بەفردا ف شکار گروهی کبك.

**کارگ:** ١) قارچ؛ ٢) مریشك، مامر، کەرگی ف ١) قارچ؛ ٢) مُرغ.

**کارگا:** جێگەی پیشەسازی ف کارگاە.

**کارگوزار:** سوورباش ف کارگزار.

**کارگە:** کارگا ف کارگاە.

**کارگە:** مریشك، مامر ف مُرغ.

**کارگەچی:** باڵەی کارخانە ف کارگر کارخانە.

**کارگەر:** کارکەر، باڵە، خەبانکار ف کارگر.

**کارگەگولانە:** کارگی ژەهراوی کە ناخورێ ف قارج سمّی.

**کارگەگولە:** کارگەگولانە ف فارج سمّی.

**کارگی:** مریشك، مامر ف مُرغ.

**کارگێڕ:** کەسێ بەسەر کاروباری شوێنێ ڕادەگا، مدیر ف مدیر.

**کارلەکارترازان:** بڕینی لە رووداوێك کە پاشگەزبوونەوەی نبا نەبێ ف کار از کار گذشتن.

**کارم:** ١) کاری من، شوڵی من؛ ٢) دەتوانم: (ئەز **کارم** ڤێ شوڵێ بکەم)؛ ٣) کرم ف ١) کارمن؛ ٢) می توانم؛ ٣) کِرم.

**کارماخ:** سەرەند ف سرند، غربال درشت.

**کارمامز:** بەچکەئاسك ف بچە آهو.

**کارمدەکەوتش:** ١) کرمی تێکەوتوە؛ ٢) بریتی لە تەمەڵی و بێکاری ف ١) کرموشدە؛ ٢) کنایە از تنبلی و بیکارگی.

**کارمژن:** کرمێ، کرم تێکەوتوو ف کرمو.

**کارمسەرا:** جێگەی پشودانی قافڵە، کاروانسەرا ف کاروانسرا.

**کارمسەرادار:** خانچی ف کاروانسرادار.

**کارن:** ١) کاری ئێمە؛ ٢) دەتوانن ف ١) کار ما؛ ٢) می توانند.

**کارناس:** زانا لە کار، کارزان ف کارشناس.

**کارنامە:** پسوڵەی سیابی کارێ کە کراوە ف کارنامە.

**کارنیار:** داخوازی کار ف خواهان.

**کاروا:** جیوەی دارێکە زەردو سووك و زۆر بەقیمەت ف کهربا.

**کاروان:** قافڵە ف کاروان.

**کاروانشی:** پیازاوی هێلکەتێکراو ف اشکنە.

**کاروانچی:** کەسێ کە دەگەڵ قافڵەبە ف کاروانی.

**کاروانسەرا:** کارمسەرا ف کاروانسرا.

**کاروانقڕان:** ئەستێرەکە، ئەستێرەی ڕۆژێ ف ستارە سحری.

**کاروانکوژ:** ۱) کاروانقران؛ ۲) هەویردە، مەلیکە [ف] ۱) ستارە سحری؛ ۲) پرندەای است.

**کاروانکوژە:** کاروانفران [ف] ستارۀ سحری.

**کاروانڤان:** سەرقافلە. سەروکی کاروان [ف] ساربان.

**کاروانە:** ۱) بالداریکە بەقەد مریشکیك دەندوُکی دریژە؛ ۲) هاتوچوُ لە یەك جیگـەدا؛ ۳) ژەنینی گان کردن؛ ۴) هەوایەکی گۆرانی یە [ف] ۱) پرنـدۀ کاروانـك؛ ۲) آمـدوشد در یك جای معیّن؛ ۳) کفل جنباندن هنگام جماع؛ ۴) آهنگی است.

**کاروانەپێ کردن:** ژەنین لە کاتی گان کردندا [ف] کلەزدن در جماع.

**کاروانی:** مروّی ناو قافلە [ف] کاروانی.

**کارّوبا:** کاروا [ف] کهربا.

**کاروبار:** کار لە هەمو جوٚریّك [ف] کاروبار.

**کاروخا:** نامرازیکە لە دەزگای جوٚلاّیی‌دا [ف] از ابزار بافندگی.

**کاروس:** گیایەکی بوٚن‌خوٚشە زەگەڵ پەنیر دەخریٚ [ف] گیاهی است کە با پنیر آمیختە می‌شود.

**کاروُس:** وتاری‌نایینی. ئاموٚژگاری‌دینی [ف] موعظە.

**کارّوش:** ۱) گیایەکە لە گیای هەرزن دەکا؛ ۲) پەلکی شینی پیازو سیر بێ سەلك [ف] ۱) گیاهی است شبیە ارزن؛ ۲) ساقۀ سبز پیاز و سیر.

**کاروّك:** ۱) کارگ، قارچ، قارچـــك؛ ۲) پوّلاّ، ئاسـنی‌بی‌خەوش [ف] ۱) قارچ؛ ۲) پولاد.

**کارووّ:** کاروان، قافلە. کارڤان [ف] کاروان.

**کارە:** ۱) کارت، کارتـــە. خیّروّك؛ ۲) کاراك؛ ۳) کاربـــەدەســـت: (هیچ **کارە**بە)؛ ۴) گـــوندیّکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ۱) نگـا: خیّروّك؛ ۲) معـدن؛ ۳) کارە، کار بە دست؛ ۴) نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کارّە:** دەنگی بەرزی پەزو بەرخ [ف] صدای میش و برە. بع.

**کارەب:** کارە با. جیوەی داریکە دەکرینە تەسبیح‌و... [ف] کهرُبا.

**کارەبا:** ۱) کاروا. کاروبا؛ ۲) بەرق، بروسکە [ف] ۱) کهربا؛ ۲) نیروی برق.

**کارەبایی:** ۱) زەردی ئاچیخ‌و روّشن، بە رەنگی کارەبا؛ ۲) ئەسپابی بەرقی [ف] ۱) کهربایی رنگ؛ ۲) ابزار برقی.

**کارەرّەهات:** شەرو جویّنی زوّر [ف] کنایە از دعوا و دشنام زیاد.

**کارەسات:** فەومان. بەسەرهاتی ناخوّش [ف] رویداد ناگوار.

**کارەك:** گندوّرە. کاڵەك [ف] خربزە.

**کارەکەر:** قەرەواش. فەرواش. جیّری [ف] کلفتِ خانە.

**کارەکـــەرە:** کەسیّ کە ئانـــاجی ماڵ پیّك دیّنیّ‌و بوّی مانـــدو دەبیّ: (**کـارەکـەرەم** بمریّ مشوُر خوّرەم نەمریّ) [ف] کسی کە برای خانە زحمت می‌کشد.

**کارەگا:** کارگا [ف] کارگاه.

**کارەمو:** نەنراو لە موی‌بزن [ف] تافتە از موی بُز.

**کارّەنگ:** زەردی روّشن. بەرەنگی کا [ف] زردِ کاهی.

**کارەوا:** کارەبا [ف] نگا: کارەبا.

**کارەوان:** شوانی کارژیلان [ف] بزغالەچران.

**کاری:** ۱) بەکـــار، ئازا لە کار؛ ۲) کاردوُ؛ ۳) ناڵات‌و زەردەچـــیوە؛ ۴) چاندراو: (نەرّە**کاری**)؛ ۵) گیایەکە لەدەم ئاو دەروێ‌وشیرەکەی ژەهرە [ف] ۱) فعّال. کاری؛ ۲) نگا: کاردوُ؛ ۳) دیگ‌افزار؛ ۴) کاشتە. کشت؛ ۵) گیاهی اسـت سـمّی.

**کاربتان:** ۱) پلورەمیّش؛ ۲) عەمارەی‌دەخڵ؛ ۳) گوندیّکە لە کوردستان بەعسی ویّرانی کرد [ف] ۱) کنـدوی عسل؛ ۲) انبار حبوبات؛ ۳) از روستاهای ویران‌شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**کاریتە:** شانبر، دیرەك [ف] بالار.

**کاریتەپشت:** موّغەرەی‌پشت، مروخەی‌پشت [ف] ستون فقرات.

**کاریج:** ۱) شەنە، شەن؛ ۲) ناوچەیەکە لەکوردستان [ف] ۱) افشون؛ ۲) ناحیەای در کردستان.

**کاری‌خیّر:** ۱) شوُلی باش‌و خواپەسند؛ ۲) بریێنی لە گانی حەڵاڵ‌و رّەوا؛ ۳) بریێنی لە زەماوەن [ف] ۱) کارخیر؛ ۲) کنایە از جماع زن و شوی؛ ۳) کنایە از عروسی.

**کاریّز:** ۱) ناویّ کە لە بن زەویەوە دەرهیّنراوەو داپوّشراوە؛ ۲) ناوچەیەکە لە کوردستـــان؛ ۳) گونـدیّکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ۱) کهریز. قنات؛ ۲) ناحیەای در کردستان؛ ۳) نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کاریّزکەن:** کەسیّ کە کاری کاریّزلیّدان دەکا [ف] مُقنّی.

**کاریّز لیّدان:** کاریّز نیجاد کردن [ف] کهریز زدن.

**کاریّزاو:** ۱) ئاویّ کە لە کاریزەوە دیّت؛ ۲) بریێنی لە ناوی فیّنك‌و سوُك [ف] ۱) آب کهریز؛ ۲) کنایە از آب خنك و گوارا.

**کاریّزە:** ۱) کـاریز؛ ۲) گونـدیّکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ۱) کهریز؛ ۲) نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کاریّژ:** ۱) قولی سەربـانی کادان کە لەویّوە کا دەریّژنە ناو کادانەوە؛ ۲) کاراژ؛ ۳) جەمســەری شەوبلاکە؛ ۴) شەنە، شەن [ف] ۱) سوراخ بام کاهدان برای ریختن کاه؛ ۲) گاراژ؛ ۳) مفصل آرواره ها؛ ۴) افشون.

**کاریس:** کاروش، کاروس [ف] گیاهی است.

**کاریگەر:** کاری، بەتاسیر [ف] کاری. اثر بخش.

**کاریلە:** کارژوّلە [ف] کهر. بزغالە.

**کارین:** توانین، تاقەت هیّنان [ف] توانستن، تاب آوردن.

**کاریناي:** دەکارکرباگ. کوّن‌بوگ [ف] کارکردە، مُستعمل.

**کاریێ‌هەبێ:** عەمباری دەغڵ [ف] سیلو.

**کاریێ‌هەنگان:** پلوُرەی هەنگ [ف] کندو.

**کاز:** قوخنە [ف] کوخ. خانۀ محقّر.

**کازتین:** هەراو هاوار [ف] داد و فریاد.

**کازکـاز:** ۱) ناڵانـدن؛ ۲) دەردی‌دڵ کردن؛ ۳) لوُرە [ف] ۱) نالیدن؛ ۲) درددل کردن؛ ۳) زوزە.

**کازکازە:** هەوای گوّرانی‌و قام‌و لاوکی زوّرخوّش [ف] ترانۀ شاد.

**کازوکوُز:** بوُلیّلەی بەیان. کازیوە: (**کازوکوُز**ی بەیانی) [ف] سپیدەدم. فجر کاذب.

**کازه:** بازی و شوخی ف سرگرمی و شوخی.

**کازین:** کازنین، هەراو هاوار ف داد و فریاد.

**کازبوه:** بوڵبڵەی بەیان ف فجر کاذب.

**کازیوه:** کازیوه ف فجر کاذب.

**کاژ:** ١) نویژەمـار؛ ٢) توێ شیر و ماست؛ ٣) نیکولی پێست؛ ٤) داری کاج؛ ٥) قرقرەی دەزوو؛ ٦) جاوخێل؛ ٧) تیشەشاخ ف ١) پوسته‌ای که مار می‌اندازد؛ ٢) سرشیر، چربی روی ماست؛ ٣) قشر نازك پوست؛ ٤) درخت کاج؛ ٥) قرقره؛ ٦) دوبین، لوچ؛ ٧) کوه سنگی.

**کاژاو:** ١) دارستانی کاج؛ ٢) ناوچەیەکە لە کوردستان؛ ٣) جبابەکە لە کوردستان؛ ٤) نویژی سوور لەسەر ئاو، زەڵم؛ ٥) جۆرێ نرێ، نەوعێ هەنگور؛ ٦) گوندێکە لە کوردستان بەعسی ویرانی کرد ف ١) بیشهٔ کاج؛ ٢) ناحیه‌ای در کردستان؛ ٣) کوهی در کردستان؛ ٤) لایهٔ قرمز بر اب؛ ٥) نوعی انگور؛ ٦) از روستاهای ویران‌شدهٔ کردستان نوسط بعثیان.

**کاژاوی:** ١) کـاژاو، دارستـانی کاژ؛ ٢) جۆرێ نرێ رەشکـە ف ١) کاجستان؛ ٢) نوعی انگور سیاه.

**کاژه:** ١) بنـەی کاروان لە دەشت؛ ٢) رەبەت، بۆسـەی ژواجی؛ ٣) نێسکەسەر ف ١) جای انراق کاروان؛ ٢) کمین شکارچی؛ ٣) جمجمه.

**کاژەرە:** ئێسکی سـەر، قەحف، فاف ف جمجمه.

**کاژەڵاك:** قەحف ف جمجمه.

**کاژەڵە:** قەحف، کاژەڵاك ف جمجمه.

**کاژەنگ:** بزار ف وجین.

**کاژی:** پەردەی نازکی ناو دەروون ف غشاء.

**کاژێر:** ١) شەویلاکـە، شەویلکـە، شەویلە؛ ٢) سووچ و قوژبنی نۆدە؛ ٣) نافـسە لە دیواردا؛ ٤) برینێ لە زەحـمەتبوگ لە گانـدا؛ ٥) ئۆدەی خەڵوەت لە نەکیەدا ف ١) آرواره؛ ٢) گوشه و زاویهٔ اتاق؛ ٣) ناقچه؛ ٤) کنایه از ارضاشده در جماع؛ ٥) زاویهٔ نکایا.

**کاژێری:** رەحەتبوون، ناوهانەوه ف ارضاشدن، انزال منی.

**کاژێله:** کارژۆڵە ف بزغاله.

**کاژێڵه:** کاخڵی، قاخڵی ف کاجیره.

**کاس:** ١) سەرنـاساو، گێژ، وڕ؛ ٢) هیچ نەبیس، کەڕ؛ ٣) هەرشنی قوڵ و رۆچوگ؛ ٤) زەرك، ناس، فاپ، جام؛ ٥) بناری کێو؛ ٦) هەوراز ف ١) گیج و منگ؛ ٢) ناشنوا؛ ٣) مقعّر، گود؛ ٤) کاسه؛ ٥) دامنهٔ کوه؛ ٦) ارتفاعات.

**کاساڵاشینکه:** قژاکه ف پرندهٔ سبزقبا.

**کاسب:** کەسێ لە رێگەی کڕین و فرۆشتنەوە دەژی و بە بازرگان دانانرێ ف کاسب.

**کاسبکار:** کاسب ف کاسب.

**کاسبوون:** ناسان ف گیج شدن.

**کاسبی:** کاری کاسب ف کسابت.

**کاسبین:** کاسبوون ف گیج شدن.

**کاستین:** ١) لوراندن؛ ٢) قروسکاندنی سەگ ف ١) زوزه؛ ٢) نالیدن سگ.

**کاسك:** سەوز ف سبزرنگ.

**کاسـك:** ١) تاسی جکۆڵە، زەرك؛ ٢) کوپی باکێشی حەجامات ف ١) کاسهٔ کوجك؛ ٢) بادکش حجامت.

**کاسمه:** نانێ کە هەویرەکەی بە رۆنەوه شێلدرابێ ف نوعی نان روغنی.

**کاسنی:** گیابەکە، جەقجەقە ف کاسنی.

**کاسـۆ:** ١) قاشـۆ، داری سەرخـواری گۆ بازی؛ ٢) ژارو فەقیر ف ١) چوگان گوی‌بازی؛ ٢) بینوا.

**کاسۆتی:** بەناسه، ئارەزوومەن، ئاوات خواز ف آرزومند.

**کاسـۆخ:** داسی درێژ کە بە دودەس دەکـار دەکرێ، مەڵەغان ف داس بلندی که دو دستی بشود با آن کار کرد.

**کاسول:** ١) شەکەت، ماندگ؛ ٢) نەمەڵی دەست و پێسپی ف ١) خسته و کوفته؛ ٢) تنبل.

**کاسۆی:** کاسبی ف کسابت.

**کاسه:** فاب، بادی، بادیە، گلێنە ف کاسه.

**کاســەئـارد:** مزراق بەسـەر مزراقـا کونـان لە زاراوی منـاڵاندا ف اصطلاحی در گردنا بازی کودکان.

**کاسەئاوسا:** شێو بۆ جیران بردن ف غذایی که به همسایه بخشند.

**کاسەئاوسی:** کاسەناوسا ف نگا: کاسه ناوسا.

**کاسەئەژنۆ:** پێشەی زرانی ف کاسهٔ زانو.

**کاسەپشت:** کیسەڵ، کیسۆ ف لاك‌پشت.

**کاسەجەژن:** چێشتی نابیەنی بۆ رۆژ جەژن ف غذای مخصوص عید.

**کاسەجەژنان:** کاسەجەژن: (کاسەجەژنانمان لە ماڵدا نەبوو) ف غذای مخصوص عید.

**کاسەجێژنه:** کاسەجەژن ف غذای مخصوص عید.

**کاسەچەش:** قاپێلکی جاو ف کاسهٔ چشم.

**کاسەجێژنان:** کاسەجێژنان ف غذای مخصوص عید.

**کاسەزرانی:** کاسەئەژنۆ ف کاسهٔ زانو.

**کاسەسفره:** خۆراکێ کە بۆ ئاوسای نازەهانگ دەنێردرێ ف خوراکی که برای همسایهٔ نو رسیده می‌فرستند.

**کاسەسەر:** فاپێلکەسەر، کازەڵە ف جمجمه.

**کاسەسم:** پشتی سمی چارەوێ ف کاسهٔ سم ستور.

**کاسەشۆر:** گیابەکی گەڵاپان و زبره ف گیاهی است.

**کاسەشەن:** پێلی داربنی خەرمان نێك‌وەردان ف پاروی ویژهٔ خرمن.

**کاسەکەر:** ئیر بارکەر ف سفالگر.

**کاسەکەران:** ناوی دێیەکە لە کوردستان ف نام دهی است.

**کاسەلە:** سوێسکه ف تیهو.

**کاسەلەشینکه:** کاساڵاشینکه، قژاکه ف پرندهٔ سبزقبا.

**کاســەلێس:** ١) برینێ لە بنبادەمی جەورەوچڵێس؛ ٢) برینێ لە مرۆی خۆفرۆش بە بێگانه ف ١) کنایه از سورچران؛ ٢) کنایه از خودفروخته.

**کاسەمسا**: کاسەئاوسا ف نگا: کاسەئاوسا.

**کاسەمەن**: کاسەی پێوانەی کڕینو فرۆشتن ف کاسۀ پیمانۀ خرید و فروش.

**کاسەی ئەژنۆ**: کاسەئەژنۆ ف کاسۀ زانو.

**کاسەی زرانی**: کاسەزرانی ف کاسۀ زانو.

**کاسەی سمت**: قوڵایی نێوان پشتو ڕان ف لگن خاصره.

**کاسی**: ناسان، وڕبوون ف گیجی.

**کاسینۆك**: چینەدانی باڵندە ف چینەدان مرغ.

**کاش**: ١) شوێنێ لە ناو زرعاتا؛ ٢) زرعاتی بەبێ شکاو؛ ٣) شیشی گوشتی براشتنی؛ ٤) شێو، کێڵانی زەوی؛ ٥) زەوی بەیار؛ ٦) نەپۆڵکە؛ ٧) ئەرکدان: (چەندی کردوکاشم کرد پەبدام نەکرد)؛ ٨) کێش، لەدوهانن، ڕاکێشان؛ ٩) خۆزی، خۆزیا، بڕبا؛ ١٠) گوبسوانەی خانو؛ ١١) نیشەشاخ؛ ١٢) خزینو خوشین بەسەر زەویدا؛ ١٣) سەرەولێژی ڕژد؛ ١٤) هەورازی کوڕو ڕژد؛ ١٥) توێخ، پێستی هەرە ناسك؛ ١٦) توێژە مار؛ ١٧) قەدی کێو، بەروار ف ١) رد پا در کشتزار؛ ٢) سبزۀ پامال شده؛ ٣) سیخ کباب؛ ٤) شخم؛ ٥) زمین بایر؛ ٦) نل، نیۀ کوچك؛ ٧) کوشش؛ ٨) کش، کشش؛ ٩) کاشکی؛ ١٠) سقف؛ ١١) کوه سنگی؛ ١٢) خزیدن؛ ١٣) شیب تند؛ ١٤) صخرۀ سخت و مرتفع؛ ١٥) پوستۀ نازك؛ ١٦) پوست مار؛ ١٧) کمر کوه.

**کاشان**: شوێن گێڕان، بەئیشانەی جێگەپا دۆزینەوە ف ردگیری.

**کاشت**: چاندن، کاڵ، کار ف کاشت، بذرپاشی.

**کاشتن**: کاشت ف کاشتن.

**کاشتی**: چێندراو، چاندراو ف کاشته.

**کاشخانك**: میچی خانو ف سقف.

**کاشك**: هەڵاشی خانو ف انبیره.

**کاشکا**: بڕبا ف کاشکی.

**کاشکان**: ١) پێڵاوی خلیسکێن؛ ٢) وەستای خلیسکێن؛ ٣) خۆزیا، بڕبا، بری ف ١) کفش اسکی؛ ٢) اسکی باز؛ ٣) کاشکی، ای کاش.

**کاشکای**: کاشکا ف کاشکی.

**کاشکابە**: کاشکا ف کاشکی.

**کاشکایەکو**: کاشکا ف کاشکی.

**کاشکایەکی**: کاشکا ف کاشکی.

**کاش کردن**: ١) ڕاکێشان؛ ٢) کێڵانی زەوی ف ١) بر زمین کشیدن؛ ٢) شخم زدن.

**کاشکرن**: ڕاکێشان بەزەویدا ف بر زمین خزیدن.

**کاشکەردۆخ**: ڕاکێشەر بەسەر عەرزدا ف کشاننده بر زمین.

**کاشکی**: کاشکا ف کاشکی.

**کاشمە**: گیابەکە ف گیاهی است.

**کاشنگ**: توربەی ئالف کە بەسەر دەواربەوە دەکەن ف توبرۀ علف.

**کاشۆ**: ١) کاسۆ، قاشۆ؛ ٢) تورەکەی سەری وڵاخ؛ ٣) دوداری ناوبار بۆ قایم کردنی بار ف ١) جوگانِ بازی؛ ٢) توبره؛ ٣) دو چوبی که بار را بدان محکم کنند.

**کاشۆ**: کاشۆ، قاشۆ ف چوگان.

**کاشوانی**: بازی بە کاشۆ ف چوگان.

**کاشوڕ**: گیابەکە گەڵادانەدار بە شلکی دەخورێ ف گیاهی است خوردنی.

**کاشوکوش**: سەرەولێژی ڕژد، سەربەرەوخوارەی نون ف شیب تند.

**کاشوڵ**: ١) برینی لەپێست؛ ٢) سواڵەتی سەربان‌داپۆشین؛ ٣) قاشوڵە، لەتەسواڵەت ف ١) کنایه از پوست؛ ٢) سُفال بام؛ ٣) تکه سُفال.

**کاشە**: ١) پەڕەی ناوبێچکی عەڕابە، گاریە؛ ٢) ئەوشتەی بێ پێچکەو بەسەر بەفرا ڕای‌دەکێشن ف ١) پرۀ چرخ گاری؛ ٢) سورتمه.

**کاشی**: ١) کاسەی ڕەنگ لێدراو؛ ٢) خشتی ناسکی ڕەنگاوڕەنگ ف ١) کاسۀ لعابی؛ ٢) کاشی.

**کاشیکاری**: خانوێك کە کاشی لە ڕوکاریدا دەکار کرابێ ف بنای کاشیکاری.

**کاشیکان**: ١) پێڵاوی خلیسکێن؛ ٢) خلیسکێن‌کەر ف ١) کفش اسکی؛ ٢) اسکی باز.

**کاشێل**: شوێن گێڕان، کاشان ف ردیابی.

**کاغاغ**: قڕینی قاڵاو ف صدای کلاغ.

**کاغز**: ١) قاقەز؛ ٢) پسوڵەی نوسراو، نامە ف ١) کاغذ؛ ٢) نامه.

**کاغەز**: کاغز ف نگا: کاغز.

**کاغەزدان**: شتێ کە قاقەزی تێ بخەن ف کاغذدان، پوشه.

**کاغەزساو**: قاقەز سمانە ف کاغذ سمباده.

**کاغەزی**: تەنكو ناسك: (بادامی **کاغەزی**) ف نازك.

**کاف**: ١)ناوی پیتێکی ئەلفوبێنکە؛ ٢) ئەشکەوت، ئەشکەفت، مغاره ف ١) حرف کاف؛ ٢) غار.

**کافا**: ١) قەحف، کەللەی‌سەر؛ ٢) پشت‌مل ف ١) جمجمه؛ ٢) پس گردن.

**کافر**: بێ‌دین، خوانەناس ف کافر.

**کافربوون**: ١) لە دین وەرگەڕان؛ ٢) بریتی لە نوڕەبوونی زۆر: (**کافرم** مەکە، لە نوڕەبیان **کافر** بوم) ف ١) از دین برگشتن؛ ٢) کنایه از زیاد خشمناك شدن.

**کافرسان**: شوێنی کافرانو خوانەناسان ف کُفرستان.

**کافرسانی**: کافرسان ف کُفرستان.

**کافرستان**: کافرسان ف کُفرستان.

**کافرستانی**: بریتی لە بەزە بەهەژاردا نەهاتنەوە ف کنایه از بی‌اعتنایی نسبت به درمانده و بی‌نوا.

**کافرمان**: چەقۆی نێری مۆناش، گوزان، گوێزان ف استره، تیغ موتراشی.

**کافك**: ئەشکەوت، مغاره، کاف، شکەفت ف غار.

**کافوڕ**: شیرەی وشکەوەبوی داریکە سپی‌و بۆن‌خۆشە ف کافور.

**کافی**: ١) بەس، نیتر زیادە؛ ٢) ناوی ژنانە ف ١) بس؛ ٢) نام زنانه.

**کافێ**: ناوی ژنانە ف نام زنانه.

**کافیە**: ١) کافێ؛ ٢) بەسە ف ١) نام زنانه؛ ٢) کافی است.

**کاف**: جەنگەی فنق‌چنین. کە لە سێبەمی ڕوزبەرەوەیە [ف] موسم چیدن فندق.

**کاڤار**: ناڤار، ناوچە، مەڵبەند [ف] ناحیە، اقلیم.

**کاڤـــڕ**: ١) بەرخی لەدایك‌دابـڕاو کە شیر ناخـــواو پوش دەخـوا؛ ٢) بەرخەساوا [ف] ١) برهٔ از شیر بریده؛ ٢) برهٔ تازه متولدشده.

**کاڤری**: ١) جۆرێ هەنار؛ ٢) بەرخەمێ [ف] ١) نوعی انار؛ ٢) برهٔ مادینه.

**کاڤشکێ**: هەست‌کردن بە هێشنا ڕونەداو [ف] پیش‌بینی.

**کاڤل**: وێران، خاپوور، خانوی بەسەر بەکا نەباو [ف] ویران.

**کاڤلاش**: ١) خانوێ کە بۆ ناش جێکراوە؛ ٢) برێنی لە خانوی نەوی بچوکی فەقیرانە [ف] ١) ساختمان آسیاب؛ ٢) کنایە از کلبهٔ محقّر.

**کاڤلان**: بەرگی شمشێر و خەنجەر [ف] نیام.

**کاڤیرك**: کارگ، فارچ، قارچك، کوارگ [ف] قارچ.

**کاڤیلك**: کافیرك [ف] قارچ.

**کاك**: ١) برای گەورە؛ ٢) وشـەی حورمەت بۆ پیاوان؛ ٣) جۆرێ نانی شیرین؛ ٤) سەهۆڵ، سوڵ [ف] ١) برادر بزرگتر؛ ٢) کلمهٔ احترام برای مردان؛ ٣) نوعی نان شیرینی، کاك؛ ٤) یخ.

**کاك‌بوون**: بەستن لەسەرمان. بوونەسەهۆڵ [ف] یخ زدن.

**کاکا**: ١) مام، ناب، نابۆ؛ ٢) وشەی بانگ‌کردنی براگەورە [ف] ١) عمو؛ ٢) کلمهٔ خطاب به برادر بزرگتر.

**کاکـاو**: دەنکی بەری داریکـە دەبهـازن و لەنـاوا دەیکـوڵێنن وەك قاوە دبخۆنەوە [ف] کاکائو.

**کاکشان**: کادزی عاسمان [ف] کهکشان.

**کاکشیر**: لەنجەو لار [ف] ناز و خرام.

**کاکـل**: گیابەکـە بۆن‌خۆش وەك ڕیحانە دەچێ و گەڵای باریکترە [ف] ریحان کوهی.

**کاکڵ**: ناوەڕوکی بادام و گوێز و هەر دەنکێك [ف] مغز بادام و گردو و غیره.

**کاکڵە**: کاکڵ [ف] نگا: کاکڵ.

**کاکڵەشێران**: جۆرێ بازی زاروکانە [ف] نوعی بازی کودکان.

**کاکڵەقـوچـە**: کاکڵی گوێز کە بە خڕی دەرچێ. فەلاقـوچکـە [ف] مغز گردوی درسته.

**کاکڵەمـوشان**: ١) جاڵ‌جاڵۆکە، جوڵانەنە؛ ٢) داوی جاڵ‌جاڵۆکە؛ ٣) بازیەکی زاروکانە [ف] ١) تارتنك، عنکبوت؛ ٢) تار عنکبوت؛ ٣) نوعی بازی کودکان.

**کاکڵی**: گوێز، گوز [ف] گردو.

**کاکنج**: گیایەکە [ف] گیاه کاکنج.

**کاکۆ**: ١) وشەی دواندنی براگەورە؛ ٢) وشەی حورمەت بۆ پیاوان؛ ٣) برای دایك، خاڵۆ [ف] ١) کلمهٔ خطاب به برادر بزرگ؛ ٢) کلمهٔ احترام مردانه؛ ٣) دایی.

**کاکۆت**: کەللەسەر، قەحف، قاف [ف] جمجمه.

**کاکۆتەل**: کای باشماوەی چەت‌کونان [ف] کاه حاصل از کوبیدن کوزر.

**کاکوچ**: چەکوچ، چاکوچ [ف] چکش.

**کاکوچی**: شەلەمین، نرخێنە، کاکوچیل [ف] آش شلغم و گندم.

**کاکوچیل**: نرخێنە [ف] آش شلغم و گندم.

**کاکورك**: دارکونکە [ف] دارکوب.

**کاکـوڵ**: ١) مووی درێژی بێنـەسـەر؛ ٢) بۆپەی بەرزی باڵندە [ف] ١) کاکل سر؛ ٢) کاکل پرنده.

**کاکول**: ١) کاکوڵ؛ ٢) جۆرێ گەنم [ف] ١) نگا: کاکوڵ؛ ٢) نوعی گندم.

**کاکـوڵی**: گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کاکۆیە**: خاڵ، خاڵۆ، برای دایك [ف] دایی.

**کاکە**: ١) برای گەورە؛ ٢) وشەی حورمەت لە پیاوان [ف] ١) برادر بزرگ؛ ٢) کلمهٔ احترام برای مردان.

**کاکەشان**: کادز، کاکشان [ف] کهکشان.

**کاکـەلێ**: وشـەی خۆشەویستی لە دواندنی نێر بنەی بنیادەما [ف] کلمهٔ محبت‌آمیز، ای برادر.

**کاکەیی**: چەند تیرەیەکی کوردن کە نابنێکی تایبەتیان هەیە، گۆران [ف] اهل حق.

**کاکی**: ١) کاکـە؛ ٢) دەشتی ڕاستی تەخت: (لـە دەشتێکی **کاکی** بە **کاکی**) [ف] ١) نگا: کاکە؛ ٢) جلگهٔ هموار.

**کاکێز**: بێزنگ [ف] غربال، بیزن.

**کاکێش**: ١) کەسێ کا بە بار دەبانەوە ناوایی؛ ٢) کادزی عاسمان [ف] ١) کاهکش؛ ٢) کهکشان.

**کاکێشان**: ١) بردنەوەی کا بۆ ناوایی ٢) کادز [ف] ١) کاه به آبادی بردن؛ ٢) کهکشان.

**کاکیل**: کاکڵە گوێز و بادام و... [ف] مغز گردو و بادام و...

**کاکیلکە**: شەوبلاکە، شەوبلکە، شەویلە، کارێز [ف] آرواره.

**کاکیلە**: ١) کاکیلکە؛ ٢) کاکەلێ [ف] ١) آرواره؛ ٢) ای برادر.

**کاگـارس**: ١) کای گەنمـەشامی؛ ٢) کای هەرزنە گەورە [ف] ١) علف ذرّت؛ ٢) کاه ارزن درشت.

**کاگرس**: کای درشت، فەسەڵ [ف] کاه درشت.

**کاگڵ**: ١) کای ورد کە بۆ قوڕەکاری دەشێ؛ ٢) قوڕو کا بۆ سواغ [ف] ١) کاهریزه؛ ٢) کاهگل.

**کاگەز**: قاقەز، کاغز، کاغەز [ف] کاغذ.

**کال**: ١) بابـیر؛ ٢) پیاوی پیر؛ ٣) کەسـێ نەمـەـنی لە چل بەرەژوورەو نەگەیوەتـە پەنجا؛ ٤) کول، نەبـڕ؛ ٥) نەگەیشتو، کاڵ؛ ٦) کەت، لێوارپەڕبو؛ ٧) ددان لە دەمـدا نەمـاو [ف] ١) نیا؛ ٢) سالخورده؛ ٣) میانسال؛ ٤) کُند، مخالف تیز؛ ٥) نارسیده، کال؛ ٦) لب پر شده؛ ٧) بی‌دندان.

**کاڵ**: ١) بابـیر؛ ٢) پیرەمێرد؛ ٣) نەگەیشتـو؛ ٤) ڕەنگی چاوی عابی ناماڵ‌زەرد؛ ٥) ڕەنگی چاوی ڕەشی ناماڵ‌عابی؛ ٦) ڕەنگی چاوی زۆر ڕەشی گلێنـە زۆر چەرمـگ؛ ٧) ڕەنگی ناچـخ: (سـوری **کاڵ**)؛ ٨) قاوەیی ناچـــخ؛ ٩) نەمـانـی ڕەنـگ؛ ١٠) کار، جانـدراو؛ ١١) بزنی گوێ‌بازگ؛ ١٢) نەکوڵاو؛ ١٣) بەربەران: (شەکی **کاڵ**) ١٤) خوری و موو، دەگەڵ کولکە دەگونرێ: (کولکەو **کاڵ**)؛ ١٥) وشەیەکە لە جیانی

**گرانایی:** قورسایی، سەنگینی ف سنگینی.

**گرانبار:** ١) ئەسپابانی تەبەو قورس لە ناو ماڵ؛ ٢) کەسێ خێزانی زۆرەو زەحمەت‌کێشە ف ١) اسباب و اثاثیۀ سنگین وزن؛ ٢) عیالوار زحمتکش.

**گرانبایی:** زۆر بەنرخ ف گرانبها.

**گرانبەها:** گرانبایی ف گرانبها.

**گرانتا:** گرانەتێ ف تبفوس.

**گرانجان:** ١) زەرەناڵ، رەزاقورس، خوێنتاڵ؛ ٢) کەسێ شت بە بنر لە نرخی خەڵك دەفرۆشێ ف ١) گرانجان؛ ٢) گرانفروش.

**گراندن:** ١) کرەکردن بە دەسناز بان بە ئاشی کرە چەڵتوك لێکردن؛ ٢) بڵێسەدارکردنی ئاگر ف ١) تبمکوب‌کردن با دستاس؛ ٢) شعله‌ور کردن.

**گرانکێش:** ١) قەپان؛ ٢) جەرێ سەقبل ف ١) قپان؛ ٢) جرثقیل.

**گرانمایە:** ١) بەپارەی زۆر کڕدراو؛ ٢) برێنی لە بنیادەمی بە هونەرو جەوهەر ف ١) گران قیمت؛ ٢) کنایه از هنرمند.

**گرانمێر:** پیاگی بەحورمەو سەنگین و بەزوومەت ف مرد باوقار.

**گرانە:** ١) روتەوەبوی سەر؛ ٢) گربنگی؛ ٣) باخە ف ١) طاسی سر؛ ٢) اهمّیت؛ ٣) یقه.

**گرانەتا:** کەونۆبی ف تیفوس.

**گرانەتێ:** گرانەتا ف تیفوس.

**گرانی:** ١) قورسی، گرانایی؛ ٢) دەسەنەکەوتنی بژیو، قانی؛ ٣) نرخ‌بەرەژوری؛ ٤) شەرم‌و پشوڵەسەرخۆیی؛ ٥) جۆرێ هەڵپەرکێی ف ١) سنگینی؛ ٢) قحطی، تنگسالی؛ ٣) گرانی نرخ؛ ٤) وقار؛ ٥) نوعی رقص دسته‌جمعی.

**گرانیر:** قورس‌تر لە کێشانەدا ف طرف سنگین‌تر در توزین.

**گرانیە:** قورسایی لە کێشاندا ف سنگینی در توزین.

**گراو:** ١) دیل، نێسیر؛ ٢) بەندی، زیندانی؛ ٣) کونی داخراو؛ ٤) بارمتە، گرەو ف ١) اسیر؛ ٢) زندانی؛ ٣) سوراخ مسدود؛ ٤) گِروی.

**گڕاو:** ١) ناوێ کە گازی هەبەو گەرمەو بۆ دەرمانی خورو دەبێ؛ ٢) بەبڵێسەکراو ف ١) چشمۀ آب معدنی؛ ٢) شعله‌ور شده.

**گراوە:** ١) جزیر، دورگە، ئاد، جزیره؛ ٢) دینگی چەڵتوك کونان ف ١) جزیره؛ ٢) وسیلۀ شالیکوبی.

**گربوُن:** هەراش بوُن، باش خۆگرتن و بەخۆداهاتن ف نموکردن و ریشه دوانیدن.

**گربەرازکی:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**گربەست:** وەشارتن و لەپر بسکەدا گرێدان ف پنهان کردن.

**گراوی:** ١) دلبەر، ماشقە، باری مبوبنە؛ ٢) ناوی ئاوایی بەکە ف ١) معشوقه؛ ٢) نام روستایی است.

**گربێش:** ناوی دێ بەکە ف نام دهی است.

**گڕپە:** ١) کلپە، بڵێسە، گڕ؛ ٢) دەنگی هەڵبوُنی ئاگری بەرز ف ١) شعلۀ آتش؛ ٢) صدای مشتعل شدن.

**گرت:** ١) رابوردەی گران و گرتن: (چویلەکەم **گرت**، دار ئاگری **گرت**، کابرای ولآنی **گرت**)؛ ٢) نەبە، گر ف ١) گرفت؛ ٢) نپّه.

**گرتك:** ١) ئەپۆلکە، گدو؛ ٢) پشەی لەش: (پیاوێ **گرتك** ئەسنۆرە)؛ ٣) پارچەگۆشت: (**گرتکە**گۆشتێکی دامێ)؛ ٤) پرێسکە؛ ٥) ناوك، قوڵایی پچوکی دوز زگ؛ ٦) ئەنگوتك؛ ٧) شوێنی حەیوانەکێوی گر؛ ٨) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ١) نپّه‌کوچك؛ ٢) استخوان بدن؛ ٣) قطعه گوشت؛ ٤) بیرزه؛ ٥) ناف؛ ٦) چونه، گلوله خمیر؛ ٧) جای همایش حیوان کوهی؛ ٨) روستایی در کردستان کە بعثیان آن راویران کردند.

**گرتکسپیان:** ناوی دێیەکە لە ناوچەی لاجان ف نام روستایی است.

**گرتکشانە:** ناوی دێ‌یەکە لە ناوچەی لاجان ف نام روستایی است.

**گرتکە:** ١) ئەنگوتك؛ ٢) پارچەگۆشت؛ ٣) شوێنێ کە حەیوانەکێوی زۆر دێنێ ف ١) چونه؛ ٢) تکه‌گوشت؛ ٣) جولانگاه حیوانات کوهی.

**گرتن:** ١) خستنەناودەست؛ ٢) دیل‌کردن؛ ٣) بەندکردن؛ ٤) دانان، فەرزکردن؛ ٥) بێ‌بوُنی رۆژگ: (حەمەرۆژوم **گرت**)؛ ٦) دادانی کون: (کونەکانم **گرتن**)؛ ٧) فرتاندن: (نینوکم **گرتن**)؛ ٨) کوشین: (کەوشەکەم پام **نەگرێ**)؛ ٩) بەردەست‌کردن: (دوژمن فەلاکەی **گرت**)؛ ١٠) چوُنەناو: (بچن سەنگەر **بگرن**)؛ ١١) جێ‌بوُنەوە: (ئەم جەوالە شەش بوُت **ناگرێ**) ف ١) گرفتن؛ ٢) اسیرکردن؛ ٣) حبس‌کردن؛ ٤) فرض کردن، انگاشتن؛ ٥) روزه گرفتن؛ ٦) اندودن سوراخ؛ ٧) چیدن ناخن و...؛ ٨) فشردن؛ ٩) فتح کردن؛ ١٠) تورفتن؛ ١١) گنجایش.

**گرتنەدڵ:** دەدڵدا راگرتنی رك یا قسەیەك ف به دل گرفتن.

**گرتنەك:** پەنگەی حەساوکیتاو ف سَنَد.

**گرتنەمل:** دەسنەبەربوُن، وەئەستۆگرتن ف مُتعهد شدن.

**گرتنەناو:** دەورەدان ف درمیان گرفتن.

**گرتنەوە:** ١) بەردەنەرازوُ دروست‌کردن؛ ٢) قۆزتنەوە لە حەوا؛ ٣) تراوکردنەوەو لێکدان: (دەرمانم بۆ **دەگرێتەوە**، خەنەم **گرتەوە**)؛ ٤) هاتنەوەجێی شکاو: (دەسەشکاوەکەت **گرتویەتەوە**)؛ ٥) رُوانین لە کتێب بۆ ئاییندەزانین؛ ٦) فاڵ‌دیتنی فالگرەوە؛ ٧) راکردو دەست‌خستنەوە: (ئەسپ بەر بیو**گرتمەوە**)؛ ٨) نۆش‌بوُنی نەخۆشی لە خەڵکەوە: (ئەم نەخۆشیە **گرتنەوەی** هەیە)؛ ٩) فەرەبوُی رۆژوی فەوتاو: (پاشان دوورۆژوم **گرتەوە**)؛ ١٠) گەیشتن بە جانەوەرێ کە پێش کەوتوە: (بەجێی هێشتبوُم **گرتمەوە**)؛ ١١) پێست لێ‌دارنین، کەوڵ‌کردنی حەیوان: (پێستەکەی **بگرەوە**)؛ ١٢) تێکوڵ لێ‌کردنەوەی میوە: (پوستی ئەم خەیارە **بگرەوە**)؛ ١٣) خەرجی کەم‌کردنەوە: (لە منداڵی خۆم **گرتوتەوە** داومە بەو)؛ ١٤) راگرتن و بەندکردنی ناوی ناو دێری: (گۆڵەکەم **گرتەوە**)؛ ١٥) قەدەغەکردن: (لەوکارانەم **گرتونەوە**) ف ١) براورد کردن سنگ ترازو؛ ٢) قاپیدن در هوا؛ ٣) تهیه و ترکیب کردن رنگ با دوا؛ ٤) بهبود شکستگی استخوان؛ ٥) تفأل به کتاب؛ ٦) فال دیدن؛ ٧) بازگرفتن در رفته؛ ٨) سرایت بیماری؛ ٩) قضاء روزه؛ ١٠) رسیدن به پیشتاز؛ ١١) پوست‌کندن جانور؛ ١٢)

بوست‌گرفتن میوه؛ ١٣) صرفه‌جویی؛ ١٤) بندآوردن آب آبیاری؛ ١٥)منع کردن.

**گرتم:** ١) وامدانا؛ ٢) خسنمه‌ناوه‌دسنم؛ ٣) به‌رۆژوو‌بووم؛ ٤) دبل‌وزبندانیم‌کرد ف ١) جنین فرض کردم؛ ٢) دردست گرفتم؛ ٣) روزه‌دار بودم؛ ٤) زندانیش کردم.

**گرتوٚ:** ١) دبل، ئیسیر؛ ٢) به‌ندی، زبندانی ف ١) اسیر؛ ٢) زندانی.

**گرتوٚخانه:** به‌ند،حه‌فس ف زندان.

**گرتوٚله:** ١) سه‌یروسه‌مه‌ره؛ ٢) جیٚ‌ترس، به‌سام ف ١) عجیب و غریب؛ ٢) ترسناک.

**گرته:** ١) خه‌مبار، دلٚته‌نگ؛ ٢) گوندیٚکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف ١) انـدوهگین، گرفـته؛ ٢) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرته‌ك:** پەلٚگەی‌واو، فەیزی‌قەرد ف سند وام.

**گرته کان:** گویٚز، گوٚز،گوٚز، قوٚز ف گردو، گردکان.

**گرتی:** گرتوٚ ف نگا: گرتوٚ.

**گرتیخانه:** گرتوٚخانه ف زندان.

**گرچك:** ١) دو ئه‌نـدامی چکـوٚلـه‌ی پانکه‌لٚه‌ن سه‌رچاوه‌ی مسولٚدانن، گورجیله، گورچه‌ویله ٢) برینی له خالٚیگه؛ ٣) گریٚ‌دار که زه‌قی‌بیٚ؛ ٤) نبختی که‌ل‌وکـه‌ت ف ١) کلیه، گرده؛ ٢) کنـایه از نهیگـاه؛ ٣) گره برجسته تنه درخت؛ ٤) نیغ کند و لب برشده.

**گرچن:** ١) داری به‌گریٚ؛ ٢) نبختی که‌ل بوٚگ ف ١) درخت گره‌دار؛ ٢) تیغ کند شده.

**گرچو:** گرچك ف نگا: گرچك.

**گرچـوبـر:** ١) زه‌بری قورس؛ ٢) برینی له چیٚشتی سویٚر ف ١) ضربهٔ کاری؛ ٢) کنایه از غذای شور.

**گرخ:** ١) کپانی ده‌نگی گه‌رو؛ ٢) بیٚر، فیٚز ف ١) گرفتگی صدا؛ ٢) بیزحال بهم خوردن از چیزی.

**گرخ‌بوٚن:** کپ‌بوٚنی ده‌نگ، ده‌نگ‌که‌وتن ف صدا افتادن.

**گرخواردن:** به‌ده‌وره‌دا سوٚرانه‌وه ف پیرامون گشتن.

**گرد:** ١) گر، ته‌په، ته‌پوٚلکه؛ ٢) خرٚ وه‌ك توٚپ؛ ٣) کوٚبوٚنه‌وه؛ ٤) جه‌غزی؛ ٥) خرٚ وه‌ك داردوٚژه‌نـگ؛ ٦) درشت؛ ٧) هه‌مو، تیکرا؛ ٨) ده‌وره؛ ٩) سوٚر، گیٚژدان؛ ١٠) کورتـه‌بالاٚ، بالاٚپچوٚك ف ١) تپه؛ ٢) کُروی؛ ٣) همـابش؛ ٤) دایره‌ای؛ ٥) لوله‌ای، استوانه‌ای؛ ٦) دُرُشت؛ ٧) همه، کلّ؛ ٨) پیرامون؛ ٩) جرخش آب؛ ١٠) کوتاه‌قد.

**گردئیٚستر:** گوندیٚکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گردا:** هوٚزیکی کورده له کوردستاندا ف طایفه‌ای در کردستان.

**گرداشه‌وان:** ناوی دیٚ‌یه‌که ف نام روستایی است.

**گراداف:** ١) ناوی زوٚر و خوٚر که خول ئه‌دا؛ ٢) برینی‌له کاره‌سات‌و به‌لاٚ ف ١) گرداب؛ ٢) کنایه از بلا مُصیبت.

**گردان:** ١) خولانه‌وه؛ ٢) سوٚرانه‌وه؛ ٣) وشه‌یه‌که له بازی جاو شارکیٚ‌دا ف ١) گشتن؛ ٢) جرخیدن؛ ٣) اصطلاحی در فایم موشك بازی.

**گرداو:** گرداف ف گرداب.

**گرداوا:** گونـدیٚکـه له کوردستان به‌عسی ویٚرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گردبوٚن:** کوٚبوٚنه‌وه، کوٚم‌بوٚن ف جمع شدن.

**گردبوٚنه‌وه:** کوٚم‌بوٚنه‌وه ف جمع شدن.

**گردچینه:** گوندیٚکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرد زبیٚر:** گوندیٚکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گردش:** نروٚکان، به‌ددان‌شکان ف با دندان شکستن تخمه و امثال آن.

**گردشاندن:** نروٚکاندن ف با دندان شکستن.

**گرد عاره‌بان:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولبان کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گردك:** مابجه ف ماهیچه، عضله.

**گرد کردن:** ١) کوٚم‌کرن؛ ٢) خرٚه‌لٚدان ف ١) جمع کردن؛ ٢) مدوّر کردن.

**گرد کردنه‌وه:** کوٚکردنه‌وه ف جمع کردن پراکنده.

**گرد که‌چیا:** گوندیٚکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرد گاسنه:** گوندیٚکه له کوردستان به‌عسی ویٚرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گردگراو:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولبان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گردن:** گرتن ف نگا: گرتن.

**گردنه‌وه:** گرتنه‌وه ف نگا: گرتنه‌وه.

**گردوٚکردن:** گردکردنه‌وه ف جمع کردن پراکنده.

**گردوکوٚ:** ١)کوٚکردنه‌وه‌ی باره‌ی زه‌مین؛ ٢) پاشه‌که‌وت ف ١) جمع کردن محصولات؛ ٢) پس‌انداز.

**گردوکوٚش:** کردوکوٚش، ئه‌رك‌دان ف زحمت کشی.

**گردولـك:** ١) گردوٚلـك؛ ٢) ته‌پـه‌ی چکـوٚله، گردی پچوٚك ف ١) نگا: گردوٚلك؛ ٢) تپهٔ کوچك.

**گردوٚلـك:** ١) هه‌رشتی به‌سـه‌ریه‌کداکراوی به‌رزه‌وه‌بوٚگ؛ ٢) خوٚبانی به‌سه‌ریه‌کداکراو ف ١) انباشتهٔ بلند شده؛ ٢) توده خرمنِ باد نداده.

**گردوٚلکه:** گردوٚلك ف نگا: گردوٚلك.

**گردوٚلـه:** ١) ته‌پکی پچـوٚك؛ ٢) تیٚفـه‌کی ده‌ربیٚ ف ١) تپهٔ کوچك؛ ٢) خشتك تنبان.

**گرده:** ١) خرٚی توٚپی؛ ٢) جه‌غـزی؛ ٣) تیکـرا؛ ٤) جوٚری برنـج؛ ٥) کاورای کورته‌بالاٚ؛ ٦) درشته‌ی ناو شتی ورد؛ ٧) سه‌لکی گیاسارمه؛ ٨) خول‌و سوٚر؛ ٩) کوٚلـکـه‌ی ئه‌ستـوٚر؛ ١٠) فوژینی مالٚ؛ ١١) ئه‌سنورابی سه‌روی زان (گرده‌ی زانی شکاوه)؛ ١٢) ئه‌زاد، برك؛ ١٣) دورگه، ئاد ف ١) مدوّر، کروی؛ ٢) دایره‌ای؛ ٣) همـگی؛ ٤) نوعی برنج؛ ٥) یاروی کوتاه قد؛ ٦) درشتهٔ میانِ چیزهای ریز؛ ٧) پیازهٔ گیاه

سلمك: ۸) جرخش: ۹) کندهٔ ستبر: ۱۰) گوشهٔ خانه؛ ۱۱) انتهای ران: ۱۲) نگا: برك: ۱۳) نگا: ناد.

**گرده‌با:** باهۆز ف گردباد.

**گرده‌بڕ:** ۱) شه‌قه‌مشار: ۲) کۆلکه‌ی به‌شه‌قه‌براو: ۳) شکانی ئێسکی لای سه‌رووی ڕان: (فاجی **گرده‌بڕ** شکاوه) ف ۱) ارّهٔ دونفره؛ ۲) کندهٔ با ارّه بر بده؛ ۳) شکستگی استخوان ران.

**گرده‌بن:** ناوی گوندێکه ف نام روستایی است.

**گرده‌به‌ردان:** ناوی دێیه‌که ف نام دهی است.

**گرده‌بان:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گرده‌پیاو:** پیاوی کورته‌بالای خڕه‌که ف مرد کوتاه قد.

**گرده چاو:** گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گرده‌ران:** ئێسکی لای سه‌رووی ڕان: (ده‌ك ئه‌سنۆو **گرده‌رانت** شکێ) ف استخوان بالای ران.

**گرده‌ڕه‌ش:** ناوی ناواییه‌که ف نام روستایی است.

**گرده‌ڕه‌شه:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گرده‌ڕه‌شی‌پچووك:** گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گرده‌ژن:** ژنی کورته‌بالا ف زن کوتاه قد.

**گرده‌سپیان:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرده‌سوور:** ۱) ناوی گوندێکه له به‌ربه‌نه‌ی لاجان؛ ۲) گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف ۱) نام روستایی است؛ ۲) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گرده‌شینان:** ناوی گوندێکه ف نام دهی است.

**گرده‌شینه:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گرده‌قازی:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرده‌قیت:** ناوی گوندێکه له ناوچه‌ی سندووس ف نام دهی است.

**گرده‌ك:** پیتی درشتی ئه‌لف‌وبێتکه له نوسینا ف حُرف درشت الفبا در نوشتن.

**گرده کلاش:** زاڕۆی ژن له شووی پێشوو ف فرزند زن از شوهر پیشین.

**گرده که‌روێشك:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرده گڕوێ:** ناوی دێیه‌که له شاروێران ف نام روستایی است.

**گرده گوێ:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرده گۆم:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرده‌ڵ:** ۱) چکۆڵه؛ ۲) بان‌گوێز، بانگوش، باگردێن؛ ۳) خڕی وه‌ك تۆپی چکۆڵه ف ۱) ریز؛ ۲) بام غلتان؛ ۳) کُرهٔ کوچك.

**گرده‌لوی‌جنه:** گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گرده‌له:** ۱) خڕی چکۆڵه؛ ۲) نیفه‌کی ده‌ربێ: ۳) نه‌رمه‌زین: ۴) گردۆلك؛ ۵) ئامرازێ له ئاسباودا؛ ۶) ده‌پێ که جۆلا بوزوی له‌سه‌ر ده‌پێچێ؛ ۷) به‌ندی قامك: ۸) نۆبه‌عه‌ڕابه‌ی به‌کپارچه له دار تاشراو؛ ۹) کۆلکه‌داری خڕو درشت ف ۱) کُروی کوچك: ۲) خشتك تنبان؛ ۳) نمدزین: ۴) نگا: گردۆلك: ۵) ابزاری در آسباب: ۶) تخته‌ای در جولایی که شال را بر آن بپیچند: ۷) بندانگشت: ۸) چرخ گاری چوبین بکپارچه: ۹) کندهٔ گرد و بررگ.

**گرده‌نازێ:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرده‌نشین:** که‌سێ که ناتوانێ کار بکاو له سووچی ماڵه‌وه دانیشێوه ف از کار افتادهٔ خانه‌نشین.

**گرده‌وکردن:** کۆکردنه‌وه ف جمع کردن.

**گرده‌وه‌بوون:** کۆبوونه‌وه ف جمع شدن.

**گرده‌وه کۆیی:** گردوکۆ ف نگا: گردوکۆ.

**گردی:** ۱) درشتی؛ ۲) وردی: ۳) ئێکرا، هه‌موو؛ ۴) کۆوه‌بوون ف ۱) درشتی: ۲) ریزی: ۳) همه؛ ۴) گردهم‌آیی.

**گردی‌ڕه‌وا:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گردی‌سه‌ر:** دانه‌یه‌ی، له‌شوێن جوون ف جستجو.

**گردی‌شه‌ریف:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گردی کاولان:** ناوی گوندێکه له به‌ربه‌نه‌ی لاجان ف نام روستایی است.

**گردی گه‌ڕۆڵ:** ناوی گه‌ڕه‌کێکه له شاری سنه ف محلّه‌ای در شهر سنندج.

**گردیله:** ۱) خڕی بچکۆڵه؛ ۲) ته‌په‌ی چکۆڵه ف ۱) مدوّر کوچك؛ ۲) تپهٔ کوچك.

**گردین:** تێکرا، هه‌موو ف همه، کُلّ.

**گرژ:** ۱) که‌سێ جرچی هێناوه‌ته توێڵ له تووڕه‌یی؛ ۲) ناڕه‌حه‌ت و خه‌مبار، کز: ۳) بادراو؛ ۴) کاری که‌وڵ کردن ف ۱) اخمو؛ ۲) افسرده: ۳) ناب خورده؛ ۴) عمل پوست کندن.

**گرژاڵ:** ڕه‌نگێکه بۆ مه‌ره‌ز که نێوانی ڕه‌ش و سووره، سووری ناماڵ ڕه‌ش ف بنفش قرمز سیه‌فام.

**گرژاندن:** که‌وڵ کردن ف پوست کندن.

**گرژبوون:** ۱) ڕوونرش کردن؛ ۲) تووڕه‌بوون؛ ۳) ناڕه‌حه‌ت و کز دیارکردن؛ ۴) تونده‌وه‌بوونی به‌ن به بادان: ۵) کرژبوون له کار ف ۱) اخم کردن: ۲) خشمگین شدن؛ ۳) افسرده گشتن: ۴) تاب خوردن نخ؛ ۵) جالاك بودن در انجام کار.

**گرژه:** کاورای ئه‌نی گرژو ڕوناخۆش ف یاروی اخمو.

**گرژهەلاتن:** سپس و چرچ بوون [ف] چروك شدن، پژولیدن.

**گرژی:** ١) گرژی و خەمباری؛ ٢) توڕەیی [ف] ١) افسردگی؛ ٢) خشمگینی.

**گرژین:** بزەکردن [ف] لبخند زدن.

**گرژینەوە:** گرژین [ف] لبخند زدن.

**گرس:** ١) بنبادەمی بابەبەرز؛ ٢) توندو لێك‌چەسپاو؛ ٣) خولفاو، رسکاو: (تومەکە **گرس** بوە، بیزە لە ناو سکیا **گرس** بوە)؛ ٤) خۆگرتنەوە: (لە دار کەوتم بە پەلێ **گرسامەوە**، بلارم هاویشتە دار لەوێ **گرسایەوە**)؛ ٥) زەوی لە کێلان رەق؛ ٦) بەقەوارە، نەسنور؛ ٧) زبر؛ ٨) درشت؛ ٩) کاربنە [ف] ١) بزرگوار؛ ٢) محکم و به هم چسبیده؛ ٣) رسته، نکو بن یافته؛ ٤) واچسبیدن، گیرکردن؛ ٥) زمین سفت و سخت در شخم؛ ٦) هیکل‌دار؛ ٧) زبر؛ ٨) درشت؛ ٩) بالار.

**گرسان:** ١) گرس؛ ٢) پێ‌بوونی ئاگر: (ئاگرەکە **گرسا**)؛ ٣) لەش گەرم‌داهاتن: (هەمو لەشم داگرساوە رەنگە تام لێ بێت) [ف] ١) نگا: گرس؛ ٢) افروختگی آتش؛ ٣) گرمی تن به نشانهٔ تب.

**گرساندن:** بەگەورەزانین [ف] محترم پنداشتن.

**گرسانەوە:** ١) خۆگرتنەوە؛ ٢) مانەوە لە شوێنێك: (لەو دێ‌یە **گرساومەتەوە**) [ف] ١) واچسبیدن، گیرکردن؛ ٢) ماندگارشدن.

**گرساو:** گرس بوگ [ف] «گرس» شده.

**گرسك:** ١) گروسك؛ ٢) کێلگەیەکی رەق هەلاتیێ [ف] ١) گلابی وحشی؛ ٢) زمین سخت در شخم.

**گرسە:** تولا، قورسە [ف] نگا: تولا.

**گرسەلار:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرسیاك:** گرساو، گرس بوگ [ف] گرساو.

**گرسیان:** گرسان [ف] نگا: گرسان.

**گرسیانەوە:** گرسانەوە [ف] نگا: گرسانەوە.

**گرش:** داری دارەڕا [ف] دیرك، چوب سقف.

**گرشمە:** ناز، عیشوە، گربشمە [ف] کرشمه، ناز.

**گرشە:** ١) کلوش، قرشە؛ ٢) کومایەك لە بافەی لەسەریەك داندراو، تابە؛ ٣) درەوشان، بریقە [ف] ١) سپاری، ساقهٔ غلّه؛ ٢) توده‌ای از بسته‌های سپاری و گیاه؛ ٣) درخشش.

**گرفت:** ١) تبنتەلا، نەخۆشی لە عەزم‌نەکردنی خۆراکەوە؛ ٢) بەرگر لە کار [ف] ١) بیماری امتلا؛ ٢) مانع راه.

**گرفتار:** ١) تووش‌هانگ، دوچار؛ ٢) یرێتی لە نەویندار [ف] ١) گرفتار؛ ٢) کنایه از عاشق.

**گرفنج:** ١) تێك ئالۆزانی بەن و دەزوو؛ ٢) گرێی بچوکی دژوار لە کردنەوە؛ ٣) دلۆ لە رێس‌دا [ف] ١) سردرگم شدن نخ؛ ٢) گره کور؛ ٣) برجستگی کوچولو در ریس.

**گرفنچ:** گرفنج [ف] نگا: گرفنج.

**گرفنچك:** دلۆ لە رێس‌دا کە ژن لە کاتی نەشی‌رستن‌دا بە ددان دەیقرتێنێ [ف] برامدگی کوچك در ریس.

**گرفە:** کلپە، دەنگی گڕی ئاگر [ف] صدای شعلهٔ آتش.

**گرفەگرف:** گرفەی زۆر [ف] صدای پیاپی شعله.

**گرك:** ١) گرنك؛ ٢) تابشت، تاقەت، قەوەت؛ ٣) دەستار؛ ٤) دوگی وشتر؛ ٥) کوللێرە؛ ٦) تولا؛ ٧) گردی بچوك [ف] ١) نگا: گرنك؛ ٢) تاب، توان؛ ٣) دستاس؛ ٤) پیهٔ شتر؛ ٥) گرده نان؛ ٦) نگا: تولا؛ ٧) تپّهٔ کوچك.

**گڕك:** ١) دەستار؛ ٢) جوون، بەردی قوڵی شت تێداکوتان [ف] ١) دستاس؛ ٢) سنگ گود به جای هاون، هاون سنگی.

**گرکا:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گرکاشە:** ١) ناوی گوندێکە؛ ٢) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] ١) نام دهی است؛ ٢) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گرکال:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گڕکان:** ئاگربژێن، ئاگری [ف] آتشفشان.

**گرکرن:** پف کردن [ف] مُبالغه.

**گرکچك:** دەنکێ ئاڵە لە ناو گەنم‌دا، مرۆر [ف] تلخك در گندم.

**گڕکە:** ١) تاڵکە؛ ٢) کەچەڵی ئاژەڵ؛ ٣) قاقر، کراڵ [ف] ١) طالبی؛ ٢) بیماری کچلی دام؛ ٣) زمین لُخت و بی گیاه.

**گرکەش:** باوێشك، باوێشك [ف] خمیازه.

**گرکی:** قسەیەك کە نازانرێ مەبەست چیە [ف] سخن مُبهم.

**گرگ:** کرش، عوور [ف] شکمبه، معده.

**گرگاز:** گیایەکە [ف] گیاهی است.

**گرگازۆڵە:** گرگاز [ف] نگا: گرگاز.

**گرگازە:** گرگاز [ف] نگا: گرگاز.

**گرگاشە:** بەڵاو نەهامەت [ف] بلا و مصیبت.

**گڕگر:** پیاوی بابەبەرزو گەورە [ف] بزرگ مرد.

**گڕگڕ:** ١) دیسانەوە بەپەلە: (هەر دەڕواو **گڕگڕ** خۆ بە ماڵ‌دا دەکانەوە)؛ ٢) جۆرێ بافلە؛ ٣) گڕی ئاگری لەسەر یەك: (**گڕگڕ** دایسا) [ف] ١) باز با عجله؛ ٢) نوعی باقلی؛ ٣) شعلهٔ مداوم.

**گڕگران:** ئاگربازی، ئاتەشبازی [ف] آتشبازی.

**گڕگرتن:** ١) گڕتێ‌بەربوون، هەڵبوونی ئاگر؛ ٢) یرێتی لە زك‌هەستانی زۆر [ف] ١) شعله‌ور شدن؛ ٢) کنایه از به خشم آمدن زیاد.

**گرگروك:** عەرەبانەی زاروکان [ف] ارادهٔ اسباب بازی.

**گرگرە:** پیاوی گەورە [ف] بزرگ مرد.

**گرگن:** زگ‌زل [ف] شکم گنده.

**گرگنە:** کورتەباڵای زگ‌زل [ف] کوتاه‌قدّ شکم‌گنده.

**گرگین:** توڕەی زك‌هەستاو [ف] خشمگین.

**گرم:** ١) دەنگی زل وەك دەنگی توپ و هەور؛ ٢) دەنگی کەوتنی شتی قورس: (**گرم** بە عەرزدا کەوت) [ف] ١) صدای غرنب؛ ٢) صدای افتادن جسم سنگین.

**گرماندن:** دەنگی زل لێهانن: (هەور **گرماندی**) ف غرنبیدن.

**گرمانن:** گرماندن ف غرنبیدن.

**گرمخین:** شونەوەو کوژاندنەوەی خەتی نوسراو ف پاك‌کردن نوشته.

**گرمژن:** دەنگی ڕۆخانی زۆر: (چیا **گرمژنی** هات‌و رزا بە خوار) ف غرنب ریزش کوه و امثال آن.

**گرمژنە:** زیپکـەی چکۆڵـە لە نـاو بردنـەوە ف جوش ریز پوست از آفتاب‌زدگی.

**گرمژە:** گرمژنە ف نگا: گرمژنە.

**گرمش:** خۆ پێدادانی لەپڕ ف حرکت کردن ناگهانی.

**گرمست:** مستەکۆڵە، مست ف مشت.

**گرموتە:** چکۆڵەی خڕەکە ف گردِ مدوّر و ریز.

**گرموڵە:** ١) گرمونە؛ ٢) لە دەوری یەك ئالاوی خڕەوەبوگ: (لە سەرمان خۆی **گرموڵە** کردبو) ف ١) مدوّر و ریز؛ ٢) بە هم پیچ خوردە.

**گرموڵە:** گرمونە ف نگا: گرمونە.

**گرموهوڕ:** دەنگی بەفەوی زۆر: (هەوران **گرموهوڕ**یانە) ف غرنبهٔ زیاد.

**گرمە:** گرم ف نگا: گرم.

**گرمەژنە:** گرمژنە ف نگا: گرمژنە.

**گرمـە گـرم:** گرمـەی بەدوی‌یەکدا: (**گرمەگرمی** هەورانە. **گرمەگرمی** تۆبان دێت) ف غرنبهٔ زیاد.

**گرمین:** گرماندن ف غرنبیدن.

**گرناڵ:** زبرو قورنج‌قورنج وەك تێکوڵەبادام ف زبر و ناهموار.

**گرناڵ گرناڵ:** گرناڵ ف زبر و ناهموار.

**گڕنای:** گڕی ئاگر ف شعلهٔ آتش.

**گرنج:** ١) برنج؛ ٢) قورنج، زبری زۆر ف ١) برنج؛ ٢) آجیده، زبر.

**گرنجار:** چەڵتوکجاڕ ف شالیزار.

**گرنج‌بەشیر:** برنج بەشیر ف شیر برنج.

**گرنج گرنج:** قورنج‌قورنج ف آجیده، زبر.

**گرنچك:** گرێ‌قامیش، بەند ف بندنی، گرەنی.

**گرنژ:** بزە، زەردە ف لبخند.

**گرنژاندن:** ١) جرچ‌ولۆچ تێ خستن؛ ٢) هەڵقرچاندن ف ١) چروکاندن؛ ٢) در اثر حرارت فشرده کردن.

**گرنژین:** بزە هاتنەسەرلێوان ف لبخندزدن.

**گڕنژین:** ١) چرچ‌ولۆچ‌بوُن؛ ٢) هەڵقرچان ف ١) چروکیدن؛ ٢) در اثر حرارت به هم آمدن.

**گرنگ:** جێگەی بایەخ‌دان، پڕبایخ: (کاریکی **گرنگە**، قسەیەکی **گرنگە** نابێ بەکەم بگیرێ) ف مهمّ، با اهمیّت.

**گرنگی:** بایەخداری ف اهمیّت.

**گرنوڕ:** گرناڵ ف زبر، آجیده.

**گرنوُز:** شتی جوان‌و بەرچاو ف چیز زیبا و چشمگیر.

**گڕنۆز:** ١) کەزواوی، برشاوی؛ ٢) بەکرێژ ف ١) کپك زده؛ ٢) شورەزده.

**گرنوُگ:** گیایەکە، تۆن تۆفیلە ف گیاهی است.

**گرنە:** پەلپ، بەهانە ف بهانه.

**گڕنـە گـرتن:** پەلپ‌گرتن‌و بەهـانـە دۆزینـەوەی منـداڵ بەگریانەوە ف بهانه‌گیری بچه.

**گڕنەوت:** جەنگەی سواربوُنی پشیلەی نێر لە مێ ف موسم جفتگیری گربەها.

**گڕنی:** ١) زبر لە دەست‌لێدان؛ ٢) مناڵی پەلپگر؛ ٣) بنیادەمی شڵتاغ‌باز ف ١) زبر در لمس؛ ٢) بچهٔ بهانه‌گیر؛ ٣) شلتاق‌باز.

**گرۆ:** ١) نوگر، خوگرتوُ؛ ٢) کۆمەڵ، دەستە: (**گرۆ گرۆ** هاتن)؛ ٣) شەرت، مەرج؛ ٤) بارمتە؛ ٥) داناربوُنی رۆن‌و سەمەنی‌و ...؛ ٦) خاوەخاوکردن لە کارا ف ١) الیف، خوگرفته؛ ٢) گروه؛ ٣) شرط‌بندی؛ ٤) گروگان؛ ٥) دان دان شدن روغن و...؛ ٦) سُستی و اهمال در کار.

**گروُ:** لە لای ئەستۆوە لاشە لە پێست دەرهاوردن ف لاشهٔ حیوان را از راه گردن از پوست در آوردن.

**گڕوُ:** ١) نەخۆشی پێست‌خوران؛ ٢) روخسارتاولاوی؛ ٣) گڕی ئاگر؛ ٤) پەلپی منداڵ ف ١) بیماری گَری؛ ٢) آبله‌رو؛ ٣) شعله؛ ٤) بهانهٔ بچه.

**گروا:** لە ملەوە گۆشت‌و ئێسکی هاتە در ف گوشت و استخوان از گردن درآمد.

**گروان:** کاری لاش لە ئەستۆوە دەرهێنان ف انجام دادن عمل «گروُ».

**گروانـدن:** دەرهێنانی لاشی گۆشت لە ئەستۆرا: (ئەم بزنە **بگروُ** پێستی دەکەمە هەنبانە، گامان گروه کلکی ماوه) ف انجام دادن عمل «گروُ».

**گروانکە:** کێشانەیەکە بۆ چایی بەرانبەر بە چوارسەت‌و دە گرام ف وزنی است معادل چهارصدو ده گرام، گیروانکه.

**گرۆبردنەوە:** ١) لە شەرت‌بەستن‌دا سەرکەوتن؛ ٢) پێش‌کەوتن لە خەڵك ف ١) برنده شدن در شرط‌بندی؛ ٢) سرامد بودن.

**گرۆبرن:** گرۆبردنەوە ف نگا: گرۆبردنەوە.

**گرۆبوُن:** ١) رام‌بوُن، خوگرتن، نوگربوُن؛ ٢) وەدرەنگی کەوتن ف ١) اُنس گرفتن، خوگرفتن؛ ٢) دیرکردن.

**گرۆبـەر:** ١) بنیادەمێ کە گرۆی بردوەتـەوە؛ ٢) برێتی لە کەسێ کە لە خەڵکی تر لە پێشترە ف ١) برندهٔ شرط؛ ٢) کنایه از سرامد.

**گرۆبەندە:** برێتی لە پیاوی زۆر ئازا لە شەڕو جەنگ ف کنایه از شجاع و جنگاور.

**گرۆپـیـف:** ١) سەرریژبـوُن‌و نیشـتـنـەوەی شێو لە دیزەدا؛ ٢) لەپـڕ بەرزەوەبوُن‌و دامرکانی گڕ؛ ٣) برێتی لە توُڕەبوُن‌و زوُ پەشیمان بوُنـەوە: (دەدڵی مەگرە توڕەبـوُنی ئەو **گرۆپفێکە**)؛ ٤) برێتی‌لە لەپڕ دەولەمەندبوُن‌و زوُ نابوُدبوُن ف ١) لبریزشدن و فرود آمدن جوشیده بلافـاصله؛ ٢) شعله‌ور شدن و زود خاموش شدن آن؛ ٣) کنـایه از برافتن و به سرعت آرام شدن؛ ٤) کنایه از دولت مستعجل.

**گروُر:** ١) دەنکێ ئاڵە لە ناو گەنم دا؛ ٢) ناوی دێ‌یەکە ف ١) دانه‌ای تلخ در گندمزار؛ ٢) نام دهی است.

**گروُز:** ١) هەڵتۆقین لە لێدانەوە؛ ٢) لو ف ١) ورم کردن از ضربه خوردن؛ ٢) غدهٔ بارز.

**گڕوز:** زاروی گڕوگر ف بچهٔ همیشه گریان و بهانه‌گیر.

**گروزین:** هەڵتۆقین لە لەش یالە زەمیندا ف برآمدگی در بدن یا در زمین.

**گڕۆژ:** ئێکرای ڕۆژان، هەموڕۆژێ ف هر روز.

**گرۆسك:** کرۆسك ف گلابی وحشی.

**گرۆشك:** نامرازی زارئاختنی گونجەی ئاو ف لولەباز کن.

**گروف:** قانگل، قانگلە ف نگا: قانگل.

**گرۆفر:** ١) کڵپەی لەپڕ و نەکاو؛ ٢) شتێ کە زوو بفەوتێ؛ ٣) شات و شوت ف ١) شعلهٔ ناگهانی؛ ٢) سریع الزوال؛ ٣) لاف و خودستایی.

**گرۆفیك:** چەرخ و گاری بچوك ف گاری کوچك.

**گروڤ:** گروف، قانگلەبەن ف نگا: قانگلە.

**گروقەر:** ١) خڕ وەك توپ؛ ٢) جەغزی؛ ٣) درێژۆکەی لوس و بێ سوچ وەك داردۆژەنگ ف ١) کروی؛ ٢) دایره‌ای؛ ٣) استوانه‌ای.

**گروك:** ١) ئاوریشمی خاو؛ ٢) کورك، کوڕوو ف ١) ابریشم خام؛ ٢) کرك، موی نرم زیر بن.

**گروك:** ١) زارۆیێ کە زۆر دەگری؛ ٢) تەپەی چکۆلە ف ١) کودك همیشه گریان؛ ٢) تپهٔ کوچك.

**گرۆکردن:** شەرت بەستن ف شرط بندی.

**گرۆکف:** گرۆپف ف نگا: گرۆپف.

**گرۆگاڵ:** گاڵ و بوغ ف نگا: گاڵ و بوغ.

**گرۆگرتن:** بەلپ گرتنی زارۆك ف بهانه گیری بچه.

**گرۆل:** پارچەیەکی سێ سوچە بۆ بن باغەڵ لە کراس و جوغە ف خشتك زیر بغل در پیراهن.

**گرۆڵە:** گاری و عەرەبانەی بارکێشان ف گاری و ارادهٔ باربری.

**گرۆڵە:** گرۆل ف خشتك زیر بغل.

**گرۆلی:** بەرگی جەکی گەرم ف گلولهٔ اسلحه.

**گرۆلیە:** ١) لەسەر یەك پێنجراوی بەن بەخرێ، گلۆلە؛ ٢) بەرگی تفەنگ ف ١) گلوله نخ؛ ٢) گلولهٔ تفنگ.

**گرۆن:** ١) گرواندن؛ ٢) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ١) نگا: گرواندن؛ ٢) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گرۆنی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرۆنی:** ١) جۆرێ قوماشی گوڵ گەورە؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) نوعی پارچه؛ ٢) نام مردانه.

**گرۆی:** ١) نەخۆشی دەردی گرۆ؛ ٢) ئاولاوی ف ١) بیمارگری؛ ٢) آبله‌گون.

**گرۆس:** پەنی درێژ ف رسن، ریسمان کلفت و دراز.

**گرۆیی بی:** نەخۆشی گرۆبوون ف بیماری گری.

**گرە:** ١) بەندی نوندی بەن و بەت، گرێ؛ ٢) کونی بەرداش؛ ٣) پیاوی خاوەن پایە ف ١) گره؛ ٢) سوراخ سنگ آسیا؛ ٣) مردبزرگ.

**گرە:** ١) سەمون، بای گەرمی کوشندە؛ ٢) تین و هالاو؛ ٣) دەنگی زبری ناخۆش؛ ٤) کرەی دەخل ف ١) بادسام؛ ٢) آلاو، الو، گرما؛ ٣) صدای گوش خراش؛ ٤) نیمکوبی دانه.

**گرهان:** گرانی کون ف گرفتگی سوراخ.

**گرەبێچ:** گێژەلوکە، باهۆز ف گردباد.

**گرەبێچە:** گڕی بەنەوڕمی نەتدوور ف شعلهٔ قوی و فشردهٔ تنور.

**گرەزوك:** گرۆز ف نگا: گرۆز.

**گرەژۆ:** گەلارێزان، خەزەڵوەرین ف برگ ریزان.

**گرەسیسە:** دوامین گڕی نەتدوور کوژانەوە ف آخرین شعله‌های تنور.

**گرك:** ناوی شلوێ، قوراو، چلپاو ف گل ولای.

**گرە گر:** پیاوماقوڵان، پیاوانی پایەبەرز ف اشخاص سرشناس.

**گرەگر:** ١) گرگر، کلپەی بەردەوامی ئاگر؛ ٢) زەنازەنا و چەقەچەق ف ١) شعلهٔ مداوم آتش؛ ٢) سر و صدای گوش خراش.

**گرە گرە:** گرە گر ف اشخاص سرشناس.

**گرەمێر:** پیاگی وەهەیکەل و درشت ف مرد هیکل‌دار.

**گرەو:** گرو ف نگا: گرو.

**گرەوای:** ١) جوشین، کولین؛ ٢) گریان ف ١) جوشیدن؛ ٢) گر بستن.

**گرەوبردنەوە:** گرۆبردنەوە ف ١) شرط بردن؛ ٢) سرامد بودن.

**گرەوتا:** ١) بەزۆر تێ ئاخنراو؛ ٢) گیراو، گریاگ، گراو؛ ٣) داپۆشراو ف ١) به زور داخل کردن؛ ٢) گرفته شده، مسدود؛ ٣) سر پوشیده شده.

**گرەوتش:** ١) کڕبن، سەنن، سەندن؛ ٢) سەرپۆش لەسەر دەفر دانان؛ ٣) تێ ئاخنین؛ ٤) وەدەس هێنان؛ ٥) توند بەستنی دەم؛ ٦) داپۆشین؛ ٧) گەزبن، پێوەدان ف ١) خریدن؛ ٢) روی ظرف غذا سرپوش گذاشتن؛ ٣) داخل کردن؛ ٤) بەدست آوردن؛ ٥) محکم دهان را بستن؛ ٦) پوشاندن؛ ٧) گازگرفتن.

**گرەوتە:** گرەوتا ف نگا: گرەوتا.

**گرەوکردن:** گرۆکردن ف شرط بندی.

**گرەوەك:** لەبارمتە نراو ف گروی.

**گرەی:** گری، هەڵتۆقیو لە لەشدا ف غدّهٔ برجسته در بدن.

**گری:** ١) گربان، ئاو لە چاوهاتن لە خەم و خەفەتان؛ ٢) بەخەیاڵ دانان: (گریم کرد وابو) ف ١) گر بستن؛ ٢) فرضاً.

**گرێ:** ١) بەند، گرە؛ ٢) بەندی قامیش و دارو گیا؛ ٣) پاژێك لە شازدە پاژی گەزی پێوان؛ ٤) گەی قامك، بەندی تبل؛ ٥) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) گره؛ ٢) بندنی و گیاه و...؛ ٣) یك شانزدهم ذرع شاهی؛ ٤) بنداگشتان؛ ٥) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرێ:** ١) بەرانبەری لوسی، زبری لە دەست لێدان؛ ٢) ددان دیاری بوون؛ ٣) زبری دەنگ ف ١) زبری، آجدگی؛ ٢) نموداری دندانهای پیشین؛ ٣) زبری صدا.

**گریا:** ١) ئاو لە چاوی هات لە خەمان؛ ٢) کولبو: (ئاو گربایە) ف ١) گر بست؛ ٢) جوشیده.

**گڕیا:** کلپەی کرد ف شعله‌ور شد.

**گریان:** گری، ئاو لە چاوهاتن لە خەفەتان ف گر بستن.

**گڕیان:** کلپەکردن، بڵێسەسەندن ف شعله‌ور شدن.

**گریاندن:** کارێ کردن کە کەسێ بگری ف گر باندن، به گر به انداختن.

**گریانن:** گرباندن ف نگا: گرباندن.

**گریانــە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرێ بەرانــە:** جۆرێ گرێ کە لە ملی ئاژەڵ نوند نابێ و بە هاسانی دەکرێتەوە ف نوعی گره که آسان باز می‌شود.

**گرێ بەست:** کیسەپوولی پێنەو ف کیسه پول قدیمی.

**گرێ بەند:** راپۆرت، هاپدان بە نوسین: (**گرێ بەندا** خۆ بگورا دلێ تاغە نڤیست) ف گزارش کتبی، راپُرت.

**گرێ پێتی:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گرێ بۆچکە:** گرێ کە بە دژواری دەکرێتەوە ف گره کور.

**گرێجان:** خدەوخوێ ناشیرین دەگەڵ ف دارای اخلاق وخوی زشت.

**گرێ جوانــە:** جۆرێ گرێ کە فێر بــوونــی دژوارە ف نوعی گره که باد گرفتنش مشکل است.

**گرێ جوڵەکانە:** گرێ جوانە ف نگا: گرێ جوانە.

**گرێچ:** هەراوهوریا، زەنازەنا ف داد و بیداد.

**گرێچك:** بەندی قامك ف بند انگشت.

**گرێچن:** ١) جۆرێ تەنین بە گرێ گرێ؛ ٢) بەستنی پشتێند کە تاوەژاسنی قەدەکانی بە گرێ دەوەستێ ف ١) بافتهٔ گره‌دار؛ ٢) نوعی بستن کمر بند.

**گرێدار:** ١) پێچ و ڕەقایی لە مێشکی داردا؛ ٢) هەر شتێ بەندی هەبێ ف ١) گره میان تنهٔ درخت؛ ٢) دارای بند.

**گرێدان:** ١) نونــدلێك بەستن؛ ٢) برینی لە دەبــەرکــردنی ئەسپابی شەڕوسەفەر ف ١) گره‌زدن؛ ٢) کنایه از پوشیدن لباس رزم یا سفر.

**گرێ دانــك:** ١) پەیمــان، شەرتی دۆستــایەتی بەستن؛ ٢) شوێنەواری مێژوویی بەجێ هێشتن ف ١) عهد، پیمان؛٢)اثر تاریخی بجاگذاشتن.

**گرێدراو:** ١) بەندکراوی دەزوو؛ ٢) داخراوی درگا ف ١) گره‌زده؛٢) در بسته.

**گریز:** ئاوێ کە لە ڕەخی دەمەوە دێت، لیکاو ف لعاب دهن که از گوشهٔ لب آید.

**گریزانك:** لەرزینی لەپڕ ف چندش.

**گریزە:** مچورك، موچرك، لەرزینی زۆرکەم لەبڕدا ف مورمور شدن بدن.

**گریزە:** گریز، لیکاوی دەم ف لعاب دهن.

**گرێژ:** ئەندامی جێگەی شیر لە ئاژەڵدا، گوان، مەمك ف پستان دام.

**گرێژە:** گوندێکی کوردستانــە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرێژنە:** باژنەی دەرگا، ژێرپێنەمە ف پاشنهٔ در.

**گریس:** سست و شل ف شُل و نامحکم.

**گریش:** ١) تینوڵ؛ ٢) گیشەی گیاو دەخڵی لەدەشت ف ١) نگا: تینوڵ؛ ٢) بسته‌های گیاه و غلّهٔ جمع‌آوری نشده.

**گرێش:** تینوڵ، بژگوری جلەکۆن ف نگا: تینوڵ.

**گرێشك:** گرێ کۆرە ف گره‌کور.

**گریشمە:** نازەقەمزە ف ناز.

**گریڤ:** مان، جەنە، گەی ف اعتصاب.

**گریڤان:** ژێرکراس ف زیرپیراهن.

**گریڤکەر:** مانگرتو ف اعتصاب کننده.

**گرێ قەمــرۆك:** گوندێکە لە کوردستــان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گریك:** نابشت، نوان، نافەت ف ناب، نوان.

**گرێك:** گرێ ف گره.

**گرێکوتك:** گرێ کۆرە، گرێکوێرە ف گره کور.

**گرێکۆرە:** ١) گرێ بۆچکە؛ ٢) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) گره‌کور؛ ٢) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گرێکورە:** گرێ بۆچکە ف گره کور.

**گرێکوێرە:** گرێ بۆچکە ف گره کور.

**گرێل:** باگردان ف بام غلتك.

**گرێل:** جۆرێ بەری مازو ف نوعی ثمر مازوج.

**گرێلە:** گرێی بچوکی دوای دەزوو دورمان: (تەز بەتەزی سەر بە **گرێلە**) ف گره کوچك دنبالهٔ نخ دوختنی.

**گریم:** ١) وام دانا، فەرزم کرد؛ ٢) گربانی من ف ١) گیرم؛ ٢) گریه‌ام.

**گریمان:** ١) وامان دانا؛ ٢) گریانمان ف ١) فرض کردیم؛ ٢) گریهٔ ما.

**گریمانە:** گرێی زۆر لە بەن و دەزوودا: (ئەم دەزووە نێکڕا **گریمانەیە**) ف گره خورده.

**گرێمی:** جۆرێ خەنجەری بچوك ف نوعی خنجر کوچك.

**گرین:** گریان، گری ف گریه.

**گریناى:** کولان، کولین، پێگەیشتن لەسەر ئاگر، بوخنەبوون ف پختن.

**گرینگ:** گرنگ، بایەخدار، موهیم ف با اهمیّت.

**گرینوك:** کەسێ کە زۆر دەگری، گرۆك ف بسیار گریان، همیشه‌گریان.

**گرێنی:** گرێمی، جۆرێ خەنجەری گچکە ف نوعی خنجر کوچك.

**گریو:** ١) شەرت بەستن؛ ٢) بارمتە ف ١) شرط‌بندی؛ ٢) گروگان.

**گریوان:** ژێرکــراس، ئەو پارچــەجلەی لەسەر گۆشت و لەبن کراس دەبەردەکرێ، گریڤان ف زیرپیراهن.

**گریوگــۆڵ:** ١) ئاڵــۆزی و گرێی زۆر دەبــەندا؛ ٢) برینی لە کارێ کە سەرەوبەری لێ دەرناکرێ: (وات کردە **گریوگۆڵ** هەر سەر دەر ناکەم) ف ١) درهمی و گره‌زیاد؛ ٢) کنایه از سردرگمی.

**گریوە:** گری، گریان ف گریه.

**گریوەغار:** کێبەرکێ لەڕاکردندا ف مسابقهٔ دو.

**گریە:** گری، گریان، گرموە ف گریه.

**گرێهتــك:** ١) کێڵگــە لەنــاو دۆڵ و شیودا؛ ٢) نەخۆشی گەزۆڵی ف ١) مزرعهٔ واقع در درّه؛ ٢) بیماری گَری.

**گریەوڕۆ:** شەپۆڕ، شیوەن ف شیون.

**گریەوڕۆڕۆ:** گریەوڕۆ، شیوەن ف شیون.

**گریەوگۆ:** گریان و دەردەدڵ کردن ف گریه و زاری.

**گز:** ١) ئالۆدە، خۆگرتو: (ئەم کابرایە **گز**ناڕەق و قوماره)؛ ٢) حیلە، فنبل:

(گـز مەکـە)؛ ۳) بڕ، جاوزەقی: (**گـزگـز** نواشای کردم ترسیام)؛ ۴) بەعـــەزرەت و ئاوات: (گـــز نەورۆژەم نۆ بویئم)؛ ۵) وشـــەیەکـــە لە کاشـۆ بازی‌دا وانا: وشیار بە لەسەر ڕێ و شوێن کایە بکە؛ ۶) دەنگی کیسـەڵی نێر بۆ ناوکردنی مێوینەکەی: ۷) دارێکی دەوەنە لە بەستی ڕوبـاران دەڕوێ؛ ۸) لەپڕ و نەکاو: (**گزو گومەت**) [ف] ۱) خوگرفتگی؛ ۲) حیلە: ۳) نگاه خیرە: ۴) مشتاق؛ ۵) اصطلاحی در چوگان‌بازی؛ ۶) صدای لاک‌پشت نر هنگام جفتگیری؛ ۷) درختچهٔ گز؛ ۸) ناگهانی.

**گزجاڕ**: بیشەی دەوەنی گز [ف] گزستان.

**گزچاڕ**: داری گز [ف] درختچهٔ گز.

**گزر**: گیایەکە لە تیرەی تۆرو چۆنەر سەلکی درێژوکەو بەڕەنگی زەرد یان سوور، گزەر [ف] هویج.

**گزرانۆك**: پرچی وەهۆندراو [ف] زُلف تابداده.

**گزرە**: ۱) گیای وردکراو بۆ لەوەڕی ئاژەڵ؛ ۲) داری پارچەپارچە کراو بۆ سوتانی زستانە؛ ۳) پوش‌وپار [ف] ۱) گیاه کوبیده برای علوفهٔ دام؛ ۲) هیزم قطعه‌قطعه شده؛ ۳) خس وخاشاك.

**گزڤانۆك**: گزرانۆك [ف] زُلف تابداده.

**گزك**: جاڕو [ف] جارو.

**گزكدان**: جاڕوکردن [ف] جارو زدن.

**گزكدەر**: کەسێ کە جاڕو دەکا [ف] جاروزن.

**گزكنـە**: ۱) کەزی پڕپشت، پرچی زۆرپڕ؛ ۲) داری پڕلق وتۆپ [ف] ۱) موی پُرپشت؛ ۲) درخت پُرشاخ و برگ.

**گزگ**: گزك، جاڕو [ف] جارو.

**گزگز**: ۱) قانون و ڕێوشوێنی بازی؛ ۲) دەنگی کیسەڵی نێر بۆ ناوکردنی مێوینە، گز؛ ۳) لەرزینێکی کەم؛ ۴) چزەچزی گۆشت لەسەر ئاگر [ف] ۱) اصـــول وآداب بازی؛ ۲) صدای لاک‌پشت نر در جفتگیری؛ ۳) مورمورشدن بدن؛ ۴) صدای گوشت بر آتش.

**گزگزاندن**: کەمێك لەرزاندنەوە [ف] اندکی لرزاندن.

**گزگزە**: ۱) گیایەکە پەلکە کەی وردە دڕکێکی هەیە وە ئەندامی ڕووت کەوێ ئەبچـوزێنێتـەوە؛ ۲) گیایەکی گەڵابـاریکی بۆن‌خۆشـە بنـەکەی بۆ سوتاندن دەبێ؛ ۳) شوشە [ف] ۱) گیاه گزنه؛ ۲) گیاهی است که بیخ آن برای سوختن به کار می‌رود؛ ۳) شیشه.

**گزگزین**: سوکە لەرزین [ف] مورمورشدن.

**گزگل**: ۱) قەل، قەلەموونە، عەلوعەلو، عەلەشیش؛ ۲) بەرێکی دارمازوە؛ ۳) باوەعەمەرە، باوەقـوڕەت، چلەنۆك [ف] ۱) بوقلمون؛ ۲) یکی از ثمرهای مازوج؛ ۳) کونوله.

**گزگلاگە**: پیشەی پشتی گوێ [ف] استخوان پشت گوش.

**گزگی**: ئاوێنە، عەینك، قودیك [ف] آیینه.

**گزم**: ۱) دەوەنی گزچاڕ؛ ۲) زبر [ف] ۱) درختچهٔ گز؛ ۲) خشن، زبر.

**گزمك**: دەمبێنی حەیوان [ف] پوزه‌بند.

**گزمـوڵە**: ۱) خڕی چکۆڵە لە قوڕ؛ ۲) کەلای حەڕی [ف] ۱) گلولهٔ ریز گلی؛ ۲) تیلهٔ گلین.

**گزمی**: زبری [ف] خشونت، زبری.

**گزن**: ۱) فێڵباز؛ ۲) تەشقەڵەباز [ف] ۱) نیرنگباز؛ ۲) شلتاق باز.

**گزنگ**: سەرەتای تاوی بەیانی [ف] اولین تابش آفتاب.

**گزنگ‌دان**: تازە دەرکەوتنی تیشکی خۆر [ف] دمیدن آفتاب پگاه.

**گزنەك**: ببروی نەڕ [ف] اگزما.

**گزنی**: ۱) درۆی دروسکـراو، بوختان؛ ۲) پیاوی گزن [ف] ۱) بهتان؛ ۲) نگا: گزن.

**گزۆری**: نەکۆز، ڕێك‌وپێك، بێ کەم و کوڕی [ف] بی کم و کاست.

**گزوفت**: ۱) تاسەی زۆر بۆ خواردنی شتێ: (**گزوفتمە** بۆ گۆشتی برژاو)؛ ۲) عەزرەت پێدان: (دەم‌خواردو **گزوفتی** ئەوم دەدا) [ف] ۱) اشتیاق زیاد برای خوردن چیزی؛ ۲) حسرت دادن به کسی.

**گزوگوم**: لەپڕ و نەکاو [ف] ناگهانی، یکهو.

**گزوگومەت**: لەپڕ و نەکاو، گزوگوم [ف] ناگهانی، یکهو.

**گزە**: ۱) فێڵ، حیلە؛ ۲) گاز بە ددان لە زمـانی زاڕۆکـانـدا [ف] ۱) حیلە، نیرنگ؛ ۲) گاز با دندان درزبان کودکانه.

**گزەر**: گزر [ف] هویج.

**گزەگز**: ۱) کزۆزانەوەی بەگریانەوە؛ ۲) خەیاڵ کردنەوە لە کارێ [ف] ۱) ناله و گریهٔ بچه؛ ۲) فکر کردن در مورد کاری.

**گزەون**: فێڵەباز [ف] حیلەباز.

**گزی**: فێڵ، حیلە [ف] حیلە، نارو.

**گزیچاڕ**: گزچاڕ [ف] درختچهٔ گز.

**گزیر**: بەردەستی کوێخا لە دێدا [ف] پادو کدخدای ده.

**گزیرانە**: پێتاکێ کە ڕەعیەت دەیدا بە گزیر [ف] مزد پادو کدخدا که رعیّت می‌دهد.

**گزیرك**: ۱) بریسکەدانی چاو لە دارکاری کردندا؛ ۲) بریتی لە ئێشی زۆر [ف] ۱) برق زدن چشم هنگام چوبکاری شدن؛ ۲) کنایه از درد شدید.

**گزیکار**: فێڵباز، حیلەساز [ف] ناروزن، نیرنگباز.

**گزیکەر**: گزیکار [ف] ناروزن.

**گزینگ**: ۱) گزنگی خۆر؛ ۲) ڕەشکێنەی چاو، بی‌بیلە [ف] ۱) اوّلین تابش آفتاب؛ ۲) مردمك چشم.

**گژ**: ۱) ئێك‌هاڵان بۆ کێشەوشەڕ: (دە گژم ڕاچو، بەگژم داهات)؛ ۲) قەدی دار: (دارمێو لە گژ داربـەڕو ئاڵاوە)؛ ۳) ڕاست بونەوەی موی لەش، گرژبـوون؛ ۴) توڕەیی؛ ۵) وشەی دنەدانی جوانەگا بۆ سەر چێڵ؛ ۶) شل و سست؛ ۷) موی تێك‌هاڵاوی شانەنەکراو؛ ۸) تێکڕا، هەمو، گ؛ ۹) ڕوەك: (گـــژو گیای زۆرە، گیاو گژی زۆرە)؛ ۱۰) لوربـــوون، بەرەوخواربونەوە، لەژورەوە بەنهێم بەرەوخوارهاتن؛ ۱۱) ڕەق، سەخت [ف] ۱) گلاویزشـدن؛ ۲) تنهٔ درخت؛ ۳) سیخ شدن مو؛ ۴) خشم؛ ۵) کلمهٔ برانگیختن گاو گُشن؛ ۶) سست؛ ۷) موی ژولیده؛ ۸) همه؛ ۹) رستنی، گیاه؛ ۱۰) به تندی پایین آمدن از سراشیبی؛ ۱۱) سخت، سفت.

**گژاڕ**: چینەدانی باڵندە، جیکڵدانە [ف] ژاغر، چینەدان.

**گژاژ**: گژاڕ [ف] چینەدان.

**گژانـدن:** ۱) تێکـەڵ‌پێکەڵ کردن؛ ۲) برێنی لە ئاژاوەنانەوە ف ۱) درهم آمیختن؛ ۲) کنایە از آشوب بپاکردن.

**گژڤاموك:** پرچی هۆندراو ف موی بافته.

**گژك:** ۱) کوژەکە؛ ۲) تەرزەی ورد؛ ۳) پرچی پەرژو بڵاو ف ۱) خرمُهره؛ ۲) نگرگ ریز؛ ۳) موی بر بشان.

**گژکردن:** ۱) کزکردن، خوڵێك‌هاڵاندن؛ ۲) راست‌بوونەوەی‌مو ف ۱) تو ی هم رفتن؛ ۲) راست شدن مو.

**گژکن:** ۱) کەزی پڕ و زۆر؛ ۲) داری پڕلك وپۆپ ف ۱) موی پرپُشت و بسیار؛ ۲) درخت پُرشاخ و برگ.

**گژکە:** پوکاولە، چەموڵە، چەمبوڵە ف ام کردن، پنجه‌گذاشتن.

**گژگـژ:** ۱) وشەی دنەدانی جوانەگا بۆ سەر جێڵی بەکەڵ، گژ، کەڵە؛ ۲) وشـك، زوا، زژ، زوهـا؛ ۳) تێکـەوە هاویشتنی ناپـوڕە ف ۱) کلمهٔ برانگیختن گاوگشن؛ ۲) خشك؛ ۳) شلوغی و ازدحام مردم.

**گژگژاندن:** هانەدان بۆ شەڕ، دنەدان بۆ جەنگ ف تحریك کردن برای شروع جنگ.

**گژگژە:** پۆش و پەڵاشی بابردەڵە ف گیاه خشك بادآورده.

**گژگژەك:** بەفرخۆرکە، جۆرێ تەرزەی زۆرورد ف نوعی برف بسیار ریز.

**گژگژین:** راست‌بوونەوەی مو لە ترسان ف سیخ شدن موی بدن از شدّت ترس.

**گژل:** تەرزە، تەزرە، تەبروك ف تگرگ.

**گژلوك:** تەزروکە، تەرزەی ورد ف تگرگ ریز.

**گژم:** ۱) خەم، خەفەت؛ ۲) خەمبار؛ ۳) تەخۆشی تەنگەنەفەسی ف ۱) اندوه؛ ۲) دژم؛ ۳) نفس تنگی.

**گژن:** موی تێك‌هاڵاو ف ژولیده.

**گژنەسەرە:** سەرفژن ف ژولیده موی،پیچیده موی.

**گژنیژ:** کشنیژ ف گشنیز.

**گژنیژ:** گژنیژ ف گشنیز.

**گژنیژە:** ۱) گژلـوك، تەرزەی ورد؛ ۲) زیـبـری بێست لە سەرمـان؛ ۳) کشنیژە؛ ۴) کشنیژ ف ۱) نگرگ ریز؛ ۲) خشن شدن پوست از سرما؛ ۳) نوعی زیور؛ ۴) گشنیز.

**گژۆرەك:** وردە جرپی بۆ ئاڵاشی بان داپۆشین ف انبیره.

**گژوژ:** جڵکن و قژن ف جرکین و ژولیده موی.

**گژوگیا:** پۆش و پار، رووەك ف نباتات علفی.

**گژوڵ:** جۆرێ داری جەنگەڵ ف از درختان جنگلی.

**گژوڵە:** پەرژو بڵاو ف پراکنده وآشفته.

**گژوڵەك:** گێژەلۆکە ف گردباد.

**گژولی:** گژۆرەك ف انبیره.

**گژومژو:** تێکەڵ‌پێکەڵ، تانەکۆژ ف درهم برهم وبی‌نظم.

**گژە:** ۱) دەنگی بای بەتـەوژم؛ ۲) گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ؛ ۳) دنەی جوانـەگا بۆ سەر مانگابەکەڵ ف ۱) صدای وزش تندباد؛ ۲) گیاهی است دارویی؛ ۳) کلمهٔ تحریك گشن بر ماده گاو.

**گژەبا:** بای توندی پابزی ف باد تند خزانی.

**گژەگژ:** گژەی با ف صدای تندباد.

**گژیان:** قرژبوونی مو، شێوانی مو ف آشفتن و ژولیدن موی.

**گژی‌ببێ:** گوندێکە لە کوردستان بە عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گس:** وشەی لێخوڕینی پەز، کس ف کلمهٔ راندن گوسفند.

**گست:** گوست، تبل،تلی، قامك، تەنگوست، تەنگوس ف انگشت.

**گسك:** جارو، گزك، گزگ ف جارو.

**گسکدان:** گزکدان ف جاروکردن.

**گسکـەدەر:** کەسێ کە بە گسك کار دەکا ف جاروزن.

**گسکە:** کسکە، بریقەی چاوی پشیلە لە تاریکی‌دا ف برق چشم گربه در تاریکی.

**گش:** گ، گژ، تێکڕا، هەمو ف همه.

**گشت:** ۱) بادراو، باوخواردو؛ ۲) گش، تێکڕا؛ ۳) قامك، تەنگوس ف ۱) نخ تابیده؛ ۲) همه، همگی؛ ۳) انگشت.

**گشتائۆرتی:** قامکی ناوەڕاست ف انگشت وسطی.

**گشتابلل:** تبلامەزن، قامکەگەورە ف انگشت شست.

**گشتاقلانج:** قامکەتوته ف انگشت کوچکه.

**گشتامیانین:** گشتائۆرتی، زەرتەقوته ف انگشت وسطی.

**گشتانـە:** ۱) تەنگوستیلە؛ ۲) قوچەکەی دورمـان؛ ۳) قولی درەو، تەوەنـدەی لە دەستێکـا جێ دەبێتـەوە ف ۱) انگشتر؛ ۲) انگشتانهٔ خیاطی؛ ۳) میزانی معادل یك کف دست.

**گشتر:** کلکەوانە، گشتانە ف انگشتر.

**گشتك:** تەنگوتك ف چونه.

**گشتونە:** قوچەکەی دورمان ف انگشتانهٔ خیاطی.

**گشتەك:** بەنی گشت ف نخ تابیده.

**گشتی:** تێکڕایی، هەموانی ف همگانی، عمومی.

**گشـك:** ۱) تێکـڕا، گژ، گ، گشت؛ ۲) پوکـاولە، چەموڵە؛ ۳) بەنجەی تاواڵەکراو؛ ۴) گژك، تەرزەی ورد ف ۱) همگی؛ ۲) ام کردن؛ ۳) پنجهٔ باز؛ ۴) تگرگ ریز.

**گشکە:** پوکاولە، چەمبوڵە، گشك ف ام‌کردن.

**گغ:** دەنگێ کە لە منداڵی ساوا دەردەچێ ف صدای بچهٔ نوزاد.

**گغکی:** منداڵی گغ‌وێژ ف کودك چند ماهه، نوزاد.

**گغنی:** شلناغ، تەشقەلە، تەلەکە ف شلتاق.

**گغە:** ۱) گغ: (زاروکەمان **گغەو** بغە دەکا)؛ ۲) بغە، وشەی ترساندنی ساوا ف ۱) نگا: گغ؛ ۲) کلمهٔ تحذیر از خطر برای کودك.

**گف:** ترساندن بەقسە: (هەرو **گفم** لێ دەکا) ف تهدید.

**گفت:** پەیمان، بەڵێن ف قول و پیمان.

**گفتار:** قسە بۆخەڵك‌کردن ف سخنرانی، گفتار.

**گفت‌دان:** بەڵێن‌دان، پەیمان‌دان ف قول‌دادن.

**گفتوگۆ:** تاخافتنی پێکەوە ف گفتگو.

**گفتە:** گفت، بەڵێن ف قول.

**گفشك:** ۱) قورینج، قوربنج‌گرتن؛ ۲) پوکاولە، گشك، چەمبوڵە ف ۱)

نبشگون؛ ٢) ام کردن.

**گف**: ١) گشتـەك، بادراو؛ ٢) گف، ترساندن بەقسە؛ ٣) دەنگی بەردی هاویژراو بە قۆچـەقانی: (هەر گفەگفی دێت) ف ١) نخ نابیدە؛ ٢) نهدید؛ ٣) صدای سنگ برتاب شده با فلاخن.

**گفاشتن**: کوشین ف فشردن.

**گفاشگه**: جێگەی گوشینی ترێ‌و...، گوشینگە ف جای فشردن میوە.

**گفاله**: کۆمەڵی چەکدار ف گروه تفنگداران.

**گفاند**: ١) هێڵ، خەنی جوت؛ ٢) خوارو خێچ ف ١) شیار شخم زمین؛ ٢) کج و کوله.

**گفانده**: ١) سەرلێوی کەنداڵ و شاخ؛ ٢) کەوشەنی زەمینی کێڵگە ف ١) لبهٔ پرتگاه؛ ٢) مرز کشتگاه.

**گفر**: پشیلەی نیر ف گربهٔ نر.

**گفرت**: کێم و هەوا، چڵکی برین ف چرك و ریم زخم.

**گفردی**: لەرزین لەترسان، راچەنین ف لرزه از ترس، بکەخوردن.

**گفرك**: هەراش، ساوای بەکەیف‌و تەبار ف نموکرده، نوزاد شاداب.

**گفرونەك**: گیابەکی دەشتەکیە ف از گیاهان صحرایی.

**گفشك**: ١) ئەنگـوتكەهەوبـر؛ ٢) قـوربنـج ف ١) چونـهٔ خمیر؛ ٢) نیشگون.

**گفگه**: ١) گف، دەنگی بەردی بەرەقانی؛ ٢) دەنگی سوڕانی خول‌خولەو مزراق ف ١) صدای سنگ فلاخن؛ ٢) صدای چرخش شدبد گردنا.

**گفگف**: گزەگز ف صدای تندباد.

**گفگفـــه**: دارێکی جەغـــزیە بەدو کونی تێکــراوە بەتێ تێ‌دەخـەن‌و بای‌دەدەن گفەگفی لێ دێت ف نوعی فرفرهٔ چوبی.

**گفن**: موی تێك‌هالاوی گرژ ف موی زولیده.

**گفوردی**: گفردی ف چندش، بکەخوردن.

**گفـه**: ١) گفقـە؛ ٢) دەنگی بای بەقـەوەت، گزە ف ١) نگا: گفقه؛ ٢) صدای تند باد.

**گفه‌گف**: دەنگی گفەی لەسەریەك ف صدای پیاپی «گفه».

**گفی**: دەلەمەی پەنیر ف دَلَمهٔ پنیر.

**گفیری**: ژان‌و برك ف دلپیچه.

**گفیرین**: عەزم کردن، هەڵناواندن ف هضم خوراك.

**گفیشـــك**: ١) بلچ، گێوژ، گوێژ؛ ٢) کوشـراو، کوشـراوی میوە ف ١) زالزالك؛ ٢) عُصاره.

**گفین**: مەبین، بوئەماست بان پەنیر ف بندآمدن شیر.

**گل**: ١) ژانی چاو؛ ٢) جوڵە، بزاو؛ ٣) خلۆر؛ ٤) خاکێ کە ژنان سەربانی پێ دەشۆن؛ ٥) جار، کەرەت؛ ٦) راگرتن: (گلم داوەتەوە)؛ ٧) ترۆپکی چیا، دوندی کێو، نۆك کێف؛ ٨) سەرلق، لکی هەرەبڵندی دار؛ ٩) زیپکە ف ١) چشم درد؛ ٢) حرکت؛ ٣) غلت؛ ٤) گل سرشـــوی؛ ٥) بار، دفعـه؛ ٦) نزد خود نگهـداشتن؛ ٧) قُلّهٔ کوه؛ ٨) بلنـدترین شاخـهٔ درخت؛ ٩) جوش پوست.

**گڵ**: ١) خاك، خوڵ؛ ٢) گڕ، بڵێسە: (گلبێنەی ئەندوڕ) ف ١) خاك؛ ٢) شعله، لهیب.

**گلا**: ١) بەڕێ، پەرت بو؛ ٢) گش‌لا، هەمسولابەك؛ ٣) خلۆرەوەبـو؛ ٤) پرچی وەهـــۆنـــدراو؛ ٥) جارێك‌تر، هەڵبکی کە ف ١) پرت شد؛ ٢) همگی، همه جانب؛ ٣) غلتید؛ ٤) زلف تابیده؛ ٥) باردگر.

**گلابوچ**: پرچی کورتی وەهۆنراو ف زُلف کوتاه آرایش شده.

**گلاده**: ١) قەلادە، ئالقـەی دەوری ئەستـو؛ ٢) خشڵی ئەستـو ف ١) قلّاده؛ ٢) گردنبند.

**گلار**: ١) چەمی بچـــوك؛ ٢) خلۆر: (لـــەو سەرەوە گلار بوەمـەوە)؛ ٣) زقر بن؛ ٤) دەنکەترێ، لبەترێ؛ ٥) شۆڕبۆوە: (گلارێ بن‌جەنێ، وانا: بەرخەبەبە) ف ١) رود کوچك؛ ٢) غلتان؛ ٣) برگرد، برگشت؛ ٤) دانه انگور، حبّه انگور؛ ٥) آویزان.

**گلاراو**: ١) نۆفرەتەگرتن، بێ‌قەراری؛ ٢) نەخۆشی ئەسبەك ف ١) آرام نگرفتن؛ ٢) بیماری مالیخولیا.

**گلاراوی**: گوندێکی کوردستانە بەعەسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گلارکو**: ١) گازر، قەسار؛ ٢) ئێلای جلك‌و گەلاکوتان ف ١) گازر؛ ٢) کدینه.

**گلاره**: ١) بڕەداری لەسەریەك دانراو؛ ٢) دنکەترێ: (گلارەترێ وەدەمنا ناچێ)؛ ٣) گلێنە، بێبیلەی چاو ف ١) قطعات هیزم برهم انباشته؛ ٢) حبّه‌انگور؛ ٣) مردمك چشم.

**گلاز**: ١) عەلوکەسوورەی پایزی، ئالو بخارا؛ ٢) ناوچەیەکە لە کوردستان ف ١) آلوی فرمز؛ ٢) ناحیه‌ای در کردستان.

**گلاس**: شەربەی شوشە بۆ ئاوپێ‌خواردنەوە، پەرداغ ف لیوان شیشه‌ای.

**گلاسی**: چەرمی نەرمی رەنگ‌کراو ف جرم ورنی.

**گلاف**: پیس، چەپەڵ ف کثیف.

**گلاله**: ئالو ف لوزتین.

**گلالـــه**: ١) نیوەدروس بوگ: (کـارەکـە گلالـە بوە)؛ ٢) کەلابـەردی لەچەرخ‌نەدراو ف ١) نیم ساخته؛ ٢) تیلهٔ سنگی صاف نشده.

**گلالـه کـردن**: ١) نزیك بە نەواوبـوون کردن؛ ٢) بیرکردنەوە لە کارێ‌و رێگەی دروست‌بوونی دبنەوە ف ١) نیم ساخته‌کردن؛ ٢) زمینه‌چینی، طراحی.

**گلان**: ١) بەسەرزەوێدا کەوتن: (ئەسپەکەم گلا)؛ ٢) پەرت‌بوون: (لە ئەسپ گلام)؛ ٣) جوڵان لە جێگە؛ ٤) خلۆربوونەوە ف ١) سکندری خوردن؛ ٢) پرت شدن؛ ٣) تکان خوردن؛ ٤) غلتیدن.

**گلانا**: دیسان، ئەم‌جارەش ف دوباره، باردگر.

**گلاندن**: ١) خلۆرکردنەوە؛ ٢) جوڵاندن؛ ٣) فرێ‌دان؛ ٤) کۆکردنەوەی خواردنی لە ماڵان ف ١) غلتانیدن؛ ٢) تکان دادن؛ ٣) پرت کردن؛ ٤) جمع کردن خوراك از منازل.

**گلانگ**: جار، جەل، دەحفە، دەحە ف دفعه، بار.

**گلانگا**: جاروبارە ف گاهگاه.

**گلانگی**: جارێك، کەرەتێ، دەمێ وەدەحفەیێ ف یك‌بار.

**گلانگینا**: جارێکی‌دیکە، دەحفەی تر ف باردگر.

**گلانن**: گلاندن ف نگا: گلاندن.

**گلاو:** ١) خلۆرەوەبوگ؛ ٢) بەزبو لە بەرزی‌یەوە؛ ٣) بەسەر زۆردا کەفتك؛ ٤) گلاڤ [ف] ١) غلتیده؛ ٢) پرت شده؛ ٣) سکندری خورده؛ ٤) کثیف.

**گڵاو:** ١) قوراوی گلەسوُر؛ ٢) جی‌دەمی سەگ‌و بەراز؛ ٣) زۆر پیس؛ ٤) بریَتی لە بنبادەمی بەدفەڕو بی‌ناکار [ف] ١) آب گل آلود؛ ٢) دهان زدهٔ سگ و خوك؛ ٣) پلید؛ ٤) کنایه از آدم بی‌اخلاق.

**گڵاوبوُن:** جەیەڵ‌بوُن بە دەم‌لێدانی سەگ‌و بەراز [ف] پلیدشدن با دهان سگ و خوك.

**گڵاوکردن:** شوتنی جی‌دەمی سەگ‌و بەراز بەقوڕاو جاریك‌و بەئاو شەش‌جار [ف] شستن دهان‌زدهٔ سگ و خوك با آب گل‌آلود و آب صاف.

**گلاوگل:** تلاوتل، رەت‌بردن [ف] تلوتلو.

**گڵاوی:** ١) پیسی لە دەمی سەگ‌و بەرازەوە؛ ٢) بریتی لە بەدفەڕی‌و بی‌ناکاری [ف] ١) پلیدی از سگ و خوك؛ ٢) کنایه از بداخلاقی.

**گڵاوی کردن:** گڵاوکردن [ف] نگا: گڵاوکردن.

**گلاهە:** ١) تالان، بوڕ؛ ٢) تالانکراو [ف] ١) غارت، چپاول؛ ٢) غارت شده.

**گلاهـەك:** ١) گزموڵەی زەبی لە قوڕی دیزە، گوزە کە بە جوُرەکەوانێك دەهاویزرا بو ڕاوەباڵندە؛ ٢) خوڵ‌و قسڵی تێکەڵاو بو سواغدان [ف] ١) مهرهٔ کمان گروهه؛ ٢) مخلوط خاك و آهك برای اندودن

**گلب:** گەروُ، قورگ [ف] گلو.

**گل بوُنەوە:** گلاربوُنەوە، خلوربوُنەوە [ف] غلتیدن.

**گلبێنە:** ١) گزبەندی تەندوُر؛ ٢) باکێشی تەندوُر [ف] ١) بادکش بند تنور؛ ٢) بادکش تنور.

**گلپ:** ١) هەڵمـەت، هێرش؛ ٢) بز پێداکـردن‌و زفـاندن [ف] ١) یورش، هجوم؛ ٢) قاپیدن.

**گلپوَج:** کەزی وەهونراو [ف] زُلف نابداده.

**گلپە:** ١) کڵپە، گزی لەبز؛ ٢) دەنگی گزگرتنی ئاگر [ف] ١) شعلهٔ بکهو بدیدآمده؛ ٢) صدای لهیب آتش.

**گلپەگلپ:** دەنگی لەسەریەکی گزی ئاگر [ف] صدای پیاپی شعلهٔ آتش.

**گلتە:** ١) کێشەو هەرا، شەڕەقسە بەدەنگی بەرز؛ ٢) راوەی نەخوش [ف] ١) جدال لفظی؛ ٢) هذیان مریض.

**گلچژە:** ناقانەی دابکێ، ناکەمنداڵ لە دابکێك [ف] بکی بکدانه.

**گلخواردن:** ١) خلوربوُنەوە؛ ٢) بەدەورەدا گەڕان؛ ٣) مانەوە لەشوێنێك [ف] ١) غلتیدن؛ ٢) پیرامون گشتن؛ ٣) واماندن در جایی.

**گڵخواردن:** قێری خاك‌خواردن‌بوُنی زاروك [ف] خاك خوردن بچه.

**گلخواردنەوە:** مانەوە لەشوێنێك [ف] ماندن، از رفتن صرفنظر کردن.

**گڵخوَر:** زاروی فێری خاك‌خواردن [ف] بچهٔ خاك خور.

**گڵخوَرکە:** کرمەسوُرە، کرمی گڵ [ف] کرم خاکی.

**گلدان:** ١) جوڵاندن، تەکان‌پی‌دان؛ ٢) جوری ترێ سپیلکەی دەندك‌زل کە زوتر پی‌دەگا [ف] ١) تکان دادن؛ ٢) نوعی انگور زودرس.

**گلدانەوە:** لای خو هێشتنەوە [ف] نزد خود نگهداشتن.

**گلدە:** ١) بیزوینە، تەکان‌بدە؛ ٢) پرێسکە؛ ٣) گلنە [ف] ١) تکان بده؛ ٢) بپرزه؛ ٣) نگا: گلنه.

**گلدی:** خلورەوەبوگ بەسەر زەمیندا، تلاوتل‌بوُن [ف] غلت خوردن.

**گلدی کرن:** خلورکردنەوە، تلاوتل‌پێدان [ف] غلت دادن.

**گلزە:** باقە، باغە، دەسکێکی زل لە گیاو دەخل [ف] توده‌ای دسته شده از گیاه.

**گلسە:** بەزەمینداکەوتن [ف] بر زمین افتادن.

**گلفچ:** پیناوتن، لەناودەسنا کوشران [ف] مچاله.

**گلفچاندن:** لەناودەسنا کوشین [ف] مچاله‌کردن.

**گلفچین:** قرمچین، هەڵقرچان [ف] در اثر حرارت جمع شدن.

**گلفەرك:** ١) گروڵ؛ ٢) نیڤەك [ف] ١) خشنك زیر بغل؛ ٢) خشتك تنبان.

**گلك:** ١) لاسکەگەنمەشامی بی‌دەنك؛ ٢) گیابەکی بنك‌دارە؛ ٣) مینکە، بەلوکە [ف] ١) ساقهٔ بی‌دانهٔ بلال؛ ٢) گیاهی است؛ ٣) جوجوله.

**گڵکار:** بەنا، کەسێ کاری قوڕ دەکا [ف] بنّا.

**گڵکاری:** توڕەکاری [ف] گلکاری.

**گلکردن:** وەژان‌کەوتنی چاو، چاوئێشان [ف] به دردآمدن چشم.

**گڵکـوَ:** ١) گڵی بەسـەریەکـداکراو، کوَمای خاك؛ ٢) قەبر [ف] ١) تودهٔ خاك؛ ٢) قبر.

**گلکەردش:** بەرناوتن، کەزاخە، لکی زیادی داباچین [ف] هَرَس درخت.

**گڵکەن:** کانی گڵەدیزەو تیر بار [ف] کان خاك رس.

**گڵکەند:** گڵکەن [ف] کان خاك رس.

**گلگل:** ١) تەنەڵەی دانەوێڵەو دەخل؛ ٢) هەرزنەگەورە؛ ٣) گیاگەسك [ف] ١) بوجاری؛ ٢) گارس؛ ٣) گیاهِ جارو.

**گلگلاندن:** تەنەڵەکردن [ف] بوجاری کردن.

**گلگیر:** کەو، سەڕەند، سەڕەد [ف] سرند.

**گللارە:** گلارە، بوڵوەترێ [ف] دانه انگور، حبهٔ انگور.

**گللك:** ١) زێدان، مناڵدان؛ ٢) کوز، قوز [ف] ١) زهدان؛ ٢) آلت تناسلی زن.

**گللی:** ڕەشکێنەی چاو، بیبیلەی چەم [ف] مردُمك چشم.

**گللێرە:** تەرزەی ورد [ف] تگرگ ریز.

**گللی کوَر:** کوێر [ف] نابینا.

**گلم:** لق، لك [ف] شاخهٔ درخت.

**گلمت:** کەستەك، کلوگڵ [ف] کلوخ.

**گلمتك:** گلمت [ف] کلوخ.

**گڵنجان:** گڵکەن [ف] کان خاك رس.

**گلو:** ١) بوڵ، بوڵەترێ، گلارە؛ ٢) خزی زور چکوڵە لە ماست‌و شیری خراوبوُدا: (شیرەکە خراو بوە **گلوگلو** بوە)؛ ٣) دانـاردانـاربـوُنی سەمەنی‌و...: (**گلوگلو** وەستاوە) [ف] ١) دانه انگور، حبّه؛ ٢) اجزاء از هم گسستهٔ ریزی که در ماست یا شیر فاسد شده دیده می‌شود؛ ٣) دانه‌دانه‌شدن سمنو و...

**گلوَ:** ١) گش فەدبێك، گشت جبنێ؛ ٢) بوَجی، چما؟ [ف] ١) همهٔ لا به‌ها؛ ٢) چرا؟.

**گلواته:** ۱) قربۆکی میوەی وشك وەك مێوژو هەنجیرو...؛ ۲) نلیەی مێوژ [فا] ۱) مویز یا انجیر پوك و خشكیده؛ ۲) نفالهٔ مویز.

**گلواز:** ۱) رستـەهـەنجیری ناڵقـەکراو؛ ۲) ناڵقەی بەخلەخل بە داری بێشکـەوە [فا] ۱) انجیر خشـك بە رشتـە کشیدهٔ حلقـە شده؛ ۲) اسباب‌بازی آویزان به گهواره.

**گلواز:** جۆرێ بەری دارمازو [فا] نوعی ثمر مازوج.

**گلوان:** بەرێکی دارمازوە بۆ دەباغ دەبێ [فا] نوعی ثمر مازوج.

**گلۆت:** کەسنەك، سندەگڵ [فا] کلوخ.

**گلوچاندن:** قرمچاندن، گلۆفین، ژاکاندن لە ناو دەسنا [فا] مچاله‌کردن، فشردن در دست.

**گلوخول:** جەرخو خول، بزوتن و سوڕانەوە [فا] جنب وجوش.

**گلوخۆڵ:** تۆزو غومار [فا] گردوغبار.

**گلۆخه:** بەچکەمەلی خڕەکەو نازەپێ‌گەیشتوو [فا] جوجـەپرندهٔ تازه پـر درآورده.

**گلودۆر:** بەدەورەدا هەڵخولان [فا] پیرامون گشتن.

**گلۆر:** ۱) مازنە، بازن، خشڵی جومگەو یاسك؛ ۲) گروڤەر؛ ۳) خلۆر؛ ۴) بەری هەرداریك کە وەك قۆزاخەبێ؛ ۵) جارێ لە جاران [فا] ۱) النگو؛ ۲) مدوّر، کروی یا دایره‌ای؛ ۳) غلتیده؛ ۴) هر ثمر غوزه‌مانند؛ ۵) وقتی از اوقات.

**گلۆربونەوه:** خلۆربونەوە [فا] غلتیدن.

**گلۆف:** بە دەست پشاوتن [فا] مچاله.

**گلۆفین:** لە ناو دەستدا پشاوتن [فا] مچاله‌کردن.

**گلۆڤەر:** گروڤەر، خڕ وەك هەنار یان وەك جەغز [فا] نگا: گروڤەر.

**گلۆك:** ۱) ئەسپێ کە زۆر زەت دەبـاو بەسـەردا دەکـەوێ؛ ۲) بەسـەر یەکاپێچراوی بەن [فا] ۱) اسبی که زیاد سکندری می‌خورد؛ ۲) گلولهٔ نخ.

**گلوگلو:** ۱) داناردانار؛ ۲) دەنکەدەنکە نرێ [فا] ۱) دانه‌دانه؛ ۲) دانه‌دانهٔ انگور.

**گل‌وگوێز:** ۱) رۆیشتن و هەستانی زۆر؛ ۲) خول‌خواردن و نۆقرە نەگرتن [فا] ۱) جست وخیز؛ ۲) بی‌قراری، ناآرامی.

**گلۆل:** ۱) گرۆر؛ ۲) خلۆر [فا] ۱) دانه‌ای انگل در گندمزار؛ ۲) غَلت.

**گلۆلان:** ناوی دی‌بەکە [فا] نام روستایی است.

**گلۆل بونەوه:** خلۆربونەوە [فا] غلت خوردن.

**گلۆله:** ۱) بەنی لێك‌هالاوی خڕهەڵدراو؛ ۲) هەرشتێ خڕی لێك‌هالاو: (لەسەرمان خۆی **گلۆله** کردبو) [فا] ۱) گلوله نخ؛ ۲) به هم پیچیده و درهم خزیده.

**گلولی:** دۆکەشك [فا] دوغ کشك.

**گلۆلی:** گروڤەری وەك کەلا [فا] گرد کروی.

**گلۆنگ:** دەحفە، جار، کەرەت [فا] دفعه، بار.

**گلوەز:** گرولی‌جۆغە [فا] خشتك زیر بغل.

**گلۆی:** فورگ، ئەستوڵەناوەوە [فا] گلو.

**گلوێن:** نف، ناوی‌دەم [فا] آب دهان، خدو.

**گلۆینه:** گلێینە [فا] نگا: گلێینە.

**گله:** ۱) دەنکـەتـرێی لە هێشـو دارنـاو؛ ۲) گازن، گازنـدە؛ ۳) پرچی وەهۆندراو [فا] ۱) دانه‌های انگور از خوشه ریخته؛ ۲) گله، گلایه؛ ۳) زُلف نابیده.

**گلەنەرمەنی:** خاکێکی دەرمانە [فا] نوعی خاكِ دارویی، طین ارمنی.

**گلەبان:** ناخەبان، بانەناو [فا] خاك‌ریزی بام.

**گلەبـەرانـه:** جۆرێ خاك بۆ رەنگ‌کردنی دەفری سوالەتی [فا] نوعی خاك رنگی لعابی.

**گلەجان:** ۱) کانی گڵی نیرپار؛ ۲) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [فا] ۱) معـدن خاك رس؛ ۲) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گلەجانی:** گلەجان [فا] معدن خاك رس.

**گلەحەرام:** خاکی تەسڵ [فا] خاك آهك.

**گلەخۆرکه:** کرمی گڵی، کرمەسوورکە [فا] کرم خاکی.

**گلەدۆشاو:** گڵێکی سپیە لە دۆشاوکردندا بەکاری دەهێنن [فا] خاکی که در شیره‌سازی به‌کار آید.

**گلەرەش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [فا] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گلەزەرده:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد [فا] روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گلەسپی:** خاکێکی جەرمگە سواغی ناوەوەی پێ‌دەکەن [فا] خاکی که به جای گچ برای اندودن دیوار به کار آید.

**گلەسـەر:** فورێکی زەردە ژنان سەری پێ‌دەشۆن [فا] گل سرشو به.

**گلەگله:** دانەدانە، دەنکەدەنکە [فا] دانه‌دانه.

**گلەماره:** جۆرێ خاکی بۆری کەفەلۆك [فا] نوعی خاك خاکستری رنگِ سُست.

**گلەمەن:** بەگازندە، گازن‌کار [فا] گله‌مند.

**گلەمەند:** گلەمەن [فا] گله‌مند.

**گلەنجان:** گلەجان [فا] کان خاك رُس.

**گلەودان:** لای خۆ ڕاگرتن [فا] پیش خود نگاه داشتن.

**گلەوەز:** کرێژی بەرد [فا] گل سنگ.

**گلەهەرمەنی:** گلەنەرمەنی [فا] نگا: گلەنەرمەنی.

**گلەیی:** گلە، گازن، گازندە [فا] گلایه.

**گلی:** ۱) گلەیی، گازنـدە؛ ۲) شکـایەت؛ ۳) قسـە [فا] ۱) گلایه؛ ۲) شکایت؛ ۳) سخن.

**گلێ:** ۱) یازی لەسەر یەك‌پا رۆیشتن و پابەك بەرزکردن؛ ۲) بەك‌دەنك؛ ۳) گلەتـرێ، گلوی نرێ [فا] ۱) بازی لی‌لی؛ ۲) یك دانـه؛ ۳) دانه‌انگور، حبّهٔ انگور.

**گلێ:** خاکی، لەخاك [فا] خاکی.

**گلیا:** ۱) بزوت، نەکانی خوارد؛ ۲) بەسەر زودا کەوت؛ ۳) بەرت بو [فا] ۱) تکان خورد؛ ۲) سکندری خورد؛ ۳) پرت شد.

**گلیار:** شکۆفەی دارهەنار [فا] گل انار.

**گەندەژن:** ژنێ زۆتر لە وەخت پیر بێ ف زنی کە دچار پیری زودرس شود.
**گەندەژە:** ڕێوی تۆلەك کردو ف روباه پشم ریخته.
**گەندەکار:** کەسێ کە لە کاردا زانا نیەو خراپی دەکا ف ناشی.
**گەنـدەل:** ١) نەمـەل؛ ٢) نەفام؛ ٣) چروك و بێ کەلك ف ١) تنبل؛ ٢) بی‌شعور؛ ٣) بی مصرف.
**گەندەڵ:** داری ڕزیو ف درخت پوسیده.
**گەندەلۆ:** گیایەکە لە کەما دەکا. نازەل بیخوا کوێر دەبێ ف گیاهی است سمّی.
**گەندەمو:** وردەموی زەرد کە دەوەرێ و موی لەجێ دەڕوێنەوە ف موی زرد نخستین کە بعداً می‌ریزد.
**گەندەنێ:** خەفتانێك بارانی کەمی لێ بباری و تیشەی وشك بێ ف کشتهٔ دیمی کم باران.
**گەنکاو:** ئاوی بۆگەنیو ف گنداب.
**گەنکاوە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**گەنکەزەردە:** گیابۆگەنیوە ف گیاهی است بدبو.
**گەنگەل:** گۆنگەل ف نگا: گۆنگەل.
**گەنم:** گەندم ف گندم.
**گەنمدرەو:** دروێنەی گەنم ف دروگندم.
**گەنمدونە:** ١) دانوی گەنم؛ ٢) دانوڵەی تێکەلاو لە هەمو دانەوێڵەیێ بۆ خێری ددانهاتنی زارۆك ف ١) گندم آب پز؛ ٢) آش دندانی.
**گەنمڕەنگ:** گەندمی، بەرەنگی گەنم، ئەسمەر ف گندم‌گون.
**گەنمزەردە:** فەریکەگەنم ف گندم درمل.
**گەنم گردی:** لەسەریەك بێ‌ڕاوەستان: (**گەنم گردی** دابگرت بە داران) ف بدون وقفه.
**گەنم گەنم:** گاڵتەیەکی شەونشینیە ف نوعی بازی شب‌نشینی.
**گەنم گەنمێن:** بازی گەنم گەنم ف نگا: گەنم گەنم.
**گەنموجۆ:** ١) موی ماش و برنج؛ ٢) ڕەشبەڵەك ف ١) موی جو گندمی؛ ٢) نوعی رقص گروهی.
**گەنمـوك:** ١) گوڵەپێغەمبەرە، شامی، گوڵەگەنم، زورات، سەرداری؛ ٢) گیادۆکڵبویکە ف ١) بلال؛ ٢) گیاهی است آشی.
**گەنمە:** گەندمە، بالوکە ف زگیل.
**گەنمەبرێشکە:** گەنمی لەسەر ساج بۆدراو ف گندم بوداده.
**گەنمەبەهارو:** تۆمەگەنمێکە لە بەهاردا دەچێنرێ، بەهارو ف گندم بهاره.
**گەنمەبەهارە:** گەنمەبەهارو ف گندم بهاره.
**گەنمەپێغەمبەرانە:** گەنموك ف بلال.
**گەنمەپێغەمبەرە:** گەنموك ف بلال.
**گەنمەحولە:** جۆرێ گەنمی دەنك درشتە ف نوعی گندم درشت.
**گەنمەزەردە:** جۆرێ نۆمی گەنم ف نوعی گندم.
**گەنمەشام:** گەنموك ف بلال.
**گەنمەشامی:** گەنموك ف بلال.
**گەنمەقەندەهاری:** جۆرێ گەنم ف نوعی گندم.
**گەنمەکوێستانی:** جۆرێ گەنم ف نوعی گندم.
**گەنمی:** گەنمڕەنگ ف گندمی رنگ.
**گەنو:** ١) برشاوی، کەرواوی؛ ٢) بۆگەن لە ترشاوی ف ١) کفك زده؛ ٢) ترشیده.
**گەنۆس:** جکۆس، ڕەزیل، ڕژد، بیسکە، سەقبل ف خسیس.
**گەنە:** ١) گەندە؛ ٢) کەوگی ف ١) نگا: گەندە؛ ٢) کنه.
**گەنـەدار:** ١) گیایەکی بالا بەرزی گەلابانە؛ ٢) داریکە بەنازەی زۆر جوانەو بەپیری خواروخێچە ف ١) گیاهی است؛ ٢) درختی است.
**گەنەك:** گیای گەرچەك ف گیاه کرچاك.
**گەنەکار:** گەندەکار ف نگا: گەندەکار.
**گەنەکەولە:** کەوگی درشت ف نوعی کنهٔ درشت.
**گەنـەگـولـە:** جۆرێ گەنە کە بە ماڵانەوە دەنوسێ ف نوعی کنه که به حیوانات می‌چسبد.
**گەنەگەنە:** دەرمانێکە لە تێکوڵی داریکی دەوەنی دەگیرێ دژی تاو لەرزە ف گنه‌گنه.
**گەنەلۆ:** گەندەلۆ ف گیاهی است سمّی.
**گەنەم:** گەنم، گەندم ف گندم.
**گەنەمە:** گیایەکە بەریکی هەیە دەیدەن بەگا ف گیاهی است که ثمرش را به گاو میدهند.
**گەنەی:** گیاگەرچەك، گەنەك ف گیاه کرچك.
**گەنی:** ١) بۆگەن؛ ٢) ڕزیو لە تەزابی‌دا؛ ٣) بۆگەن‌بو ف ١) بدبو؛ ٢) گندیده؛ ٣) گندبد.
**گەنیگ:** گەنی ف نگا: گەنی.
**گەنین:** ١) بۆگەن‌بون؛ ٢) ڕزین لە شەدا ف ١) بدبوشدن؛ ٢) گندیدن.
**گەنیو:** گەنی ف نگا: گەنی.
**گەو:** ١) ئالقـە؛ ٢) بەنـدی پەنجەو قامیش و...؛ ٣) گاو، تێلی لە شکاو بەستراو؛ ٤) گا؛ ٥) زنجی سەرنەپوشراو بۆ نازەل ف ١) حلقە؛ ٢) بند انگشت و نی و...؛ ٣) بش چینی شکسته؛ ٤) گاونر؛ ٥) محوطه محصور برای نگهداری دام.
**گەوا:** ١) گەفا، شایەت؛ ٢) قورمساغ، دەویت ف ١) گواه؛ ٢) قرمساق.
**گەواد:** دەویت ف قرمساق.
**گەوارا:** چاوپۆشی، بەخشین لەخەتا ف چشم‌پوشی.
**گەوارە:** پەڵەهەور ف لکه ابر.
**گەواشـە:** پۆش و جرۆی کە بەسـەر میچی دادەدەن، هەلاش ف سقف پوش از گیا و ترکه.
**گەواڵ:** ١) پەڵەهەور، گەڤالە؛ ٢) حەپۆل، کەم‌ناوەز ف ١) لکه ابر؛ ٢) هالو، نفهم.
**گەواڵ گەواڵ:** پەڵەپەڵەی هەوران ف لکه‌های متعدد ابر.
**گەواڵە:** پەڵەهەور، گەوارە ف لکه ابر.
**گەوان:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در

کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەواه:** گەوا، گەڤا، شایەت ف گواه.

**گەواهی:** شایەتی ف گواهی.

**گەوبەند:** گرێپشت ف ستون فقرات.

**گەوبەندە:** گەوبەند ف ستون فقرات.

**گەوج:** بێناوەز ف ابله.

**گەوجە:** عەلوکەی بەهارە ف گوجەسبز.

**گەوجەگەوج:** قسەی زۆر و بێنام ف وراجی، یاوەگویی.

**گەوجی:** بێناوەزی، دەبەنگی ف حماقت، ابلهی.

**گەوچن:** هەرچی بەئـالقـە چندرابێ: (عـەرەب گەوچن یان کردوتـە جەوشەن بە زری دەلێن) ف حلقەچین، بافت حلقەیی.

**گەوخان:** خنکان لەبەر تەنگەنەفەسی ف خفگی در اثرتنگی نفس.

**گەوخاندن:** بە تەنگەنەفەسی تووش بوون ف ابتلا بە تنگی نفس.

**گەوده:** ۱) گەدە: ۲) لەشی مرۆ ف ۱) نگا: گەدە؛ ۲) جسم آدمی.

**گەور:** ۱) سپی ناماڵ زەرد؛ ۲) رەنگی کەوە؛ ۳) ئاورپەرست؛ ۴) ئەسمەر، گەنم رەنگ؛ ۵) زل، مەزن؛ ۶) زەردی خورمایی؛ ۷) هۆزێکی کوردە ف ۱) سفید مایل بە زردی؛ ۲) توسی؛ ۳) گبر، زرتشتی؛ ۴) گندمگون؛ ۵) بزرگ؛ ۶) خرمایی رنگ؛ ۷) نام عشیره‌ای است کردزبان.

**گەوڕ:** تەوێلە، پشتێر ف اصطبل.

**گەوران:** ۱) دەشتێکـە لە کوردستـان لای دیاربـەکر.ئەوێنی هەیە؛ ۲) هۆزێکـە.مامۆستا عەلی سەیدو لەوانە؛ ۳) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) منـطقـە‌ای نفتخیز در کردستـان؛ ۲) نام طایفـه‌ای است کُردزبان؛ ۳) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەوراندن:** سپی کردنەوە ف سفیدکاری.

**گەوڕز:** گیایەکی بەلك پان و بەری بە قۆزاخەیە ف گیاهی است.

**گەورك:** ۱) جۆرێ بەزی دوگەفولە؛ ۲) ناوی عەشیرەتێکی کوردە ف ۱) نوعی گوسفند؛ ۲) نام عشیره‌ای است.

**گەوڕك:** ۱) گیایەکـە وشتـری پێ قەلـەو دەبێ؛ ۲) جۆرێ هەرمێ؛ ۳) بۆری ناماڵ سپی؛ ۴) موی سەرهەڵوەرین ف ۱) گیاهی است؛ ۲) نوعی گُلابی؛ ۳) خاکستری روشن؛ ۴) ریزش موی سر.

**گەورکـان:** ئەو ناوچـەی عەشیرەتی گەورکی لێ دەژین ف منـطقـهٔ عشیرهٔ «گەورك».

**گەورکایەتی:** گەورکان ف نگا: گەورکان.

**گەورگە:** تەپڵی زەلام ف طبل بزرگ.

**گەورۆ:** ۱) پیاوی سپی پێست؛ ۲) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) مرد سفیدپوست؛ ۲) نام مردانه.

**گەورۆك:** کیژی گەنم رەنگ ف دختر گندمگون.

**گەورونە:** کاورای زل ف آن بزرگە.

**گەورە:** ۱)زل، زەلام؛ ۲) پایەبەرز؛ ۳) سەرۆك، رەئیس؛ ۴) پیر، بەتەمەن؛ ۵) موخـورمایی؛ ۶) موبۆر ف ۱) کلان؛ ۲) بزرگوار؛ ۳) سردار؛ ۴) سالخورده؛ ۵) موخرمایی؛ ۶) موخاکستری.

**گەورەبـوون:** ۱) بالاکـردن؛ ۲) زاروکـی بەجێهێشتن؛ ۳) پلەو پایە بەرەژوورچوون ف ۱) نموکردن؛ ۲) از بچگی گذشتن؛ ۳) بلندپایە شدن.

**گەورەچۆڵ:** فەرتاڵەی دەسکداری ناسك ف سبد دستەدار نازك.

**گەورەدێ:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گەورەك:** ۱) موزەردی ناماڵ سوور؛ ۲) بۆری بەرەنگی بەزۆر ف ۱) موزرد مایل بە سرخ؛ ۲) خاکستری.

**گەورەکـچ:** ۱) کیژێ کە دەمی شوکـردنی هاتوە؛ ۲) قەبرەکچ ف ۱) دختر بالغ؛ ۲) دختر ترشیده.

**گەورەم:** ۱) سەرۆکی من، ئاغـام؛ ۲) من پیرم؛ ۳) زەلامم ف ۱) آقای من؛ ۲) من پیرم؛ ۳) من بزرگم.

**گەورەمار:** ماری زل ف افعی.

**گەورەماڵ:** خانەدان ف خانوادهٔ بزرگ.

**گەورەی ماڵ:** سەرۆکی خێزان ف سردار خانواده.

**گەورەیی:** ۱) سەرداری، سەرۆکـی؛ ۲) زەلامـی؛ ۳) بارسـت: (بــە گەورەیی ئەم بەردە) ف ۱) سرداری؛ ۲) بزرگی؛ ۳) حجم.

**گەوری:** ۱) گەروو، فورگ؛ ۲) سپێنەی هێلکە ف ۱) گلو؛ ۲) سپیدهٔ تخم مرغ.

**گەوری:** ۱) ژنی سپی پێست؛ ۲) ناوە بۆ ژنان ف ۱) زن سپیدپوست؛ ۲) نام زنانە.

**گەوریك:** نەخۆشیەکی فورگە ف ازبیماریهای حنجره و گلو.

**گەوریلە:** مەلێکە، جۆرێ فرنەیە، باڵدارێکە ف پرنده‌ای است.

**گەوریە:** گەورگە، تەپڵی زەلام ف طبل بزرگ.

**گەوز:** ۱) گەڤز، دروێنەی پڕی داسێك؛ ۲) گاز بە ددان، قەپ، گەز؛ ۳) پڕچـەشـامـەت: (جـڤـات گەوزە)؛ ۴) شاد، دڵخـۆش؛ ۵) روخسارەچرچاو؛ ۶) گەش وشلك ف ۱) نگا: گەفز؛ ۲) گاز دندان؛ ۳) شلوغ؛ ۴) شاد؛ ۵) رُخسار چروکیده؛ ۶) شاداب.

**گەوزان:** گەڤزان ف نگا: گەڤزان.

**گەوزاندن:** گەڤزاندن ف نگا: گەڤزاندن.

**گەوزدان:** تل خواردن لەسەر ئەنشت ف بر پهلو غلتیدن.

**گەوزکەوتا:** رەنـگ پەڕیـو، پەژمەریـو، سیس وژاکاو ف رنگ پر بـده و پژمرده.

**گەوزکەوتە:** گەوزکەوتا ف رنگ پر بده وپژمرده.

**گەوزلێدان:** پڕ بە داس درونەوە ف پرداس دروبدن.

**گەوزین:** گەوزان، گەڤزان ف نگا: گەڤزان.

**گەوش:** ۱) سست؛ ۲) ڕژدوجنـۆك؛ ۳) نرسـەنـۆگ؛ ۴) گەش ف ۱) سُست؛ ۲) خسیس؛ ۳) نرسو؛ ۴) شاداب.

**گەوشت:** ۱) هەوایەکی گۆرانی یە؛ ۲) نایەبنی ف ۱) آهنگی است؛ ۲) خصوصی.

**گەوشـەك:** ۱) سەرلـێ‌شێواو، سەرگەردان؛ ۲) سسـت و شل ف ۱)

سرگردان؛ ٢) سُست.

**گەوشین:** تایبەتی [ف] ویژگی، خصوصیّت.

**گەوشینی:** بەتایبەتی [ف] به ویژه، مخصوصاً.

**گەوك:** ١) چرۆی تازە بشکوتو؛ ٢) شلْخەمیش [ف] ١) جوانۀ تازه شکفته؛ ٢) نسل نو بن زنبور عسل.

**گەوکەر:** گاوکەر، کەسێ کە چینبەشکاو بینە دەکا [ف] بشزن، چینی بندزن.

**گەولا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەولاز:** بڕواننە گەڵوازە [ف] نگا: گەڵوازە.

**گەولە:** جۆرێ جۆی هەشتڕیزە کە لە بەراو دەبچێنن: (**گەولەجۆ**) [ف] نوعی جو.

**گەون:** گوێنی [ف] گَوَن.

**گەونێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەوە:** ١) نیوەچەغز؛ ٢) قەداوقەدی کێو، بڕوار؛ ٣) بڵندی و نزمی لە زەمیندا [ف] ١) نیم دایره؛ ٢) کمرۀ کوه؛ ٣) بلندی و پستی در دشت.

**گەوەر:** ١) بەردی زۆر بەنرخ؛ ٢) ناوە بۆ ژنان؛ ٣) دەشتی پان و بەرین [ف] ١) گُهر، سنگ قیمتی؛ ٢) نام زنانه؛ ٣) صحرای وسیع.

**گەوەڕ:** ١) بشنێر، تەویلە، گەوڕ؛ ٢) شکێر، کەلێنەشاخ [ف] ١) اصطبل؛ ٢) شکاف کوه.

**گەوەزن:** گاکێوی، کەڵەکێوی [ف] گوزن.

**گەوەزە:** ١) زەبەلاح؛ ٢) لەخۆبایی [ف] ١) لندهور؛ ٢) مُتکبّر.

**گەوەك:** زەمینی بڕ لە بەرزایی و نزمی، گەوە [ف] زمین پراز بلندی و پستی.

**گەوەل:** لیکاوی دەم، تف [ف] لعاب دهن.

**گەوەن:** گەون، گوێنی [ف] گَوَن.

**گەوەند:** گەفەندە، سەرسەری، بێشەرم و شەلانی [ف] لات و لاأُبالی.

**گەوهەر:** گەوەر [ف] نگا: گەوەر.

**گەوهەرناس:** ١) کەسێ لە نرخی گەوهەر دەزانێ؛ ٢) بریتی لە بنیادەمی زۆر زاناو دانا [ف] ١) گوهرشناس؛ ٢) کنایه از دانشمند.

**گەهـ:** ١) گە، بەندی قامك و قامبش؛ ٢) جومگە؛ ٣) جار، دەم؛ ٤) نۆرە، نۆگە؛ ٥) گە، بێجەقاندن؛ ٦) جێگە؛ ٧) کونەبەراز [ف] ١) بندنی و انگشت؛ ٢) مچ؛ ٣) گاه؛ ٤) نوبت؛ ٥) امتناع از رفتن؛ ٦) جای؛ ٧) سوراخ گُراز.

**گەهان:** ١) بێگەبشتن: (مبوە گەهایە)، رەسین؛ ٢) ناردراو گەیشتن بە دەست کەسێ کە بۆی هانوە [ف] ١) رسیدن میوه؛ ٢) رسیدن پیك.

**گەهاندن:** ١) ناردراو بە خاوەن بوُن؛ ٢) رەسیەکردنی میوە و دەغڵ و... [ف] ١) رسانیدن فرستاده؛ ٢) رسانیدن میوه و...

**گەهراندن:** ١) نۆرانن، قەهر بێدان؛ ٢) نازاردان [ف] ١) قهردادن؛ ٢) آزُردن.

**گەهریك:** کارژیلە [ف] بزغالۀ نوزاد.

**گەهگر:** گەگر، بێجەقێن [ف] امتناع کننده از رفتن.

**گەهە:** گەی قامکان، بەندی تبل [ف] بند انگشت.

**گەهەك:** رەبەت، سیبە [ف] کمین شکارچی.

**گەهیشتن:** رەسین [ف] رسیدن.

**گەهیشتی:** رەسیو [ف] رسیده.

**گەهین:** گەهیشتن [ف] رسیدن.

**گەی:** ١) گە، بێجەقاندن؛ ٢) نوری لە زماندا، قسەبوُنەهانن [ف] ١) اعتصاب از رفتن؛ ٢) لکنت زبان.

**گەیا:** شینایی کە لە زەمین دەڕوێ، شینکە، گیا [ف] گیاه.

**گەیاندن:** گەهاندن [ف] رسانیدن.

**گەیشتن:** گەهیشتن [ف] رسیدن.

**گەیشتوُ:** گەهیشتی [ف] رسیده.

**گەیشتی:** گەهیشتی [ف] رسیده.

**گەیگ:** گەهیشتی [ف] رسیده.

**گەیگر:** گەگر [ف] امتناع کننده از رفتن.

**گەیگە:** گەهەك، رەبەت، سیبە [ف] کمین شکارچی.

**گەیگیر:** گەگر [ف] نگا: گەگر.

**گەیێن:** گەیشتن [ف] رسیدن.

**گەینەوە:** ١) گەیشتنە ئەو شوێنەی کە لێوە ڕۆیشتوُن؛ ٢) گەیشتنە کەسێ کە لە ڕێدا پێش کەوتوە؛ ٣) سەر بەیەکەوەنانی لارەوەکراو [ف] ١) وارسیدن؛ ٢) رسیدن به پیشتاز؛ ٣) به هم رسیدن هردوسر جسم خم شده.

**گەینـــەوەیەك:** ١) هەردو سەری چەمێنراو نیکەڵبوُن؛ ٢) بەیەکتر گەینەوە پاش لێك دوُرکەوتنەوە [ف] ١) به هم رسیدن هردو سر جبزی؛ ٢) وصال دوباره پس از مدتها دوری.

**گەیوُ:** ١) گەهیشتی؛ ٢) دومەڵی نەرم بوُگ [ف] ١) رسیده؛ ٢) دُمَل نرم شده.

**گەیەنـەی ڕەش:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**گی:** گوُ، پیسایی بنیادەم [ف] مدفوع.

**گێ:** ١) گوێ؛ ٢) گ، گش، نیگرا؛ ٣) پاشگری بەوانا: گابەر: (شێتی عاقل گێ) [ف] ١) گوش؛ ٢) همه؛ ٣) پسوند به معنی کنندۀ جماع.

**گیئاسارە:** گوڵەسنێرە، نەسنێرۆك، گوەستێرە [ف] کرم شبچراغ.

**گیا:** گەیا [ف] گیاه.

**گیائادەمە:** گیایەکە بنکەکەی لە بیچمی بنیادەمە بۆ دەرمان دەشێ [ف] مردم گیاه، استرنگ.

**گیابڕ:** کرمێکە لە گیا دەنیشێ و ئەگەر ئاژەڵ بیخوا بێ دەمرێ [ف] کرمی است سمّی که برگیاه نشیند و دام را مسموم کند.

**گیابڕبوُن:** بە گیابڕ مردنی ئاژەڵ [ف] مرگ حیوان به وسیلۀ «گیابر».

**گیابـڕنـك:** کەسێ کە گیای دەرمـان کۆدەکـانەوە [ف] کسی که گیاهان داروبی را جمع آوری می کند.

**گیابرین:** گیایەکە بۆ دەرمانی برین دەشێ [ف] گیاهی است داروی زخم.

**گیابۆگەنە:** گەنکەزەردە [ف] گیاهی است بدبو.

**گیابۆگەنیوە:** گیابۆگەنە ف نگا: گیابۆگەنە.

**گیابەرانە:** گیایەکی بنەوی باڵابەرزە لە چیغ‌هۆنینەدا بەکار دێت ف گیاهی است قدبلند که در ساختن چیغ از آن استفاده می‌کنند.

**گیابەرك:** گیایەکی لاسك‌کلۆری بەرزە. گوڵی زەردو بۆن خۆشە ف گیاه درمنه.

**گیابەن:** گیایەکی زۆر بۆن‌خۆشە ف گیاهی است خوشبوی.

**گیابەند:** گیابەن ف نگا: گیابەن.

**گیابەنیشت:** ١) گیاچەقە؛ ٢) شیرەی بنی شنگ ف ١) گیاه قندرون؛ ٢) شیرهٔ گیاهی است.

**گیاپرچ:** گیایەکی بەپنجی زۆر گەڵاباریکی لبك‌هاڵاوە ف گیاهی است.

**گیاترکە:** گیادوژلبویکە ف گیاهی است آشی.

**گیاجار:** جێگەیە کە زۆری گیا لێ ڕواوە ف مرغزار.

**گیاچا:** گیایەکە بۆی دەدەن و لە جیاتی چا دەمی دەکەن ف گیاهی است به جای چای استعمال می‌شود.

**گیاچنارە:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ و بر بن دەبرژێنینەوە ف گیاهی است دارویی.

**گیاچەقە:** گیایەکە شیرەی وەك بنێشت دەجوێن ف گیاه قندرون.

**گیاخۆر:** جانەوەری بێچەوانەی گۆشت‌خۆر ف جانور گیاهخوار.

**گیاخوێن:** گیایەکە شیرەکەی سوورە. *ماڵانی بێ زۆر فەلەودەبێ* ف گیاهی است با شیرهٔ سرخ.

**گیاداروك:** گیایەکە گوڵی زەردەو نامی تاڵە. بۆ دەرمان بەکاردێ و میز ڕەوان دەکا ف گیاهی است دارویی.

**گیادانو:** گیایەکە لە تیرەی جانرەکێوبلە ف گیاهی است از تیرهٔ نعناعی‌ها.

**گیادانە:** گیایەکە گوڵی شین دەکاو زۆر لەوەڕێ چاکە، مێژوردا ف گیاهی است با گلهای آبی.

**گیادوپشك:** گیایەکە بۆ دەرمانی دوپشك‌پێوەدان ف گیاهی است داروی عقرب گزیدگی.

**گیارەش:** جەنگەی بەهارو گیای زۆر ف عنفوان بهار.

**گیارەنج:** بەڵای قۆزاخەپەمۆ ف آفت غوزه.

**گیارەنگ:** گیایەکە ڕەنگی زەردی کاڵی لێ پەیدا دەکەن ف گیاهی که رنگ کاهی از آن گیرند.

**گیازبش:** گیایەکە ف گیاهی است.

**گیازبشالوك:** گیایەکی دەشتی و لەتیرەگیای لەوەڕە ف گیاهی است علفی.

**گیاریفك:** گەسك، گزگە، گیزك ف جارو.

**گیاریڤینگ:** گیایەکە لەتیرەی وەنەوشە ف نوعی بنفشه.

**گیاز:** ١) جیازی بووك؛ ٢) کورتانی حوشتر ف ١) جهاز عروس؛ ٢) جهاز شتر.

**گیازاڤا:** گیایەکە ف گیاهی است.

**گیازراڤك:** گیای مێرگان ف گیاهی است.

**گیازەنگلۆك:** گیایەکە بەرەکەی لەزەنگوڵەی بچووك دەکا ف گیاهی است ثمرش شبیه زنگوله.

**گیاسارمە:** گیایەکە بۆ دەقاقی چیت دەبێ ف گیاه سلمه.

**گیاسالمە:** گیاسارمە ف گیاه سلمه.

**گیاسپی:** گیایەکە بۆ دەرمانی بر بن دەبێ ف گیاهی است داروی زخم.

**گیاسەدر:** گیایەکی کوڵکنی دەشنەکی‌یە ف گیاهی است.

**گیاشلە:** گیایەکی وردیلەیەبەزەویەوە نوساوە بەردەس ناکەوێ ف گیاهی است که بر روی زمین می‌خوابد.

**گیاقاپوشك:** گیایەکە نێرنکی لە شەیتانۆکەی زیندو دەکا ف گیاهی است ثمرش شبیه حلزون.

**گیاکتك:** گیایەکە پشیلەزۆر حەز لە بۆنەکەی دەکا ف علف گربه، سنبل الطیب.

**گیاکرموك:** گیایەکی دەشتیە ف از گیاهان علفی است.

**گیاکندر:** گیایەکە لە برزەکەی کندر دروس دەکەن ف کنب، کنف.

**گیاکوریشك:** گیایەکی پڕو بەرزەباڵای خوارە ف گیاهی است.

**گیاکوڵکنە:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاهی است دارویی.

**گیاکەتان:** گیایەکی باڵابەرزە ف گیاه کتان.

**گیاکەتك:** گیاکتك ف علف گربه.

**گیاکەفە:** ئەسپوون ف اشنان، چوبك.

**گیاکەلە:** کەڵە، کیرکەلە ف انگل بلای تونون و بالنز.

**گیاکەن:** ١) کەسێ کە گیا لە زەوی دەکەنێ؛ ٢) پیشکان ف ١) گیاه‌کن؛ ٢) ابزار گیاه کندن.

**گیاکەنان:** سەروبەندی گیاکەندن، بڕانەوەی بەهارو سەرەتای هاوین ف موسم گیاه کندن.

**گیاکەوڵە:** گیایەکە بەرلە هەموگیا دەڕوێ و بەرلە هەموان زەرد دەبێ ف گیاهی است که قبل از تمام گیاهان سبز می‌شود و قبل از همه هم زرد می‌شود.

**گیاگرنجك:** گیایەکە دەرمانی زك‌ویشنان و برینە ف گیاه هفت‌بند.

**گیاگەزوك:** گەزگەزك ف گیاه گزنه.

**گیاگەسك:** گیایەکی بەرزەباڵایەو نوویکی وەك هەرزن دەگرێ. *جگە لە گەسکەشاربە* ف گیاه جارو.

**گیاگێزك:** گیاگەسك ف گیاه جارو.

**گیاگێسك:** گیایەکی گوڵزەردی زۆر ناڵە ف گیاهی است.

**گیاگێلە:** گیاشلە ف نگا: گیاشله.

**گیالاڤا:** بەرەزا ف گیاهی است.

**گیالاوە:** بەرەزا ف گیاهی است.

**گیامار:** گیایەکە دەرمانی ماران گەسنە ف گیاهی است پادزهر نیش مار.

**گیامسك:** گیایەکی زۆر بۆن‌خۆشە ف گیاهی است خوشبوی.

**گیامێش:** ١) بێژان؛ ٢) گوڵی داودی ف ١) گیاهی است صحرایی؛ ٢) گل داوودی.

**گیامێشوڵە:** گیایەکە وەك سێسو بۆ باقەبێن دەبێ ف گیاهی است برای بسته‌بندی علوفه به کار می‌رود.

**گیان:** ١) ڕوح، جان؛ ٢) بەدەن: (هەمو گیانم ژان دەکا)؛ ٣) جوابە بۆ

زۆر خۆشەویست: (گیان چیت وت؟)؛ ٤) خوایشت: (گیان دەوەرە) ف ١) جان؛ ٢) کالبد؛ ٣) جواب محبت‌آمیز، جانم؛ ٤) خواهش.

**گیان‌ئەسپاردن:** روح دەرچوون ف جان سپردن.

**گیاندار:** زیندو ف زنده.

**گیان‌بەخش:** گۆری، خۆبەقوربان‌کەر ف جانباز در راه عقیده.

**گیان‌بەدەستەوەدان:** ١) روح‌دەرچوون؛ ٢) برینی لە سازان و گونجان: (گیان بەدەستەوە نادا، گیانی دا بە دەستەوە) ف ١) جان سپردن؛ ٢) کنایه از سازش در معامله.

**گیان‌بەر:** ١) پێغەمبەری خودا؛ ٢) برێتی لە نازا لە جەنگ ف ١) عزرائیل؛ ٢) کنایه از شجاع.

**گیاندان:** روح دەرچوون ف جان سپردن.

**گیان‌دەبەر:** زیندو ف زنده.

**گیان‌سپاردن:** روح دەرچوون ف جان سپردن.

**گیان‌سوز:** بەسام، بەهەیبەت ف هولناک.

**گیان‌سەخت:** ١) سەرسەخت، نەسازاو؛ ٢) زیندوێ کە لە روح‌دەرچووندا درەنگ دەکا: (دەزانی بۆ لە دووری تۆ نەمردم/ کە من سەگمەرگم و گیان‌سەختو دلـرەق) «شێخ‌رەزا» ف ١) دیرساز در معامله؛ ٢) دیرمیر، جان سخت.

**گیان‌کەندن:** ١) روح‌کێشان؛ ٢) روح دەرچوون ف ١) میرانیدن؛ ٢) مردن.

**گیان‌کەنشت:** دەمی روح‌دەرچوون ف هنگام نزع.

**گیان‌کەنن:** گیان‌کەندن ف نگا: گیان‌کەندن.

**گیان‌کەنکە:** ئیزرائیل، پێغەمبەر، فریشتەی گیان‌کێشان ف عزرائیل.

**گیانکی:** کارێ کە شێخ و مەلا دەیکەن ف روحانیت.

**گیان‌کێش:** پێغەمبەر ف عزرائیل.

**گیان‌کێشان:** گیان‌دان ف جان دادن.

**گیان‌لەبەر:** زیندو، گیان‌دەبەر ف زنده.

**گیانە:** ئەی خۆشەویستم ف جانا.

**گیانەسەر:** جاڕز، نارەحەت ف بکر، ناراحت.

**گیانە‌گوینە:** دوامین پشو ف آخرین رمق.

**گیانەلا:** دەمی ناوبلکەدان، دەمەدەمی روح‌دەرچوون ف حالت نزع.

**گیانەلاو:** گیانەلا ف حالت نزع.

**گیانەمەژگ:** مێشکێ کە لەناو ئێسکی ئەندامانی لەش دایە ف مغز استخوان.

**گیانەوەر:** زیندو، جانەوەر ف جانور.

**گیانی:** پەسنی‌دۆستی زۆر خۆشەویست ف دوست بسیار عزیز، جانی.

**گیانی:** گیانە، وشەی دواندنی زۆر خۆشەویست ف جانا.

**گیانی گیانان:** ١) برێتی لە خودا؛ ٢) برێتی لە گراوی ف ١) کنایه از خدا؛ ٢) کنایه از معشوق.

**گیانی‌گیانی:** گیانی: (دۆستی گیانی گیانی) ف دوست جانی.

**گیاوەردینە:** گیایەکە بۆ دەرمانی چاوێشە دەبێ ف گیاهی است داروی چشم درد.

**گیاهۆنک:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاهی است دارویی.

**گیایی:** ١) بەرەنگی گیا؛ ٢) کەسێ کە جگەلە گیا ناخوا ف ١) به رنگ گیاه؛ ٢) گیاهخوار، آدم گیاهی.

**گیپ:** گۆپ ف لپ.

**گیپا:** کیپار ف سیرابی آکنده از قیمه و برنج، نگا: کیپار.

**گیپار:** کیپار، گیپا ف نگا: کیپار.

**گیپال:** عوڕ، زگی سەر زبخۆلەدان ف شکم بالای شکمبه.

**گیپن:** ١) گۆپن؛ ٢) کورنەبالای فەلەو ف ١) لُپ برآمده؛ ٢) کوتاه‌قد چاق.

**گیپنە:** گیپن ف نگا: گیپن.

**گیپە:** گیپا ف نگا: کیپار.

**گیپەز:** ١) نەسنوورابی نەسنوو؛ ٢) کۆنەرە ف ١) کلفتی گردن؛ ٢) قطر.

**گیپەزە:** گیپەز ف نگا: گیپەز.

**گیت:** باو بۆران، توف ف دمه وطوفان.

**گێت:** گوێچکەت، گوێی تۆ ف گوش تو.

**گیتال:** ئیتۆل، بزگوز ف لته‌پاره فرسوده.

**گیتر:** ١) شەل بە هەردولادا؛ ٢) لەنەر، بەلەک؛ ٣) ئێسکی بەلەک ف ١) لنگ از هر دوپا؛ ٢) ساق؛ ٣) استخوان ساق.

**گیتک:** گیتر ف نگا: گیتر.

**گێتکە:** کێنکە، کولێرەی هەرزن ف گردهٔ ارزن.

**گیتە:** ناڵودار، دارێ کە بەسەر کاربەندا زادە کێشرێ ف الوارهای سقف.

**گێتـــە:** ١) گێتکــە؛ ٢) بەرگ‌شڕ، رووت و نەدار ف ١) گرده نان ارزن؛ ٢) ژنده‌پوش و بینوا.

**گیتەلە:** ئەشقەڵە ف شلتاق.

**گێتی:** کوللێرە ف گردهٔ نان.

**گێتی:** دنیا، جیهان ف گیتی.

**گیج:** ١) کەسێ کە ولات لەبەر چاوی خول دەخوا؛ ٢) سەرسوڕماو؛ ٣) گەج ف ١) گیج؛ ٢) متحیّر؛ ٣) گچ.

**گێج:** گیج ف نگا: گیج.

**گێجاو:** گەرداو ف گرداب.

**گێژخواردن:** ١) سەرگێژبوون؛ ٢) سوڕانی باو ناو بە دەوری خۆیاندا ف ١) گیج شدن؛ ٢) چرخش باد و آب.

**گێژدان:** سووڕاندن ف چرخاندن.

**گێجەبا:** گەردەلوول، باهۆز ف گردباد.

**گێجەگێج:** دنیا لەبەرچاوسووڕان ف سرگیجه.

**گێجەلوکە:** باهۆز، گەردەلوول، گێجەبا ف گردباد.

**گێجەنە:** گریژەنە، بازنەدەرگا ف پاشنهٔ در.

**گێجی:** ١) سەرسووڕان؛ ٢) نەخۆشیەکە ف ١) گیجی؛ ٢) بیماری سرگیجه.

**گیچ:** گوێژ، بلچ، گفیشک ف زالزالک.

**گێچ:** گەچ ف گچ.

**گێچکار:** گەچکار ف گچکار.

**گێچکاری**: گەچکاری ف گچکاری.

**گێچکە**: ۱) گوێچکـە، گوێ؛ ۲) گنـج خواردن ف ۱) گـوش؛ ۲) نگا: گنج خواردن.

**گێچەڵ**: گەڕ، دەبە، شڵتاغ، تەشقەلە ف شلتاق.

**گێچەڵی**: کەلوی خوری ف آغندهٔ پشم.

**گێچینـە**: گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گیدۆ**: باهۆز، گێجەلۆکە ف گردباد.

**گێدوک**: ۱) گەوە؛ ۲) رێ بەگەوەی کێفدا ف ۱) کمر کوه؛ ۲) مسیر در کمر کوه.

**گیر**: ۱) بەرهـەڵـست؛ ۲) خۆراکێ کە بە سانـایی قوت ناچێ؛ ۳) رژد، چکۆس؛ ۴) بەنی حەیوان بەستنەوە؛ ۵) پاشگری بەوانا: گر. شتێ کە دەگرێ ف ۱) مانع؛ ۲) خوراك گلوگیر؛ ۳) خـسیس؛ ۴) رسن دام بند؛ ۵) پسوند فاعلی به معنی گیرنده.

**گیڕ**: ۱) چیر، بەقەوەت؛ ۲) بەکێش؛ ۳) زۆرویژ؛ ۴) رەق لە سـەودادا؛ ۵) فاڵ، خیرە؛ ۶) ملە، کەل؛ ۷) شیوەڵەی نێوان دوکێف؛ ۸) بەردەلان ف ۱) نیرومنـد؛ ۲) کنـدار؛ ۳) وراج؛ ۴) سرسخت در معامله؛ ۵) فال فالبین؛ ۶) گردنه؛ ۷) درّه؛ ۸) سنگلاخ.

**گێر**: ۱) بست؛ ۲) کونی بەرداش؛ ۳) تەڵەوی پان و پوز؛ ۴) حەپەساو؛ ۵) ئەوی لە جێ چەقیوە و توانـای بزوتنـەوەی نەمـاوە ف ۱) وجب؛ ۲) سوراخ سنـگ آسـیا؛ ۳) چاق و پهن؛ ۴) حیرت‌زده؛ ۵) کسی که برجای خود میخکوب شده و توان حرکت ندارد.

**گێڕ**: ۱) خوار و خێچ؛ ۲) گیڕ؛ ۳) سمت لەجێ‌جوگ؛ ۴) سوڕێن: (ناوی ناشگێڕ)؛ ۵) دروسکەرو سازدەر: (بەزمگێڕ، کارگێڕ، شۆڕشگێڕ)؛ ۶) خلۆر ف ۱) کج و ناهمـوار؛ ۲) نگا: گیڕ؛ ۳) لگن از جا دررفته؛ ۴) جرخاننده؛ ۵) گرداننده وسازنده؛ ۶) غلتان از بالا.

**گیرا**: ۱) قبوڵ‌بوونی دوعا: (دوعای گیرا بوە)؛ ۲) رابردوی گرتن، گرا ف ۱) اسنجابت دعا؛ ۲) گرفته‌شد.

**گێراز**: بەلالۆکەکێو بلە ف آلبالوی کوهی.

**گێراڤ**: لاسا، دەمەلاسکە،لاسایی ف تقلید.

**گیرام**: ۱) وام دانا، گرتم؛ ۲) دەگیر کەوتم ف ۱) فرض کردم، گیرم؛ ۲) گرفتار شدم.

**گیران**: ۱) گرفتاربوون؛ ۲) بەسنرانی رێگەی شتی نراو؛ ۳) گری کرن؛ ۴) رەش‌داگەڕانی مانگ‌وڕۆژ؛ ۵) نەخۆشی گرفت ف ۱) گرفتارشدن؛ ۲) گیرکـردن، بنـدآمـدن؛ ۳) گر بستن؛ ۴) خسـوف و کسـوف؛ ۵) بیماری اِمتلا.

**گێڕان**: ۱) گەڕانـدن، گەردش پێ‌کردن؛ ۲) کارپـێ‌کردن و بەسـەر راگەیشتن؛ ۳) سەربـان بە باگردان شێلان؛ ۴) بەستاوتنی بەرگن بۆ رابەخ و بەسنەك؛ ۵) خلۆرکردنەوە، شانلۆرە؛ ۶) وەپاش خستن ف ۱) به گردش بردن؛ ۲) به‌کار انداختن؛ ۳) غلتك زدن بام؛ ۴) پامال کردن نمد؛ ۵) غلتاندن؛ ۶) به تأخیر انداختن.

**گیراندن**: گریاندن ف به گر به انداختن.

**گێڕاندن**: ۱) گەڕاندن؛ ۲) کارپێ‌کردن ف ۱) گردش دادن؛ ۲) به‌کار انداختن.

**گێڕانـدنـەوە**: ۱) گەڕانـدنـەوە؛ ۲) باس کردنی فسـەی گونـراو؛ ۳) حیکایەت‌گوتن ف ۱) بازکرداندن؛ ۲) بازگو کردن؛ ۳) داستان گفتن.

**گێڕانن**: گێڕاندن ف نگا: گێڕاندن.

**گێڕاننەوە**: گێڕاندنەوە ف نگا: گێڕاندنەوە.

**گێڕانەوە**: گێڕاندنەوە ف نگا: گێڕاندنەوە.

**گیرانی**: شەیتانیێ کەنبو، بالغ‌بوگ ف بالغ شده، به سن رُشد رسیده.

**گیرانی بون**: شەبنانی‌بوون، بالغ‌بوون ف بالغ شدن، به سن رُشد رسیدن.

**گیراو**: ۱) گراو، گرفـتـار؛ ۲) رێگـە بـەسـنـراو؛ ۳) مانـگ و رۆژی رەش‌هەڵگەڕاو؛ ۴) بەکسی نازە فێرەبارو زین‌کراو ف ۱) گرفتار؛ ۲) راه سدّ شده؛ ۳) آفتاب و ماه گرفته؛ ۴) ستور نازه رام شده برای بار و زین.

**گیراوردە**: پەیداکراو ف پیداشده.

**گیراوە**: ۱) نیکەڵ‌کراوی جەند شتێ؛ ۲) خاك و ئاوی کراو بە فوڕ ف ۱) درهم آمیخته برای دوا؛ ۲) گل سرشته.

**گێڕایش**: ۱) گەڕیدەیی؛ ۲) لەشـوێن گەڕان بۆ پەیداکـردن ف ۱) جهانگردی؛ ۲) جستجو.

**گیربون**: ۱) وێستان بەشتێکەوە؛ ۲) نەڕۆیشتن و مانەوە لە شوێنێ ف ۱) گیر کردن به چیزی؛ ۲) ماندگار شدن در جایی.

**گێڕبـون**: ۱) خوارو ناقـولابـوون؛ ۲) تێسکی ران ترازان ف ۱) کج و ناهموار شدن؛ ۲) استخوان ران دررفتن.

**گیرچ**: بلچ، گوێز، گفشك، گوهینك ف زالزالك.

**گیرخستن**: ۱) گرتن؛ ۲) دەست‌خستن ف ۱) گیرانداختن؛ ۲) پیدا کردن.

**گیرخواردن**: گرفتاربوون ف گیرافتادن.

**گیردان**: راگرتن و لە رۆیشتن گێڕانەوە ف معطّل کردن و از کار مانع شدن.

**گێڕزان**: فالگرەوە ف فالبین.

**گیرسان**: گرسان ف نگا: گرسان.

**گیرسانەوە**: بەندبوون لە شوێنێ ف بند شدن به جایی.

**گیرستن**: گریین، گری کرن ف گریستن.

**گیرسك**: کرۆسك ف گلابی وحشی.

**گیرفان**: بەربك، بەرك، جیو ف جیب.

**گیرڤان**: کەسێ کە گاو گوڵ لە خەرمان کوناندا لێ دەخوڕێ ف منصدّی خرمن کوبی.

**گێرك**: ۱) مێروەزەردەی ورد؛ ۲) مروجە، مێرولە ف ۱) مورجهٔ زرد ریز؛ ۲) مورچه.

**گێڕك**: گێژاو ف گرداب.

**گیرکـردن**: ۱) گیردان، وێستـانـدن لە رۆین؛ ۲) شتێ بە شتێکەوە قایم‌کردن: (دەستی لێ گیرکرد) ف ۱) گیردادن؛ ۲) چیزی را محکم به چیز دیگر بستن.

**گێرکه:** گێرك [ف] مورچهٔ زرد ریز.

**گیرکەوتن:** دەس کەوتن [ف] به دست آمدن.

**گیرگـه:** ۱) ددانی پێشبن: (**گیرگەی** نەماوە پیر بوە)؛ ۲) جێگەیێ کە شتی لێ گیر بێت: ۳) ئامرازی خوارکردنەوەی دار بۆ کۆچان و کەمە [ف] ۱) ناب، دنـدان پیشین: ۲) جای گیرکردن چیزی: ۳) ابزار خم کردن چوب.

**گیێم:** شوروا، شۆربە [ف] شوربا.

**گیرما:** گەرما، دژی سەرما [ف] گرما.

**گێرمه کیش:** کێشە کێش [ف] کشاکش.

**گێرمی:** شێوی دانۆلە [ف] آش گندم.

**گیرنـەدەر:** کەسێ کە ناتـوانێ تڕ و تس ڕاگرێ [ف] کسی که نتواند باد شکم را حبس کند.

**گیرۆ:** پەتا، نەخۆشیەك کە خەڵك دەگرنەوە [ف] بیماری واگیردار.

**گیرودار:** بگرەو بەردە [ف] گیر ودار.

**گیرۆدە:** ۱) گرفتار؛ ۲) هۆگر، ئۆگر، خوٚ پێ گرتو، ئالوٗدە؛ ۳) ئەڤیندار [ف] ۱) گرفتار: ۲) انس گرفته: ۳) عاشق.

**گیرۆدەیی:** ۱) گرفتاری؛ ۲) ئۆگری [ف] ۱) گرفتاری: ۲) علاقەمندی.

**گێروٗسه:** دەستار، کرە [ف] دستاس.

**گێروٗشه:** گێروٗسه [ف] دستاس.

**گیروگرفت:** گرفتاری [ف] گیر وگرفت.

**گێروقەن:** شیاوی، ژیهاتویی [ف] لیاقت، قابلیّت.

**گیرۆیی:** ۱) گرفتـاری؛ ۲) گرتنـەوەی نەخۆشی [ف] ۱) گرفتاری: ۲) سرایت بیماری.

**گیره:** ۱) شەددە؛ ۲) جەرو مەنگەنەی پیشەسازان؛ ۳) گیرگە، کەلپ؛ ۴) کورسی قورعان؛ ۵) ئامرازی درگا لەپشتەوە داخستن جگە لە قفل؛ ۶) نانی تێکەڵاو لە گەنم و هەرزن و جۆ؛ ۷) ئاڵقەی بەن لە ڕەشماڵدا بۆ گوریس پێ قایم کردن؛ ۸) گرفتاری؛ ۹) ئامرازێکی جوڵایی [ف] ۱) تشدید بر حرف؛ ۲) منگنه؛ ۳) نگا: گیرگه؛ ۴) رحله قرآن؛ ۵) رزه در از داخـل؛ ۶) نان آمیختـه از گندم و ارزن وجو؛ ۷) حلقه‌های سیاه چادر؛ ۸) گرفتاری؛ ۹) از ابزار بافندگی.

**گێڕه:** ۱) چەقەکردن و چەنەلێدانی زۆر؛ ۲) شلتاغ، ئەشقەڵە، گەڕ [ف] ۱) روده درازی، وراجی؛ ۲) شلتاق.

**گێره:** ۱) وردکردنی دەغڵ و گیا بە پێ لێنان و سمبڵانی حەیوانات؛ ۲) گلی، شکایەت؛ ۳) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ۱) کوبیدن گیاه و غلّه وسیلهٔ حیوانـات، خرمنکوبی؛ ۲) گله، شکایت؛ ۳) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گێرەشێوێن:** بڕیتی لە ئاژاوەچی، فتنه [ف] آشوبگر.

**گێرەڤان:** گێرڤان [ف] متصدّی خرمن کوبی.

**گێره کردن:** ۱) بە سم کوتانی دەخڵ و گیا؛ ۲) بڕیتی لە هاتوچۆ بەسەر قوڕدا کردن [ف] ۱) کوبیدن خرمن؛ ۲) کنایه از رفت وآمد زیاد در گل.

**گیرەم:** وام دانا، گرتم، گریم کرد [ف] فرض کردم، گیرم.

**گێرەنه کەر:** بڕیتی لە تەمەڵ [ف] کنایه از تنبل.

**گێرەوان:** گێرڤان، گێرەڤان [ف] نگا: گێرڤان.

**گێرەوکێشـه:** ۱) کلۆش بردنەسەر خەرمان و گێرەکردنی: ۲) گرفتاری، دەردەسەری [ف] ۱) سپاری بەخرمن بردن و کوبیدن؛ ۲) گرفتاری.

**گێڕەوە:** ۱) هەرچی بەر لە ڕۆیشتن دەگرێ؛ ۲) پارێزەر: (بـەلا گێڕەوە)؛ ۳) کەسێ باری ڕوداو یان بیژراو دوبـانە دەکاتەوە: (قسە گێڕەوە) [ف] ۱) مانع؛ ۲) محافظ؛ ۳) بازگوکننده.

**گیرەوە:** گیرۆدە [ف] نگا: گیرۆدە.

**گیرهـه:** ۱) بۆقی ئاوی ڕەق بوگ، تەمنمـان، بلغ [ف] رسوب سفت شدهٔ درون آب.

**گێرەی قوڕێ:** کوتانی جێ جێخۆن بەهۆی گاگەل [ف] جای خرمن را با سُم دامها کوبیدن.

**گیری:** تامی گەروگر [ف] مزهٔ گلوگیر.

**گێڕی:** ۱) خوارو خێچـی؛ ۲) شەلـین بە هەردولادا [ف] ۱) کجـی و ناهمواری؛ ۲) لنگیدن از دوبا.

**گیریاگ:** گیراو [ف] گرفتار.

**گیریان:** ۱) گیران، گری کرن، گرین؛ ۲) گیرهـاتن، دەگیرکەوتن؛ ۳) کپ بوٗن [ف] ۱) گر بستن؛ ۲) گرفتار شدن؛ ۳) مسدود شدن، گرفتگی.

**گیریست:** گری، گریان [ف] گریه.

**گیرین:** گرین، گری کرن [ف] گریستن.

**گیرێ:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گیز:** ۱) گوێز، گرنـەکان، قۆز، گوٗز، گۆز؛ ۲) پشت ئەستو، پۆق مل؛ ۳) پرچ، کەزی، کەزیە؛ ۴) دەنگی باریك وەك دەنگی سەماوەروکەتری؛ ۵) دەنگی ڕۆیشتنی گوللە: (بـە **گیزەگیز** ڕۆیشت)؛ ۶) ئەلـەس، مەست، سەرخۆش؛ ۷) ڕانلەکان، ژانی مەشکە [ف] ۱) گردو؛ ۲) پشت گردن؛ ۳) گیسـو؛ ۴) صدای نازك مانند صدای سماور؛ ۵) صدای رفتن گلوله؛ ۶) مست؛ ۷) بهم‌زنی مایع.

**گێز:** ۱) گوێز؛ ۲) پشـت ئەسـتـو: (**گـێزی** ملیم گرت)؛ ۳) بەراوردو لێکـدانـەوە بە بیر و خەیاڵ؛ ۴) تەفـرە، دەستـاودەست؛ ۵) ڕیشوی شەدەو مێزەر [ف] ۱) گردو؛ ۲) پشـت گردن؛ ۳) حدس و تخمین؛ ۴) امروز وفردا کردن در اجرای وعده؛ ۵) شرابه، منگولهٔ عمامه.

**گیزان:** گوێزان [ف] اُستره.

**گێزان:** ۱) کیان، کەی، ڕانلەکـانی تراو لە دەفـردا؛ ۲) گوێزان، تیغی موٗتاش [ف] ۱) به هم زده شدن مایع؛ ۲) اُستره.

**گێزبەلۆك:** بزنەڕیشە، جۆرێ شنگی بەلك درێژ [ف] نوعی شنگ.

**گێزبەله:** ئالەکوك [ف] گیاهی است.

**گێزر:** تەفرەدەر، دەستاودەست پێ کەر [ف] کسی که در وعده امروز و فردا می کند.

**گیزك:** ئیسوت، بیبار [ف] فلفل.

**گێزك:** گەسك، گزگ [ف] جارو.

**گیزگیزه:** مزراح، مزراق [ف] گردنا.

**گیزلی:** گوزلی [ف] نگا: گوزلی.

**گێزوگوڵنگ:** زبنیی و گوڵنگەی سەرو مێزەر فا شرابه و منگوله.

**گێزوگوڵنگە:** گێزوگوڵنگ فا شرابه و منگوله.

**گێزوگوڵینگ:** گێزوگوڵنگ فا شرابه و منگوله.

**گێزوگوڵینگە:** گێزوگوڵنگ فا شرابه و منگوله.

**گێزە:** ۱) دەنگی باریکی ناوکولان لە دەفری نەنگا: (**گێزەی سەماوەر**)؛ ۲) دەنگی زۆبشتنی گولله؛ ۳) دەنگی مێش فا ۱) صدای جوش آب در سماور؛ ۲) صدای عبور گلوله؛ ۳) صدای مگس.

**گێزە:** ۱) بە سەبروکە گۆرانی گوتن لە خۆشیان، سۆزە: (**گێزەی دێت**)؛ ۲) برێتی لە کورنەبالای قەڵەو فا ۱) ترنّم از شادی؛ ۲) کنایه از کوتاه قدّ چاق.

**گێزەر:** ۱) گزر؛ ۲) گیایەکی بن‌سپی گوڵ‌وەنەوشە فا ۱) هویج؛ ۲) گیاهی است ساقه‌سپید با گل بنفش.

**گێزەرتەر:** گیایەکە بۆ رەوانی باشە فا گیاهی است مُسهل.

**گێزەرە:** پشت گەردن، پشت نەستۆ فا قفا، پشت گردن.

**گێزەگێز:** دەنگەدەنگی باریکی گوللەو مێش‌و سەماوەر فا صدای نازک بیاپی.

**گێزەڵ:** بنیادەمی دایم قەڵس‌و جاڕز فا آدم عصبی.

**گێزەمل:** مل‌نەستوور فا گردن کلفت.

**گێزی:** گزك، گەسك فا جارو.

**گێزین:** ۱) گزەی‌با؛ ۲) دەنگی گەڵا کە با دەبشەکێنێ فا ۱) صدای تُند باد؛ ۲) صدای حرکت برگها از وزش باد.

**گێژ:** گێج فا نگا: گێج.

**گێژاف:** گێجاو فا نگا: گێجاو.

**گێژاڵ:** فرزاڵ، قرژانگ، کێفژاڵ فا خرجنگ.

**گێژاو:** گێژاف فا گرداب.

**گێژبوون:** گێج‌بوون فا گیج شدن.

**گێژدان:** ۱) گێج‌دان؛ ۲) پاکەوەکردنی دەخڵ بە بێژنگ فا ۱) نگا: گێج‌دان؛ ۲) بوجاری وسبلهٔ غربال.

**گێژلك:** گەرداو، گێژاو، گەرداف فا گرداب.

**گێژکردن:** ۱) تۆشی سەرسوڕان کردن؛ ۲) دەغڵ بە بێژنگ پاك کردن؛ ۳) برێتی لە جەقەی زۆر بۆکەسێ کردن فا ۱) گیج کردن؛ ۲) بوجاری کردن وسبلهٔ غربال؛ ۳) کنایه از وراجی و سر به‌دردآوردن.

**گێژکە:** پاکەوەکردنی خەڵە بە بێژنگ فا بوجاری غلّه با بیزن.

**گێژکەر:** شتێ کە سەر تۆشی سوڕان دەکا فا گیج کنندە.

**گێژلۆك:** گیایەکە فا گیاهی است.

**گێژن:** جێژن، جەژن، عەید فا عید.

**گێژن:** گێجەنە، گرێژەنە، پاژنەی درگا، بن زنسمانە فا پاشنهٔ در.

**گێژنۆك:** گوڵێکە لە سەرە بەهاردا دەپشکوێ فا گلی است.

**گێژۆك:** ۱) گێوژ، بلج؛ ۲) داری گوێژ فا ۱) زالزالك؛ ۲) درخت زالزالك.

**گێژوویژ:** بێ‌هۆش، حۆل فا گیج و منگ.

**گێژەراو:** راوە رێوی بەرلە‌بارانی پاییز فا شکار روباه قبل از باران پاییز.

**گێژەڤانك:** باوەخولێ فا بازی به‌دور خود چرخیدن.

**گێژەگ:** ۱) خولخوله؛ ۲) گێژی فا ۱) فرفره؛ ۲) گیجی.

**گێژەگێژ:** جەقەی بێ‌تام‌و خوێ فا باوه، وراجی.

**گێژەلۆکە:** باهۆز، گەردەلوول، گێجەلۆکە فا گردباد.

**گێژەڵە:** گێژەلۆکە فا گردباد.

**گێژەلە:** بلج، گۆیژ، گێوژ، گفیشك، گوهیشك فا زالزالك.

**گێژەنە:** گێجەنە، گێژن، گرێژەنە، بن زنسمە فا پاشنهٔ در.

**گێژەو:** گێژکە فا بوجاری با غربال.

**گێژەوانك:** گێژەڤانك، باوەخولێ فا بازی به دور خویش چرخیدن.

**گێژەوکراو:** لەبێژنگ‌دراوی خەڵە فا غلّهٔ بوجاری شده، جاش.

**گێژی:** گێجی فا گیجی.

**گێژبن:** گێژبەنی، گێزایەتی فا حالت گیجی.

**گێس:** پرچ، کەزی، گێز، پەلکە، پوزی سەر فا گیسو.

**گێست:** برسی، برجی، نبز فا گرسنه.

**گێست‌مەردش:** لەبرسان‌مردن فا از گرسنگی مردن.

**گێسك:** بەچکەبزنی لەشیر برڕاو فا چپش، بزغالهٔ از شیر بریده.

**گێسك:** کەزی، پرچ، پوزی‌سەر فا زُلف.

**گێسك:** ۱) گیسك؛ ۲) گێزك، گەسك، جارو، گسك، گزك فا ۱) چپش؛ ۲) جارو.

**گێسك‌لیل:** کەزی‌لوول‌و بەمۆنج فا زلف فرفری و موجدار.

**گیسکەزا:** بێچوی بزنێ کە بە بیژوکی زاوە فا بزغالهٔ بزی که در دوسالگی زاییده است.

**گیسکەزاو:** گیسکەزا فا نگا: گیسکەزا.

**گیسکێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد فا روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گیسن:** گاسن فا گاوآهن.

**گێسن:** گیسن، گاسن فا گاوآهن.

**گێسنای:** بێ‌کردنی ناگر، گڕتێ‌بەردان فا افروختن.

**گسنەچڕ:** گرێوەغار، ملەی ڕاکردن فا مسابقهٔ دو.

**گێسو:** کەزی، پرچ فا گیسو.

**گێسوانە:** گوێسوانە، پاسارە، سوانە فا لبهٔ بام.

**گێسوبڕی:** پوڕکورکراو، برێتی لە ژنی خراپ فا گیسو بریده، کنایه از زن بدعمل.

**گیسەنە:** پێ‌کراوی ئاگر فا افروختگی.

**گیسی:** زنجیرە کێو فا رشته کوه.

**گێسی:** پرچ، کەزی، پوڕ فا گیسو.

**گێش:** پۆلی باڵداران لەحەوا فا دستهٔ پرندگان در حال پرواز.

**گێشت:** گوست، ئەموست، تبل، فامك، کشك فا انگشت.

**گێشتاقلینج:** فامکەتوڵە، نبلاگچکە فا خنصر، انگشت کوچکه.

**گێشتامیوئەن:** زەڕنەقوڵە، نلباناوین فا انگشت وسطی.

**گێشتن:** گەیشتن فا رسیدن.

**گێشتۆنە:** گشنانە فا نگا: گشنانە.

**گێشکون:** بەکۆمەڵ فڕبنی مەلان بەرەو گەرمێن‌و کوێستان فا کوچ

دستەجمعی پرندگان.

**گیشه:** ١) کۆمەڵێ بافەی لەسەریەك داندراوی گیاو خەڵە لە دەشت؛ ٢) کۆمـای گەورەو زل لە بافـەگیا بۆ ئالفی زستانەی ئاژەڵ. تایە ف ١) تودهٔ بستـه‌هـای غلّه یا گیاه درویده درمزرعه؛ ٢) تودهٔ انباشتهٔ گیاه برای علوفهٔ زمستان.

**گێشه:** گیشه ف نگا: گیشه.

**گیف:** نامادەو نەبار ف آماده و مهیّا.

**گیفان:** گیرفان، بەریك، بەرك، جبۆ ف جیب.

**گیفك:** ١) ژبشوی شەدەو پێچ؛ ٢) ژبشوی زین بۆ جوانی؛ ٣) پلکەی دەسمـاڵی ژنـانـه ف ١) شرابـهٔ دستـار؛ ٢) شرابـهٔ زین؛ ٣) دنبالهٔ سرپوش زنانه.

**گیفڵك:** گۆفك، سەرانگوێلك ف شوله.

**گیفەلان:** گیفڵك، گۆفك ف شوله.

**گیفەلانك:** گیفەلان، گۆفك ف شوله.

**گیڤ:** ١) گیف؛ ٢) پێچ‌دراو، ژبشوی بادراو ف ١) مهیّا؛ ٢) شرابهٔ تابداده.

**گیڤاله:** ١) دەستەمرۆیەك؛ ٢) تیپی سواران، دەستەسوار ف ١) جمعی از انسانها؛ ٢) تیپ سواران.

**گیڤژ:** گوریەپنبلە ف گربهٔ نر.

**گیڤژاڵ:** کیڤژاڵ، قرژانگ ف خرچنگ.

**گیڤژاڵه:** برجی قرژاڵ لە عاسمان ف بُرج سرطان.

**گیڤك:** گیفك ف منگوله.

**گیڤ گیڤه:** گیزگیزە، قوزقوزە ف گردنای توخالی شده.

**گیڤل:** ئیشتیای خواردن، واز لەخواردن ف اشتها.

**گیڤه:** ١) بزوتنی سمێڵ لەخۆشیان؛ ٢) دەنگی بەردی بەنەوژم تاوبنراو ف ١) جنبیدن سبیل از شادی، خندهٔ زیرلبی؛ ٢) صدای سنگ فلاخن.

**گی گلو:** قالونچەی ژیخ‌گلێن ف سوسك سرگین گردان.

**گی گله:** گی‌گلو ف سوسك سرگین گردان.

**گیل:** هەژك، فوز، هەز، حەزی، خوڵی بەناو تەزکراو ف گِل.

**گێل:** حوّل، کەم‌ناوەز ف ابله، هالو.

**گێڵ:** ١) گەشت، گەڕان؛ ٢) نەنەلەکردن، هەڵتەکاندن، بۆ دەغڵ و نوتنی دەڵێن ف ١) گشت و گزار؛ ٢) طبق کردن.

**گێڵا:** گەڕیدە، گەڕۆك ف گردش کننده.

**گێلاخه:** گیایەکە بۆ جێشت خۆشە ف گیاهی است خورشی.

**گێلاس:** ١) میوەیەکە لە بەلاڵوك دەکا بـەلام شیر بنەو زەردو سوورێشی هەیە؛ ٢) پیالـەی بادەخواردنەوە ف ١) میوهٔ گیلاس؛ ٢) ساغر می، گیلاس میخوارگی.

**گێلاس:** گێلاس ف ١) گیلاس؛ ٢) ساغر.

**گێلاسی:** چەرمی گلاسی ف نوعی جرم.

**گێلان:** ١) گەڕان، گەڕیان؛ ٢) ولاتێکـه لە ئێران: (بـرنجی ڕەشت و گێلانی) ف ١) گشت؛ ٢) منطقهٔ گیلان.

**گێلای:** گەڕیان، گەشت، گێلان ف گردش، گشت.

**گێلبزانه:** گیایەکە لە بەهاردا بەرلە گشت گیایەك سەر دەردێنێ ف گیاهی است که در بهاران پیش از هرگیاه دیگر سبز می‌شود.

**گیلك:** ١) بەلوکە، قینکە؛ ٢) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) چوچوله؛ ٢) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گێلك:** ١) گوڵك، گوێلك، گوڕ؛ ٢) گیایەکە وەك سرێش ئەچەسپێ؛ ٣) خوری حازر بۆ ڕستن ف ١) گوساله؛ ٢) گیاهی دارای مادّهٔ چسبنده؛ ٣) آغندپشم.

**گێلکه:** جۆرێ مێرولەی سوری چکۆلە ف مورچهٔ قرمز ریز.

**گێلگێله:** ڕیزەگوڵینگـەی نێك‌خراو بۆ سەرو شەدەی ژنـان ف زنجیرهٔ منگوله‌های دستار زنانه.

**گێلو:** جۆرێ گێجکاری میچی خانو ف نوعی گچکاری سقف.

**گێلوه‌ره:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند

**گیله:** گله، گازنده ف گلایه.

**گێله:** حوّل، کەم‌فام ف ابله، هالو.

**گێڵه:** گەڕیان، گەشت ف گردش.

**گیلەبەنا:** خـوراکێکە لە ماسـتو فەزوان ف خوراکی از ماست و نانکش.

**گێلەپەڕك:** مرۆچەی باڵدار، میرولەی باڵ‌لێ‌هانگ ف مورچهٔ بالدار.

**گێلەخ:** گێلاخه ف گیاهی است خورشی.

**گێلەسی:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گێلەشۆ:** زەنازەنا، چەقەچەق ف همهمه و جنجال.

**گێلەشۆك:** گێلەشۆ ف همهمه و جنجال.

**گێلەك:** گونـدێکی کوردسـتـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گێلینـگ:** شەش‌داو شەش‌داوی لێك‌هاڵاو بۆ تەونی لەسـەر عەرز ف تارهای ششگانهٔ گلیم‌بافی افقی.

**گیم:** ١)باقەبێن، باغەبێن؛ ٢) بەندی بەستنی باوەشێ لە دەغل ف ١) نگا: بافەبێن؛ ٢) بَندِ بستن توده‌ای دروشده.

**گین:** ١)پاشگرێکە خاوەنی دەگەیەنێ: (خەمگین)؛ ٢) پاشگرێکە پەسن دەگەیەنێ: (دواگین)؛ ٣) پاشگـری بەوانا: وەك، چون: (گورگین)؛ ٤) گوان: (نونگین) ف ١) پسوند به معنی دارنده؛ ٢) پسوند وصفی؛ ٣) پسوند تشابه، مانند؛ ٤) پستان حیوان.

**گێن:** گوێن، وەك، لەنەرزی ف مانند.

**گیندال:** گیایەکە، گبادانە ف گیاهی است.

**گیندەڵ:** گبادانە ف گیاهی است.

**گینگڵ:** جینگڵ ف جنبیدن بواشکی.

**گینگەڵه:** خولیا، کەلکەلە ف نگا: کەلکەلە.

**گینۆ:** زەرنك، گیازەرنك ف گیاهی است از آن رنگ زرد گیرند.

**گێنە:** گەرچەك، گەنەك ف گرچك.

**گێنی:** گوێنی، گەون ف گَوَن.

**گێنیان:** هوٚزێکی کوردە ژێردەستی ترکان ف نام طایفەای کُردزبان.

**گیو:** ناوی‌پیاوانە ف نامی است مردانه.

**گیوِر:** گیڤِر، گورپە ف گربۀ نر.

**گیوژ:** کوێژ، بلج، کقیشك ف زالزالك.

**گیوژەزەردە:** گوێژی زەرد ف زالزالك زرد.

**گیوژەسوورە:** گوێژی سوور ف زالزالك قرمز.

**گیوٚل:** تاسەو تامەزرۆیی ف هوس و آرزو.

**گیوە:** ۱) کلاشی بن‌چەرم، کلاش؛ ۲) نۆرە، باو ف ۱) گیوە؛ ۲) نوبت.

**گیوەگیر:** نۆرەگر ف نوبت‌گیر.

**گیوەگیرە:** نۆرەگری ف نوبت‌گیری.

**گیوەگیو:** گێژەگێژ، قسەی زۆر بێ‌تام ف تُرّهات، حرف مُفت.

گیە: گەدە، عوُر، کرش ف شکمبە، شکم برامدە.

**گیهان:** گەیشتن ف رسیدن.

**گیهانەك:** قوناغ، مەنزل: (**گیهانەك** بگیهانەك دچو) ف منزلگە.

**گیهەڤ:** ۱) بەش، پشك؛ ۲) بەخشیش ف ۱) حصە، نصیب؛ ۲) بخشش.

**گیێ‌داری:** جیوەی دارو درەخت ف انگُم درخت.

**گیبرەیش:** گرەوتش ف نگا: گرەوتش.

**گیبرایش:** گرەوتش ف نگا: گرەوتش.

**گیێ‌ڤامیر:** جیوەی دار بادام ف انگُم درخت بادام.

**گیێ‌گوٚش:** چلکی گوێ ف ترشح گوش.



**لْ:** ١) ژ، جه، له‌لابه‌ن: (ل نه ڕا گه‌هابه من)؛ ٢) بۆ نزیك کردنه: (جلکی خۆ ل خۆ که وانا: ببکه به‌رت)؛ ٣) ده‌فری ده‌م و جیٚ ده گه‌به‌نیٚ: (ل کو بو ی؟، ل ڕۆژا پاشبین)؛ ۴) بۆ حالی: (های ل من)؛ ۵) پاشگری بچووك‌شانـدان: (کاکل) ف ١) از؛ ٢) پیشوندی که نزدیك کردن را می‌رسانـدن؛ ٣) ظرفیت زمان و مکان؛ ۴) پیشوند به معنی از حال، برای حال و وضع؛ ۵) پسوند تصغیر.

**لا:** ١) ڕه‌خ، ئالی؛ ٢) نه‌ســازو سه‌رســه‌خت: (کـابـرابه‌کی **لا** به هه‌ر ناسازیٚ)؛ ٣) نویٚ، ناو: (لوکه‌م خستوته **لا**که‌بەوه)؛ ۴) نیوه: (**لا** به‌کی له لا به‌کی زلتره)؛ ۵) کن، نك، جهم: (نان وا **لای** منه)؛ ۶) دووره‌په‌ریزو بیٚ‌ته‌ره‌ف: (من له‌و کارانه **لام**)؛ ٧) فه‌رمان به دوورکه‌وتنه‌وه: (تۆخوا به سه‌ری خۆت **لا**)؛ ٨) خوار، خیٚچ: (مـن ده‌لـیٚم سه‌ریکـی ئه‌م دیواره لابه)؛ ٩) نافه‌رمانی: (تۆ هه‌رچی بفه‌رموی من لام‌نیه)؛ ١٠) باریده، ناریکـار: (لـه‌م کیٚشه‌دا من **لای** تۆ ده‌گرم، **لای** تۆم)؛ ١١) وتـه‌ی بانـگ‌کردنی ژن له لابه‌ن میٚرده‌وه، وه‌ك ژنـه‌کیٚ؛ ١٢) شر بنی قه‌ند، که‌ندری زراف؛ ١٣) ناوها، نیتر، به‌لام؛ ١۴) شیو، دۆڵی ته‌نگ؛ ١۵) قرفره، غه‌رغه‌ره، ته‌خته‌کلاف؛ ١۶) لافاو، سیلاو، له‌هی، لی، لیٚمشت ف ١) سو، جانب؛ ٢) لجباز و سرسخت؛ ٣) لا به؛ ۴) نیمه؛ ۵) نزد، پیش؛ ۶) کناره‌گیر؛ ٧) دورشو؛ ٨) کج، ناهموار؛ ٩) نافرمانی؛ ١٠) باری، مَدَد؛ ١١) لفظ خطاب مرد به زن؛ ١٢) نخ کلّه قند؛ ١٣) امّا؛ ١۴) درّهٔ تنگ؛ ١۵) فرفره؛ ١۶) سیلاب.

**لائیین:** ده‌مه‌لاسکه ف ادای کسی درآوردن.

**لابا:** ١) به‌باداکردنی خه‌له به بیژنگ؛ ٢) بایه‌نا، بانه‌گر؛ ٣) دوور بخانه‌وه: (ئـه‌گه‌ر دیواره‌کـه **لابـا** خـۆش دبـیٚ)؛ ۴) لابیـا، لابوا: (هـانـوه‌مـاشینـه‌کـه‌**لابـا**)؛ ۵) زبلو زالیٚ که له به‌بـاداکردنی خه‌له خڕبۆنه‌وه ف ١) باددادن غلّه با غربال؛ ٢) بادنگیر؛ ٣) دور کند؛ ۴) بردارد؛ ۵) آت آشغال حاصل از باد دادن غلّه.

**لابار:** ١) نابار، نیوه‌بار؛ ٢) خوارو ناریٚك: (ئه‌م که‌لا به **لاباره**)؛ ٣) باره‌به‌ر به‌کریٚدان به نیوه‌ی باره‌که‌ی: (که‌ره‌که‌تم ده‌یه به **لابار**خویٚت بۆ دیٚنم) ف ١) لنگه‌بار؛ ٢) ناهموار و کج؛ ٣) کرایهٔ بار به محنوای لنگه‌بار.

**لاباری:** ١) کاری کریٚ به نیوه‌بار؛ ٢) خوارو خیٚچی؛ ٣) قیزسجمه‌یی و سه‌رسه‌خنی ف ١) کرایهٔ لنگه‌باری؛ ٢) ناهمواری و کجی؛ ٣) سرسختی.

**لاباسك:** ١) نزیکه‌ی دوند له‌که‌ناری کیٚفدا؛ ٢) پارانه‌وه‌و لالانه‌وه ف ١) ستیغ کوه؛ ٢) توسل جُستن.

**لاباشه:** نانی نه‌نکی ساج ف نان ساج.

**لابـاڵ:** ١) باڵیٚکی بالـدار؛ ٢) که‌نـاره‌ی باڵ؛ ٣) ده‌ستیٚ؛ ۴) فه‌راغی ده‌ستیٚك ف ١) بك بال؛ ٢) کنارهٔ بال؛ ٣) یك دست؛ ۴) کنارهٔ دست.

**لابان:** گه‌ڕوگزی، فیٚل، حوقه‌بازی ف حُقّه‌بازی.

**لابانته:** به‌رامه، بۆی‌خۆش ف نکْهت.

**لاباندن:** خاباندن، کلاوسه‌رنیان، فریودان ف فریب دادن.

**لابـڕ:** ١) سه‌ربڕ، له‌ڕیٚلادان بۆ کورت‌بۆنه‌وه‌ی ڕیٚگه؛ ٢) کوچکه‌ناوریٚ که دیواری له پیٚش نه‌بیٚ ف ١) میانبُر؛ ٢) اجاقی که جلوش باز باشد.

**لابردن:** ١) لـه‌سه‌رهه‌لگرتـن؛ ٢) دوورکردنـه‌وه ف ١) برداشتن؛ ٢) دورکردن.

**لابردنگ:** قسه‌ی به‌نیٚکول، زیپك ف حرف نودار، متلك.

**لابریٚ:** ١) ئه‌وساکه، ئه‌وده‌می، ئه‌وکانه؛ ٢) به‌لام ف ١) آن دفعه؛ ٢) لیکن.

**لابك:** ١) ئه‌له، داو؛ ٢) ئه‌بکه ف ١) دام، تله؛ ٢) نگا: نه‌بکه.

**لابنیٚ:** ١) ئه‌وساکه؛ ٢) به‌لان ف ١) آن دفعه؛ ٢) لیکن.

**لابوت:** ١) سه‌ری ناسنینی مه‌ساسه‌ی جووتیٚر؛ ٢) ناسنی بانی جه‌قاو بۆ قوری پیٚلاوخاوین‌کردنه‌وه ف ١) سرفلزی وسیلهٔ شخم‌زنی؛ ٢) آهن پهنی که در زمین فرومی‌کنند و گلهای کفش را بدان پاك می‌گردانند.

**لابون:** ١) که‌ناره‌گیری، دووره‌په‌ریزی؛ ٢) نه‌هاتنه‌سه‌ڕیٚ، سه‌رسه‌خنی ف ١) کناره‌گیری، بی‌طرفی؛ ٢) لج کردن.

**لابه:** ١) دوور خه‌وه؛ ٢) دووره‌په‌ریز به؛ ٣) ده‌س هه‌لگره: (**لابه** تۆ نازانی کار بکه‌ی) ف ١) بردار؛ ٢) کناره‌گیر باش؛ ٣) دست بردار.

**لابەر:** ١) کەسێ کە شتێ دەدانە ئالی؛ ٢) کەسێ کە شتێ دەسترێنەوەو نای هێڵێ ف ١) کنارگذار، بردارنده؛ ٢) زداینده.

**لابەردەی:** لابردن ف نگا: لابردن.

**لابەرە:** ١) بەرەی زین؛ ٢) خەلاس بکە، مەهێڵە: (وەرە وەرە شەماڵ وەرە خەم لە دڵەکەی من **لابەرە**) ف ١) بپشبند زین؛ ٢) بردار، بزدای.

**لابەلا:** ١) خوارو خێچ؛ ٢) سەرسەختو نەگونجاو؛ ٣) چین لەسەر چین؛ ٤) قەدپاڵی کێو؛ ٥) خۆتێ‌هەڵقوتێن؛ ٦) کەسێ کە لە نەخۆشیو ماندوبی یان سەرخۆشی خوارەوخوار دەڕوا؛ ٧) خوارەکەو پێچەکەی رێگە ف ١) کج و ناهموار؛ ٢) لجباز؛ ٣) چین‌چین؛ ٤) کمرکوه؛ ٥) فضول؛ ٦) کسی که تلوتلو می‌خورد؛ ٧) راه پر پیچ و خم.

**لابەلایی:** ١) خۆتێ‌هەڵقوتێن؛ ٢) سەرسەختی؛ ٣) خوارو پێچی رێگە ف ١) فضول؛ ٢) لجبازی؛ ٣) پیچ و خم راه.

**لابەلێ:** ١) ئەودەم، ئەوروژگارە، لابرێ، لابێ؛ ٢) بەلام ف ١) آن زمان؛ ٢) امّا، لیکن.

**لابیتە:** ١) داردەستی جوتیار لە شوێ‌برێن‌دا کە سەرێکی کلکەبزمارو سەرێکی پیشکانە، مەساسە؛ ٢) بیشکانی گیاکەنی ف ١) چوبدست شخم زن؛ ٢) بیلچهٔ گیاه کنی.

**لاپ:** جەپۆك، بە پانایی دەست لە تەپڵەسەر دان ف توسری.

**لاپا:** قەدپاڵی کێو ف کمرکوه.

**لاپار:** ١) لاپا؛ ٢) سەرەوژوورەی رژد؛ ٣) سواپ ف ١) کمر کوه؛ ٢) سر بالایی سخت؛ ٣) شن صاف و نازك برای بازی.

**لاپاران:** سواپێن ف نوعی شن بازی.

**لاپارێن:** لاپاران، سواپێن ف نگا: سواپێن.

**لاپاڵ:** ١) قەدپاڵی کێو؛ ٢) تەنشت: (بێ لە **لاپاڵمەوە** بنیشە) ف ١) کمرکوه؛ ٢) پهلو، نزد.

**لاپاڵو:** خاڵیگە، برك ف تهیگاه.

**لاپان:** شتی خڕ بلە کە تەواو خڕ نەبێ: (ئەو مناڵە سەری **لاپانە**) ف کره‌ای ناقص.

**لاپانك:** بن سوچی رەشماڵی هەڵدراو: (فلان بیوەژن لە **لاپانکی** فلان ماڵ دایە) ف گوشهٔ برچیدهٔ سیاه چادر.

**لاپاو:** سێڵاو ف سیلاب، سیل.

**لاپچین:** پێڵاوی تا قولەقاپە، پۆتین ف پوتین.

**لاپرە:** کەس‌نەناس ف ناشناس، بیگانە.

**لاپرەسەن:** ١) لابرە؛ ٢) خۆتێ‌هەڵقوتێن ف ١) ناشناس؛ ٢) فضول.

**لاپرەسەنگ:** لاپرەسەن ف نگا: لاپرەسەن.

**لاپك:** لەپك ف دستکش.

**لاپلا:** رێگەی پڕ خوارەکەو پێچەکە، لابەلا ف راه پر پیچ و خم.

**لاپلار:** ١) خۆتێ‌هەڵقوتێنی سەربەخۆ؛ ٢) قسەی بەتێکول ف ١) ناخواندهٔ فضول؛ ٢) متلك.

**لاپلەرسەنگ:** لاپرەسەن ف فضول.

**لاپواز:** ١) لاپلار؛ ٢) پوازێکی بچوکە لەو سەری قەڵشاوی دار دەخرێ ف ١) فضول ناشناس؛ ٢) پغاز جانبی.

**لاپۆتی:** رەجاڵە، روتەو پوتە ف رجّالە.

**لاپۆرە:** لابرە ف ناشناس، غریبه درمحل.

**لاپوشك:** چنگاڵ، چنگورك ف چنگال حیوان درّنده و پرندهٔ شکاری.

**لاپوڵە:** پڵپڵە، پپڵە ف سکه و مهرهٔ بەرشته کشیدهٔ زینتی.

**لاپولی:** کورتەباڵای گۆشتن ف کوتاه‌قد چاق.

**لاپە:** نخۆشەر ف لبه.

**لاپەڕ:** ١) ناك و دوور لە ئاوایی: (خانوەکەیان **لاپەڕە**)؛ ٢) دوورەپەرێزو کەنارەگیر؛ ٣) چەرمێ کە بۆ کاڵە دەبڕدرێ؛ ٤) روپەڕی کتێب؛ ٥) نیو نەبەدتە کاغەز ف ١) ناك، فاصلەدار؛ ٢) کنارەگیر؛ ٣) برش چرم چارق؛ ٤) صفحهٔ کتاب؛ ٥) یك ورق کاغذ.

**لاپەڕوەرگێران:** ١) روپەڕهەڵدانەوە؛ ٢) برێتی لە گۆڕینی باس‌و خواس لەسەر مەبەستێ ف ١) ورق زدن کتاب و دفتر؛ ٢) کنایه از عوض کردن بحث.

**لاپەڕە:** ١) روپەڕی کتێب‌و نوسراو؛ ٢) نیوتەبەقی کاغەز ف ١) صفحهٔ کتاب؛ ٢) نیم ورق کاغذ.

**لاپەڕەوەرگێران:** لاپەڕوەرگێران ف نگا: لاپەڕوەرگێران.

**لاپەڕهەڵدانەوە:** لاپەڕوەرگێران ف نگا: لاپەڕوەرگێران.

**لاپەڕەهەڵگێڕانەوە:** لاپەڕوەرگێران ف نگا: لاپەڕوەرگێران.

**لاپەڵ:** لاپەڕ ف نگا: لاپەڕ.

**لاپەلە:** لاپەڕە ف نگا: لاپەڕە.

**لاپێ:** کوێرەڕای سەخت ف کوره‌راه دشوار.

**لاپیتە:** لابیتە ف نگا: لابیتە.

**لاپێژ:** تەپاڵەپێژی بە هەق یان بە نیوەیی ف تاپاله پهن کن مزدور.

**لات:** ١) نەدارو فەقیر؛ ٢) حاڵ‌پەرێشان؛ ٣) بەردی پان‌و لوس، تات؛ ٤) لە کن نۆ؛ ٥) زەوی خەت‌دراو بۆ کێڵان؛ ٦) شاخ، بەردی گەورە لە چیادا؛ ٧) شەرفرۆش ف ١) فقیر؛ ٢) پریشانحال؛ ٣) تختەسنگ صاف؛ ٤) نزد نو؛ ٥) زمین شیار شده برای شخم زدن؛ ٦) صخرهٔ کوه؛ ٧) لات.

**لات:** ١) ناتەبەرد؛ ٢) شاخ، بەردی زل‌و بڵند لە کێودا ف ١) تختەسنگ؛ ٢) صخرهٔ عظیم در کوه.

**لاتار:** ١) تاوێرەبەرد، بەردێ کە لە کێو گلار دەبێتەوە؛ ٢) دو داری درێژی لە قیسپ ئەستوورتر لە قیسپەعەرابە قایم دەکرێ ف ١) سنگ غلتان از کوه؛ ٢) دوچوب بلند که در گاری بەکار می‌روند.

**لاتان:** ١) لجم قە؛ ٢) کۆمای بێ‌ناکاران ف ١) نزد شما؛ ٢) لانها.

**لاتانە:** ١) کاری بێ‌ناکارانە؛ ٢) لە کن ئێوەیە ف ١) کار هرزه؛ ٢) نزد شما است.

**لاتاو:** زیپك، قسەی بەتێکول، لابڕدنگ ف متلك.

**لاتایەن:** ژنێ کە کۆمەکی تایەن دەکا لە کاری مامانی‌دا ف دستیار ماما.

**لات‌بون:** ١) پەرێشانحاڵ‌بۆن؛ ٢) فەقیربۆن ف ١) پریشان احوال شدن؛ ٢) فقیرشدن.

**لاتخانە:** نەمەڵ‌خانە، فەقیرخانە ف نوانخانه.

**لاتر:** ئامرازێکی قومارە دەی سوڕێنن خۆت‌و بەخت ف لاتاری.

**لاتراسکه:** ١) تل‌خواردن؛ ٢) لادانی بارەبەر لە ڕێگە بۆ لەوەڕ ف ١) تلوخوردن؛ ٢) راه کج کردن باربر برای علف.

**لاترقەوچ:** ١) تیلاوتیل؛ ٢) خواروخێچ ف ١) اُریب؛ ٢) کج و کوله.

**لاترقەوچە:** لاترقەوچ ف نگا: لاترقەوچ.

**لاترقەوچەپێچ:** لاترقەوچ ف نگا: لاترقەوچ.

**لاترقەوچەلُفاج:** لاترقەوچ ف نگا: لاترقەوچ.

**لاتروسکە:** لاتراسکە ف نگا: لاتراسکە.

**لاترە:** رەت، تل ف تلو.

**لاترەبردن:** رەت‌بردن، بەولاولادا کەوتن ف تلوخوردن.

**لاترەبەستن:** رەت‌بردن و لەدوور کەوتن ف تلوخوردن و به دور افتادن.

**لاتریسکە:** لاتراسکە ف نگا: لاتراسکە.

**لات‌فروشی:** شەرفروشی ف شارلاتانی.

**لاتك:** پارچەزەوی بچووك ف قطعه‌زمین کوچك.

**لات کەوتن:** نەواو دامان و بێ‌حاڵ بوون ف بینوا و در ماندن.

**لاتولوت:** رەجاڵەو رونەو پونە، عەلوجەلو ف اوباش، رجّاله.

**لاتولەوا:** لاتولوت ف اوباش.

**لاتە:** ١) نەتگەنەفەسی؛ ٢) جۆری جبە؛ ٣) نك نەبە؛ ٤) کابرا زۆن و نەدارە ف ١) نفس تنگی؛ ٢) نوعی بالاپوش؛ ٣) نزد نو است؛ ٤) بینواست.

**لاتەبەق:** بەرەکاغەز ف نیم ورق کاغذ.

**لاتەراد:** چەرمو گۆشتی نێوان ران و زگ لە نەنیشنەوە، تەراد ف تهیگاه میان ران و شکم.

**لاتەراف:** گۆشتی خالیگە ف گوشت تهیگاه.

**لاتەری:** ١) لانار، ناوێر؛ ٢) گوترە ف ١) نگا: لانار؛ ٢) الکی.

**لاتەریزە:** لاتەراد ف نگا: لاتەراد.

**لاتەریك:** دوورەبەریز ف بی‌طرف، کناره‌گیر.

**لاتەك:** لە نالی، لە بەنا ف طرف پهلو.

**لاتەنشت:** لاتەك ف طرف پهلو.

**لاتەنیشت:** لاتەك ف طرف پهلو.

**لاتەوەق:** لاتەبەق، بەرەکاغەز ف نیم ورق کاغذ.

**لاتی:** ١) شیرزەیی؛ ٢) شەرفروشی ف ١) بینوایی؛ ٢) شارلاتانی.

**لاتێ:** کڵاوی پەسنواو لە خوری ف کلاه پشمی.

**لاتیر:** نماشا بە گوشەی چاو: (لاتیر نواشای کردم) ف نگاه با گوشهٔ چشم.

**لاتیژ:** بەشێ لە دو بەشی جەوالی دوتایی ف لنگهٔ جوال دوتایی.

**لاتیگەری:** بەرهەلدایی و شەرفروشی ف بی‌بندوباری و شارلاتانی.

**لاتیل:** ١) لاتیر؛ ٢) برێنی قیچەلُفاج؛ ٣) گەنم بەدەم‌بادادان بە لێواری بێژنگ ف ١) نگا: لاتیر؛ ٢) برش اُریب؛ ٣) غلّه به‌باد دادن با لبهٔ غربال.

**لاتیلاگ:** گوشەی کەللەی سەر: (کلاوی بە **لاتیلاگی** سەریەوە نابو) ف طرفی از کلّه سر.

**لاتیە:** لاتێ ف کلاه پشمی.

**لاج:** ١) کورەجحێلەی شۆخ و جوان؛ ٢) نەنیشت و لا. بۆ هێلکەی نێرن ف ١) جوان زیباروی؛ ٢) کنار. *برای تخم‌مرغ گویند.*

**لاجامە:** ١) داری کەنارەی عارەبە؛ ٢) دیوارۆکەی بەرهەیوان؛ ٣) نیغەی نێوان زۆر لە دار؛ ٤) وێنەی لە تەسنەوە؛ ٥) داری نەولاولای لاشپیانە ف ١) نردهٔ پهلوی گاری کشاورزی؛ ٢) نردهٔ تراس؛ ٣) تیغهٔ چوبین بین دو اتاق؛ ٤) عکس نیمرخ؛ ٥) دوچوب عمودی چهارچوب در.

**لاجان:** ناوچەیەکە لە کوردستان ف ناحیه‌ای در کردستان.

**لاجانگ:** نێوان زومەت و نەستو ف عارض، عُذار.

**لاجك:** لاوك، جحێل ف نوجوان.

**لاجلەو:** نەسپی نەعلیم‌نەدینوی سەرزەق ف بدلگام.

**لاجوەرد:** بەردێکی بەقیمەت و زۆر سەختە زەنگی عاسمانی یە. دەکرێتە *قاشی نەنگوسنیلە یان دەیکەنە نوزولە رەسمکێشی‌دا بەکار دێنرێ* ف لاجورد.

**لاجوەردی:** بەرەنگی لاجوەرد ف لاجوردی.

**لاجە:** پەنابەر ف پناهنده.

**لاجەك:** لاجك، جحێل ف نوجوان.

**لاجیوەرد:** لاجوەرد ف لاجورد.

**لاجیوەردی:** لاجوەردی ف لاجوردی.

**لاچار:** دالگۆشت ف کز.

**لاچاو:** گۆشەی چاو، تیلی چاو ف گوشهٔ چشم.

**لاچاوە:** دو پاریکەقایشی بەندکەری سەرکەللەو رەشمە ف دوقطعهٔ چرمی از ابزار دهنه و افسار اسب که در طرفین صورت قرار دارند.

**لاچك:** ١) بەزنی گیا، سافەنە، لاسك؛ ٢) لەتکەهەرمێ؛ ٣) سوکەلەسەرپوشی ژنانە ف ١) سافهٔ گیاه؛ ٢) برگهٔ گلابی؛ ٣) لَچك.

**لاچلاچ:** شەویلکە، شەوبلە، کاکیلە ف آرواره.

**لاچلاچك:** لاچلاچ ف آرواره.

**لاچن:** دوورکەوتنەوە ف ١) کنار بروند، برداشته شوند؛ ٢) کنار بروید.

**لاچناکە:** بەشی سەروی شەویلە ف قسمت بالایی آرواره.

**لاچناگە:** لاچناکە ف نگا: لاچناکە.

**لاچو:** ١) لاچوْ؛ ٢) لە نزیکەوە نەما؛ ٣) لە بەبن چو ف ١) بروکنار؛ ٢) دورشد؛ ٣) محو شد.

**لاچوْ:** کەنار برۆ، دوور کەوە ف بروکنار.

**لاچوپاچو:** خرت و برت، شرەو برە ف خرت وبرت.

**لاچوون:** ١) دوورکەوتنەوە لە جێگەی خۆ؛ ٢) رابردوی چوون بۆ کوێ، لە جێگەی خۆ نەمان ف ١) کنار رفتن؛ ٢) کنار رفتند.

**لاچەژ:** مورەبا، میوەی لە شەکردا کولێندراوی هەلگیراو ف مُربّا.

**لاچەنە:** ١) لاچناگە؛ ٢) قایشی سەرکەللەی لغاو کە بە سەر شەویلەدا دەچێ ف ١) نگا: لاچناگە؛ ٢) نوار چرمی لگام که برآرواره می گذرد.

**لاچین:** ١) مەلبەندێکە لە کوردستان؛ ٢) ناوی گوندێکە؛ ٣) کالەی چەرمین؛ ٤) سەقەر، بالداریکی زاوکەرەو لە باز بچووکترە ف ١) ناحیه‌ای در کردستان؛ ٢) نام دهی است؛ ٣) پاتابه، چارق؛ ٤) از پرندگان شکاری است، چغر.

**لاحیده:** عه‌لاحیده، تایبه‌تی ف ویژه.

**لاخ:** گیای به‌ده‌س‌دوراوی کۆوه‌نه‌کراوی نه‌به‌سنراو ف گیاه دروشدهٔ دسته نشده.

**لاخا:** لابا، دۆرخانه‌وه ف به کنار بزند.

**لاخالی:** نه‌نیشت‌والا ف پهلونهی.

**لاخالیگه:** لانه‌وار، لانه‌زیزه ف نهبگاه.

**لاخستن:** ۱) دانه‌که‌ناره‌وه؛ ۲) له‌سه‌ر ته‌نیشت دریژکردن؛ ۳) که‌م‌فرۆشی‌و ته‌رازوسوکی ف ۱) کنار زدن؛ ۲) بر پهلو دراز کردن؛ ۳) کم‌فروشی.

**لاخ‌کرن:** ۱) درونه‌وه‌ی گیاو ده‌غل؛ ۲) خاوێن‌کردنه‌وه‌ی چه‌کی شه‌ر؛ ۳) به‌سه‌ریه‌کداکردنی ده‌غل‌و گیای دوراو ف ۱) بسته‌بندی دروشده؛ ۲) پاك کردن اسلحه؛ ۳) برهم انباشتن بسته‌های درو شده.

**لاخوار:** ۱) باری چه‌فته‌وبوگ؛ ۲) ژێروا ف ۱) بار کج؛ ۲) طرف پایین.

**لاخوارگ:** ژێروا ف طرف پایین.

**لاخوارو:** لاخوارگ، ژێروا ف طرف پایین.

**لاخۆر:** ۱) حه‌یوانێ که له ناخوری حه‌یوانی ته‌نیشتی دزی ده‌کا؛ ۲) برینی له چه‌وره‌و مالانگه‌ز ف ۱) دامی که از آخور پهلویی بچرد؛ ۲) کنایه از سورچران.

**لاخوراو:** که‌ناره‌سواو ف پهلوسابیده.

**لاخه:** گیای دروراوی نه‌به‌سنراوی کۆم‌نه‌کراو ف گیاه دروبدهٔ جمع نشده.

**لاخێز:** ۱) سێلاو؛ ۲) ناخێز ف ۱) سیل؛ ۲) نیم‌خیز.

**لادار:** ۱) نالوداری خانو؛ ۲) جه‌لاکی فه‌راغ ره‌شمال؛ ۳) دوداری دریژی جوارچێوه‌ی دارته‌ون؛ ۴) نه‌رفه‌دار ف ۱) الوار سقف؛ ۲) ستونك کنارهٔ چادر؛ ۳) چوب کنارهٔ دستگاه بافندگی؛ ۴) طرفدار.

**لادان:** ۱) خستنه‌که‌ناره‌وه؛ ۲) نافه‌ی گوشاد؛ ۳) برینی له دبه‌نی‌و میوان‌بوون: (فه‌رمون لاده‌ن، لای ئه‌وان **لامان دا**)؛ ۴) کلابوون: (له ڕێ **لای دا**) ف ۱) کنار زدن؛ ۲) تافچهٔ گشاد؛ ۳) کنایه از مهمان شدن و اقامت کردن؛ ۴) انحراف.

**لادابه‌ن:** لانابه‌ن ف کمك ماما.

**لادڕ:** بۆدڕ، ره‌هۆل ف شکاف در سنگ و کوه.

**لادڕگه:** لادڕ، بۆدڕ ف نگا: لادڕ.

**لادز:** ۱) ده‌سکیس؛ ۲) دزی خوێنیله‌و سیرمه‌خۆر ف ۱) همکار دزد و به ظاهر آشنا؛ ۲) دله‌دزد.

**لاده:** ۱) ته‌باله‌ی له‌سه‌ریه‌ك داندراوی قوجه‌وه‌کراو، دیوار له نه‌پاله؛ ۲) میوان به؛ ۳) له ڕێ که‌نار بگره ف ۱) دیواره از ناپاله؛ ۲) مهمان باش؛ ۳) کناربگیر.

**لاده‌ر:** له ڕێ ده‌رجوگ ف مُنحرف.

**لاده‌س:** نزیك ئه‌وه‌نده‌ی ده‌ست بیگاتێ ف نزدیك در دسترس.

**لاده‌ست:** لاده‌ست ف دردسترس.

**لاده‌ستی:** جۆرێ کولێره، به‌نجه‌کێش ف نوعی گردهٔ نان.

**لاده‌گا:** ۱) دێ، دیهات؛ ۲) جێگه‌ی ئیسراحه‌ت ف ۱) روستا؛ ۲) جای استراحت، استراحتگاه.

**لادێ:** ۱) دیهات؛ ۲) ساتێ، تاوێ ف ۱) روستا؛ ۲) دمی.

**لادیڤ:** ده‌شته‌کی، به‌رانبه‌ری شارستانی ف روستایی.

**لادێبی:** خه‌لکی دیهات، گوندی ف روستایی.

**لار:** ۱) خوار، چه‌وت، چه‌وێل؛ ۲) به‌ده‌ن، گش نه‌نـدام؛ ۳) جۆرێ نفه‌نگی ڕاو؛ ۴) ڕۆیشتنی به‌ناز: (له‌نجه‌و لار)؛ ۵) کز، دالگۆشت؛ ۶) پشێر؛ ۷) جۆیرکه، مله ف ۱) کج؛ ۲) تن؛ ۳) نوعی تفنگ شکاری؛ ۴) چم و خم، رفتن با ناز و عشوه؛ ۵) لاغر؛ ۶) طوبلهٔ گاوان؛ ۷) حشرهٔ آبدزدك.

**لاڕ:** کز، دالگۆشت ف لاغر.

**لاران:** به‌شی نه‌سنوورابی ران ف قسمت کُلُفت ران.

**لاربوون:** ۱) خواربوون؛ ۲) داهانن ف ۱) کج شدن؛ ۲) خمیدن.

**لاڕبوون:** کزبوون، گۆشت‌که‌م‌کردنی به‌ده‌ن ف لاغر شدن.

**لاربوونـه‌وه:** ۱) داهانن، چه‌مانه‌وه؛ ۲) برینی له گیان‌ده‌رچوون ف ۱) خمیدن؛ ۲) کنایه از مُردن.

**لارك:** ته‌نیشت، ته‌ك ف پهلو، کنار.

**لارکـردن:** ۱) چه‌ماندن؛ ۲) خوارکردن: (خۆت جوانی دروس ده‌که‌ی ده‌لێی مه‌ی‌بینه/ بیالێکی پڕاوه **لاری که‌و مه‌ی ڕێژه**) «خیّام» ف ۱) خم نمودن؛ ۲) کج کردن.

**لارکردنه‌وه:** لارکردن ف نگا: لارکردن.

**لارکه:** ڕکه، سه‌ره‌وژووره‌ی سه‌خت‌و دژوار ف سر بالایی صعب‌العبور.

**لارۆ:** دیمه‌نی ڕوخسار له ته‌نیشته‌وه ف نیمرخ.

**لاروا:** ۱) ڕۆیشتنی خواره‌وخوار، لابه‌لاڕۆیشتن؛ ۲) کۆمه‌لی کرباران ف ۱) تلوخوردن از بی‌تابی؛ ۲) گروه خر بداران.

**لاروالاروا:** خواره‌وخوار ڕۆیشتن، تلاونل ف تلوتلوخوردن.

**لاروابی:** کرێنی شتێ له لایه‌ن چه‌ند که‌سێکه‌وه ف خر بد مشترك.

**لاروله‌نجه:** ڕۆیشتنی به‌ناز ف خرام.

**لاره:** ۱) نونـدگربانی زاروێ؛ ۲) ئامووری به‌کپارچه که ده‌نده‌س له خۆیه‌نی؛ ۳) ده‌نکێکـه له ناو گه‌نم ده‌روێ؛ ۴) ڕۆیشتنی به‌نـاز؛ ۵) بزوتنـه‌وه‌ی گیاو لکه‌داری ناسك له‌به‌ر با؛ ۶) جانه‌وه‌رلکی بچوکه له ناودا؛ ۷) جۆرێ گه‌نم؛ ۸) خواره‌وبوون به لای ته‌نشتا؛ ۹) خه‌تی خوار له‌کێلانـدا، هێلی چه‌فت ف ۱) گریهٔ شدیدبچه؛ ۲) خبش بکپارچه؛ ۳) دانه‌ای انگل در گندمزار؛ ۴) خرام؛ ۵) جنبش شاخه و گیاه از باد؛ ۶) حشره‌ابست آبزی؛ ۷) نوعی گندم؛ ۸) خم شدن به طرف پهلو؛ ۹) خط کج و مُعْوَج در شُخم.

**لاره‌سا:** سێبه‌ری نیوه‌ڕۆژه ف سایهٔ زوالی.

**لاره‌سه‌نگ:** ناسه‌نگ ف بار کج.

**لاره‌سیبه‌ر:** لاره‌سا ف سایهٔ زوالی.

**لاڕه‌شه:** نه‌خۆشیه‌کی ئاژه‌له ف نوعی بیماری دام.

**لاره‌لار:** لابه‌لاڕۆیشتن ف جنبیدن به هردو طرف در راه رفتن.

**لاره‌لاره:** لاره‌لار ف نگا: لاره‌لار.

**لاره‌مل:** گه‌ردن‌که‌ج ف گردن کج.

**لاره‌وای:** لارابی ف خر بد منترك.

**لاره‌و بوُن:** لاربوُنه‌وه ف نگا: لاربوُنه‌وه.

**لاره‌وکردن:** لارکردنه‌وه ف نگا: لارکردنه‌وه.

**لاره‌وه‌بوُن:** لاربوُنه‌وه ف نگا: لاربوُنه‌وه.

**لاره‌وه‌کردن:** لارکردنه‌وه ف نگا: لارکردنه‌وه.

**لاره‌وه‌لاره‌وه:** لاره‌لار ف نگا: لاره‌لار.

**لاری:** ۱) خواری، چه‌وتی: ۲) سه‌رنـاری جوٚرێ که‌رگی نه‌ستـوُ زرُنی بالاّبه‌رزه؛ ۳) بازی، گالّته، گه‌مه؛ ۴) دوژمنایه‌تی؛ ۵) به‌قسه‌نه‌کردن: (چیت پیٚ ده‌لّیٚ **لاری** مه‌که) ف ۱) کجی؛ ۲) لقب نوعی مُرغ، مُرغ لاری؛ ۳) بازی؛ ۴) دشمنی؛ ۵) گوش به حرف ندادن.

**لازی:** کزی، لاوازی، داڵگوٚشنی ف لاغری.

**لارێ:** ۱) لاده‌ر له رێگه؛ ۲) بیٚ‌چه‌قێن ر نه‌ساز ف ۱) منحرف؛ ۲) لجباز.

**لارێ‌بوُن:** ۱) له‌رێ لادان؛ ۲) بربێنی له بایی‌بوُن ف ۱) منحرف شدن از راه؛ ۲) کنایه از متکبّر شدن.

**لاری کردن:** ۱) له فه‌رمان ده‌رچوُن؛ ۲) گالّته‌کردن ف ۱) تمرّد کردن؛ ۲) شوخی و بازی کردن.

**لارێ کردن:** فریودان ر له رێ ده‌ربردن ف فریب دادن و منحرف کردن.

**لارێ گرتن:** لارێ‌بوُن ف منحرف شدن.

**لاز:** ۱) لاچ؛ ۲) شباکه؛ ۳) به‌رانی جوارساله ف ۱) بُرنای شوخ و زیبا؛ ۲) سرگین؛ ۳) قوچ چهارساله.

**لازگرد:** جوٚرێ کوتالّی گه‌زه ف نوعی پارچه.

**لازم:** پێوبست ف لازم.

**لازوُ:** ۱) ناره بوٚ پیاران؛ ۲) ئه‌ی جوان!، ئه‌ی جحێلّ! ف ۱) نام مردانه؛ ۲) خطاب به بُرنا، ای جوان!.

**لازوُیت:** ۱) گه‌نمه‌شامی، گوڵه‌پیٚغه‌مبه‌ره؛ ۲) لاسکی گه‌نمه‌شامی ف ۱) بلال، ذرّت؛ ۲) ساقهٔ ذرّت.

**لازه:** بیٚ‌که‌س و بیٚ‌سه‌رپه‌رشت ف بی فامیل و سرپرست.

**لازیان:** گونـدێکی کوردستـانه به‌عـسی کارلی کرد ف نام رروستایی در کردستان که نوسط بعثیان ویران شد.

**لاژ:** ۱) گێژ، نه‌فام، که‌م‌ئاوه‌ز، تیٚ‌نه‌گه‌یشتو؛ ۲) چه‌قه‌سروٚی قسه‌پێنام ف ۱) أبله، کم فهم؛ ۲) ژاژخا.

**لاژك:** لاژ ف نگا: لاژ.

**لاژگ:** لاژ ف نگا: لاژ.

**لاژلاژ:** لوٚژلوٚژ، روبشتنی به‌نه‌مه‌لّی ف نگا: لوٚژلوٚژ.

**لاژه:** گوٚرانی ف ترانه.

**لاژه‌بیٚژ:** گوٚرانی‌بێژ، قامبێژ ف ترانه‌خوان، خواننده.

**لاژه‌ك:** لاجه‌ك ف نوجوان.

**لاس:** ۱) لاز، لاچ، جحێلّی جوان‌جاك؛ ۲) لاخه؛ ۳) داریکه له دارسنجو ده‌کـاو درکی نیه؛ ۴) کوٚمـای گزره؛ ۵) ده‌نگی گوٚڵـه‌سه‌گ له کاتی نارکـردنی دێڵه‌بـه‌بـادا؛ ۶) ژه‌نینی گوٚڵه‌سه‌گ له دێڵه‌به‌با؛ ۷) فریو، فریب؛ ۸) ریخ، شباکه؛ ۹) ناوی پیاوانه ف ۱) برنای زیبا؛ ۲) نگا: لاخـه؛ ۳) درختی است جنگلی شبیه درخت سنجد؛ ۴) تودهٔ گیاه کوبیده؛ ۵) صدای سگ نر هنگام جفتگیری؛ ۶) کله‌زدن سگ نر بر ماده؛ ۷) فریب؛ ۸) سرگین؛ ۹) نام مردانه.

**لاسا:** ده‌مه‌لاسکه ف تقلید، ادا درآوردن.

**لاسار:** ۱) گویٚ‌نه‌بیس؛ ۲) سه‌رسه‌خت ف ۱) حرف نشنو، لجباز؛ ۲) دیکتاتور.

**لاساری:** ۱) گویٚ‌نه‌بیسی؛ ۲) بیٚ‌چه‌قێنی، سه‌رسه‌ختی ف ۱) حرف نشنوی؛ ۲) دیکتاتوری.

**لاساکردنه‌وه:** ده‌مه‌لاسکه‌کردن ف ادای کسی را در آوردن.

**لاسامه:** ۱) شه‌ست، ریٚژنه، ره‌هێڵه؛ ۲) سیڵاو، لاپار، لاخێز ف ۱) رگبار باران؛ ۲) سیل.

**لاسایی:** ده‌مه‌لاسکه، لاسا ف نگا: لاسا.

**لاسایی کردنه‌وه:** لاساکردنه‌وه ف ادای کسی را درآوردن.

**لاستیق:** جیل، جیر ف لاستیك.

**لاستیك:** جیر، لاستیق ف لاستیك.

**لاس‌خواردن:** خه‌ڵه‌تان، فریوخواردن ف فریب خوردن.

**لاسدان:** ۱) خاپاندن؛ ۲) ژه‌نینی گوٚڵ له دێڵه‌به‌با ف ۱) فریب دادن؛ ۲) کله‌زدن سگ نر ماده را.

**لاسك:** ۱) حبله‌ی سه‌برى ئه‌سب؛ ۲) لاچك؛ ۳) ریخ، شباکه؛ ۴) قروُسکه‌ی گوٚڵه‌سه‌گ له ناوکردنی دێڵ‌دا؛ ۵) زگ به لای خالّبگه‌ره؛ ۶) زمـان‌کێشـان له گه‌رمان ف ۱) شبههٔ آهستهٔ اسب؛ ۲) ساقه؛ ۳) سرگین؛ ۴) صدای نازك سگ نر در لاس زدن با ماده؛ ۵) جانب شکم؛ ۶) زبان در آوردن و هن هن کردن از گرما.

**لاس کردن:** ۱) درزنی گیاو نه‌به‌ستنی؛ ۲) حبلاندنی به‌سه‌برى ئه‌سپ؛ ۳) شباکـه کـردنی ره‌شه‌ولاّغ ف ۱) درویدن و جمع نکردن گیاه؛ ۲) شیهه کشیدن آهستهٔ اسب؛ ۳) سرگین انداختن گاو.

**لاسکه‌لاسك:** ۱) لاسی گوٚڵه‌سه‌گ؛ ۲) حبله‌ی له‌سه‌رخوٚی ئه‌سپ؛ ۳) زمان‌کێشان و پشوسوار بوُن له گه‌رمان ف ۱) لاس سگ نر؛ ۲) شیههٔ آهستهٔ اسب؛ ۳) زبان در آوردن و به هن‌هن افتادن از گرما.

**لاسکێ:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد ف رروستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**لاسماڵ:** که‌سیٚ ته‌باڵه له ده‌شت کوٚده‌کاته‌وه ف کسی که تاپاله جمع می‌کند.

**لاسماڵی:** کوٚکردنه‌وه‌ی ته‌باڵه له ده‌شت ف تاپاله جمع کردن.

**لاسوُ:** ۱) ناوی پیاوانه؛ ۲) لازوُ، ئه‌ی جوان! ف ۱) نام مردانه؛ ۲) ای جوان!.

**لاسوُتاو:** ۱) زوٚر برژاری که‌مێك لیٚ‌سوُتاو: (چه‌وه‌نده‌ری **لاسوُتاو** زوٚر خوٚشه)؛ ۲) میوه‌ی بێستانی زه‌ده‌دار ف ۱) نیم‌سوخته؛ ۲) میوهٔ زده‌دار بالیزی.

**لاسوُتی:** لاسوُتاو ف نگا: لاسوُتاو.

**لاسور:** ۱) خلیسکان؛ ۲) خلیسك ف ۱) لغزش؛ ۲) لیزگاه.

**لاسوٚر:** شتیٚ که هێندێکی سوٚر بیٚ: (سێوی **لاسوٚر**، مه‌لای **لاسوٚر**) ف نیمه‌سرخ.

**لاسوُر:** ١) لاسۆر؛ ٢) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ١) نگا: لاسوُر، نیمەسرخ؛ ٢) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**لاسوُره:** لاسۆر: (کولمت سێوی **لاسوُره**) ف نیمەسرخ.

**لاسەروُ:** ١) سەرەوەی کوڕ؛ ٢) بڵندایی ف ١) صدر مجلس؛ ٢) بلندی.

**لاسەره:** خشڵێکی ژنانە بە لایەکی سەربانەوەی قایم دەکەن ف زیوری است.

**لاسەنگ:** ١) ناسەنگ، باری خوار؛ ٢) تەرازووی ناسەنگ ف ١) بارکج؛ ٢) ترازوی ناميزان، کفه‌ای سنگين و کفه‌ای سبک.

**لاسی:** زبخاوی ف سرگين آلود.

**لاسیق:** لاسنبك، جیر ف لاستيك.

**لاسیك:** لاسبق ف لاسنبك.

**لاش:** کەلاک، جەندەک، تەرم ف لاشە، جُثّه.

**لاشاخ:** ١) شانێ کێو؛ ٢) ئانیشك ف ١) ستیغ؛ ٢) آرنج.

**لاشان:** ١) جەمسەری قوڵ و شان؛ ٢) شانی کێو، لاشاخ ف ١) اطراف کتف؛ ٢) ستيغ.

**لاشخۆر:** ١) هەر جانەوەرێ حەیوانی تۆپیو بخوا؛ ٢) برێنی لە پارەداری پیسکەی پارە پەسوُت دەر ف ١) لاشخور؛ ٢) کنایه از خسيس رباخوار.

**لاشکاو:** شتێ کە لە فەراغەوە شکابێ ف کنار شکسته.

**لاشە:** کەلاکی تۆپیو، کەلاکی فڕێدراو ف لاشه.

**لاشەڕ:** دوُرەبەرێز لە شەڕو کێشە ف ملایم و دور از جار و جنجال.

**لاشەوبلاکە:** کەناری کاکبلە ف کنارهٔ آرواره.

**لاشەویلکە:** لاشەوبلاکە ف کنارهٔ آرواره.

**لاشەویلە:** لاشەوبلاکە ف کنارهٔ آرواره.

**لاشیپان:** هەر یەك لە دارەدرێژەکانی چوارچێوەی درگا ف دو ضلع بلند چهارچوب در.

**لاشیپانە:** لاشیپان ف نگا: لاشیپان.

**لاعب کەره:** مەرایی کەر، زمان لوُس ف چاپلوس.

**لاعبی:** لاعب کەره ف چاپلوس.

**لاعیده:** عەلاحیده، تایبەتی ف ویژه.

**لاف:** ١) بەخۆدادەری بە پەمۆ ناخندراو؛ ٢) خۆهەڵکێشان؛ ٣) درۆ ف ١) لحاف؛ ٢) لاف؛ ٣) دروغ.

**لافاو:** لاپاو، لاخێز، سێڵاو ف سيلاب.

**لافلافوك:** لاولاو، لەولاو ف لبلاب.

**لاف لیدان:** خۆهەڵکێشان، پەسنی خۆدان ف لاف زدن.

**لاف وگەزاف:** درۆو دەلەسە ف تُرّهات.

**لافە:** راوە، فسەپەرێنی، وراوە ف هذيان.

**لافی:** درۆزن ف دروغگو.

**لاڤ:** ١) جحێڵ، جوان بەتەمەن، خوێرت، گەنج؛ ٢) خوشبك، جوان لەبەرجاو، قەشەنگ، زیبا؛ ٣) پارانەوە، کرۆزانەوە ف ١) جوان؛ ٢) زيبا؛ ٣) لابه.

**لاڤاهی:** پارانەوە، لاڤایی ف لابه.

**لاڤایی:** پارانەوە ف لابه کردن.

**لاڤژ:** لاژە، لاوژە، قام، گۆرانی ف ترانه.

**لاڤلاڤ:** ١) زۆر جوان و خوشبك؛ ٢) گیایەکە گوڵێکی سوُر یان شین دەکا بە دارو گیاوە پێچ دەخوا بەبانیان دەپشکوێ و زوُ دەپوُچێنەوە ف ١) زيبای تمام عيار؛ ٢) لبلاب، پيچك.

**لاڤلاڤك:** گوڵی لاڤلاڤ ف لبلاب، پيچك.

**لاڤە:** پارانەوە ف لابه.

**لاڤەکرن:** لاڤایی ف التماس و لابه کردن.

**لاڤەکی:** بەکروزەوە پارانەوە ف التماس و زاری.

**لاڤەلاڤ:** پارانەوەی زۆر ف لابهٔ زياد.

**لاق:** ١) قاچ، لە بەری پاوە تا جومگەی ران؛ ٢) گۆشتی لاوازی بێ قەڵەوایی ف ١) لنگ؛ ٢) کم گوشت.

**لاق چەقاندن:** پێ چەقاندن، سوُربوُن لەسەر داوای خۆ ف اصرار و لجاجت، پافشاری.

**لاق درێژ:** برێنی لە کەڵەگەنی کزو باریك ف لنگ دراز.

**لاقرتی:** گاڵتەو گەپ ف شوخی و تفريح.

**لاقردی:** لاقرتی ف شوخی و تفريح.

**لاقوُن:** ئەسنوُرایی سمت ف کلفتی باسن.

**لاقە:** ١) پەیوەندی: (لاقەم بەسەریەوە نیە)؛ ٢) گایینی نارەوا: (لاقەی کردوە)؛ ٣) پاڕاوەشاندنی بەنەوژم ف ١) علاقه؛ ٢) تجاوز جنسی؛ ٣) لگد.

**لاقەبرغە:** خاڵیگە، فەبرخە ف نهيگاه.

**لاقەردی:** ١) قسەی زۆری بێنام؛ ٢) خۆهەڵکێشانی بەدرۆ ف ١) سخن بسيار و بی‌معنی؛ ٢) بلُف زدن.

**لاقەفرتە:** پاڕاوەشاندنی تازە کوژراو ف لگدپرانی تازه کشته شده.

**لاقەفرتێ:** لاقەفرتە ف نگا: لاقەفرتە.

**لاقەفرێ:** لاقەفرتە ف نگا: لاقەفرتە.

**لاقەکراو:** گابراو بە نارەوا ف مورد تجاوز جنسی واقع شده.

**لاقەکردن:** گایینی نارەوا ف تعرّض جنسی کردن.

**لاقەید:** گەللابی ف بی‌بند وبار.

**لاقین:** لاقوُن ف کلفتی باسن.

**لاقینگ:** لاقوُن ف کلفتی باسن.

**لاك:** ١) لاشە؛ ٢) کەپەك و جوی لە ئاوداکوڵاو بۆ ئاژەڵ و سەگ؛ ٣) بزوتنی دوُر لە دەسەلات: (لاکی سەربەتی)؛ ٤) قالب؛ ٥) ئەمچان؛ ٦) رەنگە، شابەد ف ١) لاشه؛ ٢) نخاله و جو آب بز برای خوراك دام و سگان؛ ٣) تکان بدون اراده؛ ٤) قالب ریخته گری، لاك؛ ٥) بەقُل دوقُل؛ ٦) شاید.

**لاکان:** لێڵاویکە لە نوُلی دەینەنن. *پانە لە قاچیانی دەبەستن بۆ بەسەربەفرا زۆیشتن* ف اسکی محلّی از ترکهٔ بافته شده.

**لاکانی:** لاکان ف نگا: لاکان.

**لاکاول:** لاقەبرغە، خاڵیگە ف نهيگاه.

**لاكايا:** دەردەدڵ كردن، گلەی لە بەخت كردن [ف] شكوه كردن.

**لاكابۆخ:** زۆر بەكرۆزەو گلەیی لە ژیان [ف] شاكی از زندگی.

**لاكایە:** لاكایا [ف] شكوه كردن.

**لاكاییش:** بەكرۆزەو نۆزە، دەردیدڵھەڵڕێژ [ف] شاكی از زندگی.

**لاكـردن:** سەرو بەركـردنی نیر بۆ نامـانـج، لەنـامانج نەكەوتنی نیر [ف] انحراف تیر از آماج.

**لاكردنەوە:** ناوڕدانەوە [ف] واپس نگری.

**لاكم:** ئیتر هەر ئەوەیە، چیترنا [ف] فقط و فقط.

**لاكن:** لاكم [ف] فقط و فقط.

**لاكۆ:** زبارەی بەمۆچنین [ف] بنیەچینی تعاونی.

**لاكوت:** ١) چاوحیز؛ ٢) لاپرەسەن، خوێنیھەڵقوتێن [ف] ١) هیز چشم؛ ٢) انگل ناخوانده، فضول.

**لاكۆت:** بەمۆچنی [ف] بنیەچینی.

**لاكۆتی:** بەمۆچن [ف] بنیەچین.

**لاكوتێ:** چلێسی خوارەلۆكی‌خواردن، زگ‌لەوەزێن [ف] شكم‌چران.

**لاكۆش:** ١) خوارەوەی داوێن: (**لاكۆشێكی** گوێز هێنابو)؛ ٢) بیوەژنی سێوی‌داری بێكەس كە زەنج نەدا [ف] ١) دامنهٔ دامن؛ ٢) بیوهٔ بچه‌دار زحمت‌كش.

**لاكۆشكە:** نەرەفداری [ف] هواخواهی.

**لاكۆشی:** ١) لاكۆشكە، نەرەفداری؛ ٢) ئەركدانی بیوەژنی سێوی‌دار [ف] ١) طرفداری؛ ٢) رنج بیوهٔ بچه‌دار.

**لاكۆڵ:** لە قەراغەوە كوڵین [ف] از طرفی كندن.

**لاكۆلان:** كوچەی تەنگ‌و بەرز [ف] پس كوچه.

**لاكە:** لاك، بزوتنی سەربەخۆی لە دەسەڵات بەدەر: (**لاكەی** سەرم دێت) [ف] حركت بی‌اراده.

**لاكەت:** شتێ كە لە قەراغەوە بەرزبێ [ف] لبه‌شكسته.

**لاكەفنە:** باركەوتو [ف] درمانده.

**لاكەل:** ١) لاكـەت؛ ٢) جۆرێ تفـەنگ [ف] ١) لبـەشكسـتـه؛ ٢) نوعی تفنگ.

**لاكەن:** لاكۆڵ [ف] از یك طرف كندن.

**لاكەند:** لاكۆڵ، لاكەن [ف] از یك طرف كندن.

**لاكەوتن:** لاچوُن [ف] نگا: لاچوُن.

لاكەوتە: باركەوتو، داماو، لاكەفنە [ف] درمانده.

**لاكـەی‌سەرهـاتن:** ١) بریتی لە ماندوبوُنی زۆر؛ ٢) بریتی لە كزبوُن‌و زراوبوُن [ف] ١) كنایه از خستگی بسیار؛ ٢) كنایه از لاغر مردنی شدن.

**لاكی:** رەنگێكە بۆ قاڵی‌و بەرە [ف] رنگی در قالی، لاكی.

**لاكێش:** ١) قاڵی درێژۆكە، كەنارە؛ ٢) جگەرەخۆر لە توتنی خەڵك؛ ٣) زۆربێژ [ف] ١) قالی كناره؛ ٢) سیگاری انگل، مفت‌كش؛ ٣) روده‌دراز، وراج.

**لاكێشی:** ١) جەنەبـازی‌و زۆروێژی بێتام؛ ٢) جگەرەكێشی لە توتنی خەڵك [ف] ١) وراجی، روده‌درازی؛ ٢) سیگار مفت كشیدن.

**لاكین:** ١) تەشكەولەت، بنەدەفری سواڵەتی شكاو؛ ٢) بەلام، بلام [ف] ١) ظرف سفالین شكسته؛ ٢) لیكن.

**لاگـا:** ١) جێگەی وچان‌دان لە دەشت؛ ٢) دێهات [ف] ١) استراحتگاه صحرایی؛ ٢) روستا.

**لاگابی:** دێهاتی، گوندی [ف] روستایی.

**لاگر:** نەرەفدار [ف] هواخواه

**لاگـرتن:** ١) ئۆقـرەگرتن؛ ٢) نەرەفداری كردن [ف] ١) آرام گرفتن؛ ٢) طرفداری كردن.

**لاگری:** نەرەفداری، داژداری [ف] هواخواهی، طرفداری.

**لاگوێل:** بڕی دەستێ، گوێلێ، گولم [ف] پر یك كف دست.

**لاگە:** لادێ [ف] روستا.

**لاگەیی:** گوندی، لادێیی [ف] روستایی.

**لاگیر:** داژدار [ف] طرفدار.

**لاگیرە:** زەنبەرێكە بە لای سەرەوە قایم دەكرێ [ف] زیوری است.

**لاگیری:** داژداری [ف] طرفداری.

**لال:** ١) بنیادەمێ كە زوانی قسـەكـردنی نەبێ؛ ٢) لچەم، لنك، لەكن: (كبسكا من **لال** نەبە) [ف] ١) لال؛ ٢) نزد.

**لاڵ:** ١) لال؛ ٢) بەردێكـی بەنـرخـە بەرەنگی سوُری توخ‌و سوُری نامـاڵ‌زەرد؛ ٣) سوُری تاریك؛ ٤) میوەی زۆرگەبننو [ف] ١) لال؛ ٢) لعل؛ ٣) سرخ تیره؛ ٤) میوهٔ زیادرسیده.

**لاڵ:** لال، بێ‌زوان [ف] لال.

**لالا:** ١) خەوتنی زارۆك؛ ٢) شەمعـدانی شوشـەلـەسەر؛ ٣) لە گشت ئالی بەوە: (**لالا** دەورم گیرا) [ف] ١) خواب كودك؛ ٢) لاله، شمعدان؛ ٣) از هرطرف.

**لالاف:** لافاو، سێلاو، لەهی، لی، لا، لێمشت [ف] سیلاب.

**لالاكردن:** خەوتنی زارۆك [ف] خوابیدن كودك.

**لالاگرتن:** گشت ئالی گرتن [ف] همه طرف را گرفتن.

**لالامۆكردن:** بریتی لە زۆرمەست‌و سەرخۆشی بێ‌هۆش: (هێندە مەستە **لالامۆ** دەكا) [ف] كنایه از مست خراب.

**لالان:** پاڕانەوە [ف] لابه.

**لالانەوە:** پاڕانەوە، لالان [ف] لابه‌كردن.

**لالایی:** ١) گۆرانی بۆ دەخـەوكـردنی زارۆك؛ ٢) ربابی، كلكـە سوُتە، رۆسنی [ف] ١) لالایی؛ ٢) ربا و تملق.

**لالایی:** ١) بێ‌زوانـی؛ ٢) لـەزوان‌كەوتـن: (**لالاییم** داهــات) [ف] ١) بی‌زبانی؛ ٢) از نطق افتادن.

**لالغاوە:** قەراغی دەم، سوُچی زار [ف] گوشهٔ دهان.

**لالكە:** لالان، پاڕانەوە [ف] لابه.

**لالكەر:** ١) كەسێ كە دەپاڕێنەوە؛ ٢) ڕوُبین [ف] ١) لابه‌كننده؛ ٢) متملق.

**لالكـەر:** ١) گالتـەی فەنـای بێ‌دەنـگ؛ ٢) كەڕولاڵ [ف] ١) نوعی سرگرمی؛ ٢) كرولال.

**لالكەهاس:** كەسێ كە دەپاڕێنەوە، لالكەر [ف] لابه‌كننده.

**لالو:** خاڵ، برای دایك [ف] دایی.

**لالۆ:** لالو، خاڵۆ ف دایی.

**لالـوپاڵ:** بێ‌دەنگ‌و بێ‌سەروزمان: (لە عەیبەتان **لالوپاڵ** بوم) ف بی سروزبان، خاموش.

**لالوت:** قەلس، کەسێ کە دەنگی لە بەکێك گۆڕیوە: (دەگەڵم **لالوتە**) ف قهرکرده.

**لالوتات:** لاڵ‌وپاڵ ف بی‌سر وزبان.

**لالوتە:** گن ف کسی که تو دماغی حرف می‌زند.

**لالوتی:** قەلسی، قار ف قهرکردگی.

**لالوچ:** لاگویل ف بر بك کف دست.

**لالوزا:** خالۆزا ف دایی‌زاده.

**لالۆزا:** لالوزا، خالۆزا ف دایی‌زاده.

**لالوژن:** خالۆژن، ژنی خاڵ ف زن‌دایی.

**لالۆژن:** خالۆژن، لالوژن ف زن‌دایی.

**لالومەرە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لالوێچ:** لالوچ ف پر بك کف دست.

**لالە:** ١) خاڵ، لالۆ؛ ٢) شەمدانی بەشوشە، لالا؛ ٣) رەبەنۆك، مێلاقە ف ١) دایی؛ ٢) مردنگی، شمعدان؛ ٣) آلاله.

**لالە:** پارانەوە، لاڤە، لالان ف لابه.

**لالەپاس:** گوڵێکی بەرزەبالایە کە بە زۆر رەنگان هەیە ف گل لاله عباسی.

**لالـەبەر:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لالەپ:** کەنارەی دەستێ ف کنارکف.

**لالەپەترە:** تورە، کەسێ کە لە قسەکردندا زمانی گرێ دەکا ف الکن.

**لالەپەتە:** لالەپەترە ف الکن.

**لالەزار:** گوڵجاڕ ف لاله‌زار.

**لالەعەباس:** لالەپاس ف گل لاله‌عباسی.

**لالەعەباسی:** لالەپاس ف گل لاله‌عباسی.

**لالەعەبباسی:** لالەپاس ف گل لاله عباسی.

**لالەعەواس:** لالەپاس ف گل لاله عباسی.

**لالەغاوە:** لالغاوە ف گوشهٔ دهان.

**لالەك:** لالەپەتە، تور ف الکن.

**لاکەر:** گەمەی فڕوفێ ف بازی بی‌صدا.

**لالەکێ:** لالی، قسەکردن نەتوانین ف لالی.

**لالەلال:** نورەنور، قسە بە رەوانی بۆنەهاتن ف بالکنت سخن گفتن.

**لالەنگ:** ناسەنگ ف نگا: ناسەنگ.

**لالەنگەر:** ئامرازێکی جولابی ف ابزاری در دستگاه بافندگی.

**لالەنگی:** میوەیەکە لە نیرەی نارنج‌و پرتەقاڵ نەرم‌و شیرینە ف نارنگی.

**لالەمونی:** لاسای لاڵ کردنەوە ف لال‌بازی.

**لالەوز:** زاروی نازبرەك‌و گێلۆکە ف کودك کودن.

**لالـەوەڕ:** ١) ئاژەڵێ کە لە گەلـە دوور ئەکەوێتەوە؛ ٢) بریتی لە چەورەو زگ‌لەوەڕێن؛ ٣) قسەدرێژی کۆرجازکەر ف ١) حیوانی که از گله دور می‌شود؛ ٢) کنایـه از سورچـران؛ ٣) روده‌درازی کـه آدم را خسته می‌کند.

**لالەوێچ:** لالوچ ف پرکف دست.

**لالهی:** پارانەوە، لالانەوە ف توسل.

**لالەیی:** لالهی ف توسل.

**لالی:** ١) بێ‌زوانی؛ ٢) لە کن، لە لای؛ ٣) دەوری لە مس؛ ۴) خەوننی زاروك: (بەبەکە **لالی** کردوە)؛ ۵) فەرمان بە خەوننی زاروك: (بەبەکە لالی)؛ ۶) خاڵۆ، لالۆ، برای دایك ف ١) لالی؛ ٢) درنزد؛ ٣) بشقاب مسی؛ ۴) خواب بچه؛ ۵) امر به خوابیدن؛ ۶) دایی.

**لاڵی:** ١) بێ‌زوانی؛ ٢) سوری بەڕەنگی لاڵ ف ١) لالی؛ ٢) لعل رنگ.

**لالیان:** پارانەوە ف لابه.

**لالیانەوە:** لالانەوە ف لابه‌کردن.

**لالێ‌بڕبن:** تەنبس‌کردن ف در تنگنا قراردادن.

**لالێ‌بڕبنەوە:** لالێ‌بڕبن ف در تنگنا قراردادن.

**لالێ‌سەندن:** دەرەتان بۆنەهێشتن ف راه فرار بندآوردن.

**لالێ‌سەنن:** لالێ‌سەندن ف راه فرار بندآوردن.

**لالی کردن:** خەوننی زاروك ف خوابیدن کودك.

**لالێ کردنـەوە:** ١) ئاوڕ وەسەردان؛ ٢) ئاوڕوێدان، پێ‌زاکەبشتن؛ ٣) بەشێکی گەورە بڕین لە شتێ: (**لابەکی لێ کردەوە**) ف ١) واپس نگاه کردن؛ ٢) غمخواری کردن؛ ٣) قسمتی زیاد از چیزی بریدن.

**لالی‌لالی:** بخەوە بخەوە، دایك بۆ دەخەوکردنی زاروکی دەڵێ ف بخواب بخواب، لالایی برای خواباندن کودك.

**لام:** ١) بەڵێ، بیانو؛ ٢) کولمە، گۆنا؛ ٣) لە کن من؛ ۴) بەبڕوای من؛ ۵) ناوی پیتێکی ئەلف‌وبێکە؛ ۶) قسەو پرسیار، دەگەڵ جوم دەگوترێ: (بێ **لام**‌و جوم کارەکەی کرد) ف ١) بهانه، انگیزه؛ ٢) گونه، رخسار؛ ٣) نزدمن؛ ۴) به‌عقیدهٔ من؛ ۵) نام حرفی در الفباء؛ ۶) گفتار.

**لاُم:** ١) گوپ؛ ٢) کولمە ف ١) لُپ؛ ٢) گونه.

**لامات:** زللە، زیللە، شەقام ف سیلی.

**لامانە:** جەم مەیە، نك نێمەیە ف نزد ما است.

**لام‌با:** ١) دورم‌خانەوە؛ ٢) لە نزیکم بوایە؛ ٣) لامپا، چرای شوشەبەسەر ف ١) دورم کند؛ ٢) اگرنزد من بود؛ ٣) چراغ نفتی لامپا.

**لام‌بایە:** نزیکی من با ف اگر نزد من بود.

**لام‌بو:** نزیك بە من بو ف نزد من بود.

**لام‌بوایە:** لام بابە ف اگر نزد من بود.

**لامپە:** لامپا، چرای شوشەبەسەر ف لامپا.

**لام‌بی:** ١) لام بو؛ ٢) نزیك بە من بی ف ١) نزد من بود؛ ٢) نزد من باشی.

**لامپا:** چرای بەشوشە ف لامپ، چراغ شبنه‌ای.

**لامپە:** لامپا ف نگا: لامپا.

**لامـژ:** ١) بێچـوی شیرەخـۆرە کە مەمکی جگـە لە دایکی دەمژێ؛ ٢) کەسێ کەلـەجگـەرەی خەڵکی مژدەدا ف ١) بچـه‌ای که از بستان

غیرمادر شیر می‌خورد؛ ۲) کسی که به سیگار دیگران پُك می‌زند.

**لامسەرلابی:** بێ گوێ‌بێ‌دان، گەللایی: (کارەکانی **لامسەرلابی** دەکا) ف اهمّیت ندادن.

**لامشت:** لالۆچ ف بر بك کف دست.

**لامك:** دمو چاوچکۆلە ف رخسار کوچولو.

**لامل:** ۱) لافەبد؛ ۲) کەنارەی نەسنۆ ف ۱) لافید؛ ۲) صفحهٔ گردن.

**لاملامك:** شەوبلاکەی خوارەوە ف آروارهٔ زیر بن.

**لامـۆ:** ۱) ناوەکی؛ ۲) حەیوانی بێگـانە لە ناو گەلەدا ف ۱) آبکی؛ ۲) حیوان غریبه در گله.

**لامۆجۆم:** کەمترین قسە لە جوابدا ف کمتر بن اعتراض، لام تا کام.

**لاموجیم:** لاموجوُم ف نگا: لاموجوُم.

**لامۆفەك:** یاخی، نەشفی، دژی زاکۆنی دەولەت ف یاغی.

**لامە:** ۱) جەم متە؛ ۲) مەرایی، ریابی ف ۱) نزد من است؛ ۲) تملّق.

**لامـەردو:** ۱) شوێنی میوانـان لە مالـدا؛ ۲) جێگـەی میوانانی بیاو لە رەشمالدا ف ۱) بیرونی خانه، مهمانخانه؛ ۲) جای مهمانان در چادر.

**لامەردە:** لامەردو ف نگا: لامەردو.

**لامەرکەزی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لامەزەب:** زالم، بەدکار ف ستمگر.

**لامەلە:** سۆبایی لەسەر لانەنیشت ف شنای بر پهلو.

**لامەمك:** دو زارۆ کە شیری دایکێك دەمژن ف هم‌شیر.

**لامی:** ۱) رۆلە، عەولاد؛ ۲) جەم منی ف ۱) فرزند؛ ۲) نزد منی.

**لامی‌جیم:** خۆهەلکێشان، مەحنی‌خۆکردن ف لاف و خودستایی.

**لامێردان:** لامەردو ف نگا: لامەردو.

**لامێردە:** لامەردو ف نگا: لامەردو.

**لامێژ:** بێجوێ کە شیری جگە لە دایکی خۆی دەمژێ. لامژ ف نگا: لامژ.

**لامیسك:** بێچارەو نەدار ف بینوا.

**لان:** ۱) نك نیمە؛ ۲) نك، جەم، کن؛ ۳) کونی شێر و کەروێشك؛ ۴) گە، مان؛ ۵) نهێنی: (سەگی **لانگر** وانا: بانی‌گر) ف ۱) نزدما؛ ۲) نزد؛ ۳) کنام شیر و لانهٔ خرگوش؛ ۴) اعتصاب، امتناع از رفتن؛ ۵) بدون خبردادن.

**لان:** باشگرێ کە جێگە دەگەیەنێ: (بەردەلان، کەندەلان) ف پسوند مکان.

**لانجیر:** دیزەی شیر تێدا هەوێن‌کردن ف دیزی ماست‌بندی.

**لاندڕ:** بوُدر، رەهۆل ف آبکند، کند.

**لاندك:** بێشکە، دەرگوش، دەبدیك ف گهواره.

**لانك:** بێشکە، دەرگوش، دەبدیك، لاندك ف گهواره.

**لانکە:** لاندك، لانك ف گهواره.

**لانکەبی:** کاربنەی میچ بە بانەوە ف الوار سقف از پهنا.

**لانگر:** ۱) داژدار، تەرەفدار؛ ۲) سەگێ کە بێ حەپە گاز لە پیاو دەگرێ ف ۱) طرفدار؛ ۲) سگی که بدون پارس گاز بگیرد.

**لان‌گرتن:** تەرەفداری کردن ف طرفداری.

**لانگیری:** لان‌گرتن ف طرفداری.

**لانە:** ۱) لامانە؛ ۲) شوێنی شەوانەی بالدار؛ ۳) کونی شێر؛ ۴) قەد، لا: (بـە دولانـە دەگاتـەوە)؛ ۵) بربنی لە جێ‌سانـەوەی بنیادەم: (خانەو لانـەبەکمـان نیە)؛ ۶) پاشگـری بچـوُك‌شانـدان: (خـڕبلانـە، خونچیلانـە)؛ ۷) کەلەرم، کەلەم ف ۱) نزد ما است؛ ۲) آشیانه؛ ۳) کنام شیر؛ ۴) لا؛ ۵) کنایه از خانه؛ ۶) پسوندتصغیر؛ ۶) کلم.

**لانـەواز:** ۱) بێ‌کەس‌و نازشـێواو؛ ۲) رەبـەن‌و ئاوارە؛ ۳) یالـداری لانەگوم‌کردو ف ۱) بیچاره و درمانده؛ ۲) آوارهٔ خانه به‌دوش؛ ۳) پرندهٔ آشیان گم کرده.

**لانەوبان:** مال‌وحال ف خانەوکاشانه.

**لانەوبانە:** لانەوبان، مال و حال ف خانه و کاشانه.

**لانـەولان:** جێ‌گۆڕکێ‌کردنی کەروێشك لە ترسان ف جا عوض کردن خرگوش از ترس.

**لانی:** ۱) ئەندازە: (**لانی** کەم وەرە لامان، **لانی** کەم مشتێ گەنم بدە)؛ ۲) لە لای: (بـرام **لانی** مام‌پیرۆنە)؛ ۳) کونی جانەوەرانی کێوی ف ۱) حدّ؛ ۲) درنزد؛ ۳) سوراخ حیوانات کوهی.

**لانی:** لان: (شینکەو سەوزە**لانی**یە) ف پسوندمکان.

**لاو:** ۱) خۆرت، جحێل؛ ۲) خوشێك، جوان، زێبا؛ ۲) کوڕ، فرزەندی نێر: (زارۆکی من دو کیژو دو**لاو**ن)؛ ۳) لافـاو، لاپاو، لاخێز، سێلاو ف ۱) بُرنا؛ ۲) زیبا؛ ۳) فرزند نرینه؛ ۴) سیل.

**لاواچ:** پەنجەرەی پچوُك ف پنجرهٔ کوچك.

**لاواز:** دالگۆشت، کز ف لاغر.

**لاوازی:** کزی، دالگۆشنی ف لاغری.

**لاوان:** ۱) خۆرنان، گەنجان، جحێلان؛ ۲) پارانەوە ف ۱) جوانان؛ ۲) لابه.

**لاوانـدن:** ۱) دلـدانـەوە، ئاگاداری‌کردن لە کەسێ؛ ۲) پارانەوە ف ۱) نوازش کردن؛ ۲) لابه کردن.

**لاوانـدنەوە:** ۱) لاواندن؛ ۲) بەمردوهەلگوتن ف ۱) نگا: لاواندن؛ ۲) مرده را در شیون ستودن، مویه.

**لاواننەوە:** لاواندنەوە ف نگا: لاواندنەوە.

**لاوانـە:** ۱) خۆرت‌ناسـایی، وەك جحێلان؛ ۲) قەراغی بلنـدکراو؛ ۳) قەراغی قەبر؛ ۴) شیپانە، لاشیپانە؛ ۵) دو دەپی درێژ لە چەنجەرەدا ف ۱) جوان مانـنـد؛ ۲) کنـارهٔ برآمـده؛ ۳) کنـار ولبـهٔ گور؛ ۴) کنـارهٔ چهارچوب در؛ ۵) دوتخته در چرخ خرمنکوبی.

**لاوانـەوە:** ۱) دلـداری، دلخـۆش کردن؛ ۲) بێ‌هەلگوتنی مردو ف ۱) نوازش؛ ۲) مویه.

**لاوانی:** خۆرنی، گەنجایەنی، جحێلی، لەوەندی ف جوانی.

**لاوتە:** لابوُت ف نگا: لابوُت.

**لاوچ:** شوێنێ کە لایەکی ئاوەو سێ‌لای وشکانیە ف خلیج.

**لاوچاك:** کوڕەجحێلەی خوشکۆك ف بُرنای زیباروی.

**لاور:** جانەوەری کێوی ف حیوانات وحشی.

**لاوران:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لاورگە:** زگ‌لەوەزێن، چەورە ف طفیلی.

**لاوژا:** براگەورە ف برادر بزرگ.

**لاوژۆك:** تازەجوان، دەم‌زۆت، لاوی تازەپێگەیشتو ف نوجوان.

**لاوژۆکە:** لاوژۆك ف نوجوان.

**لاوژە:** ١) ستران، گۆرانی، فام: ٢) لەبەر ئەوە، بۆ ئەمە ف ١) ترانه؛ ٢) از برای آنکه.

**لاوس:** بانی دەم لە ژوورەوە ف سق.

**لاوك:** گۆرانی درێژو قەدیمی ف ترانۀ کلاسیك.

**لاوکبێژ:** گۆرانی‌بێژ ف ترانەخوان، خواننده.

**لاولا:** ١) دیمەن لە کەنارەوە: ٢) فیچەلفاچ ف ١) منظره از نیمرخ: ٢) اُریب.

**لاولان:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**لاولاو:** لافلافك ف لبلاب، پیچك.

**لاولاوە:** ١) ئامرازی لێك‌قایم‌کردنی درگاو چوارچێوە؛ ٢) داروکێکی بە بزمار لە چوارچێوەدراو بۆ داخستنی درگاو پەنجەرە ف ١) لولای در؛ ٢) چوبکی به جای رزه دربستن.

**لاولۆسە:** ناسولۆس، خۆخوان‌کردن ف آرامش، بزك.

**لاون:** لاوێنەر، ئەو کەسەی دەلاوێنێتەوە ف مدّاح.

**لاونا:** دلداری‌دان، لاواندن ف نوازش.

**لاونای:** لاواندنەوە ف نوازش.

**لاونیو:** لاولا ف نگا: لاولا.

**لاوو:** هۆی‌جحێـلا، ئەی‌جـوان، وشەی‌بانگ‌کردنـی جوان ف ای جوان!.

**لاوە:** ١) دلدانەوە: ٢) پاڕانەوە: ٣) دەرەوە: ٤) لابە، هەلگرە: ٥) دەست بەردە: ٦) ئەی لاو! ئەی خۆرت!؛ ٧) ئەی جوانچاك!، ئەی خوشیك!؛ ٨) خواستن، داواکردن: ٩) ئاوڕ ف ١) نوازش: ٢) لابه: ٣) خارج از منطقه: ٤) بردار: ٥) دست بردار: ٦) ای جوان!: ٧) ای زیباروی!؛ ٨) خواستن، طلبیدن: ٩) توجّه.

**لاوەدان:** ١) خستنـە کەنارەوە، لادان: ٢) دانەوەی زەوی ف ١) بەکنار زدن: ٢) کندن زمین.

**لاوەك:** لەو گونـدانەی کوردستانە کەبەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**لاوەکردن:** ١) ئاوڕدانەوە: ٢) پاڕانەوە ف ١) واپس‌نگری: ٢) لابەکردن.

**لاوەکەر:** ١) داواکار: ٢) وەشوێن دۆزو مەبەست کەفتن ف ١) طلبکار: ٢) پیگیری مرام.

**لاوەکی:** خەلکی دەرەوە، بیانی، بێگانە ف خارجی، اجنبی.

**لاوەلا:** لابەلا ف نگا: لابەلا.

**لاوەلایی:** لابەلایی ف نگا: لابەلایی.

**لاوی:** ١) جحێلی: ٢) جوانچاکی ف ١) جوانی: ٢) زیبایی.

**لاویتە:** لابیتە، لاپیتە ف نگا: لابیتە.

**لاویتی:** ڕۆژگاری جحێلی، ئافی جوانی ف عنفوان جوانی.

**لاویچ:** لالۆچ ف برکف دست.

**لاوێژە:** ١) گۆرانی، ستران: ٢) تازەجوان ف ١) ترانه؛ ٢) نوجوان.

**لاویژە:** تازەجوان ف نوجوان.

**لاوێن:** ١) جلەبی ناسك بە ڕیشەوە، ئەمامی داربی: ٢) دلداری‌دەر؛ ٣) چەمێکە لە کوردستان دەڕژێتە دەجلەوە: ٤) گوندێکە لە کوردستان ف ١) نهـال بید: ٢) نوازش دهنده: ٣) رودخانه‌ایست در کردستان: ٤) نام دهی است.

**لاوێنەر:** لاوین، لاون ف نوازشگر.

**لاوێنی:** ئافی جوانی ف دوران جوانی.

**لاهۆرە:** ١) زەبەلاح، زلحۆرت: ٢) قاش لە میوەی بێستان: ٣) پواز ف ١) لندهور: ٢) برش از میوه، قاچ: ٣) بغاز جانبی، گاوه.

**لاهێز:** ١) پشتبوانـەی دیوار: ٢) بێ‌ناقەت، کەم‌تابشت ف ١) پشتبیانۀ دیوار؛ ٢) کم‌توان.

**لاهێزە:** پشتبوانە، لاهێز ف پشتبیانۀ دیوار.

**لاهیە:** عاربە، ئەندامی بەدەل. بۆ *ددانی* دەسکردو *قژەسەری ناعەسلی* دەبلێن ف بدلی.درمورد *دندان* و *موی مصنوعی* می‌گویند .

**لای:** ١) نك ئەو؛ ٢) تۆ سەرسـەخنی؛ ٣) وەکـو ف ١) نزد او؛ ٢) نو لجبازی؛ ٣) مانند.

**لایدە:** لاوەکی ف اجنبی، بیگانه.

**لایز:** لۆسە، توێل، ملغە، یاری ف آهرُم.

**لای‌لای:** لالایی، گۆرانی‌دەخەوکردنی زارۆ ف لالایی.

**لایلابە:** ١) لای لای: ٢) لالی کە ف ١) لالایی: ٢) بخواب بچه!.

**لایلایی:** لالایی ف لالایی.

**لابەز:** ئاومالك ف آب آورده.

**لابەلایە:** لای‌لای ف لالایی.

**لابەن:** ١) نك، جەم، کن: ٢) ئالی، تەرەف ف ١) نزد: ٢) سو، طرف.

**لایەنگر:** تەرەفدار، دازدار ف هواخواه.

**لابەنگری:** داژداری ف طرفداری.

**لابەنگیر:** لابەنگر ف طرفدار.

**لابەنگیری:** لابەنگری ف طرفداری.

**لایی:** سەرسەخنی، گوێ‌نەبیسی ف حرف نشنوی، لجبازی.

**لایی‌لایی:** لای‌لایی ف لالایی.

**لایین:** لابەن ف نگا: لایەن.

**لب:** دانە، دەنك ف دانه.

**لبا:** ١) لجەم، لنك، لەکن، لای: ٢) بەرگێی بەسنواو، کولاف ف ١) نزد؛ ٢) نَمد.

**لباتە:** لای تۆ ف نزد تو.

**لباد:** بەرگێی پەسنواو، کولاف ف نمد.

**لبادە:** فەرەنجی ف بالاپوش نمدی.

**لباس:** جلك، شمەکی دەبەرکردن ف لباس.

**لباڵ:** لە لا، لنك ف نزد.

**لباڵتە:** لای تۆ ف نزد تو.

**لبان:** تەپاڵەی پێژراو ف تاپالە.

**لب‌لب:** ١) دانەدانە، دەنك‌دەنك؛ ٢) دەنكەدەنكەبەك ف ١) دانەدانە؛ ٢) دانەدانەیی.

**لبۆ:** ١) بۆچی؟، چما؟؛ ٢) بۆخاتری، لەبەر ف ١) برای چه؟؛ ٢) بەخاطر.

**لبوودی:** کەوانی تیر پێهاوێشتن ف کمان تیراندازی.

**لبۆلبۆ:** لب‌لب، دانەدانە، دەنك‌دەنك ف دانەدانە، یکی‌یکی.

**لبەر:** ١) بۆخاتری، لەبەر؛ ٢) بەرانبەر؛ ٣) لەپێش، پەرلە؛ ٤) زبەر نەکرن ف ١) بەخاطرِ، از برای؛ ٢) مقابل؛ ٣) قبل از، پیش از؛ ٤) ازبر، حفظ.

**لبەرخستن:** بێچوو پێ فڕێدان ف وادار به سقط جنین کردن.

**لبەرکرن:** ١) دەبەرکردن، پۆشینی جلك؛ ٢) بێ نوسینەوە لەبیر بوون ف ١) پوشیدن؛ ٢) حفظ کردن، ازبرکردن.

**لبەك:** دەنکێك، دانەیەك ف یکدانە.

**لبێ:** ١) بەڵێ، بەلی؛ ٢) دەلەمە، پەنیری نەگوشراو ف ١) بلی؛ ٢) دلمهٔ شیر، پنیر آبدار.

**لپ:** ١) پەلی دار؛ ٢) پڕاوپڕ، تژە ف ١) شاخه؛ ٢) لبالب، پر.

**لپاش:** ١) بێ‌برەو، نارەواج؛ ٢) نازیرەك ف ١) کساد؛ ٢) کودن.

**لپێش:** ١) پێشڕەو؛ ٢) بەقەدر و حورمەت ف ١) جلوی، پیشرو؛ ٢) محترم.

**لپێ کرن:** دەپێ کردن. بۆ دەرپێ و پێلاو و گۆریە ئێژن ف پوشیدنِ جوراب و کفش.

**لپێل‌بوون:** شەپۆل‌دان ف موج زدن.

**لتە:** لە لایەن تۆ ف ازتو.

**لتەن:** مژینی مەمك و گوان، سێنن ف مُك‌زدن.

**لج:** ناوچەیەکە لای دیاربەکر لە کوردستانی ژێردەستی تورکان ف ناحیه‌ای در کردستان.

**لچ:** ١) لێوی خوارەوە؛ ٢) فەراغ، کەنارە؛ ٣) شتێ کە دەچەسپێ وەك سریش؛ ٤) ریپووقی چاو ف ١) لب زیرین؛ ٢) لبه، کناره؛ ٣) چسپناك؛ ٤) ژفك چشم.

**لچان:** ١) پڕاوپڕ، دارماڵ؛ ٢) چەسپان، نووسان ف ١) پر و لبالب؛ ٢) چسبیدن.

**لچانلچ:** پڕاوپڕ ف لبالب، مالامال.

**لچانلیچ:** لچانلچ ف لبالب.

**لچ بردنەوە:** لێوتر بنجاندن، دەم‌خوارکردنەوە ف لب و لوچه درهم کردن.

**لچ خوار:** دەم‌چەفت ف دهن کج.

**لچ خوارکردنەوە:** برینی لە نارەزایی و فەلسی ف کنایه از اظهار ناخوشنودی.

**لچ خوارەوکردن:** لچ‌خوارکردنەوە ف کنایه از اظهار ناخوشنودی.

**لچ خولدان:** قسەی بەپەلەکردن ف باشتاب حرف زدن.

**لچ خەنە:** زەردەخەنە، بزە ف لبخند.

**لچق:** ١) شتێ کە بە دەست‌لێدان دەست لووس دەکا؛ ٢) شیر بنچك ف ١) لزج؛ ٢) مزهٔ شیر بن لزج.

**لچ‌قەوی:** لێونەسنوور ف لب کُلفت.

**لچك:** ١) سەرپۆشی ژنانە؛ ٢) کلکەی سەرپۆشی ژنانە؛ ٣) کلکەی پێچی سەری پیاوانە؛ ٤) دەم‌هەڵبەست، دەسماڵێ کە پیاو دەم و لووتی پێ دادەپۆشن ف ١) لچك؛ ٢) دنبالهٔ سرپوش زنانه؛ ٣) دنبالهٔ فروهنند دستار مردانه؛ ٤) نقاب.

**لچن:** لچ‌قەوی ف لب کُلفت.

**لچۆ:** لچن، لێونەسنوور ف لب کُلفت.

**لچ‌ولێو:** دەم‌ولێو ف لب و لوچه.

**لچ‌ولێوکردن:** لێوبڕین بۆ جزبادان ف لب بریدن برای تنبیه.

**لچە:** ١) لچن؛ ٢) جۆرێ ماسی ف ١) لب کلفت؛ ٢) نوعی ماهی.

**لچ هەڵقرچان:** برینی لە شاندانی نووڕەیی ف کنایه از اظهار ناخشنودی.

**لچ هەڵقرچاندن:** لچ‌هەڵقرچان ف کنایه از اظهار ناخشنودی.

**لچ هەڵقوتاندن:** لچ‌هەڵقرچان ف کنایه از اظهار ناخشنودی.

**لچ هەڵقوتان:** لچ‌هەڵقرچان ف کنایه از اظهار ناخشنودی.

**لچ هەڵوگەڕانن:** ١) لێو بەرەوژوور نوشتاندنەوە؛ ٢) لێوار نوشتاندنەوە ف ١) لب برگرداندن؛ ٢) لبه برگرداندن.

**لچ هەڵوەگەڕانن:** لچ‌هەڵوگەڕانن ف نگا: لچ‌هەڵوگەڕانن.

**لحیم:** لحێم، جۆشدانی کانزا ف لَحیم.

**لحێم:** جۆش‌خواردن و جۆشدانی کانزا ف لَحیم.

**لحێف:** لیفە، سەرەتنازی پەمۆ تێخزاو ف لحاف.

**لخاف:** لغاو، هەوساری لەچەرم و ئاسن بۆ ئەسپ لە سواربدا ف لگام.

**لخو:** لەسەرخۆی ف برخودش.

**لخود:** لخو ف برخودش.

**لخۆدان:** ١) بەچەپۆك سینگ و سەرکوتان؛ ٢) بەخۆداهانن و گەشەکردن ف ١) سینه‌زنی؛ ٢) شکوفاشدن.

**لخۆکرن:** دەبەرخۆکردن: (کراسی خۆ **لخۆکە**) ف پوشیدن.

**لخۆگرتن:** دەستەبەربوون، مژیاردان ف متعهدشدن.

**لخین:** ١) لیچق؛ ٢) شلك و شباوی بادان و پێچدان ف ١) لزج؛ ٢) انعطاف‌پذیر.

**لرپ:** لرفە، دەنگی خواردنی زۆرخۆر ف نگا: لرفه.

**لرچە:** خڕخڕی سنگ ف صدای خش خش سینه.

**لرچەلرچ:** لرچەی زۆر ف خش‌خش پیاپی سینه.

**لرخ:** خڕخڕی سنگ، لرچە ف خش خش سینه.

**لرخاندن:** خڕخڕکردنی سنگ ف خش خش کردن سینه.

**لرخن:** کەسێ کە خڕە لە سنگی دێت ف کسی که سینه‌اش خش‌خش کند.

**لرخە:** لرخ ف نگا: لرخ.

**لرسە:** سووڕان، زڤران ف چرخش.

**لرف:** ١) قووت‌چوونی بەپەلە؛ ٢) دەنگی لافاوی بەتەوژم؛ ٣) دەنگی

گرگری نەندوو؛ ۴) دەنگی بوڵاندنی بەقەو ف ۱) بلع شدن با شتاب؛ ۲) صدای خروش سیلاب؛ ۳) غُرّش تنور مُشتعل؛ ۴) صدای لندیدن با صدای بلند.

**لرفدان:** قوُتدان بەپەلە ف بلعیدن باشتاب.

**لرفە:** لرف ف نگا: لرف.

**لرفەلرف:** لرفی بەشوێن یەکا ف «لرف» پیاپی.

**لرفە:** نربقەی خەنین ف صدای خندیدن.

**لز:** گیایەکی گەڵاپانی دەشتەکیە. *وەك ژەهر گیاندار نەکوژێ* ف گیاهی است سمّی.

**لزگ:** لك، لق، پەلی زوەك ف جوانه.

**لژ:** لج ف نگا: لج.

**لژنە:** جڤات، کوٚمەڵی مروٚ کە بوٚ راوێژ لێك کوٚ بوٚنەوە ف گردهمآیی.

**لستن:** خواردن بە زمان بێداساوین ف لیسیدن.

**لستنەوە:** لستن ف لیسیدن.

**لستەوپستە:** باك لستنەوە، زوٚر تەواو لستن ف کاملا لیسیدن.

**لستەوپستەدان:** باك لستنەوە ف کاملا لیسیدن.

**لسکە:** هوٚگر، خوٚپێ گرتوٚ ف مأنوس، الفت گرفته.

**لسەر:** ۱) سەرکەوتو، لەپێش لە نەزموندا؛ ۲) لەلای سەرو؛ ۳) نزیك بە: (لسەر زاینە) ف ۱) موفّق در امتحان؛ ۲) طرف بالا؛ ۳) در شُرُف، مُشرف به.

**لسەرخوٚ:** ۱) بەپشو، خاوەن حەوسەلە؛ ۲) هێدی و بە نەسپایی ف ۱) شکیبا؛ ۲) آهسته و آرام.

**لسەرخوٚرا:** دەگەڵ ئەوەشا کە بوٚخوٚشی وایە ف با اینکه خود نیز چنین است.

**لسەرڤەبون:** جوٚنەوەسەر، ناسینەوە ف بەجا آوردن، بازشناختن.

**لشتش:** ۱) لستنەوە؛ ۲) بەحاسنەمو دوبەلا وێك کەوتن ف ۱) لیسیدن؛ ۲) مخفیانه تماس گرفتن.

**لشتن:** لستن ف لیسیدن.

**لشتە:** زمان پیاساوراوی خوراو ف لیسیده.

**لغاف:** ئامرازێکی ئاسنینە دەخرێتە دەمی ئەسپی سوارەوە. *دەستەجڵەوی پێوەیە* ف لگام.

**لغاو:** لغاف ف لگام.

**لغاو بوٚشل کردن:** بریتی لە رێگەدان بە کەسێ کاری سەربەخوٚ بکا ف کنایه از آزادگذاشتن آدم خودسر.

**لغاوکردن:** ۱) لغاو لە دەمی ئەسپ کردن؛ ۲) برینی لە گێرانەوە لە کار، رێگەنەدان ف ۱) لگام زدن؛ ۲) کنایه از منع کردن کسی از کاری.

**لغاوگرتن:** ۱) برینداربوٚنی دەمی ئەسپ لە لغاوەوە؛ ۲) جڵەوگرتنی سوار کە دابەزێ ف ۱) لگام گرفتگی، زخمی شدن دهان اسب از لگام؛ ۲) افسارگرفتن اسب تا سوار پیاده شود.

**لغاوە:** لالیچ، گوٚشەی دەم ف گوشهٔ دهان.

**لغاوەبرکێ:** نەخوٚشی بریندار بوٚنی سوٚچی دەم ف بیماری گوشهٔ دهان.

**لغاوەبرێ:** لغاوەبرکێ ف بیماری گوشهٔ دهان.

**لغاوەگورگە:** مەلێکە لە دماوان دەژی ف پرنده‌ای است که در کنار رودخانه می‌زید.

**لغاوهەڵبڕین:** ۱) دەسکەجڵەو بڵندکردن؛ ۲) دەسکەلغاو بە چەقوٚ لەت کردن ف ۱) لگام برکشیدن؛ ۲) دستهٔ لگام بریدن.

**لف:** ۱) پێچ، پێچدان؛ ۲) وەك، جوٚن، وێنەی؛ ۳) ناوالْدوانە ف ۱) پیچ، پیچش؛ ۲) همانند، مانا؛ ۳) همزاد، دوقلو.

**لفانە:** ۱) دوانە، جمك، جوٚی؛ ۲) شەنگڵەبەرەکەنە ف ۱) دو قلو؛ ۲) دومیوه بهم چسبیده.

**لفت:** ۱) قسەی دڵخوٚشکەرەوە، دەگەڵ گفت دەگوترێ: (گفت و لفتی خوٚشە)؛ ۲) خەلاس کردنی خواردن: (**لفت و لیٚسی دا**) ف ۱) لطف و مهربانی؛ ۲) تمام کردن و خوردن همهٔ خوراك.

**لفتە:** سوٚکەناوی لوتفەللا، ناوە بوٚ پیاوان ف مخفّف لطف‌الله.

**لفتێ:** لفتە ف نگا: لفتە.

**لفك:** ۱) پەلکەی سەرپێچی پیاوان؛ ۲) کلکەی دەسماڵی سەری ژنان؛ ۳) شتێ سپی و زبرە لە خوری بان لە برزی گیا دەچترێ و لە حەمام خوٚی پێ دەشوٚن ف ۱) دنبالهٔ فروهشتهٔ دستار؛ ۲) دنبالهٔ سرپوش زنانه؛ ۳) لیف حمّام.

**لفکە:** لفك ف نگا: لفك.

**لفکەشامی:** گیایەکە وەك لفکی حەمام بەکاردێت ف گیاهی است به جای لیف حمّام به کار آید.

**لفگرتن:** ژن هێنان و شوگرتن ف همسر گرفتن.

**لفگری:** لفگرتن ف همسر گرفتن.

**لفگیری:** لفگرتن ف همسر گرفتن.

**لفلف:** گیایەکە بنەکەی دەخورێ ف گیاهی است با پیازهٔ خوردنی.

**لفە:** ناوالْدوانە ف همزاد.

**لفەدوانە:** دوانە، جمك، جوٚی ف دوقلو.

**لڤ:** جوٚڵە، بزوتن، بزاو ف حرکت.

**لڤا:** لوا، بەرگن. توٚکی وشتر و بەرخ ف پشم شتر و برّه.

**لڤاندن:** بزواندن، جوٚلاندن ف حرکت دادن.

**لڤتا:** لێرە، لەگرە، لەم شوێنە ف در اینجا.

**لڤد:** درکێکە بەپنج دەروێ ف خاربُنی است بوته‌ای.

**لڤر:** لڤتا، لەگرە ف دراینجا.

**لڤرە:** لڤر ف دراینجا.

**لڤك:** لوٚ، گری لە گوٚشتی لەشدا ف غدّه.

**لڤن:** خشت، کەرپیچ، کەربوج ف خِشت.

**لڤوٚك:** بزوٚز، دانەسەکناو، بێ نوٚقرە ف بی‌آرام، همواره در جُنب وجوش.

**لڤەك:** لڤوٚك ف بی‌آرام.

**لڤی:** ۱) لەئەم، لەمە؛ ۲) جوٚڵا، وەجوٚڵەکەوت ف ۱) ازاین؛ ۲) حرکت کرد، جُنبید.

**لڤی دەرە:** لەم جێگەبە، لەشوێنە ف در اینجا.

**لڤێ دەرێ:** لەوشوێنەی دوٚر ف در آنجا.

**لڤێ دەرێ:** لڤێ دەری ف درآنجا.

**لڤین:** جوڵان، بزوتن ف جنبیدن، حرکت کردن.

**لق:** ۱) پەلی دار؛ ۲) قوڵەی لەشکر کە دەکانە سێیەکی هێز ف ۱) شاخه؛ ۲) گُردان ارتش.

**لقاو:** لغاو ف لگام.

**لق لق:** ۱) پەل پەلی دار؛ ۲) قاقا، خەنین بەدەنگی بەرز ف ۱) شاخه‌شاخه؛ ۲) قهقهه.

**لقلقی:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**لك:** ۱) لق، پەلی دار؛ ۲) پەلکەی دەسماڵ؛ ۳) سوچ و گوشەی ڕایەخ و قوماش و...؛ ۴) خرابی زەق لە بن پێست؛ ۵) گرێ؛ ۶) چەسپ وەك سریش ف ۱) شاخه؛ ۲) دنبالهٔ فروهشتهٔ سرپوش و دستار؛ ۳) گوشهٔ زیرانداز و پارچه و...؛ ۴) غُدّه؛ ۵) گره؛ ۶) چسب.

**لكا:** چەسپا ف چسبید.

**لكار:** ۱) حەریك، مژوڵ بە حەساب؛ ۲) دەکارهێنراو، کارکردو ف ۱) مشغول کار؛ ۲) نیمداشت، کارکرده.

**لكان:** چەسپان ف چسبیدن.

**لكاندن:** چەسپاندن ف چسبانیدن.

**لكانن:** لکاندن ف چسبانیدن.

**لكاو:** چەسپاو ف چسبیده.

**لك لك:** ۱) بارەبار، هاوارکردنی مەڕ و بزن؛ ۲) پێکەنینی بەدەنگ بەرز ف ۱) صدای بلند بز و گوسفند؛ ۲) قاه‌قاه خندیدن.

**لك مامیر:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لكمل:** ناڵو،بادامە ف لوزتین.

**لكو:** لەکام جێ؟ ف درکجا؟.

**لكوپۆ:** لق و پەلی دار ف شاخسار.

**لكوپۆپ:** لق و سەرلق ف شاخه و بالانیهای درخت.

**لكوژاندن:** لەوەڕ لەسەر تازەڕواو، تاخەلێوەکردنی ئاژەڵ ف چریدن از گیاه نودمیده در اوایل بهار.

**لكولۆ:** رەقایبەکانی بن پێست ف غده‌ها.

**لكومین:** هەڵەنگوتن، ساتمەبردن، رەت‌بردن و کەوتن ف سکندری خوردن.

**لكه:** ۱) گرێ؛ ۲) لق؛ ۳) پەلە ف ۱) گره؛ ۲) شاخه؛ ۳) لکه.

**لكه كۆره:** گرێ‌کۆرە ف گره کور.

**لكه كۆری:** گرێ‌کۆرە ف گره کور.

**لكی:** ۱) لە کام کەس؟؛ ۲) لکا، چەسپا ف ۱) از چه کسی؟؛ ۲) چسبید.

**لكیا:** لکا، چەسپا، پێوەنوسا ف چسبید.

**لكیاگ:** لکاو ف چسبیده.

**لكیان:** لکان ف چسبیدن.

**لكیده ره:** لەکوێ‌یە؟، لەکام شوێنە؟ ف کجاست؟.

**لكیده ری:** لەکام جێ؟، لەکام شوێن؟ ف کجا؟.

**لكین:** لکان ف چسبیدن.

**لكیو:** لکاو ف چسبیده.

**لگبن:** ۱) خشتی کاڵ؛ ۲) ناوی گوندێکە لە کوردستان ف ۱) خشت خام؛ ۲) نام دهی است.

**لگۆرەی:** بەپێ ف برطبق.

**لگۆری:** بەپێ، لگۆرەی ف برطبق.

**للا:** هۆی کاورا!، ئەرێ فلان! ف فلانی!.

**لم:** ۱) رەمڵ، رەڵم؛ ۲) زگ؛ ۳) سەبەب؛ ۴) فم‌کردنی چڵم؛ ۵) لیچی سەرەوەی بەراز ف ۱) ماسه؛ ۲) شکم؛ ۳) انگیزه؛ ۴) فین؛ ۵) لب زبرین گراز.

**لماو:** فوراوی لم، لم و ناوی تێکەڵاو ف لای و لجن.

**لمبۆز:** پۆز، دەم و کەپۆی حەیوان ف پوزه.

**لمبیز:** لمبۆز ف پوزه.

**لمبیس:** لمبۆز ف پوزه.

**لمت:** لماو ف لای، لجن.

**لمتش:** ۱) وەشارتن؛ ۲) ژێرخاك‌کردن، ناشتن ف ۱) پنهان کردن؛ ۲) دفن کردن.

**لمك:** خوێاوك، تراوی زۆر سوێر ف مایع بسیار شور، آب نمك.

**لمن:** ۱) بۆ من: (وای **لمن**)؛ ۲) لە من: (**لمن** را بۆ تۆ) ف ۱) برمن؛ ۲) از من.

**لموز:** ۱) لمبۆز، پۆز؛ ۲) زۆگرژ، ناوچاوترش ف ۱) پوزه؛ ۲) اخمو.

**لموز:** لمبۆز ف پوزه.

**لموز:** لمبۆز ف پوزه.

**لموززراف:** جۆرێ ماسی، باقۆ، نەقە ف ماهی اوزن‌برون.

**لمه:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لمەد:** نمەد، لباد، کولاو ف نمد.

**لنج:** ۱) لاسار، گوێ‌نەبیس، پێ‌چەقێن؛ ۲) لچق؛ ۳) سەرکۆنە، سەرزەنشت؛ ۴) حەڕی، هەڕگ، قوڕ؛ ۵) لنە، قوڕاوی زۆر شل ف ۱) لجباز؛ ۲) لَزِج؛ ۳) سرزنش؛ ۴) گِل؛ ۵) لای و لَجَن.

**لنچق:** لچق ف لَزِج.

**لنگ:** ۱) لاق، لە بەری پێوە نا زان؛ ۲) نا، بەرانبەر: (یەك **لنگ** جەوال، ئەم کەوشانە **لنگاولنگ** کەوتوون)؛ ۳) غار، ڕاکردن: (**لنگ**‌دە بزانم) ف ۱) لِنگ؛ ۲) لنگه؛ ۳) دَو.

**لنگ ئەشتش:** پێ‌پێدانان، بەرپێ‌دان ف زیر پا گذاشتن، پا برچیزی گذاشتن.

**لنگ ئەشتش ڤەر:** بەشەق تێ‌هەڵدان ف تیپازدن.

**لنگار:** غاری بەبڕتاو، چوارناڵە ف تاخت.

**لنگاران:** رکەی غاردان، گرێوەغار ف مسابقهٔ دَو.

**لنگاردان:** بەبڕتاو غارپێ‌کردن، چوارناڵە بە ئەسپ کردن ف پا تاخت دوانیدن.

**لنگدان:** ۱) ڕاکردن، غاردان؛ ۲) غارپێ‌کردن ف ۱) دویدن؛ ۲) دوانیدن.

**لنگرین:** شەلین، لەنگین، بەقاچ سەقەتی بەرێوەچوُن ف لنگیدن.

**لنگ‌قەرسین:** نەزینی لاق، مرۆچانەکردنی پا ف مورمورکردن پا.

**لنگ‌مەتك:** ۱) بێ‌پان؛ ۲) بربنی لە شوم ف ۱) پهن پا؛ ۲) کنایه از شوم.

**لنگو:** هەوبرترش، گونکەهەویر کە بۆ هەوبرترش هەڵدەگیرێ ف چونهٔ خمیرمایه.

**لنگـــە:** ۱) نا، وەك: (لنگەی لە دنیادا نیە)؛ ۲) نابار؛ ۳) تاکـەوش‌و گۆرەوی؛ ۴) جەوالی زۆر گوشادو زل، هوژ؛ ۵) لنگ، لاق، با، قاچ؛ ۶) بەردێکی دەستـاز ف ۱) همتا؛ ۲) لنگـەبـار؛ ۳) لنگهٔ کفش و جوراب؛ ۴) جوال گشاد و بزرگ؛ ۵) پا؛ ۶) سنگ دستاس.

**لنگـەئەستەنە:** ۱) پێ‌بیانان، بەرپێدان؛ ۲) بازهاو بشتن. بازبردن ف ۱) پا بر چیزی گذاشتن؛ ۲) پرش.

**لنگەتللوُر:** لەسەر زگ درێژبوُن ف دَمَر دراز کشیدن.

**لنگەتلوُر:** لنگەتللوُر ف دمر دراز کشیدن.

**لنگەشە:** فۆرتە، گورگەلوُقە ف هَروله.

**لنگەشەلە:** هەنگڵەشەلە، رۆیشتن لەسەر لاقێك ف لَی‌لَی رفتن.

**لنگەشەلێ:** لنگەشەلە ف لی‌لی رفتن.

**لنگەفرتە:** لاقەفرتە ف لگدپرانی نوکشته.

**لنگەفرتێ:** لاقەفرتە ف لگدپرانی نازه‌کشته.

**لنگەفرە:** لاقەفرتە ف لگدپرانی نازه‌کشته.

**لنگەفرێ:** لاقەفرتە ف لگدپرانی نازه‌کشته.

**لنگەلەرزە:** ئەژنۆلەرزین لە بێ‌تاقەتی‌و ترسان ف لرزش زانو.

**لنگەلەرزێ:** لنگەلەرزە ف لرزش زانو.

**لنگەلەرێ:** لنگەلەرزە ف لرزش زانو.

**لنگەوتللوُر:** لنگەتللوُر ف دَمَر درازکشیدن.

**لنگەوتلوُر:** لنگەتللوُر ف دَمَر دراز کشیدن.

**لنگەوژوُر:** کەوتن‌و قاچ‌بلندبوُن ف افتادن و پا به هوارفتن.

**لنگەوقوُج:** لنگەوژوُر ف نگا: لنگەوژوُر.

**لنگ‌هەڵکراو:** قول‌هەڵماڵاو ف نگا: قول‌هەڵماڵاو.

**لو:** ۱) گرێ‌و خرایی سەخت لە بن پێست، لك؛ ۲) سەربـە: لەسـەر، بۆ عاشیرەتـانی دەڵێن: (زەعفـەرانلو، حەیدەرانلو)؛ ۳) لێو؛ ۴) زێوی، رواس، چتر ف ۲) غدّه؛ ۲) منتسب‌به؛ ۳) لب؛ ۴) روباه.

**لۆ:** ۱) گیایەکی بەرزەبالای گەلادەرزی‌یە؛ ۲) تیسك، دستە مویکی سەر؛ ۳) نا، نال، داو؛ ۴) فەد، لا: (بـەنەکە دولۆ کەوە)؛ ۵) نوێن، چین؛ ۶) کابرا، کاورا: (وا مەکە لۆ)؛ ۷) نەی خۆرت!، نەی لاو!: (دە لۆ لوا!)؛ ۸) بۆچی؟، چما؟؛ ۹) بۆ ئەوە، لەبەر ئەمە؛ ۱۰) بۆ، ژ: (لۆ منت هینابە، لۆ نوم هینـابە، لۆم بینـە)؛ ۱۱) جۆر، نەرز: (و لۆ نابینن)؛ ۱۲) لك، لو، گرێ‌گۆشتی ژێر پێست ف ۱) گیاهی است؛ ۲) دستـەموی سر؛ ۳) نار؛ ۴) لا؛ ۵) طبقه، چین؛ ۶) فلانکس، مارو؛ ۷) ای جوان!؛ ۸) کلمهٔ پرسش، چرا؟؛ ۹) برای اینکه؛ ۱۰) برای؛ ۱۱) طور؛ ۱۲) غدّه.

**لوا:** ۱) بەرگن؛ ۲) بەرگنی بەسنواو، کولاو؛ ۳) رۆیشت؛ ۴) رەخسا، هەلم دەسکـەوت: (بوم لوا کارەکە بکەم) ف ۱) پنـم شنر و بره، کُرك؛ ۲) نمد؛ ۳) رفت؛ ۴) ممکن شد.

**لوالەو:** پڕاوپڕ ف لبالب.

**لوان:** ۱) رۆیشتن: (بێ زام خەدەنـــگ موژەی مەهـرزان/ نەنگـەن وە سارای قیامـەت لوان) «مـەولەوی»؛ ۲) رەخسان، هەڵکەوتن ف ۱) رفتن؛ ۲) امکان.

**لواوی:** گۆشتی بە لکو لۆ ف گوشت پرغدّه.

**لوای:** ۱) لوان، رۆیشتن؛ ۲) رۆیشتنی ف ۱) رفتن؛ ۲) رفتنی.

**لوباندن:** بازانەوە، لالانەوە ف لابەکردن.

**لۆبت:** زرنگ‌و چالاك ف زرنگ و چابك.

**لۆبلۆت:** بازەو کازەی بزن‌و مەڕ ف صدای بلند بز و گوسفند.

**لۆبلۆب:** سوُربوُن لەسەر شتێ ف اصرار، ابرام.

**لوبلوبە:** نوکەسپیلکـەی لەشیرداکولاوی وشکـەوەکراو ف لبلبـی، نخودچی.

**لوُبی:** لۆبیا ف نگا: لوبیا.

**لۆبیا:** دانـــەویڵەیەکی بەکلوە بە رەنگی سپی‌و سوُر دەبێ، ماشـەسپی، ماشەسوُرە ف لوبیا.

**لۆپ:** ۱) فرەنجی؛ ۲) لباد، کولاو، نەحت، نات؛ ۳) سەرکولمە، رومەت؛ ۴) بەرەی نەسوُر؛ ۵) بالداری مەلەوان وەك مراوی‌و... ف ۱) پالتوی نمـدی؛ ۲) نمد گسترنی؛ ۳) گونه، لپ؛ ۴) گلیم ضخیم؛ ۵) پرندهٔ شناگر مانند مرغابی و...

**لۆبت:** لۆبت ف زرنگ و چابك.

**لۆپـك:** ۱) داوەڵی، داهـۆڵ؛ ۲) لۆبیا؛ ۳) کونبلك، کفنەی ساوار ف ۱) مترسك؛ ۲) لوبیا؛ ۳) کوفتەبلغور.

**لۆپکە:** جۆرە کرمێکە گەلای بێستان دەخوا ف نوعی کرم که آفت جالیز است.

**لوت:** روُت، بێ‌جلك ف لخت.

**لوُت:** ۱) روُت، بێ‌جل؛ ۲) باروی زل؛ ۳) بابوُلە، نبکە؛ ۴) گاف، شەقاو؛ ۵) باز ف ۱) لُخت؛ ۲) لقمهٔ بزرگ؛ ۳) ساندویچ؛ ۴) گام؛ ۵) گام بلند.

**لوُت:** ۱) لوت، روُت؛ ۲) کەپۆ، بێڤل، کەپ، دم؛ ۳) رەجاڵە، عەلوُجەلوُ: (لات‌و لوُت) ف ۱) لُخت؛ ۲) بینی؛ ۳) اوباش.

**لوُتـاویژ:** بۆگەنی زۆرپیس کە پیاو کەبۆی دەگرێ تا بۆی نەیە ف بوی بسیار بد.

**لوُت‌نەسترین:** جڵم لەکەپۆکردنەوە ف پاك کردن آب بینی.

**لوُت‌براو:** کەسێ کە سەری بێڤلیان بڕیوە لەسەر کاری خراپ ف بینی بریده.

**لوُت‌بڕیاگ:** لوُت‌براو ف بینی بریده.

**لوُت‌برین:** بێڤل‌برین ف بینی بریدن.

**لوُت‌بەبەرخۆداهاتنەوە:** بربنی لە پەشیمان‌بوُنەوە ف کنایه از پشیمان شدن.

**لوُت‌بەخـۆداهـاتنـەوە:** بریتی لە خەجـاڵەتی‌و پەشیمانی ف کنایه از خجلت‌زدگی و پشیمانی.

**لوت‌بەرز:** بادی‌هەوا، بەفیز [ف] متکبّر.

**لوت‌بەرزی:** فیز، دەعبە [ف] تکبّر.

**لوت‌پان:** ١) کەپۆپان؛ ٢) مەلێکە لە دماوان دەژی [ف] ١) بینی پهن؛ ٢) پرنده‌ای است که در کنار آب زندگی می‌کند.

**لوت‌پروانن:** بربێنی لە نارەحەت‌کردن [ف] کنایه از افسرده‌خاطر کردن.

**لوت‌پژان:** خوێن‌بەربوونی کەپۆ [ف] خونریزی بینی، خون دماغ شدن.

**لوت‌پیانەهێنان:** لێ‌رازی‌نەبوون، نرخ‌نەدان بە کەسێ [ف] ناخوشنودبودن از کسی، ارج ننهادن.

**لوت‌چوزانەوە:** ١) کەپۆسوزبانەوە؛ ٢) بربێنی لە لەهومێدەواری‌یەوە بەسەر ناهومێدی داکەوتن [ف] ١) سوزش در بینی؛ ٢) کنایه از نومیدشدن پس از امیدواری، دماغ سوخته شدن.

**لوت‌چوزیانەوە:** لوت‌چوزانەوە [ف] نگا: لوت‌چوزانەوە.

**لوتخوار:** قەلس، نوزە، نارازی [ف] قهرکرده، ناراضی.

**لوت‌خوربان:** بربێنی لە خەباڵ لە کردنی کاریێ کردن: (بۆ چوونەسەفەر لوتی نەخوری) [ف] هوس کردن.

**لوت‌داژاندن:** سەردەبەرخونان بە ناوەحەتی‌و خەمباری [ف] کنایه از کزکردن و غم خوردن.

**لوت‌داژەندن:** لوت‌داژاندن [ف] نگا: لوت‌داژاندن.

**لوت‌داژەنین:** لوت‌داژاندن [ف] نگا: لوت داژاندن.

**لوت‌دافسیاگ:** لوت‌پان [ف] بینی پهن.

**لوت‌رەوان:** روقایم‌و فیلباز [ف] شیّاد و پُررو.

**لوت‌زانەوە:** ناولەکەپۆهاتن [ف] آب از بینی سرازیرشدن.

**لوت‌زل:** ١) کەپۆزەلام؛ ٢) بربێنی لە لوت‌بەرز [ف] ١) دماغ گنده؛ ٢) کنایه از متکبّر.

**لوت‌سولانەوە:** ١) لوت‌سوزبانەوە؛ ٢) کەپۆ بەرزکردنەوەی بارگین‌و نیرەکەر لە بۆن‌کردنی تەرس [ف] ١) سوزش در بینی؛ ٢) بینی بلند کردن اسب و الاغ از بوکردن مدفوع ماده.

**لوت‌سولیانەوە:** لوت‌سولانەوە [ف] نگا: لوت سولانەوە.

**لوت‌شکان:** ١) ناهومێدبوون؛ ٢) خەجاڵەت‌بوون [ف] ١) نومیدشدن؛ ٢) شرمنده‌شدن.

**لوت‌شکاندن:** ١) نەمێ‌کردن؛ ٢) ناهومێدکردن [ف] ١) تنبیه‌کردن؛ ٢) نومیدکردن.

**لوت‌شکانن:** لوت شکاندن [ف] نگا: لوت‌شکاندن.

**لوتك:** ١) سەما لەخۆشیان؛ ٢) بازبردن [ف] ١) رقص و پایکوبی انفرادی از شادی؛ ٢) پریدن، جهیدن.

**لوتك:** لوتك [ف] نگا: لوتك.

**لوتك:** قەمەنەرە [ف] قنطره، پُل ناودانی.

**لوتکە:** ١) نرۆپك؛ ٢) کەپك [ف] ١) قلّه؛ ٢) دماغه.

**لوتکە:** بەلەم [ف] قایق.

**لوت‌گرتن:** ١) دەس بەکەپۆگرتن لە بوگەن؛ ٢) بربێنی لە لالوتی [ف] ١) بینی گرفتن از بوی بد؛ ٢) کنایه از ناخوشنودی از کسی.

**لوت‌گیران:** بربێنی لە نالامەت‌گرتن [ف] بینی گرفتگی از زکام.

**لوت‌گیریان:** لوت‌گیران [ف] گرفتگی بینی از زکام.

**لوت‌لاگرتن:** لالوت‌بوون [ف] دلگیرشدن، ناخوشنودشدن از کسی.

**لوت‌لێ‌خوران:** خەباڵ‌لێ کردن‌و بەتەمابوون، لوت‌خوران [ف] هوس کردن چیزی.

**لوتم:** بەش، پشك، باژ [ف] سهم، حصه.

**لوتو:** جۆری ماسی [ف] نوعی ماهی.

**لوتو:** بۆ تۆ [ف] برای تو.

**لوتو:** بۆ تو، ز نەرا [ف] برای تو.

**لوت‌و بزوت:** لەپڕو نەکاو: (لوت‌و بزوت نوشی بوم) [ف] یکهو، ناگاه.

**لوت‌و پوت:** ١) زۆر زوت‌و نەدار؛ ٢) بۆڵەو پرتە [ف] ١) فقیر ژنده‌پوش؛ ٢) غرولند.

**لوتە:** ١) ترێی پلیشاو؛ ٢) بەرماوی تێکەڵ‌کراو؛ ٣) بۆ تو؛ ٤) پاروی زل؛ ٥) ترێی هەڵخراو لەبەر ناو بۆ بوونەمێوژ [ف] ١) انگور لهیده؛ ٢) بازماندهٔ خوراك دورریختنی؛ ٣) برای تو؛ ٤) لقمهٔ بزرگ؛ ٥) انگوری که برای تبدیل به کشمش در معرض تابش آفتاب قرار می‌گیرد.

**لوتە:** ١) کەپك؛ ٢) ترۆپکی چیا؛ ٣) کەپۆزل؛ ٤) روونەو پوونەکە؛ ٥) ژنی بەنازو شەرمێون [ف] ١) دماغه؛ ٢) قلّه؛ ٣) دماغ گنده؛ ٤) آدم کوچك بی‌نمود؛ ٥) زن طنّاز.

**لوت‌هاتنەخوارەوە:** ١) لوت‌شکان؛ ٢) لە فیز وازهێنان [ف] ١) کنایه از تنبیه‌شدن؛ ٢) از تکبّردست برداشتن و پست شدن.

**لوتەخور:** بابۆڵەبادەر، پاروی‌زل‌خور: (وا خوانی کەناری من بۆ نوقڵی دەم‌و ماچە/ ئەی لوتەخوری نەکبە سا تۆ لە کەنارت چی؟) «نالی» [ف] کنایه از بی‌احترام.

**لوتەر:** ١) زرنگ‌و چالاك؛ ٢) نەشی؛ ٣) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) زرنگ؛ ٢) دوك؛ ٣) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لوتەلا:** لالوت [ف] قهرکرده، دلخور.

**لوتەلوت:** پرتەو بۆڵە [ف] غرولند.

**لوتەوانە:** ١) خەزێم؛ ٢) سەردەرانەی زەوی [ف] ١) زیور بینی، گل بینی؛ ٢) آستانهٔ برامده.

**لوت‌هەڵکردن:** لالوتی‌شاندان، لالوت‌بوون [ف] قهرکردن.

**لوتی:** ١) بەزمگێری بە زورناو دەهۆڵ؛ ٢) بربێنی لە بێ‌حەیا؛ ٣) بربێنی لە دەست‌بلاو [ف] ١) خُنیاگر؛ ٢) کنایه از بی‌شرم؛ ٣) کنایه از دست و دل باز.

**لوتیاتی:** کاری لوتی [ف] «لوتی»گری، «لوتی»بودن.

**لوتیایەتی:** لوتبانی [ف] نگا: لوتبانی.

**لوتی‌خور:** دەسبڕی بێ‌شەرمانە [ف] کُلاه‌برداری.

**لوتی‌گەری:** لوتبانی [ف] نگا: لوتبانی.

**لوتی‌وپوتی:** عەلوجەلو، روت‌و رەجاڵە [ف] اوباش.

**لوتیەتی:** لوتیانی [ف] نگا: لوتبانی.

**لوج:** ژووری تایبەتی لە تەماشاخانەو سینەمادا [ف] لژ.



**م:** ١) راناوی تەنیا بۆخۆ: (نـەم خوارد، کردم)؛ ٢) راناوی پلەو پایە: (چارم، حەوتم)؛ ٣) من: (م گۆتە تە،ژ م را) ف ١) ضمیر متصل اوّل شخص مفرد؛ ٢) پسوند ترتیب؛ ٣) من.

**ما:** ١) نەرۆیشت، لانـەچـو؛ ٢) نەمـرد، ژیا؛ ٣) گشت لە گشت نەبـو پاشـەروکی‌هەبـو؛ ٤) رەنگـە، رەنـگ‌هەبە: (ما زۆژەکی چێ بە)؛ ٥) ناخـۆ؟، مەگەر؟: (مـا نە وە نەکرد؟)؛ ٦) تۆ بێژی؟، تۆ بڵێی؟: (ما وە دبێن)؛ ٧) بۆچی؟، لەبەر چی؟: (ما وەبە؟، ما نەز بچم؟)؛ ٨) منبو بنە: (مـاکـەو، ماکـەر)؛ ٩) رەگەز، بنجینە: (بنەمای باش نیە)؛ ١٠) زەرد، شاخی لوس؛ ١١) شکێز، فەڵشەبەردی زل؛ ١٢) خۆگرتن و تزبك بە پێگـەیشتن: (دۆکڵبوەکە مای هێناوە)؛ ١٣) سەبەب، هۆ؛ ١٤) پرسی بەسەبرمانەوە ف ١) ماندگار شد؛ ٢) زیست؛ ٣) بقیەماند؛ ٤) امکان دارد؛ ٥) مگـر؟؛ ٦) آیا می‌شود؟؛ ٧) چـرا؟ برای چه؟؛ ٨) مادینە؛ ٩) اصل، اساس؛ ١٠) کوه سنگی؛ ١١) شکاف بزرگ در کوە؛ ١٢) قوام آمدن؛ ١٣) انگیزه؛ ١٤) لفظ پرسش با تعجّب.

**مابوس:** بەندی، گراو، لەزبندان کراو ف زندانی.

**مابـەین:** ١) دوز، نێوان؛ ٢) ناشنایەتی: (مابەینمان خۆشە) ف ١) میان؛ ٢) میانە.

**مابین:** مابەین ف نگاه: مابەین.

**مابێن:** مابەین ف نگا: مابەین.

**ماپوس:** مابوس، بەندی ف زندانی.

**ماپوسخانە:** گرتوخانە، بەندیخانە، زیندان ف زندان.

**ماپوك:** چەپوك، بە لەپ لەسەردان ف توسری.

**مات:** ١) کز، کروشمە کردو؛ ٢) خەمگین؛ ٣) کوڵەکردو، دەرفەت‌خواز لە کارێ؛ ٤) کەلابـەردی زلتر لە کەلای ناسایی کە بۆ جۆرێ کەلابێن دەست نەدا؛ ٥) قوڵکەی بچوك بۆ کایەی کەلابازی؛ ٦) سەرگەردان، سەرسوڕماو؛ ٧) وشەیەکە بۆ لەکارکەوتنی شای شەترنجی دەڵێن؛ ٨) دۆڕاو لە کایەی شەترنجدا؛ ٩) رەنگی بێ بریقە؛ ١٠) نەوی‌تر لە رێزی خۆی: (نەو بەردانەی دە رێگەت گرتوە بەکیان ماتە)؛ ١١) بێ دەنگ: (لە گریانەکەی مات بوە)؛ ١٢) مانگ ف ١) کز کردە؛ ٢) غمناك؛ ٣) منتظر فرصت؛ ٤) تیلهٔ بزرگ؛ ٥) چالهٔ کوچك تیلەبازی؛ ٦) متحیّر؛ ٧) اصطلاح مات در شطرنج؛ ٨) بازندە در شطرنج؛ ٩) رنگ مات، نقطه مقابل برّاق؛ ١٠) کم ارتفاع‌تر در یك ردیف؛ ١١) ساکت؛ ١٢) ماه.

**ماتاب:** ناف‌هەیف ف مهتاب.

**ماتابان:** ١) مانگی لەعاسمان‌دیار؛ ٢) ناوە بۆ ژنان ف ١) ماه تابان؛ ٢) نام زنانە.

**ماتـاف:** بەرانبـەری خوڕ، ئاوێ کە بە مەندی و لەسەرخۆ دەڕوا ف آب سُست جریان.

**ماتان:** کایەی کەلا دەقوڵکەهاویشتن، چاڵان ف بازی تیلەبەگو.

**ماتانێ:** ماتان ف بازی تیلە بە گو.

**ماتاو:** ١) ناف‌هەیف؛ ٢) فیشەکەشێنە ف ١) مهتاب؛ ٢) آفتاب مهتاب آتشبازی، فشفشەبازی.

**ماتاوان:** ماتابان، ناوی ژنانە ف نام زنانە.

**مات‌بون:** ١) کز کردن؛ ٢) سەرگەردان بون ٣) بێدەنگ‌بون؛ ٤ دۆڕاندن لە شەترنجا؛ ٥) جێگیر بون ف ١) کزکردن؛ ٢) خاموش شدن؛ ٣) باختن در شطرنج؛ ٥) جایگیر شدن.

**مات‌بە:** ١) را مەبە، خۆ وەشێرە؛ ٢) بێدەنگ‌بە ف ١) خود را نشان مده، برنخیز؛ ٢) بی‌صدا باش.

**ماتك:** ١) خوشکی باوك، میمك؛ ٢) بێشکە، دەرگوش ف ١) عمّە؛ ٢) گهوارە.

**مات کردن:** ١) بێدەنگ کردن؛ ٢) زەقایی نەوی کردنەوە؛ ٣) بڕیتی لە کوشتن؛ ٤) بـرنەوەی شەترنج ف ١) ساکت کردن؛ ٢) برجستگی را صاف کردن؛ ٣) کنایە از کشتن؛ ٤) بردن شطرنج.

**ماتڵ:** بێکار داماو، شتێ یا کەسێ کە هیچ کاری نەبێ ف معطّل.

**ماتڵ بون:** بێکارمانەوە ف معطّل شدن.

**ماتڵ کردن:** لە کار وەدواخستن ف معطّل کردن

**ماتلی:** جۆرێ تفەنگ 🄵 نوعی تفنگ.
**ماتلی:** ماتڵبوون، بێکاری 🄵 معطّلی.
**ماتۆر:** ١) ئامرازی وەکارخستنی مەکینە؛ ٢) پایسکلێ کە بە بەنزین دەڕوا، دوچەرخەی بێنزینی 🄵 ١) موتور؛ ٢) موتوسیکلت.
**ماتورا:** تەمەڵ، تەوەزەل، کارنەکەر 🄵 تنبل.
**ماتورە:** ماتورا 🄵 تنبل.
**ماتـە:** ١) خـۆکـزکردن، کروشمە؛ ٢) ئاوێنگەڕان و ناڵ و بوڵ بوونی میوەی بێسـتـان؛ ٣) ئەمی یەرجـاو؛ ٤) کـوژەکـەی چاوزار؛ ٥) گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد 🄵 ١) کزکردگی؛ ٢) علائم رسیدن در میوهٔ پالیزی؛ ٣) سیاهی پیش چشم؛ ٤) مهرهٔ ضدّ چشم‌زخم؛ ٥) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**ماتـەدان:** خۆ بەزەویەوەلکـانـدن: (کـەروێشـك **ماتـەی داوە**)؛ ٢) ناڵ و بـوڵ بوونی میوەی بێستـان: (بێستـانـەکە **ماتەی داوە** بەم زوانە بێ‌دەگا) 🄵 ١) بەزمین چسپیدن و منتظر فرصت بودن؛ ٢) ظهـور علائم رسیدن میوهٔ پالیزی.
**ماتەم:** نازبمانە، نازبەباری 🄵 ماتم.
**ماتەمات:** سەیرەسەیرە رۆیشتن 🄵 رفتن پاورچین پاورچین.
**ماتەماتە:** ماتەمات 🄵 نگا: ماتەمات.
**ماتەمی:** نازبەبار 🄵 ماتمین.
**ماتەمین:** ماتەمی 🄵 ماتمین.
**ماتی:** ١) سەرسوڕمان؛ ٢) بێدەنگی؛ ٢) خەمباری؛ ٢) رەنگی بێ‌بریقە 🄵 ١) تحیّر؛ ٢) خاموشی؛ ٣) غمگینی؛ ٤) رنگ مات.
**ماج:** ١) ماز، خزم و پەیڕەوی زەردەشت؛ ٢) ناوی کۆنی کورد 🄵 ١) ماز، پیرو زردشت؛ ٢) نام باستانی قوم کُرد.
**ماجر:** کۆچەر 🄵 کوچ‌کننده، مُهاجر.
**ماجو:** کرێ، پاداشت لە بەرانبەری کاردا 🄵 مزد.
**ماجوج:** یاجوج 🄵 مأجوج.
**ماجوم:** ١) تێکـەڵاوکراوی چەنـد دەرمـانێك بۆ مەڵـحـەم؛ ٢) جۆرێ شیرنیات 🄵 ١) معجون دارویی؛ ٢) نوعی شیرینی.
**ماجۆن:** ماجوم 🄵 نگا: ماجوم.
**ماجوە:** شوێنێ کە ئاوی پێدا هاتوەو دبارە 🄵 اثر جاری شدن آب‌زیر زمین.
**ماجیت:** گونـدێکـە لەکوردستان بەعسی وێرانی کرد 🄵 از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**ماجیداوا:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد 🄵 روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**ماچ:** ١) رامـوس، رامـوسـان، پـاچ؛ ٢) جـگ، میج، قاب 🄵 ١) بـوسە؛ ٢) شنالنگ، قاب.
**ماچا:** ناو پەزێك لە پەزەکانی پاسوور 🄵 از برگهای پاسور.
**ماچان:** ١) چەند رامووسانێ؛ ٢) نێژن، دبێژن، دەڵێن؛ ٣) جگێن، قاپێن 🄵 ١) بوسەها؛ ٢) گویند؛ ٣) قاب‌بازی.
**ماچانێ:** جگێن 🄵 بازی با شنالنگ، قاب‌بازی.
**ماچك:** سوکەلەماچ 🄵 ماچ و بوسهٔ کوچك.
**ماچ کردن:** رامووسان، پاچ کردن 🄵 بوسیدن.
**ماچلەك:** بەندی ئەندام، گەی لەش 🄵 مفاصل اندام.
**ماچماچان:** ئێك و دو رامووسان 🄵 همدیگر را بوسیدن.
**ماچماچانی:** ماچماچان 🄵 همدیگر را بوسیدن.
**ماچماچۆك:** ماچماچان 🄵 همدیگر را بوسیدن.
**ماچمێ:** دبێژین، ئەوێژین، دەڵێین 🄵 می‌گوییم.
**ماچۆ:** ئێژێ، دبێژە، دەڵێ 🄵 می‌گوید.
**ماچومۆچ:** ماچماچان 🄵 همدیگر را بوسیدن.
**ماچـە:** مێو بنـە، ما. بۆ ئێسـتر و جاشەکەری دەڵێن 🄵 ماچه، ماده. ویژهٔ *استر و کرّه خر*.
**ماچی:** ١) دەڵێم؛ ٢) توێژی، هەر دەڵێی؛ ٣) ئەدی چۆن؟؛ ٤) رامووسانی ئەو 🄵 ١) گویم؛ ٢) توگویی؛ ٣) پس چگونه؟؛ ٤) بوسهٔ او.
**ماچیك:** ١) ماچ، رامووسان؛ ٢) دانێ ماچ 🄵 ١) بوسە؛ ٢) بوسەای.
**ماچێن:** ماچانێ 🄵 قاب‌بازی.
**ماحەبین:** مابەین 🄵 نگا: مابەین.
**ماخ:** ١) کاربەندی سەربان؛ ٢) رێزەناڵودار؛ ٣) نزمی نێوان دو بەرزایی؛ ٤) نهـوم 🄵 ١) بـالار؛ ٢) الـوارهـای سقف؛ ٣) پستی مابین دوبلنـدی؛ ٤) طبقه، اشکوبه.
**ماخۆ:** خاوەن، خودان، خێو، ساحێب، ساحێو 🄵 صاحب.
**ماخۆبزنان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد 🄵 نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**ماخـۆلان:** ١) خولخـولـە؛ ٢) ئـەخـۆشی سەرلـەرزین 🄵 ١) گردنـا؛ ٢) بیماری لرزش سر.
**ماخـولیا:** ١) گێژ و حۆل؛ ٢) ئەخـۆشیەکە، ئەسپەك 🄵 ١) گیج و هالو؛ ٢) بیماری مالیخولیا.
**ماد:** ١) ناوێکی کەونارای کورد؛ ٢) دەوڵەتی کورد لەهەمەدانی ئێستو 🄵 ١) قوم ماد؛ ٢) دولت ماد.
**ماداك:** گامێش 🄵 گاومیش.
**مادام:** ١) خامی ژەنی بریقەدار؛ ٢) تا وابە، هەتا وابە 🄵 ١) منقال سیاه برّاق؛ ٢) مادام که.
**مادك:** با بۆڵەی زاروی نێوەپێنجان 🄵 فُنداق بچه.
**مادوکی:** سەردەمی ژێك کەونتی نێر و مێی کۆنر پێکەوە 🄵 دوران نامزدی کبوتران.
**مادە:** ١) جـۆرێ نان؛ ٢) رفـیـدەی نان پێوەدان؛ ٣) کرش، عور؛ ٤) دومەلە، کوان؛ ٥) لوُ، لك، گرێی گۆشت؛ ٦) دایك؛ ٧) هەوێن، ئامیان 🄵 ١) نـوعی نان؛ ٢) بـالشـتـك نانوایی؛ ٣) معده؛ ٤) دُمّل ٥) غدّه؛ ٦) مادر؛ ٧) خمیرمایه.
**مادەر:** دایك 🄵 مادر.
**مادەربەچە:** ئەقەڵی وردو درشت پێکەوە بۆ جوانی 🄵 کوك ریز و درشت باهم.
**مادەرزا:** وەك لە دایك بوە، کە لە دایك بوە: (**مادەرزا کۆرە**) 🄵 مادرزاد.

**ماده‌رزاد:** ماده‌رزا [فا] مادرزاد.

**ماده‌رمه‌رده:** میوه‌ی پێسنانی سیس هه لگه‌راوی پلیخاو [فا] میوهٔ بالبزی پژمردهٔ لهیده.

**ماده‌ك:** ماداك، گامێش [فا] گاومیش

**ماده‌م:** ١)جاكه‌وابه؛ ٢)ناوابه [فا] ١)اگر چنین است؛ ٢)مادامی كه، نا چنین باشد.

**ماده‌ن:** كان، كانگه [فا] معدن

**مار:** ١)جـانه‌وه‌رێكی خزۆكی درێژۆكه‌ی به‌درێشوكه‌به ژاری هه‌به‌و پێوه ده‌دا؛ ٢)خانو، جێگه‌ی لیَ‌ژیانی حێزان [فا] ١)مار؛ ٢)خانه.

**ماراقی:** جۆرێ ماسی كه له مارده‌كا [فا] مارماهی.

**مارانگاز:** مارپێوه‌داو [فا] مارگزیده.

**مارانگه‌ز:** مارپێوه‌داو [فا] مارگزیده.

**مارانگه‌سته:** مارانگاز [فا] مارگزیده.

**ماراو:** هات، به‌خت، ئیغباڵ، نالح [فا] شگون، شانس.

**مارای:** شكان [فا] شكستن.

**ماربڕین:** ماره‌بڕان، لێك حه‌لاڵ كردنی ژن و پیاو [فا] عقدكُنان.

**مارپێچ:** لوله‌ی درێژی قلیان ناوی [فا] مارپیچ قلیان.

**مارت:** ئادار، سێهه‌مین‌مانگی سالی خاچ‌په‌رستان [فا] ماه‌مارس.

**مارتـاك:** ئالاش، پوش و چرۆی سه‌رمبجی خانـو [فا] نركـه و گیاه سقف‌پوش، انبیره.

**مارتلی:** مانلی [فا] نوعی تفنگ.

**مارتـوله:** ١)توله‌مار، به‌چكه‌مار؛ ٢)ماری باریك؛ ٣)كرمی درێژی ناو سك؛ ٤)مارمێلكه [فا] ١)بچه‌مار؛ ٢)ماریاریك؛ ٣)كرم دراز معده؛ ٤)سوسمار.

**مارتین:** مارتلی [فا] نوعی تفنگ.

**مارجو:** نیسك [فا] عدس.

**مارجه‌فری:** جۆرێ مار [فا] نوعی مار.

**مارچێو:** داری سه‌ردوفلیفانه بۆ مارگرتن [فا] چوب دوشاخهٔ مارگیران.

**مارچێوه:** ١)مـارچێو؛ ٢)گیابه‌كـه [فا] ١)چـوب دوشـاخـهٔ مارگیری؛ ٢)گیاهی است.

**ماردا:** مردو، مردگ [فا] مُرده.

**ماردش:** ١)مـردن، مه‌رگ؛ ٢)دوایی‌هاتن، نه‌واوبـوُن [فا] ١) مُردن؛ ٢) تمام شدن.

**ماردن:** شكاندن [فا] شكستن.

**مارده:** ماردا، مردگ [فا] مُرده.

**مارده‌م:** جۆرێ نفه‌نگ [فا] نوعی تفنگ.

**ماردین:** شارێكه له كوردستان [فا] نام شهری در كردستان.

**مارز:** ١) زالم؛ ٢)لاسار و سه‌رسه‌خت [فا] ١) ستمگر؛ ٢) لجباز.

**مارزا:** گوی نازه‌ولی ساوای شیره‌خۆر كه زه‌ردو شله [فا] مدفوغ نو زاد دام.

**مارزه‌یه:** مارانگاز [فا] مارگزیده.

**مارزیای:** به‌جێ هێلراو، نه‌رك كراو [فا] متروك، مهجور.

**مارژۆك:** بۆكمار، جۆرێ مارمێلكه [فا] نوعی مارمولك.

**مارژی:** نیسك، مارجو [فا] عدس.

**مارس:** مارت [فا] ماه مارس.

**مارس:** مارز [فا] نگا: مارز.

**مارسیس:** گوندێكی كوردستانه به‌عسی كاولی كرد [فا] نام روستایی در كردستان كه توسط بعثیان ویران شد.

**مارك:** پیرۆز [فا] مبارك، خجسته.

**ماركرن:** ماربڕین [فا] عقد كردن.

**ماركۆنه:** ده‌سخۆشانه‌ی شاگرد، شاگردانه [فا] انعام شاگرد.

**ماركـه:** ١) راوكـه مریشـك؛ ٢)ئـه‌و هێلكه‌ی كه له كولێن دای‌ده‌نێن بۆئه‌وه‌ی مریشك هه‌رله‌وێ هێلكی تێ‌بكا [فا] ١) رامك؛ ٢)تخم مرغی كه در لانه نخمگذار می‌نهند تانخمش را همانجا بگذارد.

**مارگر** كه‌سێ كه مار حه‌مابه‌ب ده‌كا،كه‌سێكه مار ده‌گرێ‌پێوه‌ی نادا [فا] مارگیر.

**مارگروس:** نیره‌كه‌وێ كه ماكه‌و خۆی لێ‌بواردوه [فا] كبك نری كه ماده‌اش را نمی‌یابد.

**مارگره:** مارچێوه [فا] نگا: مارچێوه.

**مارگه‌ستی:** مارانگاز [فا] مارگزیده.

**مارگیر:** ١) گیابه‌كی دڕكاوی به؛ ٢) مارگر [فا] ١) گیاهی است خاردار؛ ٢) مارگیر.

**مارگیس:** جۆرێ مارمێلكه [فا] نوعی سوسمار.

**مارگیسك:** ١)مارگیس؛ ٢)ماری زه‌هردار؛ ٣) بریتی له مرۆی بێ‌فه‌ڕو خراو [فا] ١) سوسمار؛ ٢) مار سمّی؛ ٣) كنایه از شخص بدجنس و كج رفتار.

**مارگیسه:** بۆقله، به‌قله‌مون، عه‌له‌شیش، عه‌لوَعه‌لوَ [فا] بوقلمون.

**مارمار:** ماڵماڵ، قاره‌مانێكی به‌بنی كه‌ونارایه:(ناسر و **مارمار**) [فا] از شخصیت‌های افسانه‌ای فولكلور.

**مارمارك:** كرمی درێژی ناو سك [فا] كرم دراز معده.

**مارماروشك:** ١)مارمێلكه؛ ٢)گیابه‌كه شیره‌كه‌ی زه‌هره [فا] ١) مارمولك؛ ٢) گیاهی است كه شیره‌اش سمّی است.

**مارمارۆك:** ١) مارمێلكه؛ ٢) هه‌رشتی درێژو به‌پێچ كه له مار بكار [فا] ١) مارمولك؛ ٢) هر چیز مارمانند.

**مارمارۆكه:** بازنه‌ی له‌هه‌وبری برژاو [فا] نان النگو مانند.

**مارماسه:** مارماسی، ماراقی [فا] مارماهی.

**مارماسی:** جۆرێ ماسی‌به وه‌ك مار ده‌چێ بێوه‌ناداو گۆشتی ده‌خورێ [فا] مارماهی.

**مارمالۆك:** مارمێلكه [فا] سوسمار.

**مارمزوك:** ١)بێچوه‌مار؛ ٢)مارمێلكه [فا] ١) بچه‌مار؛ ٢) مارمولك.

**مارمـژ:** ده‌م به جێگـه‌ی مارانگـه‌ستـه‌وه نان و لوُشینی ژار بۆ چاره‌ی مارانگاز [فا] مكیدن جای نیش مار به قصد معالجه.

**مارملیك:** مارمێلكه [فا] مارمولك.

**مارمه‌زوكه:** مارمێلكه [فا] مارمولك.

**مارمێزولکه:** مارمێلکه [ف] مارمولك.

**مارمێژ:** مارمژ [ف] نگا: مارمژ.

**مارمێلك:** جانەوەرێکی بچوکی بۆرەلۆکەیە لە کورنەمار دەکاو دەست‌و پای هەیە لە سەر مێش‌و جانەوەری بچوك دەژی‌و بێوەنادا [ف] مارمولك.

**مارمێلکه:** مارمێلك [ف] مارمولك.

**مارمێلۆك:** مارمێلکه [ف] مارمولك.

**مارنەگەز:** بەلەك‌پێچی لباد [ف] ساق‌پیچ نمدی.

**مارنەینك:** جۆرێ مارە [ف] مار عینکی.

**مارۆ:** ١)فـــەشـان، حەیوانی رەشی ناوچـاوسپی؛ ٢)ئـەسـێ کە خاڵی چەرمـــگ لە پای دابە [ف] ١)دام سیاهِ پیشـــانی سفید: ٢)اسبی کە خالهای سفید دردست وپادارد.

**مارۆپیر:** جوێنێکە وانا: شەرمی دابکت [ف] دُشتامی است.

**مارۆت:** فریشتەی هەواڵی *نارۆت* کە خوابان تۆرە کردوە [ف] نام فرشتەای کە مغضوب خدااست.

**ماروتە:** قولاخە، خزگەی ماسی لە زستاندا [ف] پناهگاه ماهیان در زمستان.

**مارۆخە:** پارچەزەوی بچوك [ف] قطعه زمین کوچك.

**مارودو:** قبلەوقاچ، قیچەلقاج [ف] مورّب.

**ماروژە:** گیایەکە دەخورێ [ف] گیاهی است خوردنی.

**مارۆسیا:** ١)مـــاری رەش؛ ٢) بریتـــی لە مرۆی دزی دل‌بەکین [ف] ١) مارسیاه: ٢) کنایه از دشمن کینه‌توز.

**مارول:** خاس، کاهو [ف] کاهو.

**مارومۆر:** خزوك، هەرجانەوەرێ بەزەویدا خشکە دەکا [ف] خزنده.

**مارومێرو:** بریتی لە هەمـوشتێکی خرت‌و پرت: (سەری **مارو مێروی** هەیە) [ف] کنایه از انواع خرت و پرت.

**مارە:** ژن بەپیاودان بە رێ‌و شوێنی ئاینی [ف] عقد ازدواج.

**مارە:** مارکە، راوکە [ف] رامك.

**مارەبڕ:** کچێ کە بە زارۆکی بە شوُ دراوە [ف] دختر عقد شدهٔ نابالغ.

**مارەبڕانە:** پارەیەك کە ژنی لەسەر مارە دەکرێ [ف] صداق، مهر یه.

**مارەبڕی:** ١)بە رێو شوێنی ئاینی ژن دان بە شوُ؛ ٢)مارە بڕانە [ف] ١) عقد کردن: ٢)صداق.

**مارەبڕیاگ:** ژنێ کە بە شوُ دراوەو هێشتا نەچۆتە ماڵ شوُ [ف] عقد شده.

**مارەبڕین:** ژن کردنەحەلاڵی پیاو بە رێو شوێنی ئاینی [ف] عقد کردن.

**مارەرەش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**مارەزا:** شلەگوی ساوای ئاژەل [ف] مدفوع نوزاد حیوانات.

**مارەزبو:** زیلو، هەزارپێ [ف] هزارپا.

**مارەك:** مارك، پیرۆز [ف] خجسته.

**مارە کراو:** مارە بڕیاگ [ف] عقد شده.

**مارە کردن:** مارەبڕین [ف] عقد کردن.

**مارە کوڵ:** دومارە کوڵ، دوپشك [ف] عقرب.

**مارەگویز:** تیرەی درێژی ئاو بۆ سەر گۆلەمەرەزە [ف] جوب طویل آبرسانی به کرد شالیزار.

**مارەگیرە:** مارچیوە [ف] نگا: مارچیوە.

**مارەیی:** مارەبڕانە [ف] صداق.

**ماری:** ماکەو [ف] کبك ماده.

**مارێ:** جوخم، جوخمە [ف] ١)اتاق بالای راهرو؛ ٢) کوچهٔ تنگ.

**ماری‌پشت:** مۆغەرەی پشت [ف] ستون فقرات.

**ماریژوك:** گیایەکە، ماروژە [ف] گیاهی است.

**ماریژە:** ماروژە [ف] گیاه «ماروژه».

**ماریس:** مارز، زاڵم، لاسار، سەرەڕۆق [ف] دیکتاتور.

**ماریستان:** شوێنێ کە زۆر ماری هەس [ف] جایی کە مار بسیار دارد.

**ماریشۆك:** مارمێلکەی زەلام [ف] مارمولك بزرگ.

**ماریفەت:** زوخۆشی‌و ناکاریەسندی [ف] خوش اخلاقی.

**ماریلە:** مارمێلك [ف] مارمولك.

**مارین:** گیایەکە [ف] گیاهی است.

**مارین:** شکاندن [ف] خُردکردن، شکستن.

**مارینـە:** شوێنـەوارێکی کەونـارایە لە کوردستانی بەردەستی ترکان [ف] ازآثار باستانی در کردستان.

**ماز:** ماج [ف] خویشاوند و پیرو زردشت، ماژ.

**مازان:** ١) کەڵو گامێشی ناوچاوان‌و کلك‌سپی: ٢) گەپ، زەلام، گەورە [ف] ١) گاومیش پیشانی و دُم سفید؛ ٢) بزرگ.

**مازبەر:** نەخۆشیەکە لە سمی ئاژەڵ پەیا دەبێ [ف] از بیماریهای دام.

**مازتر:** گەپتر، زلتر، مەزنتر، گەورەتر [ف] بزرگتر.

**مازگ:** بەری دارێکی لێرەوارە [ف] مازوج.

**مازگا:** پێشەی کلێنچکە [ف] استخوان دنبالچه.

**مازگە:** بڕبڕەی پشت [ف] ستون فقرات.

**مازگێرت:** ناوچەیەکە لە کوردستانی ژێردەستی ترکان [ف] ناحیه‌ای در کردستان.

**مازلوخ:** دوگرد، بەرماڵی نوێژ [ف] سجّاده، جانماز.

**مازماز:** بەرانی قەحل، بەرانێ کە دە بەزی بەردەدەن [ف] راك گُشن.

**مازن:** ١) گـەورە، گەپ، زل: ٢)سەرۆکی عاشیـرەت [ف] ١)بزرگ: ٢)سردارایل.

**مازو:** مازگ [ف] مازوج.

**مازوبــەرەلا:** وشـەیەکە بۆ مازوڵێکردنەوە بەئازادی دەگوترێ [ف] بانگ مازوج چینی آزاد.

**مازوچن:** کەسێ کە مازوُ لە دار دەتەکێنێ‌و کۆدەکاتەوە [ف] مازوج چین.

**مازودار:** دارمازو [ف] درخت مازوج

**مازور:** بێکار [ف] بیکار.

**مازوڤان:** خانەخوێ، خاوەن‌ماڵی میوان حاوێنەوە [ف] میزبان مهمان‌نواز.

**مازوڵ:** کاربەدەستی دەرکراو [ف] معزول.

**مازوڵی:** دەرکراوی لە سەرکار [ف] معزولی.

**مازوڵی کێش:** دۆستی بەئەمەگی کۆنەکاربەدەست [ف] دوست وفادار در

زمان معزولی.
**مازه:** ١) ناوەڕاستی پشت، موْغـەرە، بڕبـڕەی پشت: ٢)شـان، بیل: ٣)داریْ کەچـەرخی عارەبەی پێوەیەو دەگەڕێ ف ١) سنون‌فقرات؛ ٢)کتف؛ ٣)چوب محور چرخهای گاری و...
**مازی:** ١)مازوْ؛ ٢)بڕبڕەی پشت ف ١)مازوج؛ ٢)سنون‌فقرات.
**مازیْ:** ناوی چیایەکە لە کوردستان ف نام کوهی در کردستان.
**مازبچن:** مازوْچن ف مازوج چین.
**مازیر:** سمەشلە، نەخوْشی سمی ناژەڵ ف بیماری سُم دام.
**مازیْز:** داربەڕوی نەستوْر ف درخت بلوط بزرگ.
**مازبیْ:** گونـدیْکی کوردسـتـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**ماژ:** ماز، ماج، خزم‌و بەبڕەوی زەردەشت ف ماژ.
**ماس:** ١)شیری گەرم‌کراوی نامیان‌تیکـراوی نونـدەوەبو؛ ٢)بەنەم ف ١)ماست؛ ٢)آماس.
**ماسا:** ماسی ف ماهی.
**ماسان:** نەستوْربونی ئەندام ف آماسیدن.
**ماساو:** ١)نـەسـتـوْربـوگ، بەنەماو؛ ٢)جانەوەریکە هەر لە ئاودا دەژی گوْشتی خوْشەو یەکجار زوْرە؛ ٣)ماستاو ف ١)آماسیده؛ ٢)ماهی؛ ٣)آبدوغ.
**ماساوە:** گیایەکی نام‌تیژە ف گیاهی است تندمزه.
**ماسایا:** ماسان، بەنەمان، نەستوْربوْن ف آماسیدن.
**ماسایش:** ماسایا ف آماسیدن.
**ماسابە:** ماسایا ف آماسیدن.
**ماست:** ماس، شیری نامیان تێدراوی نوندەوەبوگ ف ماست.
**ماستاف:** ماستاو ف نگا: ماستاو.
**ماستاو:** ماستی لە ئاودا لێك‌دراوی بە مەشکە نەژنیراو ف ماست و آب بەهم زده، دوغ مشك ندیده، آبدوغ.
**ماستاوسارد کردنەوە:** بریتی لە ڕوبینی‌و کلکەسوْتە ف کنایه از تملّق و چاپلوسی.
**ماسـتـاوکـردن:** ١)مـاسـتـاو ساز کردن؛ ٢)ماستاوساردکردنەوە ف ١) ماست و آب بەهم زدن؛ ٢) تملّق کردن.
**ماستاوی:** شتێ کە ماستی پێوە بێ: (کەواکەم **ماستاوی** بو) ف ماست آلوده، آغشته بەماست.
**ماستبا:** دوخەوا، دوکڵیو ف دوغبا.
**ماستیر:** سمەشلە، نەخوْشیەکی ناژەڵە ف از بیماریهای دام.
**ماستر:** زلتر، گەورەتر، مەزنتر ف بزرگتر.
**ماسترۆن:** توێژ لەسەر نویژی زوْن‌و ماست کە بوْزستان هەڵدەگیرێ ف ذخیرهٔ ماست و کره.
**ماست‌ومـوْبژاردن:** بریتی لە بە وردی نوژینەوە لە کاریْ ف کنایه از با دقّت تحقیق کردن.
**ماستەرگ:** کوْڤك، ڕەحانی ف قبف.
**ماسـتـەزوْن:** توێژ توێژی ماسـت‌و زوْن لە سەریەك کە بوْ زستـانـی هەڵدەگرن ف لابەلابهٔ ماست و کره برهم که ذخیره می‌کنند.
**ماستیر:** ڕەحانی، کوْڤك، ماستەرگ ف قبف.
**ماسربشم:** سریْشێ کە لە ماسی دەگیرێ ف چسبی که از ماهی گیرند.
**ماسریْشە:** گیاچریش ف گیاه سریش.
**ماسك:** شکلێ کە بە ڕوبەوە دەگرن تا نەناسرێن ف ماسك.
**ماسکە:** ماسك ف ماسك.
**ماسکەش:** دەوبت ف چاکش.
**ماسمـالی:** ١) پوْشینی تاوان بەنازەوا؛ ٢)ماست بە سەر ژنی خرابدا کردن‌و بە دێدا گەڕاندن ف ١)ماستمالی؛ ٢) ماست بر سر زن بدکاره ریختن و در ده گرداندن.
**ماسو:** دێیەکە لە کوردستان ف نام دهی است.
**ماسوْ:** ماساو، جانەوەرێ کە بە بێ ناو ناژی ف ماهی.
**ماسـوْر:** ١)بـەری داریکی دڕکـاوبە لە عەنـاب دەکـا؛ ٢)ماسولکەی جوْلابی ف ١) ثمر درختی است شبیه عنّاب؛ ٢) ماسولهٔ نساجی.
**ماسـورا:** ١)باکردن‌و هەڵمسان؛ ٢)نەخوْشی بای‌سوْر ف ١)آماسیدن؛ ٢)بیماری بادسرخ.
**ماسول:** ١) ماسوْ، ماساو؛ ٢) پلیتەچرا؛ ٣) داهاتی زەوی ف ١)ماهی؛ ٢)فتیله؛ ٣)محصول زمین.
**ماسـوْلکە:** ١) ماسوْی بچوك؛ ٢) سارەی چاڵ؛ ٣) باریکەی سوْری خەرمان کە هێشتا نەبوْتە کوْ؛ ٤) لەتەقامیشێکی کورتە جوْلا داوی لێ دەپێچـن بوْ نەتـنین؛ ٥)گوْشـتـی پێـەوی ناوەڕاست نەسـتـوْری نەولاولا بـاریك ف ١)ماهی کوچك؛ ٢)کاه کنار چالهٔ غلّه؛ ٣)باریکهٔ خرمن توده نشده؛ ٤)ماسورهٔ بافندگی؛ ٥)ماهیچه.
**ماسـوْلـە:** ١) ماسوْلکەی جوْلابی؛ ٢) ماسوْلکەی گوْشت؛ ٣) جوْری ساج؛ ٤) گلوْلەی فرێت ف ١) ماسوره؛ ٢) ماهیچه؛ ٣) نوعی ساج؛ ٤) گلوله نخ پود قالیبافی.
**ماسە:** ڕەمل، مل، کفت، لم ف ماسه.
**ماسەنە:** پەنەماندن ف متورّم کردن، آماسانیدن.
**ماسەوا:** دوکڵیوی بەماست ف آش ماست.
**ماسی:** ١)ماسوْ؛ ٢)پەنەما؛ ٣)ماست‌فروش؛ ٤)ماستاوی ف ١)ماهی؛ ٢)آماس کرد؛ ٣)لبنیات فروش؛ ٤)ماست آلوده.
**ماسیان:** ماسان، بەنەمان ف آماسیدن.
**ماسی‌بڕەك:** ماسیەك ددانی وەك هەڕەبەو دریژە ف ارّه‌ماهی.
**ماسی‌بانك:** جوْریْ ماسی ف ماهی سوف.
**ماسی‌بەرك:** جوْریْ ماسی ف ماهی کفال.
**ماسی‌خاتوْنەك:** جوْریْ ماسی ف نوعی ماهی قزل‌آلا.
**ماسی‌خڕك:** وردیلە ماسی ف ماهی بسیار ریز.
**ماسی‌خوْرە:** باڵداریکی سپیە ڕاوەماسی دەکا ف فاق، مرغ‌ماهیخوار.
**ماسی‌ستیْرك:** جانەوەریکی دەریاییە ف ازجانوران آبزی.
**ماسی‌سوْل:** ماسی خوێ‌کراوی وشکەوەکراو ف ماهی نمك سود، ماهی شور.
**ماسی‌سوْل وخوا:** ماسی‌سوْل ف ماهی شور.

**ماسی‌فرۆش:** کەسێ کاری ماسی‌فرۆشتنە ف ماهی فروش.
**ماسی‌فڕۆك:** جۆرێ ماسی کە مرۆلای وابە ئەفرێ ف نوعی ماهی.
**ماسی‌فرەك:** ماسی فڕۆك ف نوعی ماهی.
**ماسیڤان:** کەسێ کاری هەر ڕاوەماسیە ف صیّاد ماهی.
**ماسی کارتۆخك:** سفرەماسی ف سفرەماهی.
**ماسی کەران:** بێچوەبۆق ف بچهٔ غوك.
**ماسی گر:** کەسێ ڕاوەماسی دەکا ف ماهیگیر.
**ماسی گرە:** ماسی‌خۆرە ف مرغ ماهیخوار.
**ماسی گرەك:** ماسی گرە ف مرغ ماهیخوار.
**ماسی گیرە:** ماسی گرە، ماسی‌خۆرە ف مرغ ماهیخوار
**ماسیلکە:** ماسولکەی لەشی زیندەوەر ف ماهیچە.
**ماسی‌لۆلـــۆ:** جۆرێ وردەمـاسی لە ڕوبـاردا کە دەبکـەنـە چێشنـەی ماسی گرتن ف نوعی ماهی ریز کە آن را طعمه می‌کنند.
**ماسیلە:** مارمێلکەی ناوخانوان کە لە جێگەی شەدار دەژی ف مارمولکی کە در خانه‌ها و درجای مرطوب زندگی می‌کند.
**ماسین:** ١) پەنەمین، پەنەمان؛ ٢) نوێژی مەبوی ژن‌و چەوری بە سەر شتێکەوە ف ١) آماسیدن؛ ٢) لایهٔ چربی بر چیزی بسته‌شدن.
**ماسی نێزەدار:** جۆرێ ماسی قورنم درێژ ف نیزه‌ماهی.
**ماسیەپانکە:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.
**ماسیەخاتونە:** جۆرێ ماسی پنوك‌پنوك ف نوعی ماهی خالدار.
**ماسیەزەردە:** زەردەماسی، جۆرێ ماسی ف زردماهی.
**ماسیەوان:** بنیادەمێ کە ڕاوەماسی دەکا ف ماهیگیر.
**ماسیەوچنە:** ماسی گرە ف مرغ ماهیخوار.
**ماسی هۆرك:** جۆرێ ماسی کە لە ناو قوتو دەکرێ ف ماهی تن.
**ماش:** ١) نامانێکە دە سەری دوولاشی دەگرن تا پۆش‌و جبلکە بگرێتەوەو نەگانـە زەنبـوورە؛ ٢) ناوی ڕاوەسناو؛ ٣) ئەوەی بەر گەسك دێت؛ ۴) دانـەوێڵەیەکی شینباوە بە چێشت لێ‌دەنرێ‌و دەنکی خڕی وردە ف ١) آبکشی که در دهانهٔ ناوآسیا نهند؛ ٢) آب راکد؛ ٣) روبیدنی؛ ۴) دانهٔ آشی ماش.
**ماشان:** ١) گزك‌دان، گەسك‌لێدان، جاڕوکردن؛ ٢) دەست‌گێڕان ف ١) جاروکردن؛ ٢) دست گرداندن.
**ماشاو:** ناومرواری، نەخۆشیەکی چاوە ف آب مروارید، از بیماریهای چشم.
**ماشتن:** گەسك‌دان ف جاروکردن.
**ماشقە:** گراوی، دۆستی مێ بنە، زۆرتر بۆ ماری دەڵێن: (ئاشقەو ماشقە) ف معشوقه.
**ماشك:** جۆرێ لوبیا ف لوبیا چشم بلبلی.
**ماشکان:** ناوی دێیەکە ف نام دهی است.
**ماش کردن:** زۆری‌هێنانی ئاوی ڕاوەستاو بۆ ڕژان ف فشار آوردن آب راکد.
**ماشکە:** ماشقە ف معشوقه.
**ماشگە:** ناوی چەند دێیەکە لە کوردستان ف نام چند آبادی.

**ماشلێن:** چێشتی ماش ف آش ماش.
**ماشوبرنج:** برێتی لە موی سپی‌و ڕەشی تێکەڵ ف موی جوگندمی.
**ماشـــوت:** ١) کلافـەتـــاوربشـمـی خۆرستو دەستلێ‌نەدراو؛ ٢) گیانداریکی بچوکە ملۆزمی نوك‌و باقلەی سەوزە ف ١) پیلهٔ ابریشم؛ ٢) حشرهٔ آفت نخود و باقلی.
**ماشە:** ١) سەبەتەیەکی دەم‌تەنگی بن فرەوانە ڕاوەماسی پێ دەکەن؛ ٢) پۆلوگر، پەنگر؛ ٣) پەلەپیتکەی چەکی گەرم ف ١) سبد تله‌ماهی؛ ٢) انبر؛ ٣) ماشهٔ سلاح.
**ماشەر:** کلافەیەنێکە لە نێوان دوئەژنۆدا هەڵدەکرێ ف گروهەربسی که میان دو زانو پیچند.
**ماشەرز:** گازی بزمارکێشانەوە ف گازانبر، کلبتین.
**ماشەرك:** فرێت، نۆپەلەیەنێ کە دە نەونەوە دەدرێ ف پودی که با دست لای تار گذارند.
**ماشەرە:** ١) ماشەر؛ ٢) ماشەرك؛ ٣) ئاورە، ئاگرە، جۆرێ کوانە لە دەم‌و چاو ف ١) نگا: ماشەر؛ ٢) نگا: ماشەرك؛ ٣) آتش پارسی، نوعی دُمَل.
**ماشەڕش:** دانەوێڵەی ماش ف دانهٔ آش ماش.
**ماشەسپی:** دانەوێڵەیەکە پانکەڵەو سپی‌و نامخۆش لە کەلوُدا دەبێ ف لوبیا سفید.
**ماشەسپیلکە:** ماشەسپی ف لوبیا سفید.
**ماشەك:** ماشە، پەلەپیتکەی چەکی گەرم ف ماشهٔ اسلحه.
**ماشەڵ:** چەبەر لەبەر ڕوبار بۆ ماسی‌گرتن ف نوعی دام ماهیگیری.
**ماشەلان:** سروەبای خۆراوا ف نسیم غروب.
**ماشەڵلا:** وشەی سەبرمان ف ماشاءالله، کلمهٔ تعجب.
**ماشین:** ١) گسـك‌دان‌و خاوێن‌کردنـەوە؛ ٢) ترومبیل ف ١) روبیدن و تمیزکردن؛ ٢) اتومبیل.
**ماشین:** ١) چێشتی ماش، ماشلێن؛ ٢) هەر ئامرازێ بە مانۆز کار دەکا؛ ٣) ترومبیل ف ١) آش ماش؛ ٢) ماشین، ابزار ماشینی؛ ٣) اتومبیل.
**ماشێنە:** ١) ماشلێن، ماشین، شێوی ماش؛ ٢) ئامرازی جلدرون ف ١) آش ماش؛ ٢) چرخ خیّاطی.
**ماشێنەچی:** جلدرو، خەیات ف خیّاط.
**ماشینەوە:** برێتی لە خواردنی بەکجار زۆر: (هەمو خواردنەکەی بەکجێ ماشیەوە) ف کنایه از زیادخوردن.
**ماشێوە:** ڕاوك، پاڵوێنە ف پالونه.
**ماع:** باع، هاواری مەڕو بزن ف بع، صدای بز و گوسفند.
**ماعبەین:** مابەین ف نگا: مابین.
**ماعبێن:** مابەین ف نگا: مابین.
**ماعتاج:** تاتاج، هەژار ف محتاج.
**ماعتاژ:** ماعتاج ف مُحتاج.
**ماعـد:** ١) ڕەنـگ‌ورو؛ ٢) واز، ئیشتیا؛ ٣) برێتی لە هەنـاسـەو هەنـاو: (مـاعـدی خۆتـەنگ کەردش) ف ١) سیما؛ ٢) اشتها؛ ٣) کنایه از حالات درونی.
**ماعدە:** ١) ورگ، ماعور؛ ٢) ئیشتیا، واز ف ١) معده؛ ٢) اشتها.

**ماعەدەن**: ١) کان، کانگا؛ ٢) مەڵبەندێکە لە کوردستان □ ١) معدن؛ ٢) ناحیه‌ای در کردستان.

**ماعزمە**: ئامرازی کار، ئامێر □ ابزارکار.

**ماعزەمە**: ماعزمە □ ابزارکار.

**ماعشلێر**: شەقەمێو، بنەڕەزی ئەستوور □ تنهٔ تاك.

**ماعشێل**: ماعشلێر □ تنهٔ تاك.

**ماعکوم**: بەندی، حوکم کراو بەپێی قانون □ زندانی محکوم.

**ماعملە**: مامڵە، ساردوسەودا، مامەڵە □ معامله.

**ماعمەلە**: مامەڵە، داوسته □ معامله.

**ماعنا**: وانا □ معنی.

**ماف**: بەش، هەق: (مافت بە سەر ئەو ماڵەوە نیە، منیش **مافم** پێوە بە) □ سهم، حصّه.

**مافندی**: بەش بڕاو، دەم لەبوش □ بی نصیب، مُفلس، ورشکست.

**مافنگی**: مافندی: (تەواو لە ماڵەکەی **مافنگی** کراوە، چی نەماوە **مافنگی** بوە) □ نگا: مافندی.

**مافوور**: ڕایەخی بە تەون تەنراوی پڕ زەدار، **قاڵی** □ قالی، فرش.

**مافوورە**: مافوور □ فرش، قالی.

**مافوێر**: مافوور □ قالی.

**مافە**: دارێ کە بە دەرگاوە دەندرێ بۆ داخستنی □ چوبی که در را بدان بندند.

**مافەتا**: ١) بەتا، دەرم، ئازار، دەردی گیروێ؛ ٢) گیابڕ، ئەو کرمەی کە ماڵات بە گیاوە دەیخواو دەردی تێدەکەوێ؛ ٣) بریتی لە بنیادەمی بەزەرەرو خراپ □ ١) بیماری واگیر؛ ٢) کرم کشندهٔ دام که بر علف نشیند؛ ٣) کنایه از آدم موذی.

**مافەتە**: مافەتا □ نگا: مافەتا.

**ماڤاژی**: قسەی من، گفتی من □ گفتهٔ من.

**ماڤاژیمە**: من ئێژم کە □ من می گویم که.

**ماق**: چاوزەق □ چشم برآمده، خیره.

**ماقوڕ**: بەردی قوڵ کە ناوی تێدا ڕادەوستێ □ سنگ گود که آب باران درآن جمع شود.

**ماقووڕ**: ١) بەڕێز، بەحورمەت؛ ٢) قسەی دڵپەسند □ ١) محترم؛ ٢) حرف قابل قبول، سخن مقبول.

**ماقووڵ**: ماقووڕ □ نگا: ماقوڕ.

**ماک**: ١) هەر ڕەگەزو بنچینەیێ کە شتی لێ پێك هاتوە، هۆی دروس بوون؛ ٢) دایك: (زاو **ماك** نێکەلن)؛ ٣) ئاسۆ، ئاسۆگ؛ ٤) شاهەنگ؛ ٥) کونو لانەی دڕندەو کێوی؛ ٦) ئەستوور بوونی جێگەی ئاوڵەکوتان؛ ٧) زیپکەی ناو چاو بەهۆی ئاوڵەوە؛ ٨) زەوی بەبڕشت؛ ٩) قۆبچە، بشکۆژ، دوگمە؛ ١٠) جۆرێ مووروی بریقەدار □ ١) مادّه؛ ٢) مادر؛ ٣) افق؛ ٤) زنبور عسل مادر؛ ٥) لانه و کنام درنده و کوهی؛ ٦) وَرَم جای آبله‌کوبی؛ ٧) جوش آبله در چشم؛ ٨) زمین حاصلخیز؛ ٩) دکمه؛ ١٠) نوعی مهرهٔ زینتی براق.

**ماکاف**: ١) جۆگەی گەورە کە جۆی تری لێ دەبنەوە لە ناوداشتنا؛ ٢) چەند دەستەکە دێراو پێکەوە □ ١) جوی اصلی در آبیاری؛ ٢) چند دسته جوی کوچك در کشتزار.

**ماکاو**: ماکاف □ نگا: ماکاف.

**ماکبڕ**: لە شبر گرتنەوەی بەرخو کار □ ازشیر بازگرفتن برّه و بُزغاله.

**ماکۆ**: پاکۆ، بەسەریەکادراوی گیای دوراو □ دروشدهٔ انباشته.

**ماکۆ**: جێگەی ماسوێکە لە ئامرازی جۆلاییدا □ مکوك جولایی.

**ماکۆز**: گیایەکە لە ناوا دەڕوێ ناماڵ تاڵەو لە کۆزەلە دەکا □ گیاهی است آبزی.

**ماکە**: ماك □ نگا: ماك.

**ماکەجۆ**: شێلەگە □ جای بریدن از جوی اصلی.

**ماکەر**: دێڵەکەر □ ماده‌خر.

**ماکەلە**: مارەبی □ صداق.

**ماکەو**: کەوی مێ □ کبك ماده.

**ماکی**: ئەدی کێ؟ □ پس چه کسی؟.

**ماکینە**: ئامرازی دەسکرد بۆ کارهاسان کردن، ماشێن □ ماشین.

**ماکینەچی**: ١) کەسێ کار بە ماکینە دەکا؛ ٢) خەیات، جلدرو بە چەرخ □ ١) تکنیسین؛ ٢) خیّاط.

**ماگ**: ١) ماو، نەمردو؛ ٢) لەبەین نەچوگ □ ١) باقی، زنده؛ ٢) ازبین نرفته.

**ماگرت**: مراری، مرواری، گەوهەرێکە لەناو سەدەفدا □ مروارید.

**ماگرتە**: ١) پەڵەی ڕەشی ڕوی مانگ؛ ٢) مانگ گیران □ ١) لکه‌های روی ماه؛ ٢) خسوف.

**ماگە**: ١) باقیماو؛ ٢) لەجێ ماو □ ١) باقیمانده؛ ٢) مانده.

**ماگیرسە**: مانگ گیران □ خسوف.

**مال**: ماڵ □ نگا: ماڵ.

**ماڵ**: ١) شتی تایبەتی کەسێ؛ ٢) دەوڵەت و دارایی؛ ٣) کەلوپەلی بازرگانی: (بازرگانێك هاتوە **ماڵی** هێناوە)؛ ٤) ژن، ژنی حەیوانی مێچکە؛ ٥) خانو، جێ ژیانی خێزان؛ ٦) مابەینی هەردوك سەری کەوان؛ ٧) مابەینی دەندەو ئامور؛ ٨) پاشگری بەواتا: بێداهێن: (دەس**ماڵ**)؛ ٩) پاشگری بەواتا: خاوێن کەرەوە؛ ١٠) ئامرازی خاوێن کردنەوە: (بەفر**ماڵ**)؛ ١١) دروسکەر: (نەمەد**ماڵ**، خشت**ماڵ**) □ ١) جزو دارایی؛ ٢) ثروت؛ ٣) کالای بازرگانی؛ ٤) شرمگاه حیوان مادینه؛ ٥) خانه، مسکن؛ ٦) فاصلهٔ دوسر کمان؛ ٧) فاصلهٔ میان گاواهن و خیش؛ ٨) پسوند به معنی مالنده؛ ٩) پسوند به معنی پاك کننده؛ ١٠) ابزار روبیدن و پاك کردن؛ ١١) سازنده.

**مالات**: ئاژڵ، وڵسات، حەیوانانی ڕاگرتن □ دام.

**مالاخمە**: کلۆشی گێرەکراوی خەرمان، خۆیان □ خرمن کوبیدهٔ بادنداده.

**مالار**: سێ پایەی مەشکە □ سه‌پایهٔ مشك.

**مالاڤا**: ١) سوپاس؛ ٢) خواحافیز؛ ٣) مرۆی زەنگین و ماڵ خۆش؛ ٤) وتەیەکە بۆ سەرکۆنەی بەخۆشەویستیەوە دەیڵێن □ ١) سپاس؛ ٢) خداحافظ؛ ٣) متموّل، دارا؛ ٤) لفظ شمانت محبت‌آمیز.

**مالاڤایی:** خانرخوازی، خواحافیزی ف خداحافظی.

**مالاکا:** زەق‌تواشا، چاوەدر پەڕباگ، مولەقی‌چاو ف چشم برجسته.

**مالاکامەندش:** بەچاوی زەق ڕوانین ف خیره‌نگریستن.

**مالامال:** دارمال، تژە ف مالامال.

**مالامن:** وشەیەکە لە جیاتی گیانەکەم ف جانا.

**مالامیر:** ١) ناوچەیەکە لە کوردستان؛ ٢) کۆشکی خان ف ١) ناحیه‌ای در کردستان؛ ٢) قصر ارباب.

**مالان:** ١) دانیشتوانی ئاوایی؛ ٢) جلك یان نبکول فڕێدان. *لەگەڵ دا* نێژن: (دامالان) ف ١) ساکنان آبادی؛ ٢) پوشش با پوست انداختن.

**مالانگەڕ:** ژنێ کە هەمیشە سەر لە هەمو مالان دەدا ف زن ولگرد.

**مالانە:** باجی خانوان ف باج مستغلات.

**مالاو:** ١) بازوکراو، گەسك‌لێدراو؛ ٢) مشت و مال‌کراو ف ١) روبیده؛ ٢) مالیده.

**مالاوا:** وشەیەکە لە جیاتی خوداحافیز، خانرێ وە ف بدرود، خداحافظ.

**مالاوایی:** خواحافیزی، خانرخواستن ف خداحافظی.

**مالاهالی:** جا ئەوە حالە؟!، ئەمەش بو بە ژیان؟! ف لفظ شکایت از روزگار.

**مالبا:** خەمەگرو، سەرمازەلە، خومخموك ف سوسمار درشت.

**مالبات:** خاو، خێزان، خانەوادە ف اهل بیت، خانواده.

**مالبڕ:** ١) ئامرازی دەسنی دزی مالان، دیواربڕ؛ ٢) دزێ کە دیوار کون دەکا ف ١) ابزار دیوار سوراخ کردن دزد؛ ٢) دُزد.

**مالبڕی:** دزی لە مالان ف دزدی خانه‌ها.

**مالبڕین:** مالبڕی ف دزدی خانه‌ها.

**مال بشکن:** ١) گەڕان لە مالان بو شتێ؛ ٢) کەسێ کە مالان دەگەڕێ بو دوزینەوەی شتێ ف ١) تفتیش خانه‌ها؛ ٢) مفتش خانه‌ها.

**مال بشکێن:** مال‌بشکن ف نگا: مال‌بشکن.

**مال بەمال:** ١) گوڕینەوەی کالا بە کالا؛ ٢) بڕیتی لە گشت خانوی ئاوایی: (مال بەمال گەڕام) ف ١) تهاتر، معاملهٔ پایاپای؛ ٢) خانه‌به‌خانه.

**مالبەند:** نیشتمان، جێ‌مال‌و ژیان، بنکەی مال ف مقرّ، موطن.

**مالپاریز:** ١) ڕژد، چکوس، سەقیل، فرنبس؛ ٢) بڕیتی لە دەولەمەندێ ترسەنوك ف ١) خسیس؛ ٢) کنایه از ثروتمند ترسو.

**مالپاریزی:** کار مالپاریز ف عمل «مالپاریز».

**مال پشکن:** مال‌بشکن ف نگا: مال‌بشکن.

**مال پشکێن:** مال‌بشکن ف نگا: مال‌بشکن.

**مال تقری:** ئامرازێ کە ئەوەرەو بەرداشی سەرەوەی گرنوە لە ئاسباودا ف ابزاری در آسیاب.

**مالتە:** ١) هی تو بە؛ ٢) وشەیەکی سەرکونەکردنە: (**مالتە تو بو هێندە بوزەی؟!**) ف ١) مال تو است؛ ٢) کلمهٔ سرزنش.

**مالجو:** شەقەجو، جوگەی سەرەکی ف جو بیار.

**مالچرا:** گڕداپوشی جرا، شیشەجرا ف شیشهٔ چراغ.

**مال خراب:** ١) مال‌ویران؛ ٢) بو لومە ئێژنی ف ١) خانه‌خراب؛ ٢) لفظ شماتت.

**مالخو:** ١) خاوەن، خێو؛ ٢) خاوەن‌مال، خانەخوێ؛ ٣) خومالی دژی بێگانە ف ١) صاحب؛ ٢) خانه‌خدا؛ ٣) خودی، مقابل اجنبی.

**مالخوێ:** ١) خاوەن‌مال؛ ٢) بریکار لە خەرج و مەزخاندندا ف ١) صاحب خانه؛ ٢) وکیل خرج.

**مالخێ:** مالخوێ ف نگا: مالخوێ

**مالخەراب:** مالخراب ف نگا: مال‌خراب.

**مالدار:** ١) دەولەمەند؛ ٢) ئاژەلدار ف ١) ثروتمند؛ ٢) دامدار.

**مالداری:** ١) گردەوەکویی؛ ٢) کەبوانویی، ئاگاداری لە مال؛ ٣) ئاژەلداری ف ١) صرفه‌جویی؛ ٢) خانه‌داری؛ ٣) دامداری.

**مالراو:** ١) خاوێنەوەکراو؛ ٢) پێداساوباو ف ١) روبیده و تمیز شده؛ ٢) ساییده‌شده بر.

**مالزەمە:** ئامبر، ئامرازی کار ف ابزارکار.

**مالسواری:** بەکسم ف مال‌سواری.

**مالشت:** ١) دەس بەلەشا هێنان بە ئەوژم، دامالین؛ ٢) خاوێن کردنەوەی ولات؛ ٣) مشت و مال ف ١) ماساژ؛ ٢) نظافت؛ ٣) صیقل.

**مالشتن:** کاری مالشت کردن ف کار «مالشت» کردن.

**مالشتە:** کەسێ کە مالشت دەکا ف «مالشت» کُن.

**مالشەوتی:** وشەیەکی سەرکونەیە ف از الفاظ شماتت.

**مالك:** ١) مالی کەوان؛ ٢) خاوەن‌زەوی؛ ٣) کەردی بچوك بو سەوزی‌چاندن؛ ٤) کوخ، کولێت، کوخنە؛ ٥) کونی شەش گوشەی ناو شانەهەنگوین ف ١) فاصلهٔ کمان؛ ٢) ارباب، صاحب زمین؛ ٣) بیل کوچك باغبانی؛ ٤) کوخ، کلبه؛ ٥) هر یك از شش‌ضلعی‌های کندوی عسل.

**مالك:** ١) خانەخانەی چوارگوشە؛ ٢) بەیتی شعر ف ١) جدول مربّعات؛ ٢) بیت شعر.

**مال کاماخ:** چارەڕەش، بێچارە، بەدبەخت ف بیچاره.

**مال کاول:** وشەیەکە بو لومەو سەرکونەکردن ف کلمهٔ سرزنش.

**مال کردن:** ١) کەمێك بەلادا خوارکردنەوە؛ ٢) خانو دروست‌کردن؛ ٣) بڕیتی لە ژن‌هێنان‌و خێزان‌دامەزراندن؛ ٤) جوێ بونەوە لە خێزان‌و مال: (**مالەخوێ کردوە**) ف ١) متمایل کردن؛ ٢) خانه‌ساختن؛ ٣) کنایه از متأهل شدن؛ ٤) جداشدن از خانواده و مستقل شدن.

**مالکو:** دەسکی دول، دەسکی دینگی چەلتوك‌کونان ف دستهٔ دنگ شالی‌کوبی.

**مالکەتن:** ئابوت‌بون، لەمال‌و دارایی بەش‌بڕان ف ورشکست شدن.

**مالکەتی:** ئابوت ف ورشکست.

**مالگر:** ١) کەسێ شتێ دەشاریتەوە بو گران‌بون؛ ٢) کرانشین ف ١) مُحتکر؛ ٢) اجاره‌نشین.

**مالگە:** خانوی کوچەر لە ئاوایی کە ئەنیا زسنان تیا دەژی ف خانهٔ ایلاتی در آبادی که فقط زمستان در آن زندگی کنند.

**مال لەیەك:** ئێکمال، شەریك، برابەش ف شریك در ثروت.

**مالم:** پێش‌نویژی جولەکان ف روحانی کلیمیان.

**مالم:** ۱) جێگەی ژینم؛ ۲) ئەو شتەی هی منە ف ۱) مسکنم؛ ۲) مال من.

**مالماشت:** ۱) کەوش کەن، پێشخانە؛ ۲) گێسك لێدەری ماڵ ف ۱) جای کفش در منزل؛ ۲) جاروکش خانه.

**مالمـاڵ:** ۱) ناقەناقەی ماڵان؛ ۲) هەمو خانوی ئاوایی؛ ۳) کەسێ کە گەسك لە زۆری ماڵ نەدا؛ ۴) ناوی قارەمانێکی چیرۆکە ف ۱) تك تك خانەها؛ ۲) همهٔ خانەهای آبادی؛ ۳) جاروزن خانه؛ ۴) نام قهرمانی داستانی.

**مالمالانێ:** خانوچکەدروست کردنی زارۆکـان ف نوعی بـازی کودکان.

**مالمالك:** مارمێلکە ف سوسمار.

**مالمالۆك:** مارمێلکە ف سوسمار.

**ماڵ ماڵە:** ناك ناکەی ماڵان ف تك و توك از خانەها.

**مالمالەسوڕە:** خاڵ خاڵۆکە ف حشرهٔ کفشدوزك.

**مالمهەقە:** بەڕاستی شایەتی دەدەم ف شهادت می‌دهم.

**مالمیرات:** وشەی سەرکۆنە، ماڵ کاول ف کلمهٔ سر زنش.

**مالمیزك:** گمبزدان ف مثانه، آبدان.

**مالن:** ماڵی ئێمە ف ۱) مال ما؛ ۲) خانهٔ ما.

**مالنج:** ئامرازی لوس کردنی سواغ ف مالهٔ بنّایی.

**مال نه کـەتو:** نزابەکی باشەوانا؛ ماڵت نەڕمێ ف دعای خیری است به معنی خانه‌ات آباد باد.

**مالنیش:** خانەنشین، گردەنشین، هەڵپەسێراو ف خانه‌نشین.

**ماڵۆ:** خێشك ف مالهٔ شخم صاف‌کن.

**مالوان:** ۱) ناوچەیەکە لە کوردستان؛ ۲) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) ناحیه‌ای در کردستان؛ ۲) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مالـوبڕ:** لە هەر ماڵێکی ئاوایی فەڵنەداریێ بۆ سوتاندن کۆ کردنەوە: (با **مالۆبڕ** بکەین بۆ مزگەوت) ف عَمَل از هر خانه یك قطعه هیزم برای سوخت جمع کردن.

**مالوبەز:** مەڕ ومالات، ولسات ف احشام و اغنام.

**مالوبیاو:** لە هەرماڵەی پیاوێ بۆ زباره ف از هر خانه مردی برای همکاری.

**مالۆچ:** گیابەکە لە ڕوەکی نزیك خۆی پێچ دەخوا لەوەڕێکی خۆشەو بە جێشنبش لێ‌دەترێ ف از گیاهان پیچك، ملوکیه.

**مالۆچکه:** ماسوڵکەی خەرمان ف «ماسولکه»ی خرمن.

**مالۆچکه:** خانوی چکۆڵە ف خانهٔ کوچك.

**مالوچه:** مالۆچ ف گیاه ملوکیه.

**مالۆچه:** مالۆچکە ف خانهٔ کوچك.

**مالوحال:** ۱) بڕێنی لە جۆرێ گوزەران؛ ۲) بڕێنی لە ئەسبابانی ماڵ ف ۱) کنایه از نوعی زندگی؛ ۲) کنایه از اثاث خانه.

**مالوس:** بەرازی مێ ف خوك ماده.

**مالـوسکـه:** ۱) ماسولکەی گۆشت؛ ۲) ماسـوڵکەی خەرمان ف ۱) ماهیچه؛ ۲) «ماسولکه»ی خرمن.

**مالۆسکه:** مالوسکە ف نگا: مالوسکە.

**مالۆکەن:** ماڵبڕی دزان ف بشنگ.

**مالۆکێش:** داری نێوان خێشك و نیر ف چوب میان ماله و یوغ.

**مالۆگا:** هەرگیانداریێ سەری زلتر لە ئاسایی بێ ف جانداری که سرش از حدّ طبیعی بزرگتر باشد.

**مالۆلك:** جانەوەرێکی خزۆکە ف از خزندگان است.

**مالولکی:** شیوێکە لە هەویر و بڕۆش چێ‌دەبی ف آشی است.

**مالوم:** ۱) مالـم؛ ۲) زاندراو، خوبـا ف ۱) روحانی بهـود؛ ۲) معلوم، مشخّص.

**مالومنال:** خاوخێزان، خێزانی ماڵ ف افرادخانواده.

**مال و مندال:** مالومنال ف افراد خانواده.

**مالـومـه:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی ویرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**ماڵ ویران:** ۱) لێقەوماو، زۆر زیان لێ کەوتو؛ ۲) وشەی سەرکۆنە، ماڵ کاول ف ۱) خانه‌خراب؛ ۲) کلمهٔ سر زنش.

**مالوینچه:** مالۆچ ف گیاه ملوکیه.

**ماله:** ۱) ئامرازی فوڕلوس کردن؛ ۲) خێشك؛ ۳) پەڵەپەڵەی دەموچاوی ژنی ئاوس؛ ۴) فلچەی زبری جۆلاکە جربێشی پێ لە بۆزۆ دەدا ف ۱) مالهٔ بنّایی؛ ۲) شخم صاف کن؛ ۳) لکه‌های صورت زن آبستن، ماهه؛ ۴) فرچهٔ مانندە.

**مالهالو:** خاڵ خاڵۆکە ف کفشدوزك.

**مالەباقی:** ئەی خۆزگە، خوا بکرابە ف خداکند، ای کاش.

**مالەبیتان:** گەمەیەکی زارۆکانە بە جەو دەبکەن ف نوعی شن‌بازی کودکان.

**مالەبیتکان:** مالەپینان ف نگا: مالەپینان.

**مالەبیتین:** مالەپینان ف نگا: مالەپینان.

**ماله کاری:** قوڕ بە ماله سواغدان ف کار بنّا با ماله.

**ماله کردن:** لوس کردنی قوڕ بە ماله ف ماله کشی.

**ماله کێشان:** ماله کردن ف ماله کشی.

**مالـەفە:** ۱) بە دەست خاوێن کردنەوە؛ ۲) مشت و ماڵ دان ف ۱) زدودن؛ ۲) صیقل دادن.

**مالەڤین:** ۱) نابوت بون، هیچ بۆنەمان؛ ۲) کەساسی، بێ‌برەوی ف ۱) ورشکستگی؛ ۲) کسادی، بی‌رواجی.

**مالەقازیان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مالـە کـانی‌شاسوار:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مالـەنیا:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مالەوکەن:** دیواربڕی دزان ف ابزار دیواربُری دزد، بشنگ.

**مالەوماڵ:** لە خانو بۆ خانو: (کرێوەیەکە کەس **مالەوماڵ** ناکات) ف ازخانه‌به‌خانه.

**ماڵـەوماڵ کردن:** لە خانویەکەوە بۆ خانوی ڕۆیشتن: (بەس **ماڵەوماڵ** بکە) فا ازخانەای به خانەای رفتن.

**ماڵـەوە:** ١) ماڵ، جێگەی ژیانی خێزان؛ ٢) بریتی لە کەبوانو: (**ماڵەوە** دەیگوت) فا ١) مسکن: ٢) کنایه از همسر.

**ماڵەونجە:** ماڵۆج، ماڵۆجە فا گیاه ملوکیه.

**ماڵەوینچە:** ماڵۆج، ماڵەوێنجە فا گیاه ملوکیه.

**ماڵەهەنگ:** شانەهەنگوبن فا شانەعسل.

**ماڵی:** ١) کەوی، کەدی، حەمابەت: (عاشقی چاوناسکێکم **ماڵی** بە/ دڵ بە بێ فکر و خەباڵی خاڵی بە) «زیوەر»؛ ٢) شتێ کە لە ماڵدا دروست دەکرێ: (نان **ماڵی**)؛ ٣) کەسگی دا؛ ٤) ماڵ نەو فا ١) رام، اهلی؛ ٢) خانگی؛ ٣) جارورد؛ ٤) «ماڵ» او.

**ماڵیات:** ١)باجی دەوڵەت؛ ٢) ماڵات فا ١) مالیات؛ ٢) دام.

**ماڵیاو:** ماڵراو فا نگا: ماڵراو.

**ماڵیاوا:** ١) لەو گونـدانـەی کوردسـتـانـە کە بەعسی کاولیان کرد؛ ٢) خانەی ئاوا فا ١) روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند؛ ٢) خانەاش آباد.

**ماڵێب:** شەنەی خەرمانبادان فا افشون.

**ماڵیتە:** جێگەی خۆلێ‌بەنادان، بەناگا فا پناهگاه.

**ماڵی‌دنیا:** ١) دارایی؛ ٢) بریتی لە هونەرو ژنهانو بی فا ١) دارایی: ٢) کنایه از هنرمندی.

**ماڵیز:** هەویری زۆر شل، زبنکه، شلکێنه فا خمیر بسیار آبکی.

**ماڵیفەت:** ڕاهێنان، حاواندنەوە، بەخودی‌کردن فا تربیت.

**ماڵیڤ:** شەنە، شەن فا افشون.

**ماڵیلە:** لوسە، باری فا اَهرُم.

**ماڵین:** ١) لێدان: (کوتەکێکی بیا**ماڵی**)؛ ٢) ساوین: (زۆنی بیا **بماڵە**)؛ ٣) بەرینێ‌دانی بەرگن بۆ لبـاد؛ ٤) گزگ‌و بازو لێدان فا ١) زدن؛ ٢) سابیدن؛ ٣) لگدمال کردن نمد؛ ٤) روبدن.

**ماڵینوس:** دەرمانەسوورەی جاو فا دوای قرمز چشم درد.

**ماڵینەوە:** ١) بردنی هەمو شتێك؛ ٢) دووپاتەکردنەوەی خاوێن‌کردنەوە بە گزکو بێڵ؛ ٣) سڕینـەوەی شت فا ١) همـه چیز را بُردن؛ ٢) تکرار نظافت؛ ٣) زدودن و صیقل دادن.

**ماڵیوراو:** ماڵراو فا نگا: ماڵراو.

**ماڵیەز:** ماڵیز، ڕبنکه فا خمیر بسیار آبکی.

**مام:** ١) نەجـوم؛ ٢) نەمـردم؛ ٣) ناب؛ ٤) وشەی ڕێز لە دواندنی پیاوی پیردا فا ١) مانـدم، نرفتم؛ ٢) زنده ماندم، نمردم؛ ٣) عمو؛ ٤) کلمهٔ احترام به سالخوردهٔ مرد.

**ماما:** ١) دابکی دابك‌و باب؛ ٢) ژنێ کە لە زاندا ناریکاری دابك دەکا، نابەن فا ١) مادربزرگ؛ ٢) ماما.

**ماماران:** جۆرێ خەمەگرۆ کە دوور لە ئاو لە چیا هەیەو زۆر زلە فا نوعی سوسمار درشت.

**مامازیان:** شنگڵەبەرەکەنەی مازو فا مازوج دوقلو.

**ماماڵە گێجێ:** باوەخوڵێ فا بازی چرخش به دور خود.

**مامان:** نایەن، ناریکاری دابك لە زاندا فا پازاج، ماما.

**مامانە گێجێ:** ماماڵەگێجێ فا نگا: ماماڵەگێجێ.

**مامانی:** ١) کاری مامان؛ ٢) کرێی مامان فا ١) مامایی؛ ٢) مزد مامایی.

**مامبرایمە:** جۆرێ ترێ فا نوعی انگور.

**مامبز:** ناسك، کەژاڵ فا آهو.

**مامجـەژنە:** گیایەکە فا گیاهی است.

**مامر:** کەرکی فا مرغ خانگی.

**مامرك:** باروکە فا جوجەمرغ ماده.

**مامرەش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد فا نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مامرەشامی:** قەلەمووتە، عەلەشیش، قەل فا بوقلمون.

**مامرەکێویلە:** مەلێکە لە کەلەشێر دەکا فا پرندەای است شبیه خروس.

**مامـرێواس:** گیابەکی بڵندی گەڵادرێژە ترشەو دەرمانی کرمە فا گیاهی است دارویی.

**مامرێوی:** رواس، جتری لە جیرۆکاندا فا روباه در داستانها.

**مامز:** ١) ناسك، کەژاڵ، مامبز؛ ٢) ماسبەك کە گمرا دادەنێ؛ ٣) مامزە فا ١) آهو؛ ٢) ماهی مادر؛ ٣) مهمیز.

**مامـزاوا:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد فا نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مامزە:** ئاسنێکە لە پاشپانیەی جەکمە قایم دەکرێ نۆکی تیژی هەیە لە تەرادی ئەسب دەدرێ بۆ لێخوڕین، مامز فا مهمیز.

**مامسارمە:** جۆرێ هەمرۆ فا نوعی گلابی.

**مامش:** بێ‌دەنگ، کڕ، مات فا خاموش و بی‌صدا.

**مامشاخانە:** ئاودەست فا مُستراح.

**مامقلیج:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد فا روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**مامك:** مەتەڵۆکە، موعەممما، دەناجبە فا چیستان.

**مامڵە:** ١) سەودا، ئاڵـوێر، کڕین‌و فرۆشتن؛ ٢) پرسین لە نرخ فا ١) معامله؛ ٢) پُرسش از قیمت.

**مامڵەبـەشبـمـانی:** کەرانە، ئاوانێ کە لەسەوداپێژیوان دەیدا فا تاوان پشیمان از معامله.

**مامڵەقوچە:** کڵاوی سەرقووچی شەوانە فا شب کلاه بلند.

**ماملیسـە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد فا نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مامناونجی:** بەینی زل‌و بچوك، بەینی زۆرو کەم فا حدّ وسط، میانگین.

**مامناوندی:** مامناونجی فا حدّ وسط.

**مامناوەندی:** مامناونجی فا حدّ وسط.

**مامو:** نایەن، مامان فا ماما.

**مامۆ:** نابۆ، ناپ فا عمو.

**مامۆتك:** زۆر عاقڵ‌و زانا فا بسیار دانا.

**مامۆتە:** ١) خوشبلك؛ ٢) شیری خوشبلك فا ١) گیاهی است؛ ٢) شیرهٔ

گیاهی است.

**مامور:** گاڵنەجار، دڵخۆشکەرەی ئاپۆرە ف دلقك.

**مامۆر:** کاربەدەستی میری ف مأمور دولتی.

**مامۆزا:** پسمام، دوتمام، ئامۆزا، فرزەندی ئاپ ف عمو زاده.

**مامۆژن:** ئامۆژن ف زن عمو.

**ماموسا:** فێرکار، ئوستاد، سەیدا ف استاد، معلّم.

**مامۆسا:** ماموسا ف استاد، معلّم.

**مامۆستا:** ماموسا ف استاد، معلّم.

**مامۆن:** مامان ف ماما.

**مامۆنی:** مامانی ف ۱) مامایی؛ ۲) مزد مامایی.

**مامۆنیه:** ئێنبوی بۆدراو ف آش آرد بوداده با روغن.

**مامە:** ۱) ماوم، نەچوم؛ ۲) نەمردوم؛ ۳) وشەی دواندنی ئاپ؛ ۴) تێ‌ماوم، سەرسوڕماوم. سەرگەردانم: (ئەز مامەد حیکمەتا خودێ‌دا/ کورمانج د دەولەتا دنێ‌دا) «خانی»؛ ۵) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) ماندەام، نرفتەام؛ ۲) زندەماندەام؛ ۳) کلمهٔ خطاب به عمو؛ ۴) درماندەام، مُتحیّرم؛ ۵) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مامەجلکە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**مامەحوجی:** بڕبێی لە پاروی زل ف کنایه از لقمهٔ بزرگ.

**مامەخوێنە:** پوراپشوکە ف حشرهٔ خرخاکی.

**مامەخەلان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مامەخەمە:** خەمان، کەسێ کە خەمخۆری هەمو جانەوەریکە ف غمخوار همهٔ جانداران.

**مامەدخان:** هۆزێکی گەورەی کوردە لە ئاگری‌داغ لە بەردەستی ترکان ف طایفه‌ای بزرگ درکردستان.

**مامەدی:** تیرەیەك لە هۆزی شکاك ف طایفه‌ای درکردستان.

**مامەسوڕە:** باوەخولێ ف بازی چرخش به دور خود.

**مامەش:** تیرەیەکە لە کورد ف عشیره‌ای است.

**مامەشە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**مامەشەڕەشکە:** عاشیرەتێکە ف عشیره‌ای است.

**مامەڵە:** مامڵە ف معامله.

**مامەلینچك:** برانۆنە ف انگشت بنصر.

**مامەند:** ناوە بۆ پیاوان ف نام مردانه.

**مامەندە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مامیران:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاه مامیران.

**مامیز:** مامزە ف مهمیز.

**مامیسا:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**مامیلان:** گیایەکە ف گیاهی است.

**مان:** ۱) ئەو شتەزەردەی کە لە ئاسۆی عاسمان وەك دەمەداس دەردەکەوێ‌و هەرڕۆژە زیاد ئەکاو نیشك ئەدا لە پازدەرۆژە وردەوردە کەم دەکاو بەشەو نیشك ئەدا، ما، مانگ، هەیڤ؛ ۲) نەمردن، لەژیانابون؛ ۳) نەچون؛ ۴) لەبەین‌نەچون: ۵) پاشگری بەوانا: ئێمە: (بۆمان بنێرە، لێمان گەڕێ)؛ ۶) نیشانەی چاوگەیی: (دورمان، درومان)؛ ۷) گە، گەگرتن؛ ۸) ئەسپابانی ماڵ: (خان‌و مانی داگە بەسەریەکا)؛ ۹) جوانی بەڕێز: (ژنێکی زۆر خان‌و مانە)؛ ۱۰) مێو بنە، مێچکە: (مانگا، وانا: گای مێو بنە) ف ۱) ماه؛ ۲) زیستن، باقیماندن در حیات؛ ۳) ماندن، نرفتن؛ ۴) ازبین نرفتن؛ ۵) پسوند به معنی ما؛ ۶) علامت مصدری؛ ۷) اعتصاب؛ ۸) اثاثیه؛ ۹) زیبای گرامی؛ ۱۰) جنس ماده.

**مانا:** گوزارە، ئیاز لە قسە یان لە نوسراو، وانا ف معنی.

**مانایش:** وێك‌جوێن ف شباهت.

**مانح:** لەمپەر، بەرگر ف مانع.

**ماندك:** شەکەت، خەستە لە کار ف خسته.

**ماندگ:** ماندك، شەکەت ف خسته.

**ماندو:** ماندك، شەکەت ف خسته.

**ماندوبون:** شەکەت‌بون ف خسته‌شدن.

**ماندوکردن:** شەکەتێ‌پێدان ف خسته‌کردن.

**ماندونەبن:** قسەیەکە رێبوار بە کۆمەڵی کرێکارو ماندوی رێگەی دەڵێ ف خسته نباشید.

**ماندونەبونی:** قسەی تۆش‌بونی رێبوارو میوان: (ماندونەبونیم لێ‌کرد، ماندونەبونی لێ‌نەکردم) ف خوش آمد به مهمان و مسافر.

**ماندونەبی:** قسەی رو بە رێبوارو میوان‌و شەکەتی کار ف خسته‌نباشی.

**ماندوەتی:** شەکەتی ف خستگی.

**ماندویتی:** ماندوەتی، شەکەتی ف خستگی.

**ماندویی:** ماندوەتی، شەکەتی ف خستگی.

**ماندەل:** ئینکێری، بەژێر باداني، حاشا ف انکار، حاشا.

**ماندەنە:** ۱) شتێ کە نافەوتێ؛ ۲) نیشتەجێ ف ۱) ماندنی؛ ۲) مُقیم.

**ماندی:** ماندو، شەکەت ف خسته.

**مانع:** مانح، بەرگر ف مانع.

**مانعا:** مانا، واتا، گوزارە ف معنی، مفهوم.

**مانقال:** ئاگردانی کانزا ف منقل.

**مانقڕ:** قۆشەیەکی پێشینە وەك شایی و فەئالی ف از اجزاء پول قدیمی.

**مانقول:** مافوڵ ف نگا: ماقوڵ.

**مانقێر:** هەژارو دەس‌تەنگ، ڕوت‌و نەدار ف بینوا و مُستمند.

**مان‌کردن:** گەگرتن، پێ‌چەقاندن‌و نەڕۆیشتن ف از رفتن خودداری کردن.

**مانگ:** ۱) مان کە لە عاسمانەوە بەشەو تیشك دەدا؛ ۲) بەشێ لە دوازدەبەشی ساڵ؛ ۳) گامێش، ماداك ف ۱) ماه آسمان؛ ۲) ماه، یك دوازدهم سال؛ ۳) گاومیش.

**مانگ:** ماندگ ف خسته.

**مانگا:** چێڵ، دابکی گوڵك [ف] گاوماده.

**مانگار:** ماو [ف] ماندگار.

**مانگاشەو:** تاڤ‌هەیڤ، نریڤە، ماناو [ف] ماهتاب.

**مانگامژ:** بەرخێ کە لە گوانی چێڵ شیر دەخوا [ف] برەای کە پستان گاو می‌مکد.

**مانگامژە:** مانگامژ [ف] نگا: مانگامژ.

**مانگان:** چەند بەش لە دوازدە بەشی ساڵ [ف] ماهها.

**مانگانە:** ١) نرخی شتێ کە هەر سی‌ڕۆژ جارێ بدرێ؛ ٢) گۆڤارێ کە مانگێ جارێك دەرچێ؛ ٣) عوزرشوتنی ژن [ف] ١) مزد ماهیانە؛ ٢) مجلۀ ماهانە؛ ٣) عادت ماهانۀ زنان.

**مانگاوس:** گاوس، مەشکە لە پێستی چێڵ [ف] مشك از پوست گاو.

**مانگاوەس:** مانگاوس [ف] مشك از پوست گاو.

**مانگ‌تازە:** سەرەتای هاتنی مانگ [ف] ماه نو.

**مانگ‌چواردە:** جاردەهەمین‌ڕۆژی پەیدابوونەوەی مانگ لە عاسمان [ف] بدر.

**مانگر:** ١) گەگر؛ ٢) بەلپ‌گر [ف] ١) خودداری کنندە از رفتن؛ ٢) بهانەگیر.

**مان‌گرتن:** ١) گەگرتن؛ ٢) بەلپ‌گرتن، گڕوگرتن [ف] ١) خودداری از رفتن؛ ٢) بهانەگیری.

**مانگری:** خوی مانگر [ف] عادت «مانگر».

**مانگ‌گیران:** ڕەش‌هەڵگەڕانی بەشێ یا گشت ڕوی مانگ لە کاتێ‌دا کە لە عاسمان دیارە [ف] خسوف.

**مانگ‌گیریان:** مانگ‌گیران [ف] خسوف.

**مانگ‌نوێ:** مانگ تازە [ف] ماه نو.

**مانگور:** فەیرەکچی شوونەکردو [ف] دختر نرشیدە.

**مانگوری:** بژیوی‌و بوو، ڕسق‌و ڕۆژی نێر و نەسەل [ف] دارایی کافی برای گذران.

**مانگە:** مانگا، چێڵ [ف] گاو مادە.

**مانگەسەوە:** بەردێکی سپی بر بفەدارە دەیکەنە خشڵ [ف] سنگی است براق.

**مانگەشەو:** مانگاشەو، تاڤ‌هەیڤ، نریڤە، ماناو [ف] مهتاب.

**مانگەشەوە:** بەردێکە لەبەر خۆر چەند ڕەنگ دەدا [ف] سنگی است زینتی.

**مانگەو:** چێڵ، مانگا [ف] گاو مادە.

**مانگەومانگ:** هەر بە سی ڕۆژ جارێك [ف] ماه بەماه.

**مانگی:** ماندویی، شەکەتی [ف] خستگی.

**مانگی‌خۆ:** ئەو مانگەی ئاوسی تێدا دەزێ: (لە **مانگی خۆ** دایە) [ف] پابەماه.

**مانگیر:** مانگر [ف] نگا: مانگر.

**مانگێر:** شەبەکی دەم‌بەرەوخوارە بۆ پووش کۆکردنەوە، درمغ [ف] شن کش.

**مان‌گیران:** مانگ گیران [ف] خسوف.

**مانگێرکرن:** مانگێر دەکارهێنان [ف] با شن کش کارکردن.

**مان‌گیریان:** مانگ‌گیران [ف] خسوف.

**مانگیشکێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**مانگیلە:** ١) مانگ تازە؛ ٢) شکڵی مانگ‌تازە لە ئاڵادا [ف] ١) هلال؛ ٢) نقش هلال در پرچم.

**مانگی‌نوێ:** مانگ‌تازە، مانگ نوێ، مانگیلە [ف] هلال.

**مانگ‌یەکشەوە:** مانگ‌نوێ [ف] هلال.

**مانگی‌یەکشەوە:** مانگ‌یەکشەوە، مانگ‌نوێ [ف] هلال.

**مانن:** شەکەت‌کردن، ماندوکردن [ف] خستەکردن.

**مانو:** شەکەت، ماندو، ماندگ، مانگ [ف] خستە.

**مانە:** ١) هەمبانە؛ ٢) مانا، وانا؛ ٣) بەهانە، پەلپ، مان، گە؛ ٤) نیغە، نێوان [ف] ١) انبان؛ ٢) معنی؛ ٣) اعتصاب؛ ٤) نبغە.

**مانەك:** ئەسپی‌ڕەسەن، جسن [ف] اسب از نژاد اصیل.

**مانەگی:** ١) زینی‌ئەسپ؛ ٢) مانەك [ف] ١) زین اسب؛ ٢) اسب اصیل.

**مانەن:** نا، وەك [ف] مانند.

**مانەند:** مانەن [ف] مانند.

**مانەوە:** ئەڕۆیشتن‌و جێ‌گیر بوون لە شوێنێ [ف] ماندگارشدن.

**مانەی:** پەلپ، بیانو، بەهانە [ف] بهانە.

**مانی:** ١) مانە، هەمانە؛ ٢) شوفار، فسەبەر [ف] ١) انبان؛ ٢) خبرچین.

**مانیاق:** شێت، لێوە، دین [ف] دیوانە، مجنون.

**مانیاگ:** شەکەت، مانو [ف] خستە.

**مانیاگی:** شەکەتی [ف] خستگی.

**مانیان:** شەکەت‌بوون [ف] خستەشدن.

**مانیلا:** لۆسە، باری، مەلغە [ف] اهرم.

**مانیلوس:** مالینوس [ف] نگا: مالینوس.

**ماو:** ماگ [ف] نگا: ماگ.

**ماوا:** شوێن، جێگە [ف] جای، مکان.

**ماوت:** پارچەیەکی کوڵکنە دەکرێنە کەواو پاتۆڵ [ف] ماهوت.

**ماوزەر:** ١) جۆرێ تفەنگ؛ ٢) ناوی ژنانە [ف] ١) نوعی تفنگ؛ ٢) نام زنانە.

**ماوزێ:** ١) زاو ماك، ئازاڵ‌و بێچوی تێکەڵ‌کراو بۆ لەوەڕ؛ ٢) گوندێکە [ف] ١) نگا: زاو ماك؛ ٢) نام دهی است.

**ماوش:** ١) گیرەی پیشەسازان؛ ٢) گیرەی کنێب‌گوشینی ئەوانەی کنێب بەرگ دەکەن؛ ٣) کونەبا، کونێ کە بای لێوە دێت [ف] ١) گیرۀ صنعتگران؛ ٢) منگنۀ صحافی؛ ٣) سوراخ منفذ باد.

**ماوڵ:** فانە، دەرفەت‌دان بۆ ناوێ [ف] مُهلت.

**ماونان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**ماوە:** ١) ماوڵ؛ ٢) ئەندازە لە زەمان: (**ماوەی** دوساڵە ئەم‌دیوی، لەم **ماوەیەدا** چت کرد؟)؛ ٣) ئەندازەی جێ: (**ماوەی** ئێرە تا ئەوێ سەد گەز دەبێ)؛ ٤) باقیماو لە شتێ: (**ماوەکەی** دوایە دەلێم)؛ ٥) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) مهلت؛ ٢) مدّت؛ ٣) مسافت؛

**مەنگۆڕ:** فەرەکچی شوێنەکردو [ف] دختر درخانه مانده.

**مەنگوڕایەتی:** مەڵبەندێ کە مەنگوڕی لێ‌دەژین [ف] منطقهٔ «مەنگوڕ»ها.

**مەنگوڵ:** چۆك، زرانی، ئەژنۆ [ف] زانو.

**مەنگۆڵە:** مەندۆڵە [ف] نگا: مەندۆڵە.

**مەنگەڵ:** مقەلی [ف] منقل آتش.

**مەنگەلە:** پوڵێکی هیند کە لە عێراق رەواجی بو [ف] واحد پول هندی.

**مەنگەلی:** ١) مەنگەڵ؛ ٢) مەنگەلە [ف] ١) منقل آتش؛ ٢) نگا: مەنگەلە.

**مەنگەلیە:** مقەلی [ف] منقل.

**مەنگەن:** گیرە [ف] منگنه.

**مەنگەنە:** مەنگەن، گیرە [ف] منگنه.

**مەنگی:** مەندی [ف] نگا: مەندی

**مەنگی:** ماندوەنی [ف] خستگی.

**مەننە:** مەندە، باقی‌ماو [ف] مانده.

**مەنوڵە:** بارچەی مەندۆڵە [ف] پارچه‌ایست.

**مەنونی:** بۆنەی کانزاتێدانواندنەوە [ف] بونهٔ ریخته‌گری.

**مەنونی:** وتەیەکی جادوگەرانەیە: (هەنونێ **مەنونێ**) [ف] کلمهٔ بدون معنی جادوگری.

**مەنە:** ١) مەندە؛ ٢) ماندو [ف] ١) باقیمانده؛ ٢) خسته.

**مەنـەر:** ١) مان، گە؛ ٢) شوێنـەوار؛ ٣) راوەستان بە شلی‌و سستی؛ ٤) فیزوەعیە [ف] ١) اعتصاب؛ ٢) اثر؛ ٣) ایستادن به سُستی؛ ٤) تکبّر.

**مەنەری:** بەفیز، بایی‌هەوا [ف] منکبّر، خودخواه.

**مەنەك:** رکێف [ف] رکاب زین.

**مەنەوشە:** گوڵەوەنەوشە [ف] بنفشه.

**مەنـی:** ١) سـەنگی کێشـانـی مەن؛ ٢) گومـان، خەباڵ، راویژ؛ ٣) گیای‌مەنـدێ؛ ٤) شاوەت [ف] ١) سنگ منی؛ ٢) حدس، تخمین؛ ٣) گیاه «مەندێ»؛ ٤) آب‌پشت، منی.

**مەنێ:** ١) دامـەنێ، مەخـەسەر: (پامەنێ وەپنجك دەرنەفرێ مەلیجك) «مەسەل»؛ ٢) تافەمنێ؛ ٣) گیای‌مەندێ [ف] ١) مگذار، منه؛ ٢) بك من؛ ٣) گیاه «مەندێ».

**مەنیج:** ناوی‌زنانە [ف] نام زنانه.

**مەنیژە:** مەنیج [ف] نام زنانه.

**مەنیسە:** رەنگی دەفری سوالەت [ف] رنگ ظروف سفالی.

**مەنیش:** دامەنیشە، رومەنیشە [ف] منشین.

**مەو:** مرۆ، بنیادەم [ف] آدمی، انسان.

**مەواچو:** ئەبژم، دەڵێم [ف] می‌گویم.

**مەواچی:** ئەبژی، دەڵێی [ف] می‌گویی.

**مەوار:** دەلەمە [ف] نگا: دەلەمە.

**مەوارو:** ئەباری [ف] می‌بارد.

**مەواژ:** نۆمەز، تمەز، نمەس، مەك [ف] نونگو.

**مەواژەکە:** مەواژ [ف] نونگو.

**مەوال:** مەبال [ف] مُستراح.

**مەوبەت:** مۆبەت، خۆشەویستی [ف] محبّت.

**مەوت:** ١) تۆکێکـەوانـا: بمـری؛ ٢) منالێ‌ترسێنی‌خەیالی [ف] ١) الهی بمیری؛ ٢) لولوخُرخُره.

**مەوتەن:** مەڵبەندی جێگەی ژیان [ف] وطن.

**مەوج:** ١) جاجم؛ ٢) مۆنجی کرو پارچە [ف] ١) جاجیم؛ ٢) درخشندگی در پارچه.

**مەوجو:** شتێ کە هەبە [ف] موجود.

**مەوجود:** مەوجو [ف] موجود.

**مەودا:** ١) لێواری نیخ؛ ٢) نۆکی خەنجەرو شمشێر؛ ٣) ماوەی بەینی دو شت؛ ٤) مۆڵەت، قانە؛ ٥) سەردەمێ لە کات‌و سات، ماوە [ف] ١) لبهٔ تیغ؛ ٢) نوك خنجر و شمشیر؛ ٣) مسافت؛ ٤) مهلت؛ ٥) مدّتی از زمان.

**مەورانی:** مەگیرانی، بێزو، بێژی [ف] وبار.

**مەورد:** ١) مەبەست؛ ٢) جار [ف] ١) موضوع؛ ٢) بار، دفعه.

**مەورە:** ١) بڕبەند، مڕمەند؛ ٢) لکی براوی دارنرێ [ف] ١) سوهان؛ ٢) شاخهٔ هرس شدهٔ تاك.

**مەورەد:** بڕبەند، مڕمەند، مەورە [ف] سوهان.

**مەوربان:** مەگیرانی، بێزو، کەرب، بێزگ [ف] وبار.

**مەوزوح:** مەبەست، مەسەلە [ف] زمینه، موضوع.

**مەوزوع:** مەوزوح [ف] موضوع.

**مەوژ:** تەرز، تەحر، بیجم، جۆر [ف] طرح، شکل.

**مەوڕ:** ١) مباوی پشیلە؛ ٢) میوڕ [ف] ١) صدای گربه؛ ٢) موبز.

**مەوڕاندن:** مباواندنی پشیلە، بانگی کتك [ف] صداادرآوردن گربه.

**مەوژوك:** گیایەکی بنکـدارەو نام‌شیر بن [ف] گیاهی است که پیازه‌اش خوردنی است.

**مەوق:** ١) شوێن، جێگە؛ ٢) دەوروبەر [ف] ١) جای؛ ٢) حوالی.

**مەوقوفە:** مڵکی مزگەوت [ف] موقوفه.

**مەوقوفەجات:** زۆر مڵك‌و زەوینی سەربە مزگەوت [ف] موقوفه‌جات.

**مەولانـە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مەولـو:** ١) مانـگـێ کە پێغـەمبـەری تیا لەدایك‌بوە؛ ٢) جێشت‌و نان‌بەخشینەوە بە هۆی لەدایك‌بونی پێغەمبەرەوە [ف] ١) ماه ربیع‌الاوّل؛ ٢) اطعام به مناسبت میلاد پیغمبر.

**مەولود:** ١) مەولو؛ ٢) ناوی پیاوان [ف] ١) نگا: مەولو؛ ٢) نام مردانه.

**مەولودنامە:** بەبێغەمبەر هەڵگوتن لە مەولودی پێغەمبەردا [ف] مولودنامه.

**مەولودەمانگ:** مانگی مەولو [ف] ماه ربیع‌الاوّل.

**مەولودی:** نان‌و جێشت‌بەخشینەوە بە مبارەکی مانگی مەولود [ف] ولیمهٔ مولودی.

**مەولەغ:** ئەندازە لە شتێ [ف] مبلغ.

**مەولەق:** مەولەغ [ف] مبلغ.

**مەولەوی:** ١) سەرناوێکی خوێندەوارانی ئایینیە؛ ٢) نازناوی هەستیاوی هەرە بەرزی کورد**مەلاعبدالرحیم تاوەگۆزیە** کە لە هەورامان ژیاوە [ف] ١) از القاب روحانیون؛ ٢) تخلص یکی از شعرای بزرگ کُرد.

**مەویژ:** تریێ هەڵخراو لەبەر ناو وشکەوە کراو ف مویز.

**مەهـ:** ١) مانگی سی‌ڕۆژە؛ ٢) بەز، مەڕ ف ١) ماه سی روزه؛ ٢) میش.

**مەهە:** شەراو، مەی ف شراب، مَی.

**مەها:** بەز، مەهـ، مەڕ ف میش.

**مەهاباد:** مهاباد ف شهری درکردستان.

**مەهار:** مهار ف مهار.

**مەهاربەن:** بەهاربەند ف بهاربند.

**مەهارکردن:** بەت و ئاڵقە دەلوتخستنی حوشتر ف مهارکردن.

**مەهارەت:** شارەزایی لە کارا، زەبەردەستی ف مهارت.

**مەهانە:** بەهانە، بەلپ ف بهانه.

**مەهانی:** کرێی مانگ بەمانگ، مانگانە ف ماهبانه.

**مەهبرن:** مانگی مەگبرانی کردن ف ماه وبارکردن حامله.

**مەهبەرە:** زبارە، هەرەوەز، کاری گەلەکۆمەگی ف کار تعاونی.

**مەهتاو:** مانگەشەو ف ماهتاب.

**مەهتەر:** خزمەتکاری ئەسب ف مِهتر اسب.

**مەهجەت:** ئاتاجی، پێوبست، بێداوبست ف احتیاج، نیاز.

**مەهدك:** دەرگوش، لانکە ف گهواره.

**مەهدەر:** نکا، رەجا، شفات ف شفاعت.

**مەهدەرچی:** نکاکەر، رەجاکەر ف شفیع.

**مەهر:** ١) مارە؛ ١) مارەیی ف ١) عقد نکاح؛ ٢) کابین.

**مەهۆر:** مەهیر، دۆکلیو، دۆخەوا ف دوغبا.

**مەهرکرن:** مارە کردن ف عقدکردن.

**مەهروڤان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مەهس:** بالالەهەمانە، سوکەسوڵ ف پای‌افزار سبك، دمپایی.

**مەهەس:** قاشاغ، رنەك ف نگا: قاشاغ.

**مەهسـوناوە:** گوندێکە لە کوردستـان بەعسی ویرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**مەهشوت:** ماشوت، کرمی نوکی‌شین خۆر ف آفت نخودسبز.

**مەهفوور:** مافور، مەهور، قالی ف قالی.

**مەهڤان:** میوان، لەخانوی بیانی خۆ خۆدی کرن ف مهمان.

**مەهك:** خوێنی ژنانە، بێ‌نوێژی ف عادت ماهانهٔ زن.

**مەهکی:** مەهك، بێ‌نوێژی ژنانە ف عادت ماهانهٔ زنان.

**مەهگران:** بێزو، مەگبرانی، مەبرانی، کەرب ف ویار.

**مەهلا:** گەڕەك، محەللە ف محله.

**مەهلان:** دەمێ، ناوێ، فان ف مدّت کمی.

**مەهلی:** ١) خێنشـك؛ ٢) کوناخنی گوێجـە لە بەرۆ ف ١) شخم صاف کُن؛ ٢) سوراخگیر آبراه.

**مەهلمی:** محەلمی ف نگا: محەلمی.

**مەهمـەدی:** جەنـدهۆزێکی کوردە لە کوردستانی بەردەستی ترکان کە زاراوەی تایبەتیان هەیە ف چند طایفه کُرد با لهجهٔ مخصوص خود.

**مەهمیز:** مامزە ف مهمیز.

**مەهە:** مەی، شەراو ف مَی، شراب.

**مەهن:** نازکردن، ناز: (ئـەز مەهنێ خۆ لکێ کەم؟ ئەز بێ‌باڤم) ف ناز، مُقابل نیاز.

**مەهەندز:** ئەندازیار ف مُهندس.

**مەهەندیس:** مەهەندیز ف مُهندس.

**مەهۆ:** مالوس، مێچکە بەرار ف ماده‌خوك.

**مەهەت:** ئاریکاری، کۆمەك، باربدە ف مُساعده.

**مەهـەلی:** هۆزێکی کوردە لە کوردستـانی ژێردەستی ترکـان ف نام عشیره‌ای است در کردستان.

**مەهەممەدی:** مەهمەدی: (بۆهنبو **مەهەممەدی** و سلیڤی/ هن لەعل و هنەك ژ زێڕ و زیڤی) «خانی» ف نگا: مەهمەدی.

**مەهەمەدی:** مەهمەدی ف نگا: مەهمەدی.

**مەهەیر:** هەژار، بێچارە، لێفەوماو ف بیچاره.

**مەهی:** مانگی، مانگ‌بەمانگ ف ماهیانه.

**مەهینی:** مانگانە، جیرەی مانگانە ف حقوق ماهانه.

**مەهیدان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد

**مەهیر:** دۆکلیو ف دوغبا.

**مەهیك:** مەهك، مەهکی، بێ‌نوێژی ژن ف عادت ماهانهٔ زن.

**مەهێلە:** ڕێگە مەدە، رەوا مەبینە ف مگذار.

**مەهین:** ١) خۆگرتن و توندبوونەوەی شیر بە ئامیان نیکردن؛ ٢) مابن ف ١) بندآمدن شیر؛ ٢) مادیان.

**مەهینکا:** ئاژیلۆکە، حوشترخوا ف آخوندك.

**مەهینی:** ئێسترێ ماچە ف ماچه استر.

**مەی:** ١) شەراو، بادە؛ ٢) مەهـ، بەز، مەڕ؛ ٣) مەزە: (مەیخۆشە) ف ١) می؛ ٢) میش؛ ٣) مزه.

**مەیا:** ١) بەهەوبن توندبوو؛ ٢) لە مەبەستیا سەرکەوت؛ ٣) ماچەئێستر ف ١) شیر بندآمده؛ ٢) موفق شد؛ ٣) استر مادینه.

**مەیان:** ١) گۆڕەپان؛ ٢) بەبنی دو شت؛ ٣) جۆرێ ترێ؛ ٤) هەویرترش؛ ٥) بەهەوبن توندەوەبوون ف ١) میدان؛ ٢) میان؛ ٣) نوعی انگور؛ ٤) خمیرمایه؛ ٥) توسط پنیرمایه بندآمدن.

**مەیانـدن:** ١) ئامیان لێدان؛ ٢) بریتی لە کردنەسەهۆڵ ف ١) مایەزدن؛ ٢) کنایه از یخ‌زدن.

**مەیانە:** دۆستایەتی، ئاشنایەتی، بەین ف میانه.

**مەیاو:** دەنگی پشیلە ف صدای گربه.

**مەیب:** بنی زەز، داری هەنگور، مێو ف تاك، مَو.

**مەیبە:** ١) دوری مەخەوە؛ ٢) کاری مەکە بچنە ژوورەوە ف ١) مَپرش؛ ٢) فرومبر.

**مەیت:** جەنازە، لاشەی مردو ف لاشه، جنازه.

**مەیتەر:** خزمەتکاری ئەسب ف مهتر اسب.

**مەیخانە:** شەرابخانە ف میخانه.

**مەیخانەچی:** شەراوفرۆش ف می‌فروش.

**مەیخۆ:** لە خواردنی دوُربە ف مخورش.

**مەیخۆر:** کەسێ کە شەراب دەخوانەوە ف میخوارە.

**مەی‌خۆرەوە:** ۱) فرێی مەکــە؛ ۲) مەیخــۆر، شەرابخــۆرەوە ف ۱) منوشش؛ ۲) مَیخوارە.

**مەیخوش:** بەینی ترش‌و شیرن ف میانهٔ ترش و شیرین.

**مەیخوُلی:** ماخولیا. نەخۆشی نەسیەك ف مالیخولیا.

**مەیدان:** ۱) گۆرەپــان. مەیان؛ ۲) شەرگە؛ ۳) گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف ۱) میدان؛ ۲) رزمگـــاه؛ ۳) نام روسنـایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**مەیداناباری:** جێگەی رکەو ملەکردن ف میدان مسابقە.

**مەیدان‌بازی:** گەمەو کایە لە مەیدان‌دا. رکەو ملە ف مسابقە درمیدان.

**مەیدانداری:** دەگژ بەك‌راچوُن ف مقابلە در جنگ.

**مەیدان‌نانەوە:** نامادە بۆ شەر لە مەیداندا ف میدان جنگ آراستن.

**مەیدان‌وازی:** ۱) گۆرەپـانی گەمە؛ ۲) مەیدانبازی ف ۱) میدان برای بازی؛ ۲) مسابقە در میدان.

**مەیدنۆز:** گێژتوك. مەعدەنوُس ف سبزی جعفری.

**مەیدی:** دوازدەیەمین نیمامی شیعەیان ف مهدی، امام دوازدهم شیعیان.

**مەیدی:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**مەیر:** مەهیر. دوکلێو، دوخەوا ف دوغبا.

**مەیرە:** پەنیرو لۆرکی نیکەلاو ف از مشتقّات شیر.

**مەیرەك:** کرمێکە نافانی شیناوەردە ف حشرهٔ آفت سبزیجات.

**مەیری:** مەهیر، مەیر. دۆکلێو. دۆخەوا ف دوغبا.

**مەیز:** نماشا ف نگاه.

**مەیزاندن:** تماشاکردن ف نگاه‌کردن.

**مەیزێ:** نماشاکە ف نگاه کن.

**مەیزین:** مەیزاندن ف نگاه کردن.

**مەیژدە:** مەجیدی. دراوێکی عوسمانی‌بوُ ف از آحاد پول عُثمانیان.

**مەیس:** مێش. مەشە ف مگس.

**مەیســەر:** ممکین. شیاوی دەسکــەوتن بەهاسانی: (بۆم **مەیسەر** بوایە باش بو) ف میسّر.

**مەیسەل:** مەیسەر ف میسّر.

**مەیشت:** سۆزی. سبحەینێ. سبەی ف فردا.

**مەیشنا:** مەر، مێ، پەز ف گوسفند.

**مەیڤان:** مەهڤان ف مهمان.

**مەیڤی:** داری‌ترێ. مێو، بنی‌رەز ف مو، تاك.

**مەیکوت:** کونێکی دارین ف بُنك چوبی.

**مەیکێ‌ناڤی:** جۆرێ سەگلاوی سوُری نامـالُرەشە. پێست‌و زۆنەکەی زۆر بەنرخن ف سگ آبی.

**مەیگەر:** کەسێ کە شەراب لە ناو شەراوخۆراندا دەگەرێنێ ف ساقی.

**مەیگێر:** مەیگەر ف ساقی.

**مەیل:** ۱) نارەزوُ، ناسە؛ ۲) خۆشەویستی: (بۆ دەگەڵم بێ‌**مەیلی**) ف ۱) آرزو؛ ۲) محبّت.

**مەیلا:** رێگە مەدە، رەوا مەزانە ف مگذار.

**مەیلان:** نارەزوُ. ناوات ف آرزو.

**مەیلانە:** مەیلا ف مگذار.

**مەیلە:** مەیلا ف مگذار.

**مەیلەو:** نامال ف متمایل بە.

**مهیم:** گر ینگ ف مُهِمّ.

**مەیمان:** کەسێ کە لە مالی بەکێ تر نان دەخواو دەخەوێ‌و زێبوارە ف مهمان.

**مەیمانێ:** بانگ‌هێشتنی خەلّك بۆ نان‌خواردن ف مهمانی.

**مەیموُن:** ۱) مەیمان؛ ۲) مەمینە ف ۱) مهمان؛ ۲) بوزینە.

**مەیـن:** ۱) مابن، ژنی نەسپ؛ ۲) سنگی لەدار؛ ۳) بزمــارو نالُقــە بۆ شت‌هەلاوەسین؛ ۴) گەمەیکی منالانەیە. *سێ‌سنگولکە لە سێ‌سوچ* دەکونن ف ۱) مادیان؛ ۲) میخ چوبی؛ ۳) رخت‌آویز؛ ۴) نوعی بازی کودکانە است.

**مەینۆش:** شەراوخۆر ف میخوارە.

**مەینۆشی:** شەراوخواردن ف میخوارگی.

**مەینە:** ۱) نێوان؛ ۲) کەمبەرە؛ ۳) قەدی‌کێو ف ۱) میانە؛ ۲) کمر بند؛ ۳) ستیغ کوە.

**مەینەت:** ۱) دەردو نازار؛ ۲) خەم‌و خەفەت ف ۱) درد و رنج؛ ۲) غم.

**مەینەتبار:** خەمبار ف غمگین.

**مەینەتی:** خەم. خەفەت ف غم.

**مەیوُ:** تونــدەوەبــوی تراو: (شیری **مەیوُ**، وەك ماسنی **مەبوُ** وابە) ف بندآمدە. منعقدشدە.

**مەیوە:** ۱) رەز. داری ترێ؛ ۲) رابردوی مەیوُ: (شیرەکە **مەبوە**)؛ ۳) میوە. فێکی. فێفی ف ۱) تاك؛ ۲) منعقد شدە است؛ ۳) میوە.

**مەیەس:** مەشە، مێش ف مگس.

**مەیەلە:** مەیلا ف مگذار.

**مەیین:** ۱) توندبــوُنەوەی تراو لە نامانێکەوە؛ ۲) داوەستان‌و نەبزوتنی گۆماو ف ۱) منعقد شدن مایع؛ ۲) راکد بودن آب.

**مەییو:** مەیوُ ف منعقدشدە.

**می:** موُ. توُك ف مو.

**مێ:** ۱) ما، ماك. پێچەوانەی نێر؛ ۲) بەز، مەر، مەهـ. مەها؛ ۳) مەزە، جێژە: (**مێخۆش**) ف ۱) مادینە؛ ۲) میش، گوسفند؛ ۳) مزە.

**میائاڤێ:** مەیکێ‌ناڤێ ف سگ آبی.

**میابــان:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**میافــارقین:** ناوچـەیەکی کوردستانە ژێردەستی ترکان. *نیستە بەناوی سلیڤان دەناسرێ* ف ناحیە‌ای درکردستان.

**میان:** مابەین، بەین ف وسط، میان.

**میان‌پولان:** ناو هەردوك‌شان. فەلاندۆش ف میان دو کتف.

**میانچی:** ناوبژی‌کەر. بەریوان. ناوجی‌کەر ف میانجی.

**میاندار:** نیوه کوتراو، بۆ هه‌رده‌خڵێك نێرن [ف] نیمکوب.

**میاندیس:** ئه‌ندازیار [ف] مُهندس.

**میانه:** ۱) مام‌ناوه‌نجی، ده‌سته؛ ۲) جێگه‌خه‌وی ته‌ویله‌وان له ته‌ویله‌دا؛ ۳) ناوقه‌د، که‌مبه‌ر؛ ۴) ناوه‌ندی پشت له سه‌ره‌وه تا خوار؛ ۵) پارچه‌یێکی دار بن له قه‌دی قلیانـاوبدا [ف] ۱) میانـه؛ ۲) خوابگاه اصطبل‌بان در اصطبل؛ ۳) کمر؛ ۴) پُشت؛ ۵) قسمتی از قلیان.

**میانه‌باری:** به‌ژن‌زراف، قه‌دباریك [ف] کمر باریك.

**میانه‌ڕه‌و:** نه زۆر توند نه زۆر شل له مه‌به‌ست‌و تاکاردا [ف] میانه‌رو.

**میانی:** ۱) ئه‌وه‌ی ناوه‌ڕاست؛ ۲) نهێنی [ف] ۱) وسطی، میانی؛ ۲) راز مگو.

**میانین:** ناوه‌ڕاست، دون، ناوه‌ند [ف] وسط.

**میانی هه‌لل:** نیمه‌ڕۆ، نیوه‌ڕۆ [ف] نیمروز.

**میانی هه‌له:** میانی‌هه‌لل [ف] نیمروز.

**میاو:** ده‌نگی پشیله [ف] صدای گربه.

**میاواندن:** ده‌نگ‌به‌رزکردنه‌وه‌ی پشیله [ف] صداکردن گربه.

**میاوائن:** میاواندن [ف] صداکردن گربه.

**میاوه:** میاو [ف] صدای گربه.

**مێباز:** تولاز، پیاوێ که زۆر گاناوی‌یه‌و ده‌وری ژنان ده‌دا [ف] زنباره.

**میت:** ۱) قبتایی، زه‌قایی؛ ۲) قامکه‌تۆنه؛ ۳) مت، گوێج؛ ۴) که‌لا، که‌للا، مه‌رمـه‌ز؛ ۵) مژی [ف] ۱) برجسنگی؛ ۲) انگشت کوچکـه؛ ۳) بول نیله‌بازی؛ ۴) نیله؛ ۵) مکید.

**میتـان:** ۱) سوکـه‌لّه‌ی محه‌ممه‌دئه‌مین، مینه؛ ۲) کراس [ف] ۱) مخفّف محمّد امین؛ ۲) پیراهن.

**میتاوی:** که‌پری ناو بێستان که له‌سه‌ری ده‌خه‌ون [ف] کپری که برآن می‌خوابند.

**میتر:** مه‌تر، مه‌تره [ف] متر.

**میتـك:** ۱) قینکـه، په‌لـو؛ ۲) رشکی سپێ؛ ۳) پنچکی مورد [ف] ۱) چوچوله؛ ۲) رشك شپش؛ ۳) بوتهٔ «مورد».

**می‌تڵك:** مورد، گیایه‌که به پنجك ده‌روێ [ف] گیاه «مورد».

**میت کردن:** قبت‌کردن: (گوهێ خۆ میت کربه) [ف] برجسته‌کردن.

**میتکه:** میتك [ف] چوچوله.

**مێتکه:** رشکی سپێ [ف] رشك شپش.

**میتن:** مژین، ملك‌لێدان [ف] مکیدن.

**مێتن:** مژین، مژنن [ف] مکیدن.

**میتو:** چاوبرۆش، کوێره‌مۆشه [ف] چشم کم‌سو.

**مێتوکه:** رشك [ف] تخم شپش.

**میتولّ:** میتکه [ف] چوچوله.

**میتولکه:** رشك [ف] رشك شپش.

**میتوله:** میتکه [ف] چوچوله.

**میتیل:** نه‌رمیی دۆشه‌ك‌و لێفه [ف] کوك لحاف و تشك.

**میتین:** که‌لایێن، مه‌رمه‌زێن، مۆشێن [ف] نیله‌بازی.

**میجاز:** ۱) خوو، خده؛ ۲) قه‌ول، گفت، په‌یمان: (ژن بێ میجازن) [ف] ۱) خوی و عادت؛ ۲) عهد.

**میجبێتی:** ته‌وجی، باربو، پیناك [ف] باج و خراج.

**میجك:** مه‌زبوت، گورج‌و گوڵ [ف] جست و چالاك.

**میچ:** ۱) دیوی ژخواره‌وه‌ی سه‌ربـان، بن‌بان؛ ۲) جگ، چو، قاپ؛ ۳) گیژ‌و بێ‌چه‌فـاندن: (میچ مه‌که، هێنده میچ مه‌به) [ف] ۱) سقف؛ ۲) شنالنگ، قاپ؛ ۳) پافشاری، اصرار.

**میچاله‌ك:** تۆزقاڵێ، پیچه‌ك، که‌موسکه‌به‌ك [ف] یك ذرّه، اندکی.

**میچڕان:** به‌سه‌ریه‌کدا گلۆفان [ف] برهم فشردگی.

**میچڕاندن:** به‌سه‌ریه‌کا گلۆفاندن [ف] برهم فشردن.

**میچك:** مێوینه‌ی‌مه‌ل [ف] مادینهٔ پرندگان.

**مێچك:** ۱) به‌رخی بێ‌دایك که هه‌مو مه‌ڕێك ده‌مژێ؛ ۲) مێوینه؛ ۳) بریتی له ترسه‌نوك [ف] ۱) برّهٔ بی‌مادر که شیر دیگر گوسفندان خورد؛ ۲) مؤنث، مادینه؛ ۳) کنایه از بُزدل.

**مێچکه:** ۱) ما، ماینه، مێ؛ ۲) مڵچه، ده‌نگ له‌ده‌م‌هاتن له خواردنا؛ ۳) بریتی له زبابی‌و مه‌رابی [ف] ۱) ماده، مقابل نر؛ ۲) صدای دهن هنگام خوردن؛ ۳) کنایه از تملّق و چاپلوسی.

**مێچکـه‌مێچـك:** ۱) مڵچه‌مڵچ؛ ۲) مه‌رابی‌و زمان‌لوسی [ف] ۱) صدای دهن درخوردن؛ ۲) تملّق و چرب‌زبانی.

**مێچلگه:** گرێوکردن، مه‌رج‌به‌ستن [ف] شرط‌بندی.

**میچله:** چیری‌وگیری [ف] پافشاری.

**میچـولکـه:** خڕکراوله‌ناوده‌ستنا: (که‌شك **میچولکه** بکه) [ف] گلوله‌شده دردست، مُچاله.

**میچوله:** میچولکه [ف] مُچاله.

**میچی قومارخانه:** بریتی له زوه‌ه‌لماڵاوی گوێ‌نه‌ده‌ر به عه‌یب‌و عار [ف] کنایه از شبّاد و پررو، قاپ قمارخانه.

**میچین:** جگێن، قاپێن [ف] قاپ‌بازی.

**میحراب:** جێگه‌ی پێش نوێژ له مزگه‌وتا [ف] محراب.

**میحراو:** میحراب [ف] محراب.

**میخ:** بزمار [ف] میخ.

**میخانه:** گولمێخ، سنگی ناسن [ف] میخ کلفت.

**مێخچه:** بزماره، زه‌قایێ له ناو پا ده‌رده‌چێ، مێخه‌که [ف] میخچه.

**میخ‌زنجیر:** مه‌ڕبه‌ند [ف] میخ سنوربند.

**میخ‌سندان:** سندانی ناسنگه‌ر [ف] سندان آهنگر.

**مێخله‌مه:** مه‌خله‌مه [ف] نگا: مه‌خله‌مه.

**مێخۆش:** مه‌یخۆش [ف] ملس.

**مێخۆلی:** حۆل، خۆل، گه‌للابی، گیژوویژ [ف] هالو.

**مێخه‌ك:** قه‌نه‌فل [ف] میخك.

**مێخه‌کبه‌ن:** به‌رمورِی له‌مێخه‌ك [ف] گردنبند از میخك.

**مێخه‌کبه‌ند:** مێخه‌کبه‌ن [ف] گردنبند میخك.

**مێخه‌که:** بزماره، مێخچه [ف] میخچه.

**مێخه‌کی:** ۱) به‌ره‌نگی مێخه‌ك، سوری تاریکی مات؛ ۲) گوڵێکه [ف] ۱) به رنگ میخك؛ ۲) گل میخك.

**میدا:** قه‌له‌مڕه‌ساس ف مداد.

**میداد:** میدا ف مداد.

**میدالْ:** بارچه‌کانزای مۆرلێدراو ده‌درێ به‌ که‌سانێ که‌ زۆر به‌کارن ف مدال.

**میده:** گه‌ده، عوُر، کرش، گیپالْ ف معده.

**میر:** ۱) سه‌رۆك، سه‌ردار؛ ۲) لاتـــه‌نیشتی فوُلْی جگ؛ ۳) هه‌ویر ف ۱) امیر؛ ۲) طرف گود جانبی شنالنگ؛ ۳) خمیر.

**میرْ:** ۱) پیاو؛ ۲) شو؛ ۳) ئازا له‌ شه‌ڕ؛ ۴) دلاْواو مه‌رد؛ ۵) ناوه بۆ ژنان؛ ۶) خۆشه‌ویستی؛ ۷) پیر، به‌ته‌مه‌ن ف ۱) مرد؛ ۲) شوهر؛ ۳) شجاع؛ ۴) نیکوکار؛ ۵) نام زنانه؛ ۶) مهر، محبّت؛ ۷) پیر، سالخورده.

**میرا:** وشه‌ی دواندنی میر به‌ ڕێزلێنان ف ای امیر.

**میرْا:** پشتێند، که‌مه‌ربه‌ند، شالْ ف شال.

**میرات:** که‌له‌پوور، مالْی به‌جێماو له‌ مردو ف ارث.

**میرْات:** جنێوێکی ژنانه‌یه‌ ف دشنامی است زنانه.

**میرات‌به‌ر:** که‌له‌پورگر ف وارث.

**میرات‌گر:** میرات‌بر ف وارث.

**میراتی:** ۱) مالْی میرات؛ ۲) برێتی له‌ مالْی چه‌په‌لْ و شوُم ف ۱) ارثی؛ ۲) کنایه از مال پلید و نحس.

**میرْاتی:** ۱) ئازانی؛ ۲) پیاوه‌نی ف ۱) شجاعت؛ ۲) مردانگی.

**میراج:** سه‌فه‌ری پێغه‌مبه‌ر بۆ عاسمانان ف معراج.

**میراخور:** که‌سێ که‌ به‌سه‌ر ته‌ویله‌ی خان و شازاده‌گا ف میرآخور.

**میرْادبش:** له‌که‌مه‌ری خۆی به‌ستن ف به‌کمر بست.

**میراز:** هه‌ویرترش ف خمیرمایه.

**میرازْدین:** گوندێکی کوردستانه‌ به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**میراش:** خاوه‌ن‌ئاسیاو ف خداوند آسیاب.

**میراف:** که‌سێ که‌ دابه‌ش‌کردنی ئاوی ئاوابی به‌ده‌سته‌ ف میراب.

**میران:** ۱) میرا؛ ۲) له‌قـه‌می بازێ له‌ سه‌ره‌ك عه‌شیره‌تان؛ ۳) گوندێکی کوردستـــانـه‌ به‌عسی کاولی کرد ف ۱) ای امیر؛ ۲) لقب بعضی از سرداران ایل؛ ۳) روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**میرانه:** باجێ که‌ ده‌درێ به‌ میر ف باج ویژه امیر.

**میرْانه:** ۱) ئازایانه؛ ۲) پیاوانه ف ۱) شجاعانه؛ ۲) مردانه.

**میرانی:** ۱) جۆرێ ترێ؛ ۲) جۆرێ هه‌لْپه‌رکێ ف ۱) نوعی انگور؛ ۲) نوعی رقص.

**میرْانی:** ئازایه‌تی ف شجاعت.

**میراو:** میراف ف میراب.

**میرْاو:** میحراب ف محراب.

**میراوا:** دوگوندی کوردستان به‌م ناوه‌ به‌عسی کاولی کردوه‌ ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**میراولی:** گوندێکی کوردستانه‌ به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**میراوه‌ر:** گوندێکی کوردستانه‌ به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**میراوێ:** میراوا ف نام چند آبادی.

**میرایه‌تی:** گه‌وره‌یی، ده‌سه‌لاْت‌داری ف بزرگی، اقتدار.

**میربه‌نجه:** برێتی له‌ ئازاو به‌ڕێزو قه‌در ف کنایه از شجاع و محترم.

**میرج:** جۆرێ گه‌نم ف نوعی گندم.

**میرج:** مرْج، ملْچ، ملْجه ف نگا: مرْج.

**میرچـك:** ۱) مه‌لیچـك، جوله‌که، چێشکه؛ ۲) بالْداری مێو بنه ف ۱) گنجشك؛ ۲) پرنده ماده.

**میرْخاس:** ۱) پیاوی چاك؛ ۲) ئازاو ڕه‌شید ف ۱) نیکوکار؛ ۲) شجاع.

**میرْخان:** ناوه بۆ پیاوان ف نام مردانه.

**میرْخون:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.

**میرْخوزار:** ۱) چیمه‌ن، مێرگ و گیاجار؛ ۲) گوندێکی کوردستانه‌ به‌عسی کاولی کرد ف ۱) مرغزار؛ ۲) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**میرخه‌زه‌ب:** کاربه‌ده‌ستی شاو خان بۆ ئازاردانی خه‌لْك ف میرغضب، جلاّد.

**میرخه‌زه‌و:** میرخه‌زه‌ب ف میرغضب.

**میرْد:** شوُ، میرْ ف شوهر.

**میرْدترێنه:** جۆرێ مۆرووی خشلْ ف نوعی مهره زینتی.

**میرْدره‌وه:** محه‌جه‌ری لێواره‌ی سه‌ربان ف نرده لب بام.

**میرْد کردن:** شوکردن ف شوهرکردن.

**میرْدم:** ۱) مه‌ردم، بنیادەم؛ ۲) خزمی نێرینه ف ۱) مردم؛ ۲) خویشاوند مُذکّر.

**میرْدوّ:** هۆی کاورا ف حرف ندا خطاب به مذکّر.

**میرْده:** ۱) شوُ، میرد؛ ۲) نێر ف ۱) شوهر؛ ۲) مَرد، جنس مذکر.

**میرْدەزمـه:** ۱) پیرهـه‌فـوك، جنـۆکـه‌ی پیاوترسێن؛ ۲) به‌ردی قه‌وه‌ت تاقی‌کردنـه‌وه؛ ۳) مۆتـه‌کـه، کاوس ف ۱) غول بیابـان؛ ۲) سنـگ آزمایش نیرو؛ ۳) کابوس.

**میرْده‌ك:** بۆره‌پیاگ، کاوراکه‌ی بێ‌نموت ف مردك.

**میرْده‌که‌ردش:** ژنی‌هاوردگه، بوته‌ خاوه‌ن‌ژن ف زن گرفت.

**میرْدی:** ۱) قه‌وه‌تی گان‌کردن بۆ پیاو؛ ۲) پیاوه‌نی و ئازایی ۱) نیروی جنسی مرد؛ ۲) مردی.

**میرْدینکێ:** گوندێکی کوردستانه‌ به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**میرروستـه‌م:** له‌و گونـدانـه‌ی کوردستانه‌ که‌ به‌عسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**میرزا:** خوێنده‌وار ف میرزا.

**میرزاده:** به‌چکه‌میر ف امیرزاده.

**میرزاروسته‌م:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه‌ که‌ به‌عسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**میرزاغه:** گوندێکه‌ له‌ کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شده کردستان توسط بعثیان.

**میرزینگ:** بژۆڵ، مژۆڵ ف مژه.

**میرستەک:** گوندێک لە کوردستان کە بەعسی بە بۆمبای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**میرسینا:** گوندێک لە کوردستان کە بەعسی بە بۆمبای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**مێرغوزار:** مێرخوزار ف مرغزار.

**میرغەزەب:** جەڵلاد، جەلاب، میرخەزەب ف میرغضب.

**میرفان:** مەیمان ف مهمان.

**میرفانی:** مەیمانی ف مهمانی.

**میرک:** ١) مباشر، بەردەستی میر؛ ٢) جێگەی ڕۆنیشتنی میر لە کۆڕدا؛ ٣) ئانیشک ف ١) معاون امیر؛ ٢) جای نشستن امیر؛ ٣) آرنج.

**مێرک:** کاورا، کابرا ف یارو.

**میرکاچیا:** گوندێک لە کوردستان کە بەعسی بە بۆمبای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**میرکۆ:** ناوە بۆ پیاوان ف نام مردانه.

**میرکوت:** نەخۆشیەکە وەک سوڕێژە لە زاڕۆکان دێ ف بیماری سرخک مانند.

**مێرکوت:** کوتکی دارین ف پُتک چوبین.

**میرکوڕ:** ١) هەڵبژاردە، بلیمەت؛ ٢) شازادە ف ١) نابغه؛ ٢) شاهزاده.

**مێرکوژ:** پیاوکوژ، کوژەر ف آدم‌کُش.

**میرکە:** ناوە بۆ پیاوان ف نام مردانه.

**میرکەردەنە:** هەوبرشێلان ف جلانبدن خمیر.

**مێرگ:** چیمەن، گیاجاڕ ف چمن.

**مێرگاقوبی:** گوندێک لە کوردستان کە بەعسی بە بۆمبای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**میرگزیرکێ:** جۆرێ گەمە بە جگ ف نوعی قاب‌بازی، شاه و وزیر بازی.

**مێرگوڵە:** مێرگی پچوکی زۆر بەدیمەن ف چمن کوچک و زیبا.

**مێرگەهان:** گوندێک لە کوردستان کە بەعسی بە بۆمبای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**مێرگەتوێ:** گوندێک لە کوردستان کە بەعسی بە بۆمبای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**مێرگەسوارە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مێرگەسەر:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**مێرگەسەبد:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**مێرگەلان:** مێرگوڵە ف چمن کم‌وسعت و زیبا.

**مێرگەهەڵێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مێرگەی کۆیە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**مێرگێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**میرمام:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مێرمەندۆک:** نەنێرنەمێ، نێرەمۆک ف نه‌نر نه ماده، مُخنّث.

**میرمیران:** خانێ کە چەند میری ژێرفەرمانە ف خانِ خانان.

**میرمیرێن:** گەمەی میرسازدان بۆ گاڵتە ف نوعی بازی.

**میرنشین:** جێگەی ژیانی میر ف امیرنشین.

**میرنکە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**میرۆ:** ١) میرا؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان؛ ٣) مرۆچە، میرولە ف ١) ای امیر؛ ٢) نام مردانه؛ ٣) مورچه.

**مێرو:** مرۆچە ف مورچه.

**مێروچە:** مرۆچە، مێروو ف مورچه.

**مێروچێر:** دۆست و ئاشنا ف دوست و آشنا.

**مێرۆژ:** راوەکەو لە کاتی کورک بوونی ماکەودا ف شکار کبک هنگام کرچ شدن کبک.

**مێروستان:** ١) ناکەمێروێک؛ ٢) شارەمێرو ف ١) یک مورچه؛ ٢) سوراخ مورچه‌ها، لانه مورچه.

**مێروک:** گەرای مێروڵە ف تخم مورچه.

**میروکی:** گوندێک لە کوردستان کە بەعسی بە بۆمبای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**میروگزیر:** میرگزیرکێ ف نوعی قاب‌بازی، بازی شاه و وزیر.

**مێروڵە:** مێرو، مرۆچە ف مورچه.

**مێروڵەکردن:** تەزینی ئەندام: (قاچم مێروڵە دەکا) ف مورمور شدن اندام.

**میرە:** ١) قوێخا، کوێخا؛ ٢) شوو، مێرد؛ ٣) نازوخەی دەوڵەنی؛ ٤) نازناوی

پیاوماقوڵی کاکه‌یی؛ ۵) جیٚ‌ژوان؛ ۶) به‌گ. ئاغا [ف] ۱) کدخدا؛ ۲) شوهر؛ ۳) سر رشته‌داری؛ ۴) لقب روحانی اهل حق؛ ۵) میعادگاه؛ ۶) بیگ، خان.

**میره‌چه‌غه:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**میره‌دیٚ:** ۱) گوندیٚ که میری لیٚ ده‌ژی؛ ۲) گوندی قه‌وغا؛ ۳) گوندیٚك له کوردستان که به‌عسی به بومبای شیمبایی خه‌ڵکیان کوشتوه‌و پاشان کاولیان کردوه [ف] ۱) دهکده امیرنشین؛ ۲) ده بزرگ؛ ۳) روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده وسپس ویران گشته است.

**میره‌قنج:** برینی له هه‌نگ: (هه‌ڵوای سه‌رپنجی یان گوی **میره‌قنجی**!) «مه‌نه‌ڵوکه» [ف] کنایه از زنبور عسل.

**میره‌کی:** نازایانه. مه‌ردانه [ف] شجاعانه، مردانه.

**میره‌گان:** جه‌ژنیٚکه له سه‌ره‌تای گوڵدانی گه‌نمدا ده‌گیریٚ [ف] مهرگان.

**میره‌وان:** ۱) خوٚشه‌ویست؛ ۲) ناوه بوٚ ژنان [ف] ۱) مهربان؛ ۲) نام زنانه.

**میره‌وانی:** خوٚشه‌ویستی [ف] مهربانی.

**میرهێ:** مه‌هیٚن. دوٚکڵیو [ف] دوغبا.

**میری:** ۱) گه‌وره‌یی. سه‌روٚکی؛ ۲) سه‌ربه ده‌وڵه‌ت؛ ۳) ماڵ‌و دارایی که راده‌گویٚزریٚ [ف] ۱) امارت؛ ۲) حکومتی. دولتی؛ ۳) اموال منقوله.

**میریٚ:** ناوی ژنانه [ف] نام زنانه.

**میریٚ:** زڕدایك، باوه‌ژن [ف] نامادری.

**میریتی:** مه‌ردایه‌تی. جوامیٚری [ف] مردانگی.

**میریجان:** ناوه بوٚ ژنان [ف] نام زنانه.

**میر یزان:** گیادوٚکڵیویکه [ف] گیاهی است آشی.

**میریٚ سوٚر:** گوندیٚك له کوردستان که به‌عسی به بومبای شیمبایی خه‌ڵکیان کوشتوه‌و پاشان کاولیان کردوه [ف] روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**میریڤان:** ۱) خوٚشه‌ویست؛ ۲) دلوڤان؛ ۳) ناوه بوٚ ژنان [ف] ۱) محبوب؛ ۲) مهربان؛ ۳) نام زنانه.

**میرینی:** ۱) قه‌وه‌تی گان‌کردن لای پیاو؛ ۲) پیاوه‌تی، مه‌ردایه‌تی [ف] ۱) نیروی جنسی مرد؛ ۲) مردانگی.

**میز:** ۱) گمیٚز؛ ۲) ته‌خته‌ی به‌پیٚچکه بوٚ شت له‌سه‌ردانان؛ ۳) ده‌نگی زه‌رگه‌ته‌و مه‌شه‌و مه‌گه‌ز [ف] ۱) شاش، ادرار؛ ۲) میز؛ ۳) وزوز حشرات.

**میٚز:** ۱) میز؛ ۲) باوه‌ش. نامیٚز [ف] ۱) نگا: میز؛ ۲) آغوش.

**میزاڤ:** ناوی زوٚر که‌م که له سه‌رچاوه یان به جوٚگه‌دا دیٚ [ف] آب اندك که در جوی یا از سرچشمه آید.

**میزان:** به‌رانبه‌ر [ف] برابر.

**میزاو:** میزاڤ [ف] نگا: میزاڤ.

**میزبه‌زیٚن:** زاروٚکیٚ که گمیٚز له بیٚشکه‌وه ده‌رده‌به‌زیٚنیٚ [ف] کودکی که شاش از گهواره بیرون زند.

**میزتن:** ۱) گمیٚزکردن؛ ۲) ده‌ربه‌زینی باریکه‌ناو له ده‌فره‌وه: (ناشیٚ له میزتن بیٚ هه‌ر ده‌میزیٚ) [ف] ۱) شاشیدن؛ ۲) بیرون جهیدن باریکهٔ آب از ظرف.

**میٚزتن:** میزتن [ف] نگا: میزتن.

**میزدان:** گمیٚزدان، مسولٚدان، موسلٚدان [ف] مثانه.

**میزدانك:** میزدان [ف] مثانه.

**میزفك:** بلوٚسك، لوٚساوك [ف] ناودان.

**میزکردن:** گمیٚزکردن [ف] شاشیدن.

**میزکردن:** میزکردن [ف] شاشیدن.

**میزگیران:** نه‌خوٚشی میزبوٚنه‌کران [ف] شاش‌بند.

**میزڵدان:** میزدان. گمیٚزدان [ف] مثانه.

**میزن:** ۱) که‌سیٚ که زوٚر گمیٚز ده‌کا؛ ۲) به‌وزه‌و گیزه [ف] ۱) شاشو، بسیار شاشنده؛ ۲) وزوزی.

**میٚزن:** که‌سیٚ زوٚر ده‌میزیٚ [ف] بسیار شاشنده.

**میزو:** ده‌نده. ئه‌و پارچه‌داره‌ی گاسنی ده‌چه‌ناو [ف] قطعه‌ای چوبی در گاوآهن.

**میزوك:** کونی میز پیٚدا هاتنه‌ده‌ر [ف] مجرای خروج ادرار.

**میزه:** ۱) گیزه، وزه؛ ۲) له‌پاش وشه‌ی جرته واتا: گمیٚز [ف] ۱) وزوز؛ ۲) بعد از کلمهٔ «جرنه» به معنی شاش.

**میٚزه:** روانین، تماشا. نواشا، فت [ف] نگاه. تماشا.

**میزه‌چرکه:** چرنکه‌میزه [ف] چکمیزك.

**میزه‌چرکیٚ:** میزه‌جرکه [ف] چکمیزك.

**میزه‌چڕکیٚ:** میزه‌جرکه [ف] چکمیزك.

**میزه‌چوڕکیٚ:** میزه‌جرکه [ف] چکمیزك.

**میٚزه‌ر:** شاشك، سه‌روپیٚچ [ف] دستار، عمامه.

**میزه‌ڕوٚ:** ره‌گیٚ که میزی پیادیٚ [ف] مجرای ادرار.

**میٚزه‌ره:** میٚزه‌ر: (چیایه شیٚخ‌و که‌وا سه‌وزی **میٚزه‌ره‌**ی به‌فره/ سیواکی جوٚزه‌ره‌زیٚواسه نه‌یله‌سانی گه‌لاّ) «حاجی قادر» [ف] دستار، عمامه.

**میزه‌فك:** میزفك، پلوسك، لوس [ف] ناودان.

**میزه‌ك:** کونده‌میز، که‌سیٚ که زوٚر میز ده‌کا [ف] کسی که بسیار بشاشد.

**میٚزه‌کردن:** لیٚ‌ڕوانین، فت‌کردن [ف] نگاه‌کردن.

**میزه‌ڵ:** که‌سیٚ که شه‌و له جیٚگه ده‌میزیٚ [ف] کسی که در رختخواب شاشد.

**میزه‌ڵ:** میزه‌ڵ [ف] نگا: میزه‌ڵ.

**میزه‌ڵدان:** مسوڵدان، گمیٚزدان، میزڵدان [ف] مثانه.

**میزی:** ۱) گمیٚزی کرد؛ ۲) جیٚگه‌ی خه‌نه‌نه [ف] ۱) شاشید؛ ۲) جای ختنه.

**میٚزیٚ:** گوندیٚکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**میزیان:** ۱) میزتن. گمیٚزکردن؛ ۲) ناو به‌تاوژم له قه‌ڵشی ده‌فره‌وه ده‌رچوٚن [ف] ۱) شاشیدن؛ ۲) آب از درز بیرون جستن.

**میٚزیان:** میزیان [ف] نگا: میزیان.

**میٚزین:** ۱) کوٚنه‌ستیٚره‌یه‌که له عاسمان. *له‌به‌رچاو وه‌ك ته‌رازو ده‌چیٚ:*

(پێورو مێزین پێرگی هەدەف بوون)؛ ٢) بەرانبەر: ٣) جاننا. خورجینی پچووك ف ١) بُرج میزان: ٢) مقابل: ٣) ساك دستی.

**مێژ:** ١) مژ، بە لێوان توند مژلێدان: ٢) دێر، دێرێك، رۆژگاری کۆن: ٣) ئەرکی پێنج فەرزەی موسولمان لە رۆژو شەودا ف ١) مُك: ٢) پیشین؛ ٣) نماز.

**مێژان:** مژین ف مکیدن.

**مێژاندن:** کەم‌کەم شیری ناژەڵ دان بە بێچو وەختی دۆشین تا شیر دادا ف کم‌کم شیردادن به بچهٔ دام در هنگام دوشیدن تا راحت دوشیده شود.

**مێژبێژ:** چیرۆك‌ڤان، حەقایەت‌خوان ف قصه‌گو.

**مێژتن:** مژین ف مکیدن.

**مێژده:** مەجیدی ف از پولهای دولت عثمانی.

**مێژك:** ١) کانـدو، گوێلیساری کە دایکی دەمژێ: ٢) برینی لە زۆرخۆری نێرنەخۆر ف ١) بارینهٔ شیرخوار: ٢) کنایه از پُرخور.

**مێژکردن:** بەجێهێنـانی فەرزی‌خودا لە هەمـو رۆژو شەوێکا ف نمازگزاردن.

**مێژکەر:** کەسێ کاری مێژکردنە ف نمازگزار.

**مێژگە:** مزگەت ف مسجد.

**مێژوو:** ١) زەمانی کۆن: ٢) کەونارا ف ١) تاریخ؛ ٢) باستانی.

**مێژوو:** بەرکەتی، لایق ف شایسته.

**مێژوورد:** گیایەکە بۆ ناژەڵ زۆر خۆشە ف علفی است.

**مێژووزان:** زانا بە دەنگ‌و باسی رابردوان ف مورّخ، تاریخ‌شناس.

**مێژووشناس:** مێژووزان ف مورّخ، تاریخ‌شناس.

**مێژووڤان:** مێژووزان ف مورّخ، آگاه به تاریخ.

**مێژووك:** مێشکی ناو ئێسك ف مغز استخوان.

**مێژوك:** بەرخێ کە گوانی هەمـو پەزێك دەمژێ ف برّه‌ای که پستان هر گوسفندی را می‌مکد.

**مێژوکە:** بەرخی تازەزاو ف برهٔ تازه متولد شده.

**مێژوڵ:** برژانگ، برزانگ ف مُژه.

**مێژولانك:** برژانگ، بژانگ ف مُژه.

**مێژوناس:** مێژووزان ف مورّخ، عالم تاریخ.

**مێژوەورد:** مێژوورد ف گیاه «مێژوورد».

**مێژوی:** دانەوێڵەیەکی پانکەڵەی کەوەرەنگە بەچێنست لێ دەنرێ، نیسك ف عَدَس.

**مێژوین:** چێشتی مێژوی، نیسکێنە ف آش عدس.

**مێژوویی:** زۆر کەونارا ف تاریخی.

**مێژەلاك:** ١) مەژگ، مزی، مەژی: ٢) هێشوەترێی بێ‌دەنك ف ١) مغز: ٢) خوشه انگور لخت شده از دانه.

**مێژەلۆك:** مەورە، لکی براوی رەز ف شاخهٔ هرس شدهٔ تاك.

**مێژی:** مەژگ، مەژی، مژی ف مغز.

**مێژیل:** مزڵ، قوناخ، مەودای رۆژەرێ بەکی بەپا ف مسافت یك روز راه پیاده‌رو.

**مێژبن:** مژین ف مکیدن.

**میس:** ١) ماچ، رامووس، رامووسان: ٢) نوند بۆن‌کردن ف ١) بوسه: ٢) تند بو کردن.

**مێس:** مەشە، مێش ف مگس.

**میسا:** سووکەڵەناوی موسا، ناوی پیاوانە ف مخفّف موسی.

**میساب:** مسنەی پینەچی ف مسنهٔ پینه‌دوز.

**میساخە:** ناردانویز ف جای آرد پیرامون سنگ آسیا.

**میساس:** مەساسە، مساسك ف چوبدست شخم‌زن.

**میسان:** ١) رامووسان، ماچ کردن: ٢) بۆن‌کردنی توند؛ ٣) ناوه بۆ ژنان ف ١) بوسیدن؛ ٢) بوکشیدن؛ ٣) نام زنانه.

**میستن:** ١) گمێزکـردن، میزکردن: ٢) مژین، هەڵمژین: ٣) دەرپەرینی دەنکە گەنم لە ناو دوبەرداشا ف ١) شاشیدن: ٢) برمکیدن: ٣) بیرون جهیدن دانهٔ گندم از بین دو سنگ آسیاب.

**میسکە:** مسکە، جۆرێ کوللە ف نوعی ملخ.

**میسکێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**میسمیسك:** گمێزدان، میزەڵدان، مسوڵدان ف مثانه.

**میش:** مشك ف موش.

**مێش:** ١) مەش، مەشـە، مەشـی: ٢) محـانـج، هاوینـنـنـی بێ‌نامـانـەجدەیـەرجـاوگرنـن لە کەلابێن‌دا؛ ٣) هەنـگ، ئەو بالـدارە چکۆلەی لیکاوی دەمی لە هەموشت شیرینترە؛ ٤) برینی لە هێزی کارو چالاکـی ف ١) مگس؛ ٢) انـداخـتـن بدون هدف درتیله‌بازی؛ ٣) زنبور عسل؛ ٤) کنایه از توانایی.

**مێشاسە:** مێشەسەگانە ف سگ مگس.

**مێشاکەران:** مێشەکەرانە ف خرمگس.

**مێشان:** گەمەیەکەلاو گوێز ف بازی با تیلەو گردو.

**مێشانە:** مۆزکردنی گاو گوڵ: (گوێلکەکان **مێشانە**یان کرد) ف رمیدن گاو و گوساله از زنبور درشت.

**میشانی:** مێشان، مووشێن ف بازی با تیله و گردو.

**مێشانی:** مێشانە ف نگا: مێشانە.

**مێشپەڕ:** رەز لە خونچەدا بەر لە پشکوتن ف تاك قبل از شکوفه.

**مێشتن:** مژبن، مژین ف مکیدن.

**مێش تێدان:** کرمێ بوونی مێوەی بێستان ف کرم زدن میوهٔ پالیزی.

**مێش خۆرە:** مەلێکی جوان و چەندرەنگە ف پرندهٔ زنبورخوار.

**مێش خەساندن:** برینی لە بێکارڕابواردن ف کنایه از بیکاری.

**مێشـرەوێن:** بەرچاوکەی بەکسم لە ترسی مێش ف پیشانی‌بند پرزدار اسب و ستور.

**مێش قەپاندن:** برینی لە بێکارڕابواردن، مێش‌خەساندن ف کنایه از بیکاری.

**مێشـك:** ١) مژی، مەژگ، مێژی: ٢) مۆز، جانەوەرێ کە بە گاو گوڵەوە دەدا ف ١) مغز؛ ٢) نگا: مۆز.

**میشکات:** ١) تاقەی چکۆلە؛ ٢) جێ‌چرا ف ١) طاقچه؛ ٢) مشکات.

**مێشکاسەی:** جۆرێ جانەوەری باڵداری بۆرە زۆر دەوری سەگ دەدا ف سگ مگس.

**مێش کوژ:** ١) دەرمان و گیابەکە مێش پێی دەمرن؛ ٢) تەناویکە لەشۆڵ بۆ مێش کوژتن ف ١) داروی مگس‌کش؛ ٢) مگس‌کُش دستی.

**مێشکوڵە:** زۆبابی پشتەسەر ف برامدگی عقب سر، مُخچه.

**مێشگر:** ١) دەرمانێ کە مێشی پێوە دەلکێ؛ ٢) بربێی لە تەمەڵ و بێکار ف ١) نوار مگس‌گیر؛ ٢) کنایه از تنبل و بیکار.

**مێشگرە:** مێشگر ف نگا: مێشگر.

**مێشلەزەرگۆ:** دەوەنێکە ف درخنچه‌ایست.

**مێشلەزەرگون:** مێشلەزەرگۆ ف درخنچه‌ایست.

**مێشلەزەرگە:** گیایەکی گەڵاپانەو ئیژن دەرمانە ف گیاهی است دارویی.

**مێش مێشك:** قومارێکە هەرکەس زۆتر مێش لە هێلکەکوڵاوەکەی بنیشێ لەبیانەوە ف نوعی بازی است.

**مێشن:** ١) پێستی بزن و مەڕی لەدەباغ‌دراو؛ ٢) بەز، مێ، مەڕ ف ١) چرم میشن، تیماج؛ ٢) گوسفند.

**مێشنا:** بەز، مەڕ، مێ ف گوسفند.

**مێشو:** حۆل، نەفام ف هالو.

**مێشوك:** مێشی بچوك ف مگس کوچك.

**مێشوکی:** هەرچی و هەرکێ زۆری مێش لێ بنیشێ ف هرچه که مگس بسیار برآن نشیند.

**مێشوڵە:** پێشکە، پێشی، نوقانە ف پشه.

**مێشومحانج:** ناوبێنی بێ‌نامانج ف انداختن بدون هدف‌گیری.

**مێشە:** ١) بێشە، دارستانی بی لە دەم‌جەم، دەحل؛ ٢) نرسانی ولاغ و بەکسم لە مۆز، مێشانە ف ١) بیشه؛ ٢) رم‌کردن حیوانات از زنبور و مگس.

**مێشەڕۆ:** یەکسمی هەڵاتو لەتاوی مێش و مەگەز ف ستور رم کرده از زنبور.

**مێشەرەوی:** مێش‌قەپاندن، بربێی لە بێکار ف کنایه از بیکار.

**مێشەسانە:** مێشکاسەی ف سگ مگس.

**مێشەسەگانە:** مێشکاسەی ف سگ مگس.

**مێشەسەبانە:** مێشکاسەی، مێشەسانە ف سگ مگس.

**مێشەسەیە:** مێشەسانە، مێشکاسەی ف سگ مگس.

**مێشەسی:** جێرگ، جرگ ف هوبره.

**مێشەڤان:** کەسێ کە ئاگای لە دەحل بێ ف جنگلبان.

**مێشەقەبرە:** مێشێکی درێژۆکەی سەوزە لانە لەبن زەمین‌دا دەکا ف مگسی درشت و سبز که لانه در زیرزمین کند.

**مێشە کەرانە:** جۆرێ مێشی رەشی درشنە، کەرمێش ف خرمگس.

**مێشە گرە:** جاڵ‌جاڵۆکە، جوڵانەنە، کاکڵەمۆشان ف عنکبوت.

**مێشە گیرە:** مێشەگرە ف عنکبوت.

**مێشەلان:** بێشەی چوغور، دەحلی پڕ، بێشەلان ف بیشهٔ انبوه.

**مێشەمڕ:** ماڵی جوڵ‌کزاو ف خانهٔ منروك.

**مێش هنگوف:** هەنگ، مێشەنگوین ف زنبور عسل.

**مێشەنگوین:** مێشی لبکاوشیرنی جزودار ف زنبور عسل.

**مێشەوان:** ئاگاداری مێشە ف نگهبان بیشه، جنگلبان.

**مێشەوش:** مێڕوی، نیسك ف عدس.

**مێش هەنگ:** مێشەنگوین ف زنبورعسل.

**مێش هەنگوین:** مێشەنگوین ف زنبورعسل.

**مێشی:** چرافنبلە، فودیلکەچرا ف چراغ موشی.

**مێشیاو:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**مێشێن:** کەلایێن، مۆشێن ف تیله‌بازی.

**مێعراو:** میحراب، جێگەی پێش‌نوێژ لە مزگەوت، مێراو ف محراب.

**مێڤان:** مەیمان ف مهمان.

**مێڤان:** مەیمان ف مهمان.

**مێڤاندار:** کەسێ کە مەیمانی هەبێ ف کسی که مهمان داشته باشد.

**مێڤانداری:** خزمەت و حاواندنەوەی مەیمان ف مهمانداری.

**مێڤانی:** ١) مەیمانی؛ ٢) جێشتی ئاردو رۆن ف ١) مهمانی؛ ٢) کاچی.

**مێڤانی:** مەیمانی ف مهمانی.

**مێڤۆك:** قۆبچە، دوگمە، بژکۆژ ف دکمه.

**مێقات:** سەعاتی باش کە باش و پێتی نیە ف ساعتی که وقت صحیح را نشان می‌دهد.

**مێقروب:** زیلەی کە بە چاو نابینرێ و دەبێنە مابەی نەخۆشی ف میکروب.

**مێقن:** سەرو سەکوت، پیچم و نەرح ف ربخت و قیافه.

**مێقناتیز:** مغناتیز ف آهنربا.

**مێك:** بەز، مەڕ ف گوسفند.

**مێکاب:** مەترەی‌چوارگۆشە ف مترمُربع.

**مێکروب:** مێقروب ف میکروب.

**مێکروسکوپ:** دووربینێ کە مێقروب دەخاتە بەرچاو ف میکروسکوپ.

**مێکوت:** کوتکی داربن ف بنك چوبین.

**مێکوتك:** مێرکوت، سێکوتە ف مخملك.

**مێکوتە:** مێرکوت، نەخۆشیەکی زاروکانە زیپکەیان لێ دێت ف بیماری مخملك.

**مێکوتەسەرە:** بەچکەبۆقی لە قاپۆرذا ف بچه قورباغهٔ دررن پوسته.

**مێکوك:** مەکوك، بەلەك ف گیاه شیرین‌بیان.

**مێکوکە:** مێکوك، بەلەك ف شیرین‌بیان.

**مێکە:** مۆکێش، مۆچن ف موچین.

**مێکەر:** ماکەر، دێڵەکەر ف ماده خر.

**مێکەو:** ماکەو، جێڵ ف ماده کبك.

**مێکێ ئاڤی:** مەیکێ ئاڤی ف سگ‌آبی.

**مێگوان:** مێنگوین، نێنگوێن، دامنەجەقان، بەرکەلی مانگا ف گوسالهٔ مادهٔ سه‌ساله، ماده گاو جوان.

**مێگەل:** گەلە، کەرك ف گله، رمه.

**مێگەل‌وان:** شوانی گەلە ⓕ چوپان.
**مێگەلەوان:** مێگەلوان ⓕ چوپان.
**میل:** ۱) کلچوک، کلچێوک؛ ۲) خەتی ڕاست لە کونالدا؛ ۳) زمانەی نەرازو؛ ۴) ئەندازەیەك لە ڕێگەپێوان‌دا کە دەکاتە سێ یەکە فرسەقێك؛ ۵) ئاسنی درێژوکە لە زورخانەدا؛ ۶) دەرەوشێکی باریکە پزیشکان دەناو برینی زادەکەن؛ ۷) کێلی قەبر ⓕ ۱) میل سرمەکشی؛ ۲) خط مستقیم در قماش؛ ۳) زبانهٔ ترازو؛ ۴) یك سوّم فرسنگ؛ ۵) میل زورخانه؛ ۶) میلهٔ جرّاحی؛ ۷) شاهدقبر.
**مێل:** لارەوەبوگ، داهاتو ⓕ کج شده.
**مێڵ:** میل ⓕ نگا: میل.
**مێلاق:** ۱) ترێی هەلگیراو بۆ زستان؛ ۲) گولێکی سوری ئالە، ڕەبەنوك ⓕ ۱) انگور ذخیره شده برای زمستان؛ ۲) آلاله.
**مێلاقە:** ڕەبەنوك ⓕ آلاله.
**مێلاك:** ۱) جەرگ و ناو؛ ۲) کەوچك، کەفچی؛ ۳) جێژە، چەشنن ⓕ ۱) دل و جگر و قلوه؛ ۲) قاشق؛ ۳) چشیدن.
**مێلاك کردن:** تام‌کردن، جێژەکردن ⓕ چشیدن.
**مێلاگ:** ڕون‌کردنەوە، سەلماندن ⓕ اثبات.
**میلان:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ⓕ از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**میلانی‌حاجی:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ⓕ روستایی درکردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.
**مێلاو:** لاسکی قلیاناوی کە سەرێکی دەگاتە ناو ناوەکەی ⓕ میلهٔ قلیان.
**میلچوك:** کلچوك ⓕ میل سرمەکشی.
**میلچێوك:** کلچێوك ⓕ میل سرمەکشی.
**میلدان:** ۱) کلتو، سورمەدان؛ ۲) میل دەبرین‌ڕوکردن ⓕ ۱) سرمەدان؛ ۲) میلەزدن جرّاحی.
**میل‌عارەب:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ⓕ روستایی درکردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.
**میلکان:** جێگەی چادرو چیغ بەرپاکردنی خێلات ⓕ جای چادرزدن ایل.
**میللورە:** مێرولە، مروچە ⓕ مورچە.
**میل‌میل:** خەت‌خەت، ڕێرێ ⓕ راەراە.
**مێلورە:** مێللورە، مروچە ⓕ مورچە.
**مێلورە:** مێلورە، مروچە ⓕ مورچە.
**مێلوکلەدان:** کلتو رو کلچوك ⓕ میل و سرمەدان.
**مێلە:** میل ⓕ نگا: میل.
**مێلەدە:** چولەچرا، مەشخەل ⓕ مشعل.
**مێلەسور:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ⓕ از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**مێلەسورە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ⓕ روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.
**میلەکە:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ⓕ دو روستا بە این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.
**مێلەگورگانە:** کلچوکەگورگانە، گیایەکە گولێکی سوری ڕاست‌و باریك دەکا لە پاییزدا ⓕ گیاهی است کە در پاییز گل می‌دهد.
**میلەهوت:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ⓕ روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.
**مێلی‌دە:** مێلەدە، مەشخەل ⓕ مشعل.
**میم:** ۱) خوشکی دایك، پور؛ ۲) موی مێ؛ ۳) ناوی پیتێکی ئەلف‌وبێیکە ⓕ ۱) خالە؛ ۲) موی مێ؛ ۳) حرف میم.
**میمار:** ۱) نەخوشی مو کە لە پەنجە دەبێت؛ ۲) دومەلی زورزل ⓕ ۱) زخم کژدمە؛ ۲) دمل بزرگ.
**مێمان:** میوان، میڤان ⓕ مهمان.
**مێمانەی:** میڤان‌بون ⓕ مهمان شدن.
**مێمانی:** بەداوەت خڕبونەوە ⓕ مهمانی.
**میمبەر:** جێگەی بەرز بۆ خودبەخوێن لە مزگەوت ⓕ منبر.
**مێمبەر:** ڕیخولەباریکە ⓕ رودهٔ کوچك.
**میمزا:** ڕولەی خوشکی دایك، پورزای دایکی ⓕ خالەزادە.
**میمك:** میم، خوشکی دایك ⓕ خالە.
**میمك‌زا:** میمزا ⓕ خالەزادە.
**میمکەزاگ:** میمك‌زا ⓕ خالەزادە.
**مێمل:** بەلا، ئافات ⓕ آفت.
**میمنایی:** مومیایی ⓕ مومیایی.
**میمو:** مەیمان، میرفان ⓕ مهمان.
**میموك:** مێکوك، بەلەك ⓕ گیاە شیرین‌بیان.
**مێموك:** مێکوك، بەلەك ⓕ گیاە شیرین‌بیان.
**میمون:** میوان ⓕ مهمان.
**میمی:** میم، میمك، پور، خوشکی دایك ⓕ خالە.
**مینا:** ۱) شوشە؛ ۲) وەکو، لەگوێن؛ ۳) گولێکە؛ ۴) ناوی ژنانە؛ ۵) پێستی بریقەداری سەرددان ⓕ ۱) شیشە؛ ۲) مانند؛ ۳) گلی است؛ ۴) نام زنانه؛ ۵) مینای دندان.
**مینابەند:** شوشەبەند ⓕ شیشەبند.
**میناك:** هاونا، وەك‌یەك ⓕ همنا، مشابە.
**میناکاری:** شوشەبەندی ⓕ شیشەکاری.
**میناکی:** هاونایی، بەدیمەن وەکو یەك ⓕ همنایی، شباهت.
**مینالغ:** شوشەبەندی ڕەنگاوڕەنگ ⓕ شیشەبندی الوان.
**میناهی:** وەك‌یەك چون ⓕ شباهت.
**مینبەر:** میمبەر ⓕ منبر.
**مینجا:** دوڕ، مابەین ⓕ وسط.
**میندەر:** دوشەکولە ⓕ تشك کوچك.
**مینگا:** مەڕ، پەز ⓕ گوسفند.
**مینگن:** پیاوێ کە مینگە زور دەکا ⓕ کسی کە تودماغی حرف می‌زند.
**مێنگوین:** دامنەچەقان، مانگای بەرکەل ⓕ مادەگاو سەسالە.
**مینگە:** دەنگی گن، منگە ⓕ صدای حرف زدن دربینی.

**مێنگە:** مێ، مێو بنە، ما، مان ف مادینە.

**مین مینك:** پەبوُلە ف پروانە.

**مینە:** ۱) مابەین، مینجا؛ ۲) سوکەڵەی حەمەدەمین، ناوە بۆ پیاوان؛ ۳) نوژینەوە، پشکنین. شی کردنەوە؛ ۴) گولێکە ف ۱) وسط، میان؛ ۲) مخفّف محمّدامین، اسم مردانە؛ ۳) پژوهش؛ ۴) نام گُلی است.

**مێنە:** پشت، پشتەوە ف پُشت بەطور عام.

**مینەڤ:** هێزی بەرگری لەتاپۆرە بۆ کاتی پێویست ف بسیج مردمی.

**مینەك:** باری تازوخەو بژێوی کاروانچیو دەشتەوانان ف بار آذوقە کاروانیان.

**مێنە کە:** ئەنگوستیلەی بێ نقیم لە شاخە بزن ف انگشتر بی نگین از شاخ بُز.

**مینە گ:** وڵاخی سواریو بارەبەر ف حیوان سواری و باربر.

**مینەموکە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**مینین:** وێك‌چوُن، هاوشێوەیی، مێناهی ف شباهت.

**مێو:** ۱) مێ، ما، مابنـە؛ ۲) شەم، شەمێ، مۆم؛ ۳) داری ترێ، ڕەز؛ ۴) بڕکەبێستان؛ ۵) داڵوُت، قایمەمێو کە داری مێوی دەخرێتە سەر ف ۱) مادینە؛ ۲) موم؛ ۳) تاك؛ ۴) بوتۀ جالیزی؛ ۵) داربست درخت مو.

**میو:** نێوان، ناوەند ف مابین.

**میوان:** مەیمان، میڤان ف مهمان.

**مێوان:** میوان، مەیمان ف مهمان.

**میوانبەڕێ کردن:** ۱) باش بەخێوکردنی مەیمان؛ ۲) مەیمانخستنەسەرڕێ بۆ ڕۆیشتن ف ۱) پذیرایی کردن از مهمان؛ ۲) مهمان را بدرقە کردن.

**میوانخانە:** ۱) دیوەخانی میوانان؛ ۲) جێگەی شەومانەوەی میوانان بەکرێ ف ۱) اتاق مهمانان، اتاق پذیرایی؛ ۲) مسافرخانە.

**مێوانخانە:** میوانخانە ف نگا: میوانخانە.

**میواندار:** کەسێ کە زۆری مەیمان هەیەو مەیمان زۆر ڕادەگرێ ف کسی کە بسیار مهمان دارد، مهمان‌پذیر.

**میوانداری:** پەزیرایی لە مەیمان ف پذیرایی از مهمان.

**میوانداکردن:** مەیمان‌ڕاگرتن، ڕێگەدانی مەیمان بۆ ناو ماڵ ف مهمان پذیرفتن.

**میوانڕاگرتن:** میوانداکردن ف مهمان پذیرفتن.

**میوانەوین:** میوان‌دۆست ف مهمان‌دوست.

**میوانی:** ۱) مەیمانی؛ ۲) میڤانی، جێژنی تاردوڕۆن ف ۱) مهمانی؛ ۲) کاچی.

**مێودان:** گشتەك دەمۆم‌ساوین ف رشتە را موم اندودکردن.

**میوڕۆن:** مەڵحەمێکی بەپێستاساوینە ف روغن و موم، مرهمی است.

**مێوژ:** ترێی لەبەرتاو تیشکەوەکراو ف مویز.

**مێوژۆکـە:** ۱) لکی داری داردەموکانە: (وەك مێوژۆکە دەلەرزێ)؛ ۲) بنی گیایەکە بەفەدگێوژ زاروز دیخۆن ف ۱) شاخۀ درختچۀ مو بزك؛ ۲) ریشۀ خوردنی نوعی گیاه.

**مێوژە:** گوندێکە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**مێوك:** دوگمە، قۆپچە، پشکۆژ ف دکمە.

**مێوگرتن:** بەرگی مۆم دەبەر دوعای نوسراو کردن ف موم اندودکردن.

**مێولاتە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**مێولەسەر:** جۆرێ فیشەك ف نوعی فشنگ قدیمی.

**مێوَن:** میو، ناوەند، دوڕ ف مابین.

**مێونێ:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**میوە:** بەری نام‌خۆشی دارو بێستان ف میوە.

**مێوە:** ۱) میوە، فێقی؛ ۲) ما، مابنە، جوُتی نێر ف ۱) میوە؛ ۲) مادینە جفت نرینە.

**میوەجات:** گەلەك‌جۆری فێقی ف میوەجات.

**مێوەرد:** تۆم‌چاندن دوای هەوەڵ‌بارانی پایز ف کاشت بعد از اوّلین باران پائیزی.

**مێوەڕۆن:** میوڕۆن ف نگا: میوڕۆن.

**مێوژەڵ:** مێورە ف شاخۀ هرس شدۀ تاك.

**میوەك:** شۆڕەوەبوُگ، دالەقاو ف آویزان.

**میوە گەنان:** مانگی ڕەزبەر ف مهرماه.

**مێوەلە:** ما، مێ، مێوە ف مادینە.

**مێوەمارانە:** جۆرێ کاڵە کەمارانەیە ف نوعی هندوانۀ ابوجهل.

**میوەهات:** میوەجات ف میوەجات.

**مێوین:** لە مێو چێ‌کری ف ساختە از موم.

**مێوینە:** ۱) ماینە، ما، مێ، جوُتی نێر؛ ۲) مشەمای مێودراو ف ۱) مادینە، جفت نر؛ ۲) مشمّع.

**میهـ:** مەڕ، پەز، مەڕەزاو ف میش، گوسفند.

**مێهتن:** مژتن، مژین ف مکیدن.

**میهرەبان:** دڵنەرم ف مهربان.

**میهرەوان:** میهرەبان ف مهربان.

**میهڤان:** میوان، مەیمان ف مهمان.

**میهڤان‌خودانکرن:** میوانداری کردن، میوان‌ڕاگرتن ف پذیرایی کردن از مهمان.

**میهڤان‌دۆست:** کەسێ کە بەمیوانان حەزدەکا ف مهماندوست.

**میهڤان‌ڕێکرن:** میهڤان‌خودانکرن ف پذیرایی کردن از مهمان.

**میهڤانی:** مەیمانی ف مهمانی.

**میهمان:** میڤان ف مهمان.

**میهمانخانە:** میوانخانە ف نگا: میوانخانە.

**میهمـانـدار:** ۱) میوانـدار؛ ۲) ناوی گونـدێکـە لە کوردستـان ف ۱) مهمان‌پذیر؛ ۲) نام روستایی است.

**میهمانی:** مەیمانی ف مهمانی.

**میهمۆز:** مامزە، ئاسنی لای پاژنەی سوار ف مهمیز.

**میەر:** پەز، مەز، مێ ف گوسفند.

**میەو:** دەنگی پشیلە، میاو ف صدای گربە.

**میهەنگ:** ١) عەیار، پێوانە؛ ٢) ئەندازەشاندەر ف ١) پیمانە؛ ٢) درجە، عقربە.

**میین:** مهین ف نگا: مهین.

**مێینە:** مێوینە، مێ، مێوە ف مادینە.

**مێیە:** ١) مێ بنە، جوتی نێرە: (ئەم کوترە **مێیە**ی ئەونێرەیە)؛ ٢) ئالقەی قرتە ف ١) مادینە، جفت نرینە؛ ٢) حلقهٔ سگک.

**مێیینە:** مێو بنە، بەرانبەری نێرینە ف مادبنە، مخالف نرینە.



**ن:** ١) پاشگری کۆمەڵ بۆ ئەوانەی دەدوێندرێن: (**بخۆن، بچن**)؛ ٢) پاشگری بەوانا: ئێمە: (**بوێن** بێنە، **لێن** گەڕێ)؛ ٣) پاشگری پەسنی ناحەز: (**چڵکن، چڵمن، کوڵکن**)؛ ٤) پاشگری ماك و کەرەسە: (**زێڕن**)؛ ٥) پاشگری حەبەر لەکۆمەڵدان: (**هانن، دەچن، دەڕۆن**)؛ ٦) پاشگری باڵدان: (**باشن**)؛ ٧) پاشگری جاوگە: (**کرن، برن**)؛ ٨) نە، نا: (ئەز نزانم) ف ١) پسوند جمع مخاطب؛ ٢) پسوند متکلّم مع الغیر؛ ٣) پسوند توصیف؛ ٤) پسوند نسبت؛ ٥) خبر از سوم شخص جمع؛ ٦) پسوند اتّکا؛ ٧) پسوند مصدری، علامت مصدر؛ ٨) نه، حرف نفی.

**نا:** ١) بێ: (**ناهومێد**)؛ ٢) دوورەپەرێزی: (**ناچم، ناخۆم**)؛ ٣) دوڵاش: (سەر **نای** ناسیاو)؛ ٤) وشەی پرسیار: (تۆ چو بە شار **نا**؟)؛ ٥) نان، بان: (**نا** تۆ بچو **نا** من دەچم)؛ ٦) وشەی حاشا: (تۆ خواردت؟ **نا**) ف ١) بدون؛ ٢) نه؛ ٣) ناوآسیاب؛ ٤) کلمۀ پرسش؛ ٥) یا؛ ٦) کلمۀ حاشا، انکار.

**ناناسایی:** بەدەر لە داب و دەستوور ف غیرعادی.

**نائومێد:** بەئاوات نەگەیشتو ف نومید.

**نانەمین:** ١) غابن، خەیان، دەستپیس؛ ٢) بفە، خەنەر ف ١) غیرقابل اعتماد، نامطمئن، نادرست؛ ٢) خطرناك.

**نابا:** ١) شتێ کە کەم دەس دەکەوێ؛ ٢) تیا جێگەی نابێتەوە: (ئەم جەواڵە ئەم گەنمە **نابا**)؛ ٣) توانای نیە: (ئەم کەرە بارەکەی **نابا**)؛ ٤) نابوات، نایبا ف ١) ناباب؛ ٢) نمی گنجد؛ ٣) توانایی ندارد؛ ٤) نمی برد.

**ناباب:** ناباو ف ناباب.

**نابالغ:** منالێ هێشتا گەورە نەبوگ ف نابالغ.

**نابالق:** نابالغ، نەگەیوەتە بلوق ف نابالغ.

**نابـاو:** ١) بێبرەو، بێزەمین؛ ٢) دوور لە داب و دەستووری کۆمەڵ ف ١) بی‌رواج؛ ٢) ناباب و غیرعادی.

**ناپابس:** لە پێوبست بە دوور ف ناپابسنە.

**نابوو:** لە دارایی کەفنگ ف ورشکست.

**نابووت:** ١) نابوو؛ ٢) بونە، بونەکە ف ١) ورشکست؛ ٢) کوتاه قدّ بدقواره.

**نابووتبوون:** لەدارایی کەوتن ف ورشکست شدن.

**نابوتە:** بوتەکە، پیسەکە، قرخنە ف کوتاه‌قدّ لاغر بدقواره.

**نابـووتی:** ١) لەدارایی کەوتن؛ ٢) بوتەکەیی ف ١) ورشکستگی؛ ٢) بدریختی و کوچك اندامی.

**نابود:** نابووت ف نگا: نابوت.

**نابوینك:** تیروکی ئەستووری ئەنگوتك‌پان‌کردنەوە، وەردێنە ف نورد نانوایی.

**نابوویی:** نابوونی، لەدارایی کەفتن ف ورشکستگی.

**نابە:** رەوانیە، نابێ، ناشێ: (ولۆ **نابە**) ف سزاوار نیست.

**نابەجا:** پێچەوانەی رێوشوێنی ناسایی ف نامعقول.

**نابەجێ:** نابەجا: (بەجێ‌ماوم لە باران **نابەجێ** ماوم ئەجەل زۆ بە/ بە مردن لەم فسووری ژینە نیستبعفا نەکەم چبکەم؟) «مەحوی» ف نامعقول، نابجا.

**نابەحەق:** پێچەوانەی حەق و راستی ف ناروا.

**نابەدڵ:** پێچەوانەی دڵخواز، شتێ کە پەسند نەکرێ و بەردڵ نەکەوێ ف برخلاف میل.

**نابەکار:** بەدکار، زاڵم ف بدکار.

**نابەکام:** بەمراد نەگەیشتگ ف ناکام.

**نابەلەد:** پێچەوانەی شارەزا ف ناوارد.

**نابەلەگ:** نابەلەد ف ناوارد.

**نابەلەڵ:** نابەلەد ف ناوارد.

**نابەوەخت:** بێ‌وەخت ف نابهنگام.

**نابەین:** دوو، مابەین ف میان، وسط.

**نابێ:** ناشێ ف نمی شود.

**نابینك:** نابوینك ف وردنۀ نانوایی.

**ناپارازی:** خۆنزیك‌کردن لە شتێ کە نەبێ لێی دووربی ف بی‌احتیاطی.

**ناپارێزی:** ناپارازی، لە خەتەر دووری نەکردن ف ناپرهیزی، بی‌احتیاطی.

**ناپاك:** ١) پیس، گەمار، چڵکن؛ ٢) بەدقەرز، خاین ف ١) ناپاك؛ ٢) خائن.

**ناپـوخت:** ١) پیس و پۆخڵ؛ ٢) کاربڵاو: (کاری هەر **ناپوختە**) ف ١)

كثيف؛ ٢) نابخته، نامنظّم.

**ناپەسن:** شتێ کە لە بەردڵ کەوتن دوورە ف ناپسند.

**ناپەسند:** ناپەسن ف ناپسند.

**ناپەسەن:** ناپەسن ف ناپسند.

**ناپەسەند:** ناپەسن ف ناپسند.

**ناپیاو:** کەسێ کە لە مەردایەتی بێبەشە ف نامرد.

**ناپیاوەتی:** پێچەوانەی مەردایەتی ف نامردی.

**ناپیاوی:** ناپیاوەتی ف نامردی.

**نات:** لەملاوە ف از این طرف.

**ناتا:** نات، لەبرەو ف از این طرف.

**ناتانم:** لە توانام بەدەرە ف نتوانم.

**ناتانین:** ١) بێ ناقەت بوون لە ئەنجامی کارێکا؛ ٢) ئێمە بۆمان ناکرێ ف ١) نتوانستن؛ ٢) نمی‌توانیم.

**ناتاو:** کەمو کورێ هێشتا بۆ پوخت بوون دەبەوێ ف نادرست، ناپخت، ناتمام.

**ناتاوان:** بێ گوناه، بێ تاوان ف بی گناه.

**ناتاوی:** کەمو کورێ، بەدوور لە پوختیی و دروستی ف نقص، کاستی.

**ناتدوت:** ئێرو ئەوێ ف اینجا و آنجا.

**ناتر:** دەللاك، کیسەکێشی حەمام ف دلاّك حمّام.

**ناترا:** لێرەوە ف از این طرف.

**ناترە:** شادە، شارە، عەلامەتی نێوان کاو گەنم لە خەرمان ف جوی کهای فاصل کاه و گندم در خرمن.

**ناتف:** گشنەکی بر بن‌دروون ف نخ بخیهٔ جراحی، رشتهٔ زخم‌دوزی.

**ناتوا:** پێچەوانەی دەخوازێ ف نمی‌خواهد.

**ناتواتا:** لێرەولەوێ ف اینجا و آنجا.

**ناتوام:** پێچەوانەی دەمەوێ ف نمی‌خواهم.

**ناتواو:** ١) بەرێشانحاڵ، پەشێو؛ ٢) پێچەوانەی تەواو ف ١) پریشان‌حال؛ ٢) ناتمام.

**ناتوای:** پێچەوانەی دەتەوێ ف نمی‌خواهی.

**ناتور:** باغەوان ف باغبان.

**ناتورە:** لەقەمی ناپەسند ف لقب زشت.

**ناتەبا:** پێچەوانەی ئاشت و مابەین خۆش ف ناسازگار.

**ناتەبایی:** مابەین نێکچوویی ف ناسازگاری.

**ناتەمیز:** پیس، چڵکن، گەمار ف کثیف.

**ناتەمیس:** ناتەمیز ف کثیف.

**ناتەوان:** بێ ناقەت، بێ تین و ئاپشت ف ناتوان.

**ناتەواو:** ناتواو ف ناتمام.

**ناجایز:** نابەحەق ف ناروا.

**ناجسن:** ١) بەدفەڕ، ناپەسند؛ ٢) رەگەزچرۆك، بنبچەخوێری ف ١) بدادا، بدجنس؛ ٢) نانجیب.

**ناجۆر:** ١) ناباو؛ ٢) دزی رێك‌وپێك ف ١) ناباب؛ ٢) نامرتّب.

**ناجۆر:** ناباو ف نگا: ناباو.

**ناجەستە:** پوونەکە، نابووت ف بی‌نمود، کوتاه‌قدّ بدریخت.

**ناجەسە:** ناجەستە ف نگا: ناجەستە.

**ناجیح:** سەرکەوتو لە کاری خۆیدا ف موفّق در کار.

**ناچاخ:** بێ‌کەیف ف بی‌حال، نزار.

**ناچار:** مەجبوور، کەسێ کە دەسەڵاتی کاری بەخۆی نەبێ ف ناگزیر.

**ناچم:** ١) رۆیشتن ناکەم، بەرانبەری دەچم؛ ٢) بەرانبەری دەشبێم ف ١) نمی‌روم؛ ٢) شباهت ندارم.

**ناچن:** ١) پێچەوانەی دەچن؛ ٢) پێچەوانەی دەشبێن ف ١) نمی‌روند؛ ٢) شباهت ندارند.

**ناچە:** کوژە، گەروڵەی ئاش ف گلوی آسیا که گندم از آن ریزد.

**ناچەخ:** تەوری دەستی شەڕکەران لە پێشوودا ف تبردست جنگاوران قدیم.

**ناچێ:** ١) پێچەوانەی دەڕوا؛ ٢) پێچەوانەی دەشبێ، لەگوێنێ نەو تبە: (کاکت وەك تۆ **ناچێ**)؛ ٣) بەخت ناکرێ، برەوی نیە: (ئەم پارەفەلبە **ناچێ**) ف ١) نمی‌رود؛ ٢) شباهت ندارد؛ ٣) رواج ندارد، رایج نیست.

**ناچیز:** خوێڕی، ناجسن ف بی‌همه‌چیز.

**ناچیزە:** ژنێ کە لە فەرمانی شوو سەرپێچی دەکا ف زن ناشزه.

**ناچین:** ١) پێچەوانەی دەچین؛ ٢) بێ شباندن بە بەکتر بین: (ئێمە وەك یەك **ناچین**) ف ١) نمی‌رویم؛ ٢) بی‌شباهتیم.

**ناحاواو:** ١) بزۆز، بێ‌ئارام؛ ٢) کەسێ کە لە سازان و تەبایی دڕدونگە ف ١) عجول، ناآرام؛ ٢) ناسازگار.

**ناحەز:** ١) بێبەش لە جوانی و خوشیکی؛ ٢) دوژمن ف ١) نازیبا؛ ٢) دشمن.

**ناحەزی:** ١) بێبەشی لە جوانی؛ ٢) دوژمنایەتی ف ١) بدگلی؛ ٢) دشمنی.

**ناحەساو:** ١) سەرجەوت؛ ٢) قسەی نابەجێ ف ١) بدحساب؛ ٢) سخن نامقبول.

**ناحەساوی:** ١) سەرجەوتی؛ ٢) قسەی بێ‌جێ ف ١) بدحسابی؛ ٢) سخن لاطایل.

**ناحەسڵ:** رەسەن‌خراو، ناجسن ف بدگهر.

**ناحەسێ:** بە ناگا نابە ف احساس نمی‌کند.

**ناحەسێبی:** ناحەساوی ف نگا: ناحەساوی.

**ناحەسێتەوە:** لە ئاسوودەبی بێبەشە ف نیاساید.

**ناحەسێوی:** ناحەساوی ف نگا: ناحەساوی.

**ناحەق:** پێچەوانەی حەق و ڕەوا، زوڵم ف ناروا.

**ناحەقی:** زوڵم ف ستم.

**ناحەونێ:** بە هیچی دانانێ ف به هیچ نمی‌شمارد.

**ناحیە:** مەڵبەند، بەشێ لە سەرزەمینی چەند ئاوابی ف ناحیه، منطقه.

**ناخ:** ١) زۆرەوەی هەرشتێ، ناوەڕۆك: (بە **ناخی** عەرزا چوو)؛ ٢) جێگە، لان؛ ٣) دەریای زل ف ١) ناف، عُمق، درون؛ ٢) جای؛ ٣) دریای مُحیط

**ناخا:** بەزەوبدا نادا، پێچەوانەی فرێ دەدا: (بارەکە **ناخا**) ف نمی‌اندازد.

**نۆکان:** دەنگی برەبرە لەگەروُهاتن بۆ سەرەتای گریان ف صدای بر بده از گلو برآمدن برای شروع گریه.

**نۆکاندن:** نۆکان ف نگا: نۆکان.

**نۆکاو:** شۆرباونۆك ف آش نخود.

**نوکتە:** حەنەك. قسەی پێکەنین ف جوك. لطیفه.

**نوکتەباز:** حەنەکچی. قسەخۆش ف لوده.

**نوکر:** کەندەکاری لە بەردو دار ف کنده کاری برسنگ و چوب.

**نوکرانـدن:** ١) کەنـدن لە دارو بەرد: ٢) بیرازکـردن: (بەریێ نیشێ مە نوکـرانـد) ف ١) کنـده کاری کردن بر چوب و سنگ: ٢) زبرکردن سنگ آسیاب سابیده.

**نوکروسك:** ویژنگی زل ف خمیازهٔ بزرگ.

**نوکل:** نکل، دندوك ف منقار.

**نۆکل:** دەفری سوالەتی تازە لەکلدەرهاتگ ف سفال نو از کوره درآمده.

**نوکم:** نکاو، گزوگومەت. لەپڕ ف بکهو، ناگهانی.

**نۆکن:** کەسێ کە زۆر نۆکەنۆك دەکا ف کسی که زیاد نك و ناله می کند.

**نوکوج:** خل. خلی، خڕ، بۆچك بەقالب ف کوچکتر از قالب.

**نوکوج کردن:** خلەخل کردن، خڕەخڕکردن ف صدای لق دادن.

**نوکوچەك:** خلەخل کەر، خڕەخڕکەر ف لق زدن.

**نوکـورتـە:** ١) ئەسپـابی لەدارکـەنـدن: ٢) نفورج، سبخورمە ف ١) ابزارکنده کاری بر چوب: ٢) سقلمه.

**نوکۆل:** ١) نکۆل: ٢) دندوك ف ١) پشیمان از قول: ٢) منقار.

**نوکۆلی:** نکۆلی ف پشیمانی از قول.

**نوکە:** تها، نهو، نیسە، نیسنا، لەجێ، هەنوکە، ئابیسە ف اکنون.

**نۆکـە:** ١) نکەنك، نۆك: ٢) نیسنێ، لەجێ: (**نۆکە** لفربو) ف ١) نك و ناله: ٢) اکنون.

**نۆکەبڕین:** بێدەنگ کردن ف بی صدا کردن.

**نۆکەتەشی:** تێلـی سەرجەمێنراوی نـاو سەرەتەشـی ف میخ نیم حلقهٔ سردوك.

**نۆکەحۆلە:** نۆکی درشت ف نخود درشت.

**نۆکەر:** خزمەتکار، خولام ف نوکر.

**نوُکەر:** نۆکەر ف نوکر.

**نۆکەراتی:** خولامی، خزمەتکاری ف نوکری.

**نۆکەرایەتی:** نۆکەرانی ف نوکری.

**نۆکەرەشکە:** جۆرێ نۆك کە رەنگی رەشە ف نخود سیاه.

**نۆکەری:** نۆکەرانی ف نوکری.

**نۆکەزۆردە:** فەربکەنۆك ف نخود دلمل.

**نۆکەسپی:** جۆرێ نۆك کە دەکرێتە لەبلەبی ف نوعی نخودکه نخودچی شود.

**نۆکەسپیکە:** نۆکەسپی ف نگا: نۆکەسپی.

**نۆکەسپیلکە:** نۆکەسپی ف نگا: نۆکەسپی.

**نۆکەشوانە:** نۆکەکێوبلـە کە رەنگـی رەشـە ف نوعـی نخود وحشی سیاه‌رنگ.

**نۆکەل:** نۆبەند ف گاو نرسه‌ساله.

**نۆکـەن:** شەقـەجـۆگەی زل بۆ تێکەڵاوکردنەوەی ئاوی دو سەرچاوەی لێك‌دوور ف کانال.

**نۆکەند:** نۆکەن ف نگا: نۆکەن.

**نۆکەنۆك:** نۆکە. گریانی بەناڵاندنەوە: (وەك چاوی وسکەسۆفی بە کانی لە دارو بەرد/ دەردێن بەسەد تەزەنتۆم و گریان و **نۆکەنۆك**) «نالی» ف گریهٔ توأم با ناله. گریه و زاری.

**نۆکەنیا:** سەرنیا، دەمەزەرد ف نرمیم نوك گاوآهن.

**نۆکیسە:** تازەپێداکەوتو، نۆبەخت، تازەکیسە ف نوکیسه، تازه به دوران رسیده.

**نۆکێ کەسك:** بۆڵکە، گاگۆز ف نخود فرنگی.

**نۆگن:** بەرکەل، جێلی سێ‌ساڵە ف ماده‌گاو سه‌ساله.

**نوگوم:** نگوم ف ١) نگون: ٢) غرقه.

**نۆگە:** ١) نۆب، نۆبە، نۆرە: ٢) نای زۆژنازۆژە: ٣) گەمەو دەس‌بازی ف ١) نوبت: ٢) تب نوبه: ٣) شوخی و دست بازی.

**نۆگها:** تازەجوان، تازەلاو، جحێل ف نوجوان.

**نۆگەبڕکێ:** نۆبەبڕی ف رعایت نکردن نوبت.

**نۆگەچی:** نۆبەدار، نێشك‌گر ف پاسدار، نگهبان.

**نۆگەن:** نۆبەند. گای سێ‌ساڵە ف گاوسه‌ساله.

**نۆگین:** جێلی سێ‌بەهارە، مانگای سێ‌ساڵە ف ماده‌گاو سه‌ساله.

**نول:** ناکار، ئەخلاق ف رفتار، خلق و خوی.

**نۆل:** نول ف رفتار، مشی.

**نۆل:** لوس و ساف. دەگەڵ نەرم دەگوترێ: (ژوشك بە بێجوی خۆی دەڵێ نۆخەی زۆڵە نەرم و **نۆڵە**کەم) ف نرم. مقابل زبر.

**نۆلا:** جەشنی، وەکی، چون، وەکو ف مانند، مثل.

**نۆلانی:** چون‌بەکی، لێك‌چوون ف شباهت.

**نۆلچکـە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی ویرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**نۆلکێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نۆلەم:** نخری، نخوری، نۆزگە، نۆسکە، نۆبەرە ف نخستین فرزند.

**نۆم:** ناو، نام، ناف ف نام، اسم.

**نوما:** نما: (قبیلە**نوما**) ف نمایانگر.

**نۆما:** جوانوئەسپی دوساڵە ف کُرّه اسب دوساله.

**نۆماڵ:** ١) کەسێ تازە ژن و ماڵی پێکەوەناوە: ٢) کەسێ تازە ماڵی هاتۆتە ناوابی ف ١) تازه متأهّل شده: ٢) تازه در آبادی ساکن شده.

**نومتش:** وەشاردن، شاردنەوە ف پنهان کردن.

**نۆمدار:** ناودار، بەناوبانگ ف نامدار، مشهور.

**نۆمسڵمان:** نۆبسڵمان ف نومسلمان.

**نۆموسوڵمان:** نۆمسڵمان ف نومسلمان.

**نۆمە:** ناو، نێو، ناف ف اسم.

**نۆمەتش:** لارکردنەوە، خوارکردنەوە ف کج کردن.

**نۆمینه**: ۱) رۆژی عارەفە. رۆژێ بەر لە جێژنی قوربان؛ ۲) مانگی قوربان ف ۱) نهم ذبحجّه. روز عَرَفه؛ ۲) ماه ذیحجّه.

**نۆن**: ۱) نخوٚن؛ ۲) نان؛ ۳) کەمایەسی و عەیب: (**نۆن** لە چاوی من دا بێ لەودا نیه)؛ ۴) ناوی پیتێ لە ئەلف و بێنکەدا؛ ۵) هوٚرترین شت ف ۱) نگون؛ ۲) نان؛ ۳) کاستی و نقص؛ ۴) نام حرف «ن» در الفبا؛ ۵) ذرّه.

**نۆنیەتی**: نان‌خاڵی. نانی بنەرسی ف نان نهی.

**نونجك**: مست، مشت، پەنجەی قوچاو ف مُشت.

**نۆنجگ**: نونجك ف مُشت.

**نونگ**: شوێن. شوٚپ ف اثر، رد.

**نونگه**: سۆراغ. سۆسە ف سرنخ از خبر.

**نونگه**: دڵخۆش ف سرحال. دلخوش.

**نونو**: تازەتازە. زۆرتازە. بۆ جلکی دەڵێن ف بسیار تازه.

**نونۆ**: دانو. دانەوێڵەی کوڵاو بە زمانی منالانە ف حبوب آب‌پز در زبان کودکانه.

**نونۆڵه**: زەلامێ کە ناکاری منالانە دەکا ف بزرگی که ادای بچه‌ها را درمی‌آورد.

**نۆنه**: نۆنۆ. دانۆڵە. دانۆ ف نگا: نونۆ.

**نونەر**: بریکار. وەکیل ف وکیل.

**نۆنەڵ**: ینبادەمی گردەڵی وریا ف قدکوتاه زرنگ.

**نۆنەمام**: خەڵفی تازەی بەکساڵە ف نونهال.

**نۆو**: نۆ. هەشت‌وبەك ف عدد نُه.

**نووازه**: کاری پیغەمبەران کە لەدەس کەسی‌تر نایە ف مُعجزه.

**نۆوه**: نۆرە. نۆبە ف نوبت.

**نۆوەن**: نۆبەند. نۆکەڵ ف گاو نر سه‌ساله.

**نۆوەند**: نۆبەند ف گاو نر سه‌ساله.

**نوهـ**: ۱) نو. تازە؛ ۲) نۆکە. ئێستێ. ئێستەکێ ف ۱) نو؛ ۲) اکنون، حالا.

**نوها**: نۆکە. نوهـ ف اکنون.

**نوهال**: دۆڵ. شیو. دەرە ف درّه.

**نوهانی**: تازەکار. زانەهاتوو هێشتا لەکار ف ناشی.

**نوهت**: ۱) خەفنـان. دەغڵی درەنگ‌چێنراو؛ ۲) کونی کرد. سمی ف ۱) بذر دیرکاشته شده؛ ۲) سوراخ کرد.

**نوهتن**: سمین. کون‌کردن بە مەتکەو با درێنە ف سوراخ کردن، سُنبیدن.

**نوهتی**: سماو. کون‌کراو ف سوراخ شده.

**نوهژەن**: نۆژەن ف نگا: نۆژەن.

**نۆهك**: نۆك. نخە. نخۆ ف نخود.

**نۆهگوان**: دامنەچەفان. بەرکەڵ ف ماده گاو سه‌ساله.

**نۆهگۆن**: بەرکەڵ. مانگای سێ‌ساڵە ف ماده گاو سه‌ساله.

**نوهلیك**: دۆشەگ ف نشك.

**نوەن**: نۆبەند. جوانەگای تازەبەرجووت ف گاونر سه‌ساله.

**نوهۆ**: ۱) نۆهك. نخە. نۆك؛ ۲) نوها. نۆکە. ئێستا ف ۱) نخود؛ ۲) اکنون.

**نوهـۆم**: ۱) قات لە خانـو. تەبەقە؛ ۲) زگ‌دانی دیوار: (دیوار **نوهۆمی** هێنـاوە) ف ۱) اشکوبه. طبقهٔ ساختمان؛ ۲) برآمدگی دیوار. شکم دادن دیوار.

**نۆهۆنه**: ۱) خانوی نوێ. خانوی تازە؛ ۲) نۆماڵ ف ۱) خانهٔ نو؛ ۲) نگا: نۆماڵ.

**نۆهەت**: نۆت. نۆد ف عدد نَود.

**نۆهەم**: دوزمارە دوای حەوتەم ف نُهم.

**نۆهەمین**: دوان پاش حەوتەمین ف نهمین.

**نۆهەوار**: ۱) تازەئێلاخ. شوێنی نوێ لەزۆزان؛ ۲) ماڵی تازە هاتینە رۆژامان ف ۱) ییلاق نوین؛ ۲) تازه به ییلاق آمده.

**نوەن**: نۆبەند. گای تەمەن سێ‌ساڵە ف گاوسه‌ساله.

**نوەی**: نۆك. نخە. نخۆ. نۆهك ف نخود.

**نوهی**: تازەیی. نوێبەنی ف تازگی.

**نۆهیڤ**: مانگی لەنوێ. مانگی یەکشەوە ف هلال.

**نوهێل**: نوهال. شیو. گەلی. دەرە. دۆڵ ف دره.

**نۆهێلکه**: مریشکێ تازە دەستی بەهێلکەکردن کردبێ ف مرغ تازه تخمگذار.

**نوهین**: تازە. نفت‌ونەو ف نوین.

**نۆی**: پێچەوانەی بڵند. نزم. نمز ف پست. کم ارتفاع.

**نوێ**: نوٚ. تازە ف نو.

**نوێ**: نوێ. تازە. نوٚ ف نو.

**نوێرد**: تەقەڵ. باقیە ف بخیه.

**نوێرده**: فەراغ دادروونی لێوی لیباس ف کنارهٔ جامه را تاکردن و دوختن.

**نوێژ**: نما. نماز. نمێژ. مێژ ف نماز.

**نوێژان**: بەر لەخۆرکەوتن ف قبل از طلوع آفتاب.

**نوێژبوون**: کاتی نمێژ گەیشتن: (بزانه بزانە **نوێژبوه**؟) ف وقت نمازآمدن.

**نوێژبەقەلاگێرانەوه**: نوێژقەلاکردن ف نگا: نوێژقەلاکردن.

**نوێژچواندن**: نوێژ دەوەختی خۆی‌دا بەجێ‌نەهێنان ف نماز را به موقع نخواندن.

**نوێژچوون**: دەمی نمێژ فەوتان ف وقت نماز گذشتن.

**نوێژخوێن**: نوێژکەر. کەسێ کە نوێژ بەجێ‌دێنێ ف نمازگزار.

**نوێژخوێندن**: نمێژ بەجێ‌هێنان ف نمازگزاردن.

**نوێژدان**: مزگەوت: (پڕ وەم **نوێژدانە** رەحمەت بۆ باوات) ف مسجد.

**نوێژقایم**: کەسێ کە نوێژی ناچێ ف نمازگزار دائمی.

**نوێژقـەلاکردن**: نوێژی جوێ کردنەوە. فەرەبوکردنەوەی نوێژی فەوتاو بە نوێژ ف نماز گذشته را قضا کردن.

**نوێژقەلاکردنەوه**: نوێژقەلاکردن ف نمازگذشته را قضا کردن.

**نوێژکردن**: نمێژ بەجێ‌هێنان. نوێژخوێندن ف نمازگزاردن.

**نوێژکەر**: نمێژکەر. نوێژخوێن. کەسێ کە نوێژ بەجێ‌دێنێ ف نمازگزار.

**نوێژگه**: مەجیت. مزگەوت ف مسجد.

**نوێژگێرانەوه**: نوێژقەلاکردن ف نماز گذشته را قضاکردن.

**نوێژنەکەر**: پێچەوانەی نوێژکەر. کەسێ کە نوێژ بەجێ‌ناهێنێ ف نمازنگزار.

**نوێژورۆژوپاك**: بریتی لە مرۆی زۆر بەدین و موسوڵمانی چاك ف کنایه از

متدیّن.

**نویژەبارانە:** نمیژ بۆ باران بارین لە نیشکە ساڵدا ف نماز باران.

**نویژەبارانی:** نویژەبارانە ف نماز باران.

**نویژی:** پاك و خاوێن: (جلکەکانم نویژین، ئەم بەرەیە **نویژبە**) ف هرچیز پاکیزه و شایان نماز با آن گزاردن.

**نویژبان:** بەر لەناوکەوتن، نویژان ف قبل از طلوع آفتاب.

**نوێس:** نۆس ف نگا: نۆس

**نوێسان:** نوێسین ف نوشتن.

**نوێسگە:** نوێسگە ف دفترخانە، جای نوشتن.

**نوێسنە:** نوێسەر، نڤیسار ف نویسندە.

**نوێسین:** نوێسان، نوێسین ف نوشتن.

**نوێشك:** تێلیشك، روونەکەرە ف کره.

**نویشك:** سنبلاوك ف پنیر مایهٔ حیوانی.

**نوێ کردنەوە:** ١) کۆن تازە کردنەوە؛ ٢) لەسەرڕا دەستپێ کردنەوە: (سەرەکەی **نوێ کردەوە**) ف ١) کهنه را تازه کردن؛ ٢) ازسر گرفتن.

**نوێ کرن:** نوێ کردنەوە ف نگا: نوێ کردنەوە.

**نویگن:** دامنەچەقان، بەرکەل، نۆهگوان ف مادە گاوسە ساله.

**نویگوان:** نویگن ف مادە گاو سەساله.

**نویل:** باری، لۆسە، مەلغە ف اَهرُم.

**نوبلدان:** بەلۆسە بزواندن ف با اهرم حرکت دادن.

**نوێ مانگ:** سەری مانگی تازە ف اوّل ماه.

نوین: نڤین ف رختخواب.

**نوێن:** ١) نما: (ئاوێنەی **بالانوێن**)، شاندەر؛ ٢) نڤین، کەلوپەلی خەو، پێخەف؛ ٣) تازە، نوێ: (**نوێنگوێن**)؛ ٤) بەرکەل ف ١) نما: ٢) رختخواب؛ ٣) نو؛ ٤) مادە گاو سەساله.

**نوێن:** گونجە، گونگە ف نتبوسه.

**نوێنك:** ناوێنە، گوزگی، تودیك، عەینك ف آیینه.

**نوێنك:** ١) نوێنك؛ ٢) نینگون ف ١) آینه؛ ٢) مادە گاو سەساله.

**نوێنگون:** نویگن ف مادە گاو سەساله.

**نوێنگوێن:** نویگن، دامنەچەقان، نۆهگوان، بەرکەل، نویگوان ف مادە گاو سەساله.

**نوێنگین:** نویگن، میگوان ف مادە گاو سەساله.

**نوێ نمەك:** نیوەنمەك، هەویری نامادە بۆ برین ف خمیر ویژه زخم و ضرب‌دیدگی.

**نوێنە:** بریکار، نایب ف نماینده.

**نوێنە:** نوێنە ف نماینده.

**نوێنەر:** ١) بریکار؛ ٢) شتێ کە پیاو دەخەوێنێ ف ١) نماینده؛ ٢) خواب‌آور.

**نوێەك:** لە نۆپاژ بازێك ف یك نهم.

**نوێەم:** نوهەم ف نهم.

**نوێەمین:** نوهەم ف نهم.

**نوبی:** دزی، شەڕفرۆشی ف ستیزه‌جویی.

**نوبین:** دژایەتی، دژمنی ف دشمنی، ضدیّت.

**نە:** بلوێر، نای، بلوور، بلول ف نی لبك.

**نە:** ١) لە، دە، وشەی دەفرایەتی بە: (**نەتوی** دەروون‌دا)؛ ٢) پێچەوانەی ئا، ئا؛ ٣) بێژی پرسیار: (**نە** ولۆبە؟) ف ١) در، علامت ظرفیّت؛ ٢) نه، مقابل آری؛ ٣) کلمهٔ پرسشی.

**نەء:** نە، نا، ناو، نۆ، نوو، پێچەوانەی ئا ف نه، کلمهٔ رد.

**نەئا:** نەء ف نه.

**نەئا:** نەئا، نەء ف نه.

**نەئاژۆتی:** نەکێڵدراو ف شخم نزده.

**نەئال:** ١) نەرانی، شەڕفرۆش، نورەونوسن؛ ٢) بەئاژاوە ف ١) ستیزه‌جو؛ ٢) مُفتن.

**نها:** ١) نوها، نوکە، نیستە؛ ٢) نوا، پێشەوە؛ ٣) دابنا، دابنیا، دانی؛ ٤) نوك، نخە ف ١) اکنون؛ ٢) جلو، پیش؛ ٣) گذارد، گذاشت؛ ٤) نخود.

**نهار:** شیوەن، چەمەرە ف شیون.

**نهال:** نوهال، شیو، دەرە، دۆڵ ف وادی، درّه.

**نهالی:** پەلاس، بەرەی سادەو کەم‌قیمەت ف گلیم ارزان قیمت.

**نهام:** ١) نهۆم، قات؛ ٢) چین، تەبەق ف ١) طبقه، اشکوبه؛ ٢) چین.

**نهاندن:** برێنی لە نیلاقەکردن ف کنایه از مُجامعت.

**نهانی:** ١) نقانی، کاری قوڕەکاری، بەنایی؛ ٢) جێگەی سانەوەو نیسراحەت ف ١) گِلکاری، بنّایی؛ ٢) جایگاه آسودن.

**نەهایەت:** بڕانەوە، دوایی ف پایان.

**نەبا:** ١) نەبوایە؛ ٢) نەوەکا ف ١) نمی‌بود، اگر نبود؛ ٢) مبادا.

**نەبات:** جۆرەشەکرێکی میناییڕەنگە ف نبات.

**نەباتی:** بەڕەنگی نەبات ف بەرنگ نبات.

**نەبادا:** مەبادا ف مبادا، نکند.

**نەبار:** ١) نالەبار؛ ٢) نیشکەساڵ: (لەچاوا نم نەما بۆ گریە بۆ نورەی سەجدە بەردەربە/ سباساڵم **نەبارە** نوێژی ئیستیسقا نەکەم چبکەم؟) «مەحوی» ف ١) نگا: نەبار؛ ٢) خشکسال.

**نەباش:** خراپ: (نەف مرۆیەکە **نەباش**) ف بد.

**نەبالغ:** نابالغ، خۆنەناسیو ف به سن رشد نرسیده.

**نەبان:** ١) شیردەرێ کە بێجوی خۆی ناوێ و شیری نادانێ؛ ٢) برێنی لە کەسێ کە دەنگی لە بەکێ گۆڕبوە: (کاکم لیمان **نەبانە** نامان‌دوێنێ)؛ ٣) بەدمیجاز، هەمیشە تەڵس و نورە ف ١) دامی که از بچهٔ خود تنفّر دارد؛ ٢) کنایه از بیگانگی کردن آشنا؛ ٣) بدخلق، عصبانی.

**نەبانوك:** خۆبویر لە کار، خۆ وەشێر لە ئەرك ف از زیرکار دررو.

**نەباو:** ١) ناباب، پێچەوانەی داموەدەستوور؛ ٢) برێنی لە بەدفەڕو بیژی ف ١) ناباب؛ ٢) کنایه از بدطینت بی‌پدر.

**نەبڕ:** ١) کول: (ئەم تەورە **نەبڕە**)؛ ٢) پیاوی کارلەدەست نەهاتوی بێ‌بڕشت ف ١) کُند؛ ٢) آدم سُست کار.

**نەبڕی:** بەردەوام، بێ ئەوجوون ف پاینده.

**نەبڕی:** نابەجێ، نارەوا ف ناروا.

**نەبز:** نل‌دانی رەگ، لێدانی رەگ ف نبض.

**نەبـگ:** میوەی داری کنـار کە لەگوێزەزەردە دەکاو درشت ترە ف میوۀ درخت سدر.

**نەبناف:** بۆرەبباگ، بێدەنگ‌وناو ف گمنام.

**نەبـو:** ۱) هیچ نا: (خـوا ئیمـەی لە **نەبـو** دروست‌کرد)؛ ۲) رابوردوی نەسـوون: (جم بی نەبو)؛ ۳) نەگەیشتو: (تریکەم هێشتا **نەبوە**) ف ۱) عدم، مقابل وجود؛ ۲) ماضی نبودن، نبود؛ ۳) میوهٔ نارسیده و کال.

**نەبوون:** ۱) هیچ نا، نەبو؛ ۲) فەقیری بێ‌مالی: (دەردی **نەبوون** ناخۆشە) ف ۱) نیستی؛ ۲) ناداری، فقر.

**نەبوونی:** فەقیری، دەستەنگی ف ناداری.

**نەبە:** ۱) حاشا؛ ۲) فەرمان بە نەبردن؛ ۳) پەند بۆ نەبوون: (زۆرد **نەبە**) ف ۱) انکار؛ ۲) مَبَر؛ ۳) مَباش.

**نەبەرد:** ئازا، رەشید، بەکار ف دلیر.

**نەبەز:** ۱) کۆڵ‌نەدەر؛ ۲) شل‌وسست لە ڕاکردنا ف ۱) نستوه؛ ۲) ناتوان در دویدن.

**نەبەکام:** ۱) ناکام، کاو نازەوا؛ ۲) میوەی نیوەگەیشتوی هێشتا نیوەکاڵ ف ۱) ناکام؛ ۲) میوهٔ خوب نرسیده.

**نەبەکۆ:** ۱) نەوەکو، نەکا؛ ۲) ناوانەبێ ف ۱) مبادا؛ ۲) این طور نباشد.

**نەبەگە:** شل‌وۆل، خۆنەگرتو ف سُست و نااستوار.

**نەبهیست:** کەڕ، نەبیس، گوێ‌کپ ف ناشنوا، کرّ.

**نەبی:** ۱) نەبـو؛ ۲) پێغـەمبـەر؛ ۳) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) نبود؛ ۲) نبی، پیامبر؛ ۳) نام مردانه.

**نەبێ:** ۱) بوونی لەبـەین‌بچێ؛ ۲) تمـەن، توەمـەیزە؛ ۳) قسە مەکە ف ۱) نباشد؛ ۲) تونگو؛ ۳) حرف نزن.

**نەبیس:** ۱) گوێ‌نەگر، لاسار؛ ۲) کەڕ، گوێ‌نەبیس ف ۱) حرف نشنو، لجباز؛ ۲) ناشنوا، کرّ.

**نەبیاوا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**نەبیست:** نەبیس ف حرف نشنو.

**نەبین:** ۱) جاوپرۆش؛ ۲) بیوار، نادیار، نەدیو ف ۱) کم‌بین، کم دید؛ ۲) غیب.

نەبینا: کوێر، کوێر، بێ‌چاو ف نابینا.

**نەبینە:** بێ‌دیتن: (وەرە با کەس **نەبینە** بکەبن) ف بدون دیدن.

**نەبا:** لەفەوتان نزیك ف ناپایدار.

**نەباتی:** نەکولاو، هەرکاڵ ف ناپخته.

**نەباخ:** مۆشەدەمەی ئاسنگەر ف دم آهنگران.

**نەباخچی:** کەسێ کە بەنەباخ کاردەکا ف کسی کە با دم کار می‌کند.

**نەپاك:** ۱) جەپەڵ، گەمار، پیس؛ ۲) برێتی لە فێڵبازو دووڕوو ف ۱) کثیف؛ ۲) کنایه از مکّار.

**نەپابی:** بێ‌ئاگادار، بێ‌چاودێری کەر ف بدون محافظ.

**نەپخاندن:** ۱) فوودان، پفت‌ێ‌کردن؛ ۲) برێتی لە ناربف‌کردن بەدرۆ ف ۱) پُف کردن؛ ۲) کنایه از مدح دروغین گفتن.

**نەپشت نەزك:** بێ‌بەروپشت، برێتی لە نازاست و دووڕوو ف کنایه از دورو و منافق.

**نەپوختە:** نەکولاو ف ناپخته، خام.

**نەپۆز:** نالەبار، نازێك ف ناهموار.

**نەپۆزیان:** نازێکی و نالەباری ف ناهمواری و به کار چیزی نیامدن.

**نەپەخەك:** فوودرباگ، پەنەماوبەبا ف بادکرده.

**نەپەرۆشك:** ۱) چرنوکی مەلی ڕاوکەر؛ ۲) نچیری مەلی ڕاوکەر ف ۱) جنگال پرندهٔ شکاری؛ ۲) نخجیر پرندهٔ شکاری.

**نەپەلولە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**نەپەندن:** شاردنەوە، گومکردن لەبەرچاوان ف پنهان کردن.

**نەپەندی:** نادیار، نهێنی ف ناپیدا، غیب.

**نەپەنی:** نادیار، گوم لەبەرچاو ف ناپیدا.

**نەپیاو:** ۱) ناپیاو، نامـەرد؛ ۲) پیاوێ کە توانای گان‌کردنی نەبێ ف ۱) نامرد؛ ۲) مردی کە توان جنسی ندارد.

**نەپێژاندی:** نەکولاو، نەبرژاو ف کال، ناپُخته.

**نەپێکهاتی:** پێك‌نەهاتوو، نامادەنەکراو، جێ‌بەجێ‌نەکراو ف مُهیّا نشده.

**نەتـــاشـــراو:** ۱) داری تیخ‌لێ‌نەدراو؛ ۲) برێتـی لە بنیادەمی کەم‌فام‌و بەروەردەنەکراو ف ۱) ناتراشیده؛ ۲) کنایه از آدم زمخت و کم فهم.

**نەتاشیاگ:** نەتاشراو ف نگا: نەتاشراو.

**نەتاشیاو:** نەتاشراو ف نگا: نەتاشراو.

**نەتانین:** نەتوانین، لەتاقەتدا نەبوون ف نتوانستن.

**نەتـر:** ۱) رەت، نەکـان، بزاو؛ ۲) مات‌و بێدەنگی ف ۱) تلو، تکـان؛ ۲) خاموشی و سکون.

**نەتراندن:** ۱) بزاوتن، رەت‌پێدان؛ ۲) بێدەنگ‌و جوڵەکردن ف ۱) تکان دادن؛ ۲) ساکت ماندن و حرکت نکردن.

**نەترس:** بوێر، ئازا، گەزناس ف نترس.

**نەترك:** پرپرەو پەرەنگی زەنبەر بەجەشنی مانگیلە: (پەیوەستە ژوەسلێ نە دمـینم کو سەراسـەر/ بشکـوژو نەلبسم‌و وەرەق‌و **نەتـرك**‌و بازن) «جـزیری»، (کـوفی زجـەواهیران موکـەللەل/ کوتـەرگە **زنەترکان** موسەلسەل) «خانی» ف یکی از زیورآلات.

نەترنایش: لەژێر چاوەدێری گیرار ف تحت نظر.

**نەتوش:** تەوەزەل، نەمەڵ ف تنبل.

**نەترە:** ۱) غیرەتی دڵ، قەوەتی دەروون؛ ۲) رەت، تل، تەکان ف ۱) جرأت؛ ۲) تکان.

**نەترەبردن:** ۱) زراوبردن، ترساندن؛ ۲) رەت‌بردن ف ۱) زهره‌ترك کردن؛ ۲) تلوخوردن.

**نەترەبۆق:** زەبەلاحی تەزە ف لندهور.

**نەترەدان:** رەت‌بردن ف تکان خوردن.

**نەتشت:** نەهیچ ف ناچیز.

**نەتك:** ۱) ڕێگەی سەنگ فەرش؛ ۲) ڕێگەی پیادە لە جادەو خیاباندا ف ۱) راه سنگ‌فرش؛ ۲) پیاده‌رو.

**نەتل:** دوژمن، نەیار، دز ف دشمن.

**نەتڵ:** ١) ملۆزم؛ ٢) لەرێگەدەرچوگ [ف] ١) سهمناك: ٢) منحرف.

**نەتم:** ١) كانی، نامانەتی، نەبەبەكجاری: ٢) كەمقسە [ف] ١) موقتی: ٢) كم سخن.

**نەنوُ:** بەدفەڕ، ناكارخراپ [ف] بداخلاق.

**نەتۆرە:** نانۆرە [ف] لقب زشت.

**نەتوُرە:** لەسەرخۆ، هێدی، هێمن [ف] آرام، شكیبا.

**نەتوتشت:** بێكەڵك، هیچ‌وپوُچ [ف] بی بهره.

**نەتوكەس:** نامەرد، ناكەس، خوێڕی، خۆری [ف] نامرد.

**نەتوهاوە:** كاری نالەبار، كردەی ناحەز [ف] كار زشت.

**نەتــە:** ١) شوُكراوی نامادەی چاندن: ٢) خەڵەی تازەشین بوُگ [ف] ١) زمین شخم‌زدهٔ آمادهٔ كشت: ٢) غلّهٔ تازه‌روییده.

**نەتەكن:** بفە، جێ‌مەترسی، هیلاك. فەلاكەت [ف] خطرناك.

**نەتەل:** دوژمن، دژ [ف] دشمن.

**نەتەڵە:** مرۆترسێن [ف] ترساننده.

**نەتەوایەتی:** كەلابەنی، فەومابەنی [ف] ملّیّت.

**نەنەوە:** ١) نۆرەمە، رەگەز: ٢) فرزەندی فرزەند [ف] ١) نژاد، نسل: ٢) نواده.

**نەتەوەپەرستی:** كاركردن بۆ فازانجی گەل [ف] ملّت‌خواهی.

**نەتەوی:** دوژمن، دژ [ف] دشمن، ضدّ.

**نەتەوێ:** ١) داوا مەكە: ٢) قبوُڵ مەكە [ف] ١) نخواه: ٢) نپذیر.

**نەتیجە:** ١) ناكام، حاسڵی شتێ: ٢) مناڵی نەوە [ف] ١) نتیجه: ٢) فرزند نوه، نبره.

**نەتیدا:** بەدەر، رەگەڵ‌نە [ف] مردود، قبول نشده در گروه.

**نەتێر:** هەژار، برجی، دەس‌كورت [ف] بینوا، مُحتاج.

**نەتبژە:** مناڵی نەوە [ف] نبیره.

**نەتێو:** لەسەرنەكراو، نەلێ، وەرنەگیراو [ف] قبول نشده در گروه.

**نەجابەت:** ناكاری باش‌و پیاوانە [ف] اخلاق پسندیده و مردانه.

**نەجات:** رزگار [ف] نجات.

**نەجــاتبوُن:** ١) رزگاربــوُن: ٢) تەواوبــوُنی كار: ٣) تەواوكردنی كار: (لــەدروێنەی **نەجاتم‌بو**) [ف] ١) رها شدن، آزاد شدن: ٢) پایان یافتن كار؛ ٣) فارغ شدن از انجام كار، به پایان رسانیدن.

**نەجــاتدان:** ١) رزگاركــردن: ٢) تەواوكردنی كار [ف] ١) نجات دادن، خلاص كردن: ٢) كار را تمام كردن.

**نەجاخ:** نەوروكە، نەوری بچوُك [ف] نیر كوچك.

**نەجار:** دارتاش [ف] درودگر.

**نەجاو:** بێ هێنان‌و بردن لەناو دەم‌و ددانا [ف] ناجو بده.

**نەجاو باگ:** نەجاو [ف] ناجو بده.

**نەجاو یاو:** نەجاو [ف] نجو بده.

**نەجدی:** ئەسپی كلك قەبچی‌كراو [ف] اسب دم قیچی شده.

**نەجف:** بێ‌بزوتن [ف] بی حركت.

**نەجم:** نەجف [ف] بی حركت.

**نەجمە:** ١) ئەستێرەی سەرشانی ئەفسەر؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان، سوُكەڵەی نەجمەدین [ف] ١) ستارهٔ سردوش افسران: ٢) اسم مردانه.

**نەجوُراو:** نەجاو [ف] ناجو بده.

**نەجیەلاندی:** ١) منت‌ومال نەدراو؛ ٢) خۆرست، خۆكرد [ف] ١) صیقل ندیده: ٢) طبیعی.

**نەجیب:** ١) رەســەن: ٢) ناكــاربــاش [ف] ١) نجیب، اصیل: ٢) خوش اخلاق، نیكو رفتار.

**نەجیبزادە:** رەسەن [ف] نجیب‌زاده.

**نەجیبزابە:** نەجیب‌زادە [ف] نجیب‌زاده.

**نەجیم:** نەجیب [ف] نجیب.

**نەجیمزادە:** نەجیب‌زادە [ف] نجیب‌زاده.

**نەجیمزابە:** نەجیب‌زادە [ف] نجیب‌زاده.

**نەجیو:** نەجیب [ف] نگا: نەجیب.

**نەچار:** ناچار [ف] ناچار.

**نەچڵیان:** راست‌نەهاتن، دروست دەرنەچوُن [ف] دُرُست درنیامدن.

**نەچی:** ١) وشــەی ئاگاداركــردن بۆ گێڕانەوە لە كارێ: (**نەچی** ئەوكارە بكەی)؛ ٢) لە رۆیشتن دەست‌بەردە [ف] ١) نكنی!: ٢) نروی.

**نەچێ:** ١) نەڕوا، نەچێت؛ ٢) خراپ‌ونالەبار [ف] ١) نرود: ٢) زشت و ناپسند.

**نەچیر:** نچیر [ف] نخجیر، شكار.

**نەچیرڤان:** نچیرڤان، راوكەر [ف] شكارچی.

**نەحس:** شوُم، بێ‌فەڕ [ف] شوم.

**نەحلەت:** لەعنەت [ف] نفرین، لعنت.

**نەحەلی:** رامەكە، غارمەدە [ف] مدو.

**نەخ:** داوەبەنی خوری [ف] نخ پشمین.

**نەخازا:** ناوازە، خاسما، نایبەنی [ف] و بەویژه.

**نەخازە:** ١) ناوازە، بەتایبەت: ٢) نەنەوێ [ف] ١) بەویژه؛ ٢) نخواه.

**نەخاسم:** نەخازە، ناوازە [ف] بەویژه.

**نەخافڵ:** ناخافڵ [ف] ناخودآگاه.

**نەخالی:** نهالی، پەلاس، بەڕەی ساكار [ف] گلیم ساده، پلاس.

**نەخاندی:** بێ‌سیوات [ف] ناخوانده، بی‌سواد.

**نەخت:** ١) تۆزقاڵ، كەم: (نــەختێ لەم مێوژەم دەرێ): ٢) پێچەوانەی قەرز: (**بەنەخت** بەچەند؟): ٣) زەوی بەرێژدو: ٤) قەڵەن، شیر بایی: ٥) پارەی‌لەسكــەدراو [ف] ١) انــدك: ٢) نقــد، مقــابــل نسیه: ٣) زمین پرحاصل: ٤) شیربها: ٥) نقد، مسكوك، مقابل جنس.

**نەخت‌و پسوخت:** ١) بێ عەیب‌و كەمــایەسی: ٢) گش، سەرلــەبــەر: (قســەكــەی **نەخت‌و پوخت** لەبەردەم دانا) [ف] ١) بدون نقصان: ٢) همگی، عموماً.

**نەختــوكــە:** كەموُكە، زۆر كەم: (ئەو **نەختۆكە** گەنمەم هەیە) [ف] كمك، بسیار اندك.

**نەختوُكە:** نەخنۆكە [ف] بسیار اندك.

**نەختە:** سەرمای سەخت [ف] سرمای سخت.

**نەختەنەختە:** كەم‌كەمە [ف] اندك اندك.

**نەختێ**: کەمێ، کەموکەیێ [ف] اندکی.
**نەختێك**: کەمێك [ف] اندکی.
**نەختینە**: گەنجینە [ف] گنجینه.
**نەخـری**: ١) نخـری، نخوری. نۆبەرەی منال؛ ٢) خوربێن؛ ٣) بالانە، نۆبەرەی‌میوە [ف] ١) نخستین فرزند؛ ٢) ناشتا، صبحانه نخورده؛ ٣) نوبرمیوه.
**نەخربن**: خوربێن‌بوُن [ف] ناشنابودن، گرسنه‌ماندن.
**نەخس**: شوم، نەحس [ف] شوم، نحس.
**نەخش**: ١) رەنـگ‌و شکڵی دروسکـراو بە دەست؛ ٢) بەخت‌و هات: (نەخشی هێناوە) [ف] ١) نقش و نگار؛ ٢) شانس.
**نەخشاندن**: بەرەنگی جوان رەنگاندن [ف] نقش و نگارزدن.
**نەخشاندی**: ١) نەخش‌کراو، نەخشاو؛ ٢) رەنگاندی [ف] ١) مُنقّش؛ ٢) نقاشی کرد.
**نەخشاو**: بەرەنگی جوان رەنگاو [ف] منقوش.
**نەخشبەند**: ١) کەسێ شت بە رەنگ‌پیاساوبن جوان‌ەکا؛ ٢) نازناوی حاوەن‌تەریقـەیێك کە ناوی محەممەد بەهائەددین‌و فەبری لە شاری بوخارابە [ف] ١) نقش‌گر؛ ٢) لقب یکی از سران سلسلهٔ طریقت.
**نەخشبەندی**: مریدانی تەریقەتی نەخشبەند [ف] پیرو طریقهٔ نقشبندی.
**نەخشدار**: بەنەخش‌کراو، دژی ساکار [ف] منقش.
**نەخشونبگار**: ١) وێنەو شکڵ پێکەوە؛ ٢) برێتی لە چونیەتی کاروباری ژیان [ف] ١) نقش و نگار؛ ٢) کنایه از وضع زندگی.
**نەخشـە**: ١) شکڵی وڵات‌و سەرزەمینـان لەسـەر کاغـەز، خەرینە؛ ٢) برباری چونـیەتـی کردنـی کارێك لەبیر وهـۆش‌دا [ف] ١) نقشـهٔ جغرافیایی؛ ٢) طرح، نقشهٔ انجام کاری.
**نەخشەبەندی**: نەخشبەندی [ف] نقشبندی.
**نەخشە کێشان**: پیلان‌گێران [ف] نوطئه‌چینی.
**نەخشە کێشانەوە**: نوُسینی شکڵی شتێك یان وڵاتێك لەسەر کاغەز [ف] نقشه‌کشی.
**نەخشین**: ١) جوان‌و رەنگـاوی؛ ٢) ناوە بۆ ژنان [ف] ١) دارای نقش و نگار، منقوش؛ ٢) نام زنانه.
**نەخشیو**: نەخشاو [ف] منقوش.
**نەخفی**: زگ‌باکردو، فوکراو [ف] بادکرده.
**نەخلەش**: بڕبەر، بەری زۆر هەبە [ف] پُربار.
**نەخلیایش**: نەخلەش [ف] پُربار.
**نەخو**: نەدی، نەی‌چی، کە وابێ [ف] پس، چه.
**نەخۆ**: ١) مەبادا؛ ٢) دەنا، نەگینا؛ ٣) مەخۆ؛ ٤) هەرناوەها [ف] ١) مبادا؛ ٢) وگرنه؛ ٣) مخور؛ ٤) بههمین ترتیب.
**نەخوازا**: ناوازە، نمازە، بەنابەنی، نەخازا [ف] و بو بژه.
**نەخوازە**: نەخوازا [ف] و بەوبژه.
**نەخوازەلا**: نەخوازا [ف] وبه وبژه.
**نەخوازی**: نەنەوێ، گەرە کت نەبێ [ف] نخواه.
**نەخوازیاگ**: بێ‌بەش لە داواکردن [ف] ناخواسته.
**نەخوازباو**: نەخوازباگ [ف] ناخواسته.
**نەخـواسـتـە**: لە مەبـەسـت دوُربـێ، لەپـاش ناوی خودا دێت: (خودانەخواستە جت لێ فەوماوە) [ف] ناخواسته، با کلمهٔ خدا آید.
**نەخـۆر**: ١) کەسێ لە خواردن دوُرە: (نان نەخۆرە، قەرز نەخۆرە)؛ ٢) برێنی لە رژدو لەچـەر: (مـاڵ نەخـۆر هین بخـۆرە) [ف] ١) کسی که نمی‌خورد؛ ٢) کنایه از خسیس.
**نەخۆش**: ناخۆش، لەش بەبار [ف] نگا: ناخۆش.
**نەخۆش‌بوُن**: دوچاربوُن بە لەش‌بەباری [ف] بیمارشدن.
**نەخۆشخانە**: خەستەخانە [ف] بیمارستان.
**نەخۆش کەفتن**: نەخۆش‌بوُن [ف] بیمارشدن.
**نەخۆش کەوتن**: نەخۆش‌بوُن [ف] بیمارشدن.
**نەخۆشی**: لەش‌بەباری [ف] بیماری.
**نەخۆشین**: نەخۆشی [ف] بیماری.
**نەخـون**: نەسپێ کە لای قوُنی بڵنـدەو ملی نەوی‌بە [ف] اسبی که کَفَل برجسته و گردن فروهشته است.
**نەخوێندە**: نەخاندی [ف] بیسواد.
**نەخوێندی**: نەخاندی [ف] بیسواد.
**نەخوێنە**: نەخاندی [ف] بیسواد.
**نەخوێندو**: نەخاندی [ف] بیسواد.
**نەخوێندەوار**: نەخاندی [ف] بیسواد.
**نەخوێندەواری**: بێ‌سبوانی [ف] بیسوادی.
**نەخوێندی**: نەخاندی، نەخوێنە [ف] بیسواد.
**نەخەسەلا**: نەخوازەلا [ف] و بە وبژه.
**نەخەم**: قەیدی نیە، با وابێ [ف] باشد.
**نەخەمە**: نەخەم [ف] باشد.
**نەخێر**: نە، نەنا [ف] نه، چنین نیست.
**نەدار**: بێ‌ماڵ، دەستەنگ، بەلەنگاز، نەقیر [ف] فقیر.
**نەداری**: بێ‌ماڵی، دەستەنگی [ف] فقر.
**نەدامەت**: نەگبەت [ف] ١) مصیبت؛ ٢) سیەروزی.
**نەدان**: ١) نەسملی‌نەکردن؛ ٢) بێ‌ناوەز [ف] ١) ندادن؛ ٢) نادان.
**نەدر**: نزر [ف] نذر.
**نەدو**: کەم‌قسە [ف] کم حرف.
**نەدوُر**: نزیك [ف] نزدیك.
**نەدوێر**: نەدوُر [ف] نزدیك.
**نەدوێن**: نەدو [ف] کم حرف.
**نەدیار**: نەخویا،بەرپیوار،نەناشکرا، نادیار [ف] ناپیدا.
**نەدیاری**: نەدیاربوُن، گوم‌بوُن [ف] ناپیدایی.
**نەدی‌بدی**: نازەپێداکەونوی زۆر ماڵ‌خۆشەویست [ف] ندیدبدید.
**نەدیتبار**: نەبانوك، خۆبوێر، خۆوەشێر لە نەرك [ف] اهمال کننده.
**نەدیتـە**: ١) نەبینـە، کڕین‌و فرۆشتنی بێ‌دیتن: (نەدیتە بەچەند؟)؛ ٢) نەنەوەی نەنەوە [ف] ١) ندید، معامله بدون دیدن؛ ٢) فرزند نبیره.
**نەدیدە**: نەدیتە [ف] نگا: نەدیتە.

**نەدیر:** ١) ئاگری سەرچیا بۆ خەبەر بەخەڵکدان؛ ٢) زوو، بەمزوانە ف ١) آتش اعلام خبر بر فراز کوهها؛ ٢) بەزودی.

**نەدیگ:** نەبینراو ف ندیده، ناآشنا.

**نەدیو:** گوم لەبەرچاو ف پنهان از دید.

**نەدی و بدی:** نەدی‌بدی ف ندیدبدید.

**نەر:** ١) نك، جەم؛ ٢) سوچ، قوژبن ف ١) نزد؛ ٢) گوشه، نبش.

**نەر:** ١) پێچەوانەی مێوینە؛ ٢) جۆرێکە لە رەسەنی وشتر: (ئەم وشترە نەرە) ف ١) نر؛ ٢) نوعی نژاد شتر.

**نەراست:** ١) خوار، چەوت، گێر؛ ٢) درو؛ ٣) برینی لەدروزن ف ١) کج؛ ٢) دروغ؛ ٣) کنایه از دروغگو.

**نەراستەرێ:** نە بە ئاشکراو روبەرو ف غیرمستقیم.

**نەراستی:** ١) بەدەل؛ ٢) خەیانەت؛ ٣) بەگاڵتە، بەشوخیەوە ف ١) بدل؛ ٢) خیانت؛ ٣) بەشوخی.

**نەران:** ١) گورە، دەنگی‌زلی‌بەقەوەت؛ ٢) ناوی گوندێکە لە کوردستان ف ١) غرش؛ ٢) نام دهی است.

**نەراندن:** گوراندن ف غر بدن.

**نەرانن:** نەراندن ف غر بدن.

**نەربەند:** مرمەند ف سوهان.

**نەربێچ:** ماربێچ قلبان ف مارپیچ قلیان.

**نەرتلێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نەرچ:** نرکە ف هن کردن خسته.

**نەرچە:** نرکە ف هن کردن خسته.

**نەرچە:** بەچکە وشتری نێر ف شُتُر بچّهٔ نر.

**نەرخ:** نرخ، بایی، قیمەت ف نرخ.

**نەرخ دان:** درکاندنی قیمەت، گوتنی بایی ف نرخ چیزی را گفتن.

**نەرخ دانان:** بایی بۆدانان ف نرخ بر چیزی گذاشتن.

**نەرد:** گەمەی ناولی ف نرد.

**نەردان:** کابەکردن بەتەختەنەرد ف نردبازی.

**نەردانێ:** نەردان ف نردبازی.

**نەردونگ:** ناردبوان، پەیژە، بەبجە، سلەم ف نردبام.

**نەردە:** ١) دیواری نزم بەدەوری شنشکا؛ ٢) ناردبوان، بەبژە ف ١) دیوارکوتاه، نرده؛ ٢) نردبام.

**نەردەوان:** نەردونگ ف نردبام.

**نەردبن:** نەردانێ ف نردبازی.

**نەردیوان:** بەبژە، بەبجە، ناردبوان ف نردبام.

**نەرز:** ناوەراستی سەرشان و پشت: (کلکی دەنەرزی پشتی ناو، دارەکەی نابوە سەر **نەرزی** شانی) ف وسط شانەها و پشت.

**نەرزە:** ١) نەرز؛ ٢) نەری درندەو دبو: (**نەرزە** شێر، **نەرزە**دبو)؛ ٣) نارە نە، گورە: (شەم **نەرزەنەرزەت** لەجیە، **نەرزە** مەکە)، نەراندن ف ١) نگا: نەرز؛ ٢) نر بنهٔ درنده و دبو؛ ٣) غریدن.

**نەهرز:** جۆرێ نیخ بۆ شیر و خەنجەر ف نوعی نبغ پرندار.

**نەرزەنێ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**نەرگز:** گوڵێکی سپی ناوزەردی زۆر بۆن‌خۆشە بنکی هەیەو لەسەرە بەهاردا دەروێ ف نرگس.

**نەرگزجار:** جێگەی لێروانی نەرگزی زۆر ف نرگس زار.

**نەرگزە:** ١) فیتکەی ناوزێی مابن کە جارنا دەبیرن؛ ٢) کلێنچکەی سەر درگی پەز ف ١) دکمهٔ فرج مادیان؛ ٢) دنبالچهٔ بالای دنبه.

**نەرگزی:** بەرەنگ و بونی نەرگز ف همرنگ با همبوی نرگس.

**نەرگس:** نەرگز ف نرگس.

**نەرگسجار:** نەرگزجار ف نرگس زار.

**نەرگسە:** نەرگزە ف نگا: نەرگزە.

**نەرگسەجار:** ١) نەرگزجار؛ ٢) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ١) نرگس زار؛ ٢) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نەرگسی:** نەرگزی ف نگا: نەرگزی.

**نەرم:** ١) پێچەوانەی زبر؛ ٢) پێچەوانەی رەق ف ١) نرم، ضدّ خشن؛ ٢) نرم، ضدّ سخت.

**نەرما:** قرنێنە ف نرمادە، سگك.

**نەرمادە:** نەرما ف سگك.

**نەرمان:** زەوینی بێ‌بەردو لەکێڵان‌خوش، پێچەوانەی بەردەڵان ف زمین هموار و نرم.

**نەرمانی:** نەرمان، پێچەوانەی بەردەڵان ف زمین هموار و نرم.

**نەرمایی:** پێچەوانەی رەقی ف نرمی.

**نەرم‌بون:** ١) لەرەقی نەکەوتنەوە؛ ٢) برێتی لە رازی‌بون بە داوایەکی لە کەسێ دەکرێ ف ١) نرم شدن؛ ٢) کنایه از راضی شدن.

**نەرمز:** نەرم ف نرم.

**نەرمژاندن:** کارێ کردن کە رەق نەرم بێ ف نرم کردن سخت.

**نەرمژین:** نەرم‌بونی رەق ف نرم شدن سخت.

**نەرمك:** گوشتی بێ‌پێشە ف لخم، گوشت بی استخوان.

**نەرمکاسەر:** بان‌مەڵاشو ف آهیانە.

**نەرمکاگوها:** شلکەی گوێ ف لالهٔ گوش.

**نەرم‌کردن:** ١) نەرمژاندن؛ ٢) رام کردن، راضی کردن ف ١) نرم کردن سفت؛ ٢) قانع کردن.

**نەرم‌کرن:** نەرم‌کردن ف نگا: نرم کردن.

**نەرمکێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نەرمکێش:** بنیادەمی بەسەبر و پشولەسەرخۆ ف مداراکننده.

**نەرمکێشی:** مدارا ف مدارا.

**نەرمو:** تاتو، نانخوری بێکارە ف طفیلی.

**نەرمو:** بەحەوسەلە، پشولەسەرخۆ ف شکیبا، بردبار.

**نەرم‌وشل:** ١) شل وشل؛ ٢) بنیادەمی بەحەوسەلە ف ١) نگا: شل‌وشل؛ ٢) بردبار.

**نەرموك:** نەرمك، گوشتی بێ‌پێشە ف لخم، گوشت بی استخوان.

**نەرمول:** ١) نەرمی چکولەی دلگر؛ ٢) ناوە بۆ ژنان ف ١) نرم نازی؛ ٢) نام زنانه.

**نەرمولە:** بچکولەی نەرم ف نرم کوچولو.

**نەرم‌ونول:** نەرمی دوور لە زبرایی ف نرم و دور از زبری.

**نەرم‌ونیان:** ١) بنیادەمی بەسەبرو حەوسەلە؛ ٢) قسەی دوور لە تووڕەیی ف ١) آدم باحوصله؛ ٢) سخن ملایم.

**نەرمە:** ١) نەرمك؛ ٢) کیژی شل‌ومل؛ ٣) شلکەی گوێ؛ ۴) هەوابەك بە باوبڕ ف ١) گوشت لخم؛ ٢) زیبای رعنا؛ ٣) نرمهٔ گوش؛ ۴) نوایی که با نی می‌نوازند.

**نەرم‌هاژوك:** نەرم‌ونیان ف صبور و آرام.

**نەرمەبڕ:** زمان لووس ف جرب زبان.

**نەرمـەبێز:** ١) ناڵـەبێز، بارچەی نەنك‌و شاش؛ ٢) دابێرزاو بە بارچەی شاش ف ١) بیزن بارجەای؛ ٢) ببخته با بارجهٔ نازك.

**نەرمەزین:** نمەدزین ف نمد زین.

**نەرم‌هژاندن:** برێنی لە ڕازی کردن‌و هێنانەڕەدا بەبێ‌هەڵگونن ف کنایه از راضی کردن به وسیلهٔ مدح و ثنا گفتن.

**نەرمەساو:** پۆلای جەقۆتیژکردن ف بولاد چاقو تیزکنی.

**نەرمەغار:** پێچەوانەی جوارناڵە، غاری لەسەرخۆی ئەسپ ف چهارنعل سبك اسب، مقابل ناخت.

**نەرمەقووت:** پاش‌جاوینی پاروو ف خوب جو بدن خوراك.

**نەرمەك:** زنی نەرم‌ونول ف زن نسبتاً چاق.

**نەرمەکوکە:** قفەی سەبرو نارام ف سرفهٔ نرم.

**نەرمەگا:** زەوی خۆشکراو، جەندهێشە ف زمین جندبار شخم زده.

**نەرمەگاو:** شەقاوی بجووك ف گامهای نرم.

**نەرمەلوت:** نەرمەگاو ف گامهای نرم.

**نەرمەلیقە:** لىجق ف لزج.

**نەرمەنەرمە:** کەم‌کەمەو بەسەبر ف نرم‌نرمك.

**نەرمەنیشك:** لەبارو شیاو ف شیك و خوش نیب.

**نەرمی:** پێچەوانەی زبری‌و زەفی ف نرمی، مخالف زبری و سختی.

**نەرمێ:** ١) قسـەی دوانـدنی کیژی جوان؛ ٢) ناوی ژنانە ف ١) کلمهٔ خطاب به زیباروی؛ ٢) نام زنانه.

**نەرمیچانك:** زۆر نەرم ف بسیار نرم.

**نەرمین:** ناوە بۆ ژنان ف نام زنانه.

**نەڕن:** نەچن، بمێننەوە ف نروند.

**نەڕند:** ١) نەباش؛ ٢) ناشیرین، ناحەز ف ١) ناپسند؛ ٢) بدشکل.

**نەڕنایش:** ١) دێلەدێو؛ ٢) برێنی لە ژنی زەبەلاحی ناقۆڵا ف ١) دلەدیو؛ ٢) کنایه از زن لندهور.

**نەڕنەڕەشێر:** برێنـی لەزەبەلاحی مرۆترسێن ف کنایـه از لندهور سهمناك.

**نەرو:** نێرنك ف نرهٔ گیاه.

**نەڕۆ:** مەچۆ، دەست‌لەڕۆیشتن بەردە ف مرو.

**نەرۆبیانزی:** نێرنك بیواز، نەولقە کە تۆمی تیایە ف نرهٔ بیاز سبز.

**نەروك:** ١) لقی ناوەڕاستی گیا؛ ٢) ژنێ کە مەمکی قبت نیە ف ١) ساقهٔ اصلی گیاه، نره؛ ٢) زنی که بستان برجسته ندارد.

**نەروم:** ١) بێ‌نەڕ، سووك‌وچرووك؛ ٢) لەخـۆبایی، بادی‌هەوا ف ١) بی اخلاق پست؛ ٢) مغرور و خودخواه.

**نەڕوما:** نەڕما، نەڕمادە، قرنە ف نرماده، سگك.

**نەڕونەیار:** ١) بۆدینن نەشیاو؛ ٢) جێ‌گومان ف ١) غیرقابل دیدن؛ ٢) جای گمان.

**نەڕۆی:** نەچی. لەسەرچوون‌سوورنەبی ف نکند بروی.

**نەرە:** ١) داربەڕوی‌زل؛ ٢) زمانەی‌نەرازو ف ١) درخت تنومند بلوط؛ ٢) زبانهٔ ترازو.

**نەڕە:** ١) گورەی دڕندە، نارەنە؛ ٢) نەڕزە ف ١) غرّش درنده؛ ٢) نگا: نەڕزە.

**نەڕەوا:** نارەوا، ناحەق ف نارەوا.

**نەڕەبی:** نێریەنی، نێرایەتی ف نر بودن.

**نەڕەی‌دێو:** نارەتەی دێو ف نعرهٔ دیو.

**نەڕەی‌پشت:** ناوەڕاستی پشت ف وسط پشت.

**نەڕەی‌شان:** سەرشان ف بالای کتف.

**نەرێ:** نە، نەخێر، پێچەوانەی ئارێ ف نە، مقابل آری.

**نەڕێ:** ١) نەچی، نەڕوی؛ ٢) پێچەوانەی مێوینەبوون؛ ٣) گوو نەکەی ف ١) نکند بروی!؛ ٢) نری، نربودن؛ ٣) نکند برینی!.

**نەریت:** ١) خدە، خو، ئاکـار؛ ٢) تازەداهاتگ ف ١) خوی، روش؛ ٢) نوبن، مدروز.

**نەڕیت:** گوو نەکەی ف نربنی!.

**نهربز:** نهرز ف تیغ دندانەدار.

**نەرێسات:** نە بەئاشکراو ڕەپ‌و ڕاست ف غیر صریح.

**نەڕێ‌مابکی:** نێرەموك، نێرەموك ف نازا.

**نەرێن:** دژ، نەیار ف مخالف، ضد.

**نەرێنی:** دژایەنی، دژمەنی ف مخالفت، ضدیّت.

**نەز:** نەفەس، هەناسە: (نەزگره وانا: نەفەس دەگرێ) ف نفَس، دم.

**نەزا:** ١) نەستێور، مێوبنەبێ کە نازێ، زگ‌نەکەر؛ ٢) بێچوی نەبو، منالی دانەنا ف ١) نازا؛ ٢) نزاد.

**نەزاکە:** جاوەڕوانی، چەمەڕایی ف انتظار.

**نەزاکـــەت:** ١) لەسـەرخـۆبی‌و بەسنـدی: (خـانمێ بەنـەزاکـەتە، بەنەزاکەت جوابی‌دامەوە)؛ ٢) ناوی ژنانە ف ١) نزاکت و لطف؛ ٢) نام زنانه.

**نەزان:** ١) منـاڵ‌نەبـوون، زگ‌نەکـردن؛ ٢) بێ‌ناوەز ف ١) بچەنیاوردن، نازابودن؛ ٢) نادان.

**نەزاندراو:** فێم‌نەکری ف معلوم نشده.

**نەزاندو:** کەسێ کە بێ‌ناوەزانە قسەدەکا ف کسی که احمقانه حرف می‌زند.

**نەزانست:** لەڕوی بێ‌ئاگایی ف اشتباه.

**نەزانستە:** لەنەزانست ف ندانسته.

**نەزان کار:** ناشی، بێچەوانەی کارامە ف کاردان، ناشی.

**نەزانم کار:** زانای خۆگێل کەر ف مُتجاهل.

**نەزانم کاری:** خۆبەنەزان ناساندنی ئاگەدار ف تجاهل.

**نەزانەی:** نەزانی ف نادانی.

**نەزانی:** بێ ئاوەزی ف نادانی.

**نەزانین:** نەزانی ف نادانی.

**نەزدیك:** نزیك بەگش بارانداف نگا: نزیك و مشتقات آن.

**نەزر:** نزر، نەدر ف نذر.

**نەزگرە:** نزگرە، نزگەرد ف سکسکه.

**نەزلە:** نزلە، نوزلە، بەسبوی زۆر سەخت ف سرماخوردگی شدید.

**نەزم:** ۱) جۆر، نەرز؛ ۲) نەکـوُزی؛ ۳) نەبز، تل‌دانی ڕەگ؛ ۴) هەوای گۆرانی یان هەڵپەڕکێ ف ۱) طور: ۲) نظم: ۳) نبض: ۴) آهنگ ترانه یا رقص.

**نەزمی:** ناوی پیاوانە ف نام مردانه.

**نەزمبە:** پۆلیسی ئاوشار ف شهربانی.

**نەزوك:** نەزا، مێو بنەیێ کە بێچوی نابێ ف نازا.

**نەزوکی:** زارونەهێنان، منالدارنەبوُن ف نازایی.

**نەزهـ:** ڕوداوی ناخۆش، فەزاوبەلا ف قضا و بلا.

**نەزەر:** ۱) بیر، بڕوا: (بـە نەزەر من وایە)؛ ۲) تمـاشـای بەکتر کردنی نامەحرەم ف ۱) عقیده، رأی: ۲) نظر نامحرم.

**نەزەرگە:** جێگای لێ بوُنی پیاوانی خوا ف جای دیدار اولیاء.

**نەزێ:** نەزۆك ف نازا.

**نەزیرە:** حیرۆکی کورت، سەرگوزشتە ف داستان کوتاه.

**نەزیك:** نزدیك بەگش باربەوە ف نگا: نزدیك.

**نەزیلە:** نەزیرە ف داستان کوتاه.

**نەژاخ:** نەجاخ، نەوری گجکە ف نیر کوچك.

**نەژاد:** ۱) رەسەن، رەچەلاك. بنچینە؛ ۲) زاکاو، سبس ف ۱) نژاد؛ ۲) پژمرده.

**نەژار:** نەجار، دارتاش ف نجّار.

**نەژخۆ:** ۱) نەدی جۆن؟؛ ۲) بەلێ وایە؛ ۳) نەخۆ ف ۱) پس چطور؟؛ ۲) آری چنین است؛ ۳) نگا: نەخۆ.

**نەژد:** ۱) قرچ. قرچـان، چرچ بوُن؛ ۲) تالان، پوُر ف ۱) ترنجیدگی، چروکیدگی؛ ۲) چپاول.

**نەژدە:** نژدە ف نگا: نژده.

**نەژدڤان:** تالانچی، پوُرکەر ف چپاولگر.

**نەژدی:** ۱) نزیك؛ ۲) مالی تالانی ف ۱) نزدیك؛ ۲) مال یغمایی.

**نەژدینێ:** نەهێزا، بێ کەڵك ف بی ثمر، بی فایده.

**نەژرنابش:** ۱) خۆجوان کردن، خۆڕازاندنەوە؛ ۲) ڕازاندنەوە ف ۱) خود را آراستن؛ ۲) آراستن.

**نەژگاف:** گزوگومەت، کتوپڕ، لەپڕ ف ناخودآگاه، ناگهانی.

**نەژنەو:** ۱) گوێ کپ، کەڕ؛ ۲) مەبیسە، گوێت لێ نەبێ ف ۱) کر، ناشنوا؛ ۲) مشنو.

**نەژنەوا:** گوێ نەگر ف پند نشنو.

**نەژنەوایی:** ۱) کـەڕی؛ ۲) گوێ نەبیسـی ف ۱) نـاشنوایی؛ ۲) پندنشنودن.

**نەژی:** ۱) بێ گیان. پێچەوانەی گیان لەبەر؛ ۲) توکێکە وانا: نەمێنی ف ۱) بی‌جان؛ ۲) دشنامی است به معنی بمیری.

**نەساز:** ۱) نەخۆش، لەش بەبار؛ ۲) کەسێ کە دژایەنی دەکاو لە ئاشتی نەبـانـە؛ ۳) لەسـەودادا سەررەق ف ۱) بیمار؛ ۲) سازش ناپذیر؛ ۳) سرسخت در داد وستد.

**نەسـاخ:** ۱) لەش بەبار، دەردەدار؛ ۲) ناڕاست، دەغەڵ ف ۱) بیمار؛ ۲) نادرست و حیله‌باز.

**نەساخن:** لەش بەباری، نەساخی، نەخوەشی ف بیماری.

**نەساخی:** نەخوەشی ف بیماری.

**نەساغ:** نەساخ، ناساغ ف نگا: نەساخ.

**نەساغی:** نەخوەشی، نەساخی، لەش بەباری ف بیماری.

**نەستەرن:** جۆرە گوڵەباخێکی چکۆڵەیە، شیلانی پەروەردەکراو ف گل نسترن.

**نەستەق:** قسەی بەڕاست و لەگاڵتە بەدوُرو پەنداوی ف سخن ارزنده.

**نەستیل:** زبان، زەرەر ف زیان.

**نەستێل:** نالەبار، ناجۆر، بێ جێگە ف بیجا.

**نەستێلە:** مەردو مەردانە، پیاوی پیاو ف رادمرد.

**نەسرەت:** ۱) ئاریکاری لەخواوە؛ ۲) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) مدد خدایی؛ ۲) نام مردانه.

**نەسرەوت:** ۱) بزۆز، بێ ئارام؛ ۲) ئاسوُدە نەبو ف ۱) بی‌آرام؛ ۲) نیاسود.

**نەسـرین:** ۱) گوڵێکی بوُن خۆشـە لە نەرگز دەکا بەلام زەردە؛ ۲) ناوی زنانە ف ۱) گل نسـرین؛ ۲) نام زنانه.

**نەسعەت:** ئامۆژگاری، نەسێحەت ف پند، اندرز.

**نەسـل:** ۱) پالـوێنە، ڕاوەك؛ ۲) کلافەدەزو؛ ۳) پشتێن، کەمەربەند؛ ۴) تۆرەمە ف ۱) پالونه، صافی؛ ۲) کلاف نخ؛ ۳) کمربند؛ ۴) نسل، نژاد.

**نەسو:** نیخێ کە ئەت نیژ نابێ ف نیغی که تیز نمی‌شود.

**نەسوان:** کون نەکران ف ناسفتن، سوراخ نشدن.

**نەسواو:** ۱) نیخی کولی لەسان نەدراو؛ ۲) کون نەکراو، نەسماو ف ۱) تیغ کندشدهٔ سوهان نزده؛ ۲) ناسفته.

**نەسوت:** شتێ کە بەئاگر ناسوُزێ ف نسوز.

**نەسوُز:** ۱) نەسوت؛ ۲) بنیادەمی خاوەن بەڵێن ف ۱) نسوز؛ ۲) آدم پای بند به قول و عهد.

**نەسەب:** ۱) ئامادە بۆ کارتێکردن؛ ۲) نەغمە، ڕازەو بەژێر زەمین‌دا؛ ۳) تۆرەمە ف ۱) تأثیرپذیر؛ ۲) نقب، تونل زیرزمینی؛ ۳) نسل و نسب.

**نەسەل:** پالوێنە، ڕاوەك ف پالونه، صافی.

**نەسەلنابش:** پالاوتن و ساف کردنی تراو ف تصفیه.

**نەسەلنابە:** پالێوراوی تراو، تراوی پالافتە ف تصفیه شده.

**نەسەلیایش:** نەسەلنایش ف تصفیە.

**نەسەلیایە:** نەسەلنایە ف تصفیەشدە.

**نەسەن:** نەرح و ییچم ف ریخت و قیافە.

**نەسیب:** نسیب، نسیو ف نصیب.

**نەسیبەت:** نسیبەت ف نگا: نسیبەت.

**نەسیحەت:** نسحەت، ئامۆژگاری ف اندرز.

**نەسیو:** نسیو، نەسیب ف نصیب.

**نەش:** بێهۆش، دڵ بوُراوە ف مدهوش.

**نەشارەزا:** ناشارەزا، نابەڵەد ف نابلد، ناوارد.

**نەشاسە:** ١) نارەوا؛ ٢) ناقابیل ف ١) ناروا؛ ٢) ناشایستە.

**نەشت:** ١) لەئاسمانەوە هاتنەسەرزەمین؛ ٢) ڕێگەی نەدا ف ١) از آسمان بر زمین آمد؛ ٢) نگذاشت.

**نەشتن:** ١) لەحەواوە هاتنەسەرزەمین، (نەبڕ نەشت)؛ ٢) ڕێگەنەدان ف ١) فرودآمدن بر زمین؛ ٢) نگذاشتن.

**نەشتوك:** جێگەی نەشتنی باڵداران ف فرودگاه.

**نەشتەر:** شفرەی دەستی برینگەر ف نیشتر.

**نەشتەردان:** نەشتەرلێدان، هەڵدڕینی بەنەشتەر ف جرّاحی.

**نەشتەركار:** برینگەر ف جرّاح.

**نەشتەركرن:** هەڵدڕینی بە نەشتەر، برینگەری ف جرّاحی.

**نەشتەرگەر:** نەشتەركار ف جرّاح.

**نەشتی:** ١) نشتو، لەحەواوە بۆ سەرزەمین هاتگ؛ ٢) برێتی لە پیاوی سەنگین‌و گران ف ١) فرود آمدە؛ ٢) کنایە از آدم باوقار.

**نەشخۆر:** فەسەڵی بەرماوی ماڵات ف پس‌ماندهٔ علف در آخور.

**نەشر:** بلاوبوونەوەی مەردم بە سارای قیامەتا. دەگەڵ حەشر دەڵێن: (حەشر و نەشر) ف حشر ونشر.

**نەشرە:** ١) قافەزو پارچەی باریکی ڕەنگاوڕەنگ کە بۆ جوانی بەدیواربەوە دەخەن؛ ٢) نوسراوی کۆمەڵێك کە بلاوەدەکرینەوە، بلاوۆك ف ١) نوار رنگی کە بە دیوار خانە آویزند؛ ٢) نشریّە.

**نەشس:** نشست، نەهامەتی ف بدبیاری، اُفول.

**نەشم:** لەنجەو ناز. دەگەڵ کەشم دەیڵێن: (خانمێکی زۆر بەکەشم‌و نەشم لێرەبو) ف خرام و ناز.

**نەشمبل:** ١) جوانی خونجیلانەی دڵڕفێن. دەلال؛ ٢) ناوە بۆ ژنان ف ١) زیبای دلکش و نازك اندام؛ ٢) نام زنانە.

**نەشمیلانە:** نەشمبل ف نگا: نەشمیل.

**نەشمیلە:** نەشمیل ف نگا: نەشمبل.

**نەشناس:** بێگانە. پێچەوانەی ناس‌و ناسیاو ف ناشناس.

**نەشۆر:** ژنێ کە لە عوزر وەستاوە ف یائسە.

**نەشە:** ١) کەیف، شادی؛ ٢) سەرەتای مەستبوُن ف ١) کیف، سرور؛ ٢) اوّل مستی.

**نەشەگرتن:** کەیف‌سازبوُن ف سرنشاط آمدن.

**نەشەهەرزا:** ١) ناشارەزا، ناشی؛ ٢) برێتی لە لەکارنەزان ف ١) ناشی؛ ٢) کنایە از ناوارد.

**نەشێ:** ناتانێ، ناتوانێت. لەدەستی نایە ف نمی تواند.

**نەشیرین:** ناحەز، دژی جوان، ناشیرین ف بدشکل.

**نەشیان:** نەتوانین، لەدەست نەهاتن ف نتوانستن.

**نەشێم:** ناتوانم. ناتانم. پێم‌ناکرێت ف نمی توانم.

**نەع:** نە، نەء ف نە.

**نەعتك:** نەنی، توێڵ. ناوچاوان ف پیشانی.

**نەعرە:** نارەتە، نەڕڕە ف نعرە.

**نەعرەتە:** نەعرە، نارەتە ف نعرە.

**نەعل:** ١) نال؛ ٢) سوڵ، پێڵاوی سڤك کە بەسەرپێوە دەکرێ ف ١) نعل؛ ٢) دمپایی.

**نەعلەت:** نەحلەت، لەعنەت ف لعنت.

**نەعنا:** ناعنە ف مرزە.

**نەعنە:** نەعنا ف مرزە.

**نەعنەکێوبلکە:** جانرە ف نعنا کوهی.

**نەعوُزوبیللا:** خوابە پەنا بەتۆ ف حرف پرهیز از بلا، نعوذُبالله.

**نەغد:** ١) پێچەوانەی قەرز؛ ٢) پارەی لەسکەدراو. نەخت ف ١) نقد، مقابل نسیە؛ ٢) نقد، پول، مقابل جنس.

**نەغدوپوخت:** نەخت‌وپوخت ف نگا: نەخت‌وپوخت.

**نەغدینە:** گەنجینە، نەختینە ف گنجینە.

**نەغم:** ١) ڕێگە بەبن عەرزا؛ ٢) فوج‌وەشاندنی کەڵ لەبەر خۆوە ف ١) نقب، راه زیر زمینی؛ ٢) پیش خود حملەبردن قوچ.

**نەغمە:** ڕەهەند، ڕێگە بەژێر زەویدا ف نقب، راه زیر زمینی.

**نەغەدە:** شارێکە لە نێوان شنۆ و مەهاباد لە ناوچەی سندوُس ف نام شهری است.

**نەف:** قازانج. فیدە. بەهرە، قازانج ف سود، فایدە.

**نەفام:** بێ‌ناوەزا ف نفهم.

**نەفت:** تراوێکی بۆگەنیوە لە کان دەری دەخەن بۆ ئاگر و ڕوناکایی زۆر بەکارە ف نفت.

**نەفتالین:** دەرمانێکی بۆن‌ناخۆشە لە زاخ دەکا لە خوری‌و لیباسی دەدەن تا جانەوەر نەیخوا ف نفتالین.

**نەفتاوی:** نەفت پێوەنوُساو، تێکەڵ بە نەفت ف نفت‌آلودە.

**نەفتخانە:** کانی نەفت ف معدن نفت.

**نەفع:** قازانج ف نفع، سود.

**نەفر:** ١) شاخی ماڵات؛ ٢) هەرچی وەك شاخ قیت‌بێت ف ١) شاخ حیوانات؛ ٢) هرچەمانند شاخ برجستە باشد.

**نەفرە:** نفرە ف نگا: نفرە.

**نەفری:** دەرکراو ف راندەشدە.

**نەفربن:** نفربن ف نفر بن.

**نەفس:** ١) خاوەن‌گیان؛ ٢) دڵ‌و دەروُن: (نەفسم بۆ گۆشت دەچێ) ف ١) جاندار؛ ٢) نفس.

**نەفس‌پێت:** ١) هێدی‌و هێمن؛ ٢) زاڵ بەسەر نارەزوی خۆیدا ف ١) شکیبا؛ ٢) مُسلّط بر نفس.

**نەفس کەوتش:** نیشتیای چو بە ف اشتها کرد.

**نەفسەك:** نەوسن. چلێس ف شکم‌پرست.

**نەفۆرات:** نفۆرات ف نگا: نفۆرات.

**نەفەر:** ناکەکەس ف نفر.

**نەفەرات:** زۆرکەس ف نفرات.

**نەفـــەرما:** جگـە لە هێزی چەکـدار، مرۆی دورلـە سەربـازی بەڵام چەك بەدەس ف بسیجی.

**نەفـەس:** هەناسە، کزەبایەك کە لەناو دەم و سیپەلاکدا دێت و دەچێ ف نفس، دَم.

**نەفەقە:** خەرجی خێزان ف هزینهٔ افراد خانواده.

**نەفەل:** ١) گیابەکی بۆن‌خۆشە؛ ٢) لەوەڕی تەڕ، سێوەڕە ف ١) گیاهی است خوشبو؛ ٢) علف سبز.

**نەڤا:** هەوای گۆرانی، رەونی ستران ف آهنگ، ترانه.

**نەڤازە:** زیاد لە پێو بست ف بیش از حدّ لازم.

**نەڤرۆز:** نیکەم‌رۆژی بەهار ف نوروز.

**نەڤس:** زڕ، زڕکوڕ، زڕکچ ف ناپسری و نادختری.

**نەڤسی:** زڕکوڕ ف ناپسری.

**نەڤش:** ١) بنەوشە؛ ٢) رەنگی بنەوش، مۆر ف ١) بنفشه؛ ٢) رنگ بنفش.

**نەڤی:** ١) فرزەندی فرزەند. نەنەوە؛ ٢) نزم ف ١) نوه؛ ٢) پست.

**نەڤیان:** ناخۆش‌ویستن، ناخۆش گەرەك بوون ف تنفّر.

**نەڤیجز:** نەنیژە، نەنیجە ف نبیره، فرزند نوه.

**نەڤیچرك:** ١) نەڤیجز؛ ٢) نەدبدە. نەڤی نەوە ف ١) فرزندنوه؛ ٢) نوهٔ نوه.

**نەڤیچی:** نەڤیچرك ف نگا: نەڤیچرك.

**نەڤیس:** نوێس، نوێس ف نویس.

**نەڤیساندن:** نفیساندن. نوێسین ف نوشتن.

**نەڤینا:** وازوازی، بەخۆنەوەستاو ف لاقید، بی اراده.

**نەق:** ١) بەڕێنی بەلکی جاو، پەڕێنی بیلو؛ ٢) بژاردە، هەڵبـــژاردە؛ ٣) خوست، نق ف ١) پرش پلك چشم؛ ٢) انتخاب؛ ٣) کمترین صدا.

**نەقار:** بەردتاش ف سنگتراش.

**نەقارم:** ناتوانم ف نتوانم.

**نەقارە:** دەهۆڵ و کەڕەنا ف کوس و کرنا.

**نەقارەخانە:** جێگەی دۆڵ و زوڕنالێدان ف نقاره‌خانه.

**نەقاڵ:** قسەخۆش ف خوش گفتار.

**نەقام:** ١) قام، مقام، نقام، گۆرانی؛ ٢) هەوای گۆرانی ف ١) ترانه؛ ٢) آهنگ.

**نەقان:** ١) بژاردن، هەڵبژاردن؛ ٢) نقەکردن، دەنگی زۆر بۆخۆهێنان ف ١) انتخاب؛ ٢) صدای فشار بر خود آوردن و زورزدن.

**نەقاندن:** ١) بژارتن؛ ٢) نقەکردن ف ١) انتخاب کردن؛ ٢) صدای زورزدن.

**نەقتاندن:** نارەقەکردن. خوەدان ف عرق کردن.

**نەقـر:** ١) قوڵ، کوڕ، فۆبل؛ ٢) دەفـری قوڵ و گوشاد ف ١) عمیق؛ ٢) ظرف گود و گشاد.

**نەقرا:** دەهۆڵ، دەوڵ، دۆڵ ف دُهُل.

**نەقش:** نەخش ف نقش.

**نەقشە:** نەخشە، خەرینە ف نقشهٔ جغرافیا.

**نەققاش:** ١) کەسێ کە بە قەڵەم لەسەر کاغەز شکل دەکێشێ؛ ٢) کەسێ کە داروديوار رەنگ‌دەکا ف ١) نقّاش هنرمند؛ ٢) نقّاش ساختمان.

**نەققـاشی:** ١) کێشـانی شکلێ بە قەڵەم؛ ٢) رەنگ‌کردنی دیوار ف ١) نقّاشی؛ ٢) رنگ‌آمیزی ساختمان.

**نەققاڵ:** نەقاڵ، فسەزانی قسەخۆش ف خوش‌گفتار، بذله‌گو.

**نەققـە:** ١) نقـە، دەنگی زۆربـوهـاتن: (نـەو **نەققـە**یەت لەچیە؟، دەنەققینێ)؛ ٢) جۆرێ ماسی ف ١) صدای زورزدن؛ ٢) نوعی ماهی.

**نەقل:** بەرۆشی‌مەزن، مەنجەڵی گەورە ف دیك بزرگ.

**نەقـــڵ:** ١) گوێزانـــەوە؛ ٢) چیرۆك، بەســەرهــات، نەزیرە، نەزیلە، سەرگورشتە ف ١) انتقال؛ ٢) سرگذشت.

**نەقلەك:** کەڕەتێ، دەحفەیەك، جارێك‌لەجاران ف یکبار.

**نەقور:** دەنوك. دەندوك. نکل ف منقار.

**نەقوس:** نفورج. نقورجك ف نیشگون.

**نەقوسکی:** نەقوس ف نشگون.

**نەقـەب:** ١) شیوەلـە، دەزەی نەنگـەبەر؛ ٢) نەغمە؛ ٣) لەو گوندانەی کوردستـانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ١) درّهٔ تنگ؛ ٢) نقب، تونل زیرزمینی؛ ٣) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نەقەنۆ:** بێ‌فەڕ، بەدفەڕ، شەڕانی، بێ‌ناکار ف ستیزه‌جو.

**نەقی:** ناهەقی، زوڵم، دەست‌درێژی ف ظلم، تعدّی.

**نەقیان:** فڕێنی جاو، پەڕینی بیلوی جاو ف پرش پلك چشم.

**نەقیـزە:** دارێ کە نوکـیکی ناسنی تیژی دەسـەرگیراوە گاو کەری پێ لێ‌دەخوڕن ف غاوشنگ. سیخونك.

**نەقیزەدان:** نەقیزە لەحـەیوان‌دان بۆ نازۆنن ف غوشنگ سوختن. سیخونك زدن.

**نەقین:** بەڕینی بەلکی جاو، جاوفڕبان ف پرش پلك چشم.

**نەقیە:** نەقی، ناهەقی ف ظُلم.

**نەك:** ١) مەبـادا، نەبـادا؛ ٢) نە نەمـەی: (**نەك** تۆم ناوێ کەسی تر بنسم ناوێ) ف ١) مبادا؛ ٢) نه‌اینکه.

**نەکا:** نەبێ، نەفەومێ ف نکند.

**نەکاڵ:** شێونەبراو ف شخم نزده.

**نەکاو:** نشکاف، ناکاو، کنوپڕ ف ناگهانی.

**نەکای:** ١) ئێستە، نهوێ؛ ٢) تائێستەش ف ١) اکنون؛ ٢) هنوز هم.

**نەکردو:** پێچەوانەی کراو بان کردە ف ناکرده.

**نەکردە:** نەکردو ف ناکرده.

**نەکس:** ١) نەخـۆشی سەرمـابوون کە سیپەلاك دێشێ؛ ٢) باری مبری فاپ. شەگگە. نەنیشتنی قوڵی مبج ف ١) بیماری ذات‌الرّیه؛ ٢) طرف

گود شنالنگ.
**نەکسۆ:** نەخۆشی سەرمابوون ف سرماخوردگی.
**نەکڤارسا:** ددان‌گڕ ف دندان برجسته.
**نەکڤارسە:** نەکڤارسا ف شخص دندان برجسته.
**نەك‌قوچکن:** ددان‌گڕی دەرپەڕیوی لەبەرچاوان‌دیار ف شخص دندان درشت و برجسته.
**نەك‌قیچ:** نەك‌قوچکن ف شخص دندان برجسته.
**نەك‌قیچن:** نەك‌قوچکن ف شخص دندان درشت و برجسته.
**نەکلۆك:** بیژۆك، دانەویلەیێ کە درەنگ دەکولێ ف دیر پز.
**نەکنەکیل:** نکل ونکین ف نکیر و منکر.
**نەکو:** نەك ف نگا: نەك.
**نەکوتە:** قسەی لەدەم دەرنەهاتگ ف ناگفته.
**نەکوچ:** فروسکە، نالەی سەگ ف زوزهٔ سگ.
**نەکوچاندان:** نالاندنی سەگ، فروسکەکردن ف زوزه کردن سگ.
**نەکول:** نەکلۆك، دانەویلەی بیژۆك ف دیرپز.
**نەکولاو:** پوخنەبوگ ف ناپخته.
**نەکولۆك:** نەکلۆك ف دیرپز.
**نەکە:** نخون نەم‌کارە مەبە ف نکن.
**نەکەر:** نەکاڵ، نەکێلدراو، گاسن لێ‌نەدراو، شۆنەکراو ف شخم‌نزده.
**نەکەروز:** ١) زۆر سارد؛ ٢) ناوە بۆ کوێستانێك ف ١) بسیار سرد؛ ٢) نام ییلاقی است.
**نەکەس:** ١) نارەسەن، نانەجیم؛ ٢) رژدوچرۆك؛ ٣) نابیاو، نامەرد ف ١) بداصل؛ ٢) خسیس؛ ٣) نامرد.
**نەکەوتەداژگیر:** ئامرازێکی دەخڵ‌بێژانە لە کەو نەنگ‌تر لە داژگیر هەراوتر ف نوعی غربال با سوراخ‌های گشاد.
**نەکەهـ:** مارەکردن، مارەبڕین ف عقدکردن.
**نەکەی:** نخون نەوکارە نەبی ف نکنی!.
**نەکی:** ١) نەکەی؛ ٢) نەبادا، مەبادا، نەك ف ١) نکنی!؛ ٢) مبادا.
**نەگ:** ١) نەك؛ ٢) پەڕبنی پێلوی چاو ف ١) نگا: نەك؛ ٢) پرش پلك چشم.
**نەگاندن:** فڕبن‌چاو، پەڕبن پێلوی چەم ف پر بدن پلك چشم.
**نەگبەت:** ١) بەلا، چۆرتم؛ ٢) بەدبەخت، چارەڕەش ف ١) مصیبت؛ ٢) سیەروز.
**نەگبەتی:** بەدبەختی ف سیەروزی.
**نەگریا:** ١) نەکولاو، نەپوخنە؛ ٢) نەکەونەگری ف ١) ناپخته، خام؛ ٢) گریه نکرد.
**نەگریس:** لاسار، سەرشەق، گوێ‌نەبس و بەدفەڕ ف لجباز، بدرفتار.
**نەگۆ:** قسەی‌نەکرد ف نگفت.
**نەگوت:** نەگۆ ف نگفت.
**نەگۆت:** نەگۆ ف نگفت.
**نەگوتە:** نەکوتە، بێ‌قسەکردن: (نەگوتە لە جوابەکەم تێ‌گەیشت) ف ناگفته.

**نەگۆڕ:** شتێ کە لە گۆڕان دوورە ف تغییرناپذیر.
**نەگۆمە:** نەبەکە، خۆنەگرتو: (شەپلەی لێداوە دەستو ماچی نەگۆمەبە) ف سست و کم حرکت.
**نەگوهێز:** نەگۆڕ، دوورلەگۆڕان ف غیرقابل تغییر.
**نەگە:** بوختان، هەڵبەست، تۆمەت ف بهتان.
**نەگها:** ١) نەگەیشتو، کال؛ ٢) نەگەیشت، نەرەسی؛ ٣) نابالغ، شەبنانی‌نەبوگ ف ١) کال، نارسیده؛ ٢) نرسید؛ ٣) نابالغ.
**نەگەنم‌نەجۆ:** دەغڵێکە، بەرەنگ گەنم‌و بە بیچم جۆ بەودەکرێتە نان ف غلّه‌ای است.
**نەگەویس:** خوێنتالی گشت ف کس نخواه.
**نەگەیشتو:** نەرەسیو ف نارسیده، نرسیده
**نەگهیشتی:** نەگها ف نگا: نەگها.
**نەگەیو:** نەگەیشتو ف نرسیده.
**نەگیراو:** بەکسمی نوزێ بەر بارو زین نەخراو ف ستور رام نشده.
**نەگیریاگ:** نەگیراو ف ستور رام نشده.
**نەلامەت:** بێ‌فەڕ، نەحلەتی ف لعنتی.
**نەلەقهاتی:** ١) پێك‌نەهاتو؛ ٢) نەشیاو بۆ یەکتر ف ١) بەنوافق نرسیده؛ ٢) غیرمتناسب با هم.
**نەلێ:** ١) رەگەڵ‌نەخراو، وەرنەگیراو لە کۆمەڵی زەماوەنو کێ‌بەرکێدا؛ ٢) نەبیژێ، قسەنەکات ف ١) قبول نشده در گروه؛ ٢) صحبت نکند.
**نەلۆس:** ناوی گوندێکە لە کوردستان ف نام دهی است.
**نەلەسو:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**نەلێن:** ناوی دومەڵبەندە لە کوردستان ف نام دوناحیه در کردستان.
**نەلیوان:** ناوی دێ‌یەکە لە کوردستان ف نام روستایی است.
**نەلی‌یە:** بێ‌ئیحتوبار، بەهیچ‌حەساونەکراو ف بی‌اعتبار.
**نەم:** شە، شێ، نەرایی، نم ف نم.
**نەما:** ١) لەبەین‌چو، فەونا؛ ٢) نیترنە ف ١) نماند؛ ٢) دیگرنه.
**نەماج:** ١) نما، نوێژ، نمێژ؛ ٢) بەرەبەیان ف ١) نماز؛ ٢) اوّل بامداد.
**نەماجی:** بەرەبەیان، کاتی نوێژی بەیانی ف پگاه، هنگام نماز صبح.
**نەمازە:** نەخوازە، ناوازە، نەخازە، خاسما ف و بەویژه.
**نەماژ:** ١) نوێژ، نوژ، نەماج؛ ٢) بەرەبەیان ف ١) نماز؛ ٢) بامدادان.
**نەماژی:** پێش ناوهەلاتن، بەیان‌بەربوون ف قبل از طلوع آفتاب.
**نەمام:** ١) چڵەزیشەی یەکسالەی دار؛ ٢) لە بوون‌و مانەوە بێ‌بەش بوم؛ ٣) فالی لاکێش ف ١) نهال؛ ٢) نماندم؛ ٣) نوعی فالی مرغوب.
**نەمام‌کردن:** بڕینی لە کەسێ دەناو لای دیوار خستن‌و کوشتنی: (خان کاورابەکی **نەمام‌کرد**) ف لای دیوار گذاشتن محکوم.
**نەمان:** ١) پێچەوانەی بوون‌و مان، لەناوچوون؛ ٢) نەوان لە بوون بێ‌بەش بوون؛ ٣) مەگەرنە نیمە؟: (نەمانگوت وایە) ف ١) نابودشدن؛ ٢) نماندند؛ ٣) مگر نه ما؟.
**نەماندن:** خوساندن، بەناو نەرم‌کردن ف نرم کردن توسط آب، خیساندن.
**نەمدان:** دەفرێ کە شتی تیا دەخوسێنن ف ظرفی که چیزی را در آن

**وەشیانەوە:** وەشانەوە [ف] سزاواری، شایستگی.

**وەشیاو:** ١) وەشباگ؛ ٢) بەزەوبا بڵاوکراو [ف] ١) زمین تخم پاشیدە؛ ٢) باشیدە.

**وەشیر:** ١) حەیوانێ کە شیری زۆربێ، بەشیر؛ ٢) بەشمشێر [ف] ١) بسیار شیرده؛ ٢) باشمشیر.

**وەشێر:** ١) کەسێ کە شت دەشارێتەوە: (مردووەشێر، پارەوەشێر)؛ ٢) بەشێر: (شێخ بارەداری وەشێر نەهاورد) [ف] ١) پنهان کنندە؛ ٢) باشیر درندە.

**وەشێرا:** ١) تەمرا، کەوتە ژێرخاکەوە؛ ٢) لەبەرچاو گوم کرا [ف] ١) دفن شد؛ ٢) پنهان گردید.

**وەشێران:** ١) ژێرخاك کران؛ ٢) شارانەوە [ف] ١) زیرخاك شدن؛ ٢) پنهان شدن.

**وەشێراو:** ١) ژێرخاك کراو؛ ٢) شاردراوە، قەشارنی [ف] ١) زیر خاك شدە؛ ٢) پنهان گردیدە.

**وەشێرە:** ١) بشارەوە!، ژێرخاك کە!؛ ٢) ونی کە لەبەرچاوان! [ف] ١) دفن کن!؛ ٢) ازدید پنهان کن!.

**وەشین:** ١) بڵاوکردنەوە؛ ٢) بڵاوکەرەوە؛ ٣) ئامرازی بڵاوکردنەوە؛ ٤) داوەرین [ف] ١) پخش کردن؛ ٢) پخش کنندە؛ ٣) وسیلهٔ پخش کردن؛ ٤) فروریختن.

**وەشینەك:** هۆی بڵاوکردنەوە، دەزگای بڵاوکردنەوە [ف] وسایل ارتباط جمعی.

**وەشینەی:** مەڵبەندێکی کوردستانە لە دەوری پالسو. *لەکوردستانی* بەردەستی ترکان [ف] ناحیەای در کردستان.

**وەعدە:** وادە [ف] نگا: وادە.

**وەفا:** ١) ئەمەگ، بەبنەت؛ ٢) ناوی پیاوانە [ف] ١) وفا؛ ٢) نام مردانە.

**وەفات:** مردن بۆ بنیادەمی بەرێز: (باوەغەڵیفە وەفاتی کرد) [ف] وفات.

**وەفادار:** بەئەمەگ، چاکەلەچاو، بەبنەتدار [ف] وفادار، باوفا.

**وەفاکار:** وەفادار، بەئەمەگ و بەبن و بەفا [ف] وفادار.

**وەفر:** بەرف، وەور، وەر، بەفر [ف] برف.

**وەفرنایش:** ١) هەڵمساو، پفدراو؛ ٢) بەفوهەڵمساندن [ف] ١) بادکردە؛ ٢) باد درچیزی کردن و پُف دادن.

**وەفرە:** کەتیرەی سپی [ف] کتیرای سفید.

**وەفەرنایش:** وەفرنایش [ف] نگا: وەفرنایش.

**وەڤەر:** هۆوەندە، ئەوشوێنەدورە [ف] آن دوردست.

**وەق:** ١) بۆق، بەق، قرواق؛ ٢) دەنگی مراوی، دەنگی بەق [ف] ١) غوك، قورباغە؛ ٢) صدای مُرغابی.

**وەقا:** کێشانەیەکە بەرانبەر بە هەزارو سەتو هەشتاوسێ گرەم [ف] وزنی معادل یکصدوهشتادوسه گرم.

**وەقت:** وەخت، کات، دەم، زەمان [ف] وقت، زمان.

**وەقتا:** وەختێکی، لەکاتێکا، ئەوسا [ف] زمانی.

**وەقتو:** وەقتا [ف] زمانی.

**وەغرە:** ئۆقرە، ئارام، داسەکنان [ف] آرام.

**وەقف:** مەوقوفە [ف] مال وقف.

**وەقفا:** وەقا [ف] نگا: وەفا.

**وەقــواق:** واق‌واق، قەدیم بە ژاپــۆن گوتــراوە: (جــزیرەی واق‌واق یا وەقواق) [ف] نام قدیم ژاپن، نگا: واق واق.

**وەقوەق:** دەنگی بۆق و مراوی [ف] صدای قورباغە و مرغابی.

**وەقە:** کێشانەیەکە، حوقە [ف] وزنی است.

**وەقی:** وەقە [ف] نگا: وەقە.

**وەك:** ١) چون، لەجۆر، لەنەرح، ئاسایی؛ ٢) بەجۆرێ کە: (وەك دەڵێی، وەك زانیومە) [ف] ١) چون، همانند؛ ٢) چنانکە.

**وەکا:** ١) وەك؛ ٢) بکانەوە، وازبکا [ف] ١) مانند؛ ٢) بازکند.

**وەکات:** رەپوراست، قسەی بێ‌روبێنی [ف] سخن رُك و صریح.

**وەکات کردن:** درکاندنی راستی [ف] بروز دادن حقیقت.

**وەکــار:** ١) ئارار؛ ٢) زۆر کارکــەر؛ ٣) کاوێژ، خاوبش [ف] ١) شجاع؛ ٢) باپشتکار، کاری؛ ٣) نشخوار.

**وەکاربان:** کاوێژکردن [ف] نشخوارکردن.

**وەکاز:** دارعاسا، عاسا [ف] **عصای دست.**

**وەکــاشــە:** ١) دوعــایەکە بۆ چارەی شێتانی دەنوسن؛ ٢) گوندێکە لە کوردستــان بەعسی وێرانی کرد [ف] ١) دُعایی کە برای شفای دیوانە می‌نویسند؛ ٢) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**وەك‌دەزانی:** چۆنی خۆت ئاگاتلی‌بە [ف] چنانکە دانی.

**وەکشان:** کشانەوە [ف] بەعقب برگشتن.

**وەکشانەوە:** وەکشان [ف] بەعقب برگشتن.

**وەکشە:** فەرمان بەکشانەوە [ف] بەعقب برگرد!.

**وەکشێ:** وەکشە! [ف] بەعقب برگرد!.

**وەکشین:** وەکشان [ف] بەعقب برگشتن.

**وەکشێن:** بکشێنەوە، بۆدواوە بچن! [ف] بەعقب برگردید!.

**وەکو:** وەك [ف] نگا: وەك.

**وەکــۆ:** ١) کۆ، کۆمــەڵ: (ئەمانە وەکۆکەرەوە)؛ ٢) هەرگا، هەرکات، ٣) وەکو، لەچەشن، لەوێنە [ف] ١) تودە؛ ٢) هرگاه؛ ٣) مانند.

**وەکۆبوُن:** کۆبوُن، کۆبوُنەوە [ف] جمع شدن.

**وەکۆك:** وەك، وەکی، وەکو، مینا، هاوتالەرەنگ‌وتەرحا [ف] همانند، مشابه.

**وەکۆکردن:** کۆکردنەوە [ف] جمع کردن.

**وەکویەك:** بەرانبەر [ف] برابر، مساوی.

**وەکە:** ١) وەك؛ ٢) وازکــە، بکەوە، بکــەرەوە [ف] ١) مــانند، چنانکە؛ ٢) بازکن.

**وەکەردش:** ١) فەڵاشتن، تلیشاندن؛ ٢) کردنەوەی گرێ و داخراو؛ ٣) دەرکێشان؛ ٤) بەدادرون نــوپەڵ کــردن؛ ٥) پیکردنی نــاکر؛ ٦) راوەشاندن؛ ٧) پاك کردنی کەللەپاچە [ف] ١) شکافتن؛ ٢) بازکردن؛ ٣) بیرون کشیدن؛ ٤) گلولەای کردن؛ ٥) برافروختن آتش؛ ٦) بەشدت تکان دادن؛ ٧) پاك کردن کلەپاچە.

**وەکــەردەنــە:** ١) لێك‌جیاکــردنــەوە؛ ٢) داگیرســاندن؛ ٣) کێڵان؛ ٤) کردنەوەی درگا [ف] ١) جداکردن از هم؛ ٢) مشتعل کردن؛ ٣)

کاشتن؛ ۴) بازکردن دَر.

**وەکەهەو:** وەکو یەك [ف] برابر.

**وەکی:** ١) وەك؛ ٢) هەرکات؛ ٣) ئەگەر، هەگەر [ف] ١) نگا: وەك؛ ٢) هرگاه؛ ٣) اگر.

**وەکێ:** وەك، وەکو [ف] مانند.

**وەکیل:** بریکار، نایب [ف] وکیل.

**وەکێل:** وەکیل [ف] وکیل

**وەکیلەڵلا:** خواوەکیلە. بۆ باوەڕپێکردن ئێژن [ف] خداوکیل. در مقام سوگند گویند.

**وەکیلەی:** بریکاری، وکیلی کردن [ف] وکالت.

**وەك یەك:** وەکو یەك، وەکەهەو [ف] برابر.

**وەك یەکی:** بەرانبەری، هامنایی [ف] مشابهت.

**وەگ:** ١) وەك؛ ٢) جاخ، هەڕەت، جەنگە، ناف [ف] ١) نگا: وەك؛ ٢) موسم.

**وەگر:** ١) کەسێ کە لەحەوا شت ئەقوزێتەوە: (خشت وەگر، توپ وەگر)؛ ٢) لەخەرج گێڕەوە: (لەماڵدا هەمو دەس بڵاون هەر من **وەگـرم**)؛ ٣) دامەزرێنەرو بەرپاکەری چادرو چیغ و پەردە؛ ۴) نەخۆشی گیرۆ [ف] ١) کسی که در هوا می‌قاپد؛ ٢) صرفه‌جو؛ ٣) برپاکنندهٔ خیمه و پرده؛ ۴) بیماری واگیردار.

**وەگرتن:** کاری وەگر [ف] عمل «وەگر».

**وەگرگریابەنە:** نزگەرە [ف] سکسکه.

**وەگروتش:** لەسەرشان‌دانان، لەکوڵ کردن [ف] بردوش نهادن، کول کردن.

**وەگرەوتش:** وگرونش [ف] بردوش نهادن، کول کردن.

**وەگلۆر:** گلۆر، خلۆر، گلار [ف] غلتیدن از بالا به پایین.

**وەگۆ:** وای وت [ف] چنین گفت.

**وەگۆ:** وەگۆ [ف] چنین گفت.

**وەگوت:** وەگۆ [ف] چنین گفت.

**وەگۆت:** وەگۆ [ف] چنین گفت.

**وەگۆڕ:** شت بەشت گۆڕانە [ف] مبادله.

**وەگۆڕین:** گۆڕینەوە [ف] مبادله کردن.

**وەگە:** بگەوە، خوت بگەبەنەوە: (وەگە تا بەشت نەخوراوە) [ف] خود را برسان.

**وەگەر:** ئەگەریش بێنو [ف] درصورتی که.

**وەگەڕ:** ١) لەسوڕاندا: (ئاشەکە وەگەڕ کەوت)؛ ٢) فێڵباز، بەحیلە [ف] ١) چرخان؛ ٢) مکّار، حیله‌باز.

**وەگەڕا:** گەڕابەوە، بەرەودوا ناما [ف] بازگشت، ماضی بازگشتن.

**وەگەڕان:** ١) گـەڕانەوە؛ ٢) گێڕانـەوەی قسە [ف] ١) بازگشتن؛ ٢) بازگوکردن.

**وەگەڕاندن:** ١) گێڕانەوە؛ ٢) گەڕاندنەوە [ف] ١) بازگو کردن؛ ٢) نگا: گەڕاندنەوە.

**وەگەڕاندنەوە:** وەگەڕاندن [ف] نگا: وەگەڕاندن.

**وەگەڕانەوە:** وەگەڕان [ف] نگا: وەگەڕان.

**وەگەڕیانەوە:** وەگەڕان [ف] نگا: وەگەڕان.

**وەگیریابش:** ١) لەکـوڵ کردن؛ ٢) تل‌دان، وەرەناندن؛ ٣) لەبەر توڕەیی مێجـازو رەنـگ گۆڕان [ف] ١) کول کردن؛ ٢) غلتیدن؛ ٣) از شدّت غضب رنگ عوض کردن.

**وەل:** ١) دەگەڵ: (**وەل** من بێ بچیمەن)؛ ٢) بەرەڵدا: (**وەلی** کە با بچێ) [ف] ١) با، همراه؛ ٢) ول، رها.

**وەلا:** ١) قالا، بەتـاڵ، خالی؛ ٢) سوێنـد بەخوا [ف] ١) خالی، تهی؛ ٢) سوگند به خدا.

**وەلات:** ١) ولات؛ ٢) بەلاتدا [ف] ١) نگا: ولات؛ ٢) از کنارت.

**وەڵات:** وڵات [ف] نگا: وڵات.

**وەڵاتبارێز:** نیشتمان‌پەرست [ف] میهن‌پرست.

**وەڵاتۆ:** ناوی پیاوانە [ف] نام مردانه.

**وەڵاتە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**وەڵاتی:** خۆوڵاتی، هاوزێدی [ف] هم‌ولایتی.

**وەڵاتینی:** هاونیشتمانیەتی [ف] هم‌میهنی.

**وەلاخەرێ:** ڕێگەی سواران [ف] راه مال‌رو.

**وەلاد:** کۆخنەی ناوباخ [ف] کلبهٔ کوچك درون باغ.

**وەلادەك:** کۆخنەی بچوك لە باخدا [ف] کلبهٔ کوچك درون باغ.

**وەلاف:** لەوەڕ، گیای وشکەوەبوی ئالف [ف] خشك گیاه علوفه.

**وەلاق:** دواندنی کچ بە توڵازی [ف] مَتلك.

**وەلاکەوتن:** لاچوُن، دوُرکەوتنەوە [ف] کناررفتن.

**وەلالیك:** بەلاڵوك [ف] آلبالو.

**وەلام:** ١) لای من؛ ٢) بەبیری من [ف] ١) نزد من؛ ٢) به رأی من.

**وەڵام:** ولام، وەرام [ف] ١) سفارش شفاهی؛ ٢) پاسخ.

**وەلاما:** بەلای مندا [ف] از کنار من.

**وەڵامدانەوە:** جواب دانەوە [ف] پاسخ گفتن.

**وەڵامناردن:** قسەڕاسپاردن [ف] پیام فرستادن.

**وەلامە:** راوە، شەرح [ف] تفسیر، شرح.

**وەڵاو:** بلاو [ف] پراکنده.

**وەلایش:** باوێشك [ف] خمیازه.

**وەل بتۆرۆ:** داخ‌وکەسەر بۆتۆ [ف] حسرتت باد.

**وەل بوُن:** بەرەڵابوُن [ف] ول شدن.

**وەل بە:** وتەی دەرکردن بە سوکایەتی [ف] گم شو.

**وەلجاخ:** قەزاوبەڵا، ئەهانی لە خواوە [ف] قضا و قدر.

**وەلچەك:** بێوانەی دەخڵ کە چل کیلو دەگرێ [ف] عدل چهل کیلو یی.

**وەلچەگ:** وەلجەك [ف] عدل جهل کیلو یی.

**وەڵدین:** ١) منداڵ‌هێنان، زان، زایین؛ ٢) لەدایك‌بوُن [ف] ١) زاییدن؛ ٢) متولّدشدن.

**وەلـزێ:** گونـدێکـە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**وەلف:** دۆستی خۆشەویست [ف] دوست نزدیك.

**وەلفەت:** نۆگری، خوبێوەگرتن ف عادت به نزدیکی کسی یا کاری، الفت.

**وەڵکرد:** حاوانەوە، زمان‌ڕاوواردن ف گذراندن.

**وەڵگ:** بەڵگ، گەڵا ف برگ درخت و گیاه.

**وەلل:** تۆزو غوماری نەرم، نەرمەتۆز ف گرد وغبار.

**وەڵلا:** سوێند بەخوا ف سوگند بەخدا، واللّه.

**وەللك:** ۱) کزبوە؛ ۲) کەزەسیسە ف ۱) کولاك؛ ۲) نگا: کەزەسیسە.

**وەللەروە:** هەتوان لە مشکی و رۆن ف نوعی مرهم.

**وەلن:** خوڵاوی، تۆزاوی ف غبارآلود.

**وەلنە:** وەلن ف غبارآلود.

**وەلـوەر:** گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ار روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**وەلوەلە:** دەنگ‌و هەراو هوریا ف جنجال و غوغا، ولوله.

**وەلە:** ۱) وتەی ناززوتنی گوێلك؛ ۲) وتەی بانگ‌کردنی گوێلك ف ۱) حرف راندن گوساله؛ ۲) حرف خواندن گوساله.

**وەلەج:** شێلاقە، باڵدارێکە بەقەد گاوانی بەڵام لنگ‌درێژ ف پرندهٔ سلوا.

**وەلەجاخ:** بەڵاو نەهاتی لە خواوە ف قضا و قدر.

**وەلەد:** رۆڵە، فرزەند ف فرزند.

**وەڵەد:** ۱) وەلەد؛ ۲) بەڵەد، شارەزا ف ۱) فرزند؛ ۲) رەشناس، رهنما.

**وەلەدبایش:** زاروێ‌دبوە، بێجوی‌بوە، زاییگە ف زاییده است.

**وەلـەسمت:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**وەلـەك:** ۱) داردەستی سەردوحـاجـە؛ ۲) گێژەلۆکە؛ ۳) بەفری بەباوە، کزبوە ف ۱) چوبدست دوشاخه؛ ۲) گردباد؛ ۳) کولاك.

**وەڵەك:** بەڵەك ف خلنگ.

**وەلەند:** وەلەد، رۆڵە ف فرزند.

**وەلەو:** جا باوایێ ف هرچند چنین باشد.

**وەلی:** ۱) پیاوی خوا؛ ۲) دەگەڵ ئەو ف ۱) مرد خدا؛ ۲) با او.

**وەلێ:** ۱) واسە، ئاوا...؛ ۲) بلام، بەڵان ف این طور؛ ۲) لیکن.

**وەلیعات:** جێ‌نشینی دەسەڵات‌دار دوای مەرگی ف ولیعهد.

**وەلیعاد:** وەلیعات ف ولیعهد.

**وەڵیفـەت:** ۱) مفتـە، خۆڕایی، بەلاش، مفت؛ ۲) سەرفـەڵـەمـانـەی نوشتەنۆس ف ۱) مُفت؛ ۲) مُزد دعانویس.

**وەڵیفەتانە:** سەرفەڵەمانە ف مزد دعانویس.

**وەڵین:** پێشو ف قبل، گذشته.

**وەڵینە:** لەبەرا ف ابتدا، قبلاً.

**وەڵیەفەتی:** پەیوەندی مێردو ژن بەیەکترەوە ف همسری.

**وەم:** ئاوهام: (وەم‌زانی) ف من این طور.

**وەمـا:** ۱) بەجێ‌ما: (یارێ کودی ئەم گەدا دەست پدەستێ مەدا/ ئەم بسەمایێ بر بن زەفس‌و سەما زێ وەما) «جزیری»؛ ۲) وەك خۆی ما، نەگۆڕا ف ۱) بەجای ماند؛ ۲) بەحال خویش ماند.

**وەماشتن:** ماڵینەوە، ماشتنەوە، رادانی هەموشتێ ف روبیدن و بردن هرچیز.

**وەماڵین:** وەماشتن ف نگا: وەماشتن.

**وەمام:** ۱) بەجێ مام؛ ۲) وەکەخۆ مامەوە ف ۱) جاماندم؛ ۲) همین طور ماندم.

**وەمـان:** ۱) ئاوهـا مان؛ ۲) بەجێ‌مان‌و دواکەوتن لەکـارێ؛ ۳) ئەوان بەجێ‌مان ف ۱) ما این طوری؛ ۲) جاماندن؛ ۳) جاماندند.

**وەماو:** ۱) جێ‌ماگ؛ ۲) وەك بەرێ، چۆن بو هەروا ماوە ف ۱) جامانده؛ ۲) همان طور مانده.

**وەمای:** وەمار ف نگا: وەماو.

**وەم‌دی:** ۱) ئەونەرزە چاوم پێ‌کەوت؛ ۲) دۆزیمەوە ف ۱) چنین دیدم؛ ۲) گم شده را یافتم.

**وەمزانی:** بەوجۆرە بیرم برد ف چنان دانستم.

**وەمکە:** بم‌کەوە، ئازادم‌کە ف بندم را بگشای.

**وەن:** ۱) بەن، دەزو، داوی بادراوی خوری؛ ۲) لێ‌بەستراو: (بازی‌وەن)؛ ۳) جێگە، شوێن: (ئەلوەن)؛ ۴) وەی وەپاڵدان، لەمەڕ، *لۆ.ناوی زۆر عەشیرەت بە وەن دوایی دێت* : (کاکاوەن، حاجی‌وەن، هەمەوەن)؛ ۵) کۆوەبـوگ: (زەماوەن وانا: کۆبونەوە بۆ سەماکردن)؛ ۶) وامان، ئێمە بەم‌جۆرە: (وەن‌زانی، وەن‌بیستوە)؛ ۷) دارەبەن؛ ۸) داوی لێك‌هاڵاوی نێك‌ڕاکـراو، هۆندراو: (گورزەوەن)؛ ۹) بەنداو ف ۱) نخ پشمی؛ ۲) بند، بستەشدە بر. *مانند بازوبند* ؛ ۳) جای، مکان؛ ۴) پسوند نسبت؛ ۵) اجتماع، جمع شده؛ ۶) ما این طوری؛ ۷) درخت بنه؛ ۸) بافت؛ ۹) سدّ.

**وەنا:** ۱) ئەدی وانیە؟، دەنا نا؟؛ ۲) دەخوا، ئەخوا ف ۱) مگرنه این طور؟؛ ۲) می‌خورد.

**وەنـاق:** دوشـاخـە، ئەخـۆشیەکە لەقورگ دێت‌و ئەخۆش دەخنکێ ف بیماری خناق.

**وەنای:** واناى، خوێندن، فێرە خوێندن بوُن ف درس خواندن، تحصیل.

**وەنابا:** بارەبەرێ کە سواربێنی دەبێ ف باربری که سواری هم بدهد.

**وەنایش:** ۱) بارکردن، کۆچ‌لێ‌نان؛ ۲) سواری بارەبەربوُن ف ۱) کوچ کردن؛ ۲) سواربارپر شدن.

**وەنجەنە:** دۆخین، دێخوُن ف بندتُنبان.

**وەنـد:** ۱) ئێش، ئازار؛ ۲) لاوجـاك: (لـەوەنـد)؛ ۳) ئەنـدازە لە شتێ: (ئەوەندم بو لەوەندیشیان کردم)؛ ۴) بەند: (بازی‌وەند، کەمەروەند)؛ ۵) جێگـە، وەن: (ئـەلوەنـد)؛ ۶) لەمـەڕ، وتـەی پاڵدان: (کاکاوەند، سەکوەند)؛ ۷) کۆوەبوُن: (زەماوەند، گۆوەند)؛ ۸) بارچە لە گۆرانی؛ ۹) ئاوبەند، لەمپەر، سەد، بەند؛ ۱۰) جمگە، جەمسەر، بەندی ئێسقان؛ ۱۱) ئازا، ئەترس، بوێر ف ۱) آزار؛ ۲) شوخ و زیبا؛ ۳) اند، اندازە؛ ۴) پسوندبستن مانند گردن‌بند؛ ۵) جای؛ ۶) پسیوند نسبت؛ ۷) جمع شدن؛ ۸) قطعـەای از ترانە؛ ۹) سدّ، مانع؛ ۱۰) بند استخوان؛ ۱۱) شجاع، دلیر.

**وەندا:** ۱) گوم، وندا؛ ۲) ژن‌و کچی خوێندەوار ف ۱) ناپیدا، گُم؛ ۲) زن و دختر باسواد.

**وەندانە:** ئازایانە، بوێرانە ف شجاعانە.

**وەنـدابەنە:** ١) وەخوێندن؛ ٢) خاوەن سبوات بوون ف ١) خواندن؛ ٢) باسواد بودن.

**وەندس:** خوێندنەوە، وەخوێندن ف مطالعە کردن.

**وەندش:** وەندس ف مطالعە کردن.

**وەندش‌دایش:** دەبەرخوێندن نرا ف درمعرض مطالعە فرار گرفت.

**وەنـدن:** ١) داوی زۆری بادراو نێك‌کێشان: (گوربس‌وەندن)؛ ٢) مووروو دەداوکێشان: (نەزبیح‌وەندن) ف ١) بافتن ریسمان؛ ٢) بەرشتە کشیدن مهرەها.

**وەندنەوە:** وەندن ف نگا: وەندن.

**وەندوخ:** ١) خوێندەوار؛ ٢) گۆرانی‌خوێن ف ١) باسواد؛ ٢) خوانندە.

**وەنـدە:** ١) زبارە، هەرەوەز؛ ٢) خاوەن: (جووت‌وەندە)؛ ٣) ئاگادار، وان: (خـەروەنـدە)؛ ٤) جمگـەئێسـك، بەند: (سێ‌وەندەی پشتم) ف ١) همکاری کشاورزی؛ ٢) صاحب؛ ٣) نگهبان؛ ٤) بند استخوان.

**وەندەن:** ١) بەرزایی، فەدی چیا؛ ٢) پردی لەچەبەر ف ١) کمرکوە؛ ٢) پل نرکەیی.

**وەنـدەنـە:** ١) خوێنـدن، دەرس فێر بـوون؛ ٢) خوێنـدنی مەل‌و مروی دەنگ‌خـۆش ف ١) درس خـواندن؛ ٢) آوازخوانـدن مرغ و آدم خوش نوا.

**وەندەی:** دەرس‌خوێندن ف درس خواندن

**وەنسە:** هۆگری، خووپێ‌گرتن ف اُنس گرفتن.

**وەنشتا:** سوار بوون ف سوار شدن.

**وەنشتش:** سوار بوون ف سوار شدن.

**وەنگ:** بەندو جەمسەری ئێسقان ف بند استخوان.

**وەنگە:** جێگەبەنداو ف جای سدّ.

**وەنگـەربنـە:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**وەنن:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**وەنۆلە:** گیایەکە ف گیاهی است.

**وەنـە:** ١) بەنە، بەندە، خولام، عەبد؛ ٢) بۆلای، بۆ: (وەنەم کیانو)؛ ٣) وەندراو ف ١) بندە، بردە؛ ٢) برای، بەسوی؛ ٣) بافتە.

**وەنەت:** لێت ف ازتو.

**وەنەتەق:** ١) قەزوان؛٢) جۆرە دارەقەزوانێکە بەرەکەی وردە، بنەوشبلە ف ١) ناتکش؛ ٢) نوعی درخت بنە کە ثمر ریز دارد، جانلانقوش.

**وەنەم:** لێم ف از من.

**وەنەمشك:** وەنەتەق، بنەوشبلە ف نوعی درخت بنە.

**وەنەنە:** لەرەلەر، جوڵەجوڵ ف لرزش، تکان.

**وەنەوز:** جۆرت، خەوبردنەوە ف پینکی.

**وەنەوزبردنەوە:** جۆرت‌دان ف پینکی زدن.

**وەنەوزدان:** جۆرت‌دان ف پینکی زدن.

**وەنەوزە:** وەنەوز ف پینکی، چُرت.

**وەنەوزەکوتێ:** جۆرت‌دان ف پینکی زدن.

**وەنەوش:** ١) بنەوشە؛ ٢) رەنگی بنەوش؛ ٣) ناوی ژنان ف ١) بنفشە؛ ٢) رنگ بنفش؛ ٣) نام زنانە.

**وەنەوشە:** بنەوشە ف بنفشە.

**وەنەوشـی:** مۆر، رەنگی وەنەوشـە ف بنفش رنگ.

**وەنی:** ١) قەزوان؛ ٢) وەنە، بەنی، خولام؛ ٣) داوی دەباڵ‌راکردو چنی ف ١) ناتکش؛ ٢) بندە، بردە؛ ٣) بافتنی راباڤت.

**وەنین:** وەندن، وەندنەوە ف نگا: وەندن.

**وەو:** ١) بەنـەو؛ ٢) نا، بەڵێ: (هـۆ مام‌پیرۆت!ـ وەو)؛ ٣) بەم، لەجـۆر: (وەونزمیە) ف ١) بەاو؛ ٢) حرف پاسخ، بلی؛ ٣) این طوری.

**وەوتۆ:** وا، بەم‌جۆرە ف چنین.

**وەوڵە:** بووکەڵەی منالان ف عروسك.

**وەوڵەبارانێ:** بووکەبارانە ف افچەبارانی.

**وەوە:** ١) بەبە، بەبەکە، منالی ساوا؛ ٢) نێخە، جێگەی مل لە کراس ف ١) نوزاد، نی‌نی؛ ٢) بقە، گریبان.

**وەوی:** ١) تازەبووك؛ ٢) ژنی کوڕ، بووك؛ ٣) بووکەڵە ف ١) تازەعروس؛ ٢) همسر پسر، عروس؛ ٣) عروسك.

**وەوبلە:** بووکەڵەی منالان ف عروسك.

**وەوبلەبارانێ:** وەوڵەبارانێ ف افچەبارانی.

**وەهـ:** ١) وتـەی سەیرمان، بەح، نەح، نەحا؛ ٢) وتەی زۆر پەسندکردن‌و خۆشی ف ١) حرف تعجّب، وا؛ ٢) حرف تحسین و پسند، بە.

**وەهـا:** ١) ئاوهـا، بەم‌جۆرە؛ ٢) بەجـۆرێ، بەئەندازەیێ: (وەها مەستی تەمـاشـای چاوتە «نالی» کە نازانێ/ بەبێداری دەبینێ یا لەئەمشەی مەستی‌و خەودا) «نالی»؛ ٣) نرخ، قیمەت، بەها؛ ٤) شینایی‌وئاو لەناو بیاباندا ف ١) این طور؛ ٢) بەاندازەیی، چنان؛ ٣) بها، قیمت؛ ٤) آب و دارودرخت در بیابان.

**وەهـات:** وات، بەجـۆرێکـت: (وەهـات لێ‌بکـەم خۆت بزانـی، وەهات‌گوت) ف چنینت، نوچنین.

**وەهار:** ١) بەهار، بوهار؛ ٢) خاوەن، خودان، دارادار ف ١) بهار؛ ٢) صاحب.

**وەهاسە:** ١) کەوایێ؛ ٢) بەڵێ وایە ف ١) در این صورت؛ ٢) آری چنین است.

**وەهام:** ناوام، ناوەهام ف چنینم، این چنینم.

**وەهاو:** وەهاب ف نام مردانە.

**وەهای:** ١) تۆ بەم‌جۆرەی؛ ٢) ئەوی، بەوجۆرە: (وەهای تەنیێ دەکەم) ف ١) تو این طوری؛ ٢) بەطوری او را.

**وەهوەهـ:** بەهـ‌بەهـ، وتەی سەیرمان لەخۆشیان ف بەبە.

**وەهە:** بەوجۆرە، بڤێ ئاوایێ ف این چنین.

**وەهەر:** خاوەن، خودان، دارادار ف صاحب، مالك.

**وەهـەنگـاوتن:** ١) پێوان‌و ئەندازەگرتن؛ ٢) راهەنگاوتن، بەسەرشتێکا راکێشان ف ١) اندازەگرفتن؛ ٢) بە درازا برنهادن بر روی چیزی.

**وەهی:** وەوی، بووك ف عروس.

**وەهید:** باربو، بارمەتی، نەوجی فا باری.

**وەهێر:** ١) بەهار؛ ٢) ئازاد، سەربەست فا ١) بهار؛ ٢) آزاد.

**وەهیە:** کاری پوچ و بێ‌تام فا کار بی ارزش.

**وەی:** ١) بوك؛ ٢) نازار: (بیاگێ بێ وەی‌ونارامە)؛ ٣) وتەی دەردو ژان: (وەی دبێشێ)؛ ٤) ئەمجۆرە: (وەی تەور)؛ ٥) وتەی سەیرمان: (وەی چەند سەیرە!)؛ ٦) وتەی بانگ کردن بۆ یاربدەدان فا ١) عروس؛ ٢) آزار، آسیب؛ ٣) حرف اظهار درد؛ ٤) چنین؛ ٥) حرف تعجّب؛ ٦) حرف ندا برای کمك خواستن.

**وەبایش:** پێکەنین، کەنین، خەنە فا خنده.

**وەبباب:** ماری شینی گائەنگێو: (کولەوەبباب) فا نوعی مار.

**وەی‌بابە:** ئەی‌باوکە فا ای پدر! کمك.

**وەیتا:** ١) ئێرە؛ ٢) لێرە، لەیرە فا ١) اینجا؛ ٢) دراینجا.

**وەبتاڵ:** بەیناڵ، حەکیمی حەیوانات فا دامپزشك.

**وەبجا:** لەوجێگەیە، لەوشوێنە فا در آنجا.

**وەبخر:** شەرفروش فا ستیزە‌جو.

**وەیخۆ:** ببخۆرەوە، بی‌نۆشە فا بنوشش.

**وەی‌خودا:** پاڕانەوە لەخوا فا ای خدا.

**وەیر:** خاوەن، خودان، سەربەرست فا صاحب.

**وەی‌را:** ئەوجارە فا آندفعە.

**وەی‌ڕۆ:** ١) ئەی داخ، ئەی مخابن، بەداخەوە؛ ٢) وتەی سەیرمان کە تایبەتی ژنانە: (وەی‌ڕۆ ئەم‌پیاوە چەند سەیرە!)؛ ٣) ئەوڕۆژە فا ١) کلمهٔ تأسّف، دریغا؛ ٢) کلمهٔ تعجّب خانمانه؛ ٣) آن روز.

**وەبس:** شێخێك بوە گۆڕی لە مابی‌دەشتە فا وبس قرنی.

**وەبسە:** ناوە بۆ پیاوان فا نام مردانە.

**وەبسی:** ناوە بۆ پیاوان فا نام مردانە.

**وەبش:** وتەی ژان‌و دەرد، ناخ، ئۆف فا حرف درد.

**وەیشۆ:** ١) بی‌شۆرەوە: (ئەوی شت یوت وەیشۆ)؛ ٢) ئەم‌دانەویڵە بشۆ فا ١) بازشوی؛ ٢) دانە را بشوی.

**وەبشۆرە:** وەبشۆ فا نگا: وەبشۆ.

**وەیشۆم:** ١) دەبشۆرمەوە: (ببس‌بۆتەوە ناچارم وەیشۆم)؛ ٢) بۆچی ببشۆرمەوە؟ فا ١) بازمی شویم؛ ٢) بازشویم؟.

**وەیشوم:** ١) بەڵا، نسیبەت؛ ٢) مابەفتنە فا ١) بلا، مصیبت؛ ٢) فتنه‌انگیز.

**وەیشومە:** ١) وەبشوم؛ ٢) برێنی لە سەرمای سەخت‌و تەزوتۆشی زستان فا ١) نگا: وەبشوم؛ ٢) کنایه از سرما و کولاك سخت زمستان.

**وەیکە:** بیکەوە!، بازی‌کە!: (درگاکە داخراوە وەبکە، گرێ‌کوێرە بە وەبکە!) فا بازش کن!.

**وەیکەم:** وازی‌کەم، ببکەمەوە فا بازش کنم.

**وەیکەن:** ببکەنەوە فا بازش کنند.

**وەیگدی:** وشەیەکە بۆ خۆشەوبستی‌و بەزەییداهاننەوە ئێژنی فا کلمهٔ نوازش و ترحم.

**وەبگرە:** ببگرەوە: (کراسەکەم ناوبردی وەیگرە، تۆپت بۆداویم وەیگرە)

فا بازگیرش.

**وەبگرەوە:** وەبگرە فا بازگیرش.

**وەی‌گۆ:** ناوای گوت فا چنین گفت.

**وەی‌گوت:** وەی‌گۆ فا چنین گفت.

**وەی‌لا:** ئەوئەرەف فا آن سو.

**وەیلان:** سەرگەردان، ناوارەو بێ‌دەرەتان فا ویلان، سرگردان.

**وەیلۆ:** ١) وتەیەکە بۆ خۆشەویستی بەمناڵی دەڵێن: (وەبلۆ چەند قشنە)؛ ٢) بانگ کردنی دۆستی نێر بنە لەدوورەوە فا ١) کلمهٔ محبّت‌آمیز نسبت به کودك؛ ٢) کلمهٔ ندا برای دوست مذکّر.

**وەیلولو:** وتەی سەرەتای لاوك بەمانا ئەی دۆستەنێرە دوورەکە فا پیش‌درآمد بعضی از ترانه‌ها به‌معنی ای دوست مرد من.

**وەیلێ:** ١) وەیڕۆ، مخابن؛ ٢) بانگ کردنی دۆستی مێو بنە لەدوورەوە فا ١) دریغا؛ ٢) حرف ندابرای دوست مؤنث از راه دور.

**وەیلی‌لی:** سەربەندی لاوکە واتا: ئەی بارەمێو بنە دوردەستەکە فا پیش‌درآمد بعضی از ترانه‌ها به معنی ای معشوق دوردست.

**وەین:** مەکر، گزی‌و فێڵ: (جودی ژوەبنێ ژنان خاربویە) «مەسەل» فا مکر، نیرنگ.

**وەینەك:** کۆسەی سەرشانۆ، نوێن‌باز فا بازیگر.

**وەینێ:** ژنێکی قارەمانی کوردە کە بەبنی هەبە فا از زنان قهرمان اسطوره‌ای کُرد.

**وەبنیایش:** تواشاکردن، نێ‌ڕوانین فا نگاه کردن.

**وەیو:** بوك، وەوی فا عروس.

**وەیولە:** ١) بوکەڵە، بوکی منالان؛ ٢) گێژەڵوکە فا ١) عروسك؛ ٢) گردباد.

**وەیولەجنانێ:** گێژەڵوکە فا گردباد.

**وەیولێ:** بوکەڵەی منالان فا عروسك.

**وەیوە:** نازەبوك فا نازه عروس.

**وەی‌وەگەڕێن:** ١) بەلاگەردان؛ ٢) بەلاگێڕەوە فا ١) بلاگردان؛ ٢) صدقه.

**وەی‌وەی:** ١) وتەی داد لەدەس ژان‌و ئێش؛ ٢) وتەی سەیرمان: (وەی‌وەی لەم‌کارەت)؛ ٣) بەهەبەهە، وەهوەهە: (وەی‌وەی چمەجلیسێ بۆ دوێنێ لە دیدەو دڵ/ دڵبەر شەرابی گێڕا «سالم» کەبابی هێنا) «سالم» فا ١) کلمهٔ اظهار درد، وای؛ ٢) حرف تعجّب، وا؛ ٣) بەبە.

**وەبە:** ئەوهابە، ئاوابە فا چنین است.

**وەیەنە:** تربان، قەرناڵە فا سبد میوه‌چینی.

**وی:** ١) ئەو: (بۆ وی هاتوە)؛ ٢) دارەبی؛ ٣) وتەی سەیرمان: (وی جعەجییە!)؛ ٤) وەی، پێنی داد لەدەست ژان؛ ٥) مۆرانەی خوری‌خۆر فا ١) او؛ ٢) بید؛ ٣) حرف تعجّب؛ ٤) حرف اظهار درد؛ ٥) موریانهٔ پشم خوار.

**وێ:** ١) پێنی ئیشارەت بۆ مێوینە: (وێ گوت وانا: ژنەکە گوتی)؛ ٢) خۆ: (ویم وانا: خۆم)؛ ٣) بە، بێ: (بارەت وێ‌بە؟، وێمە)؛ ٤) ئەوێ،

نەوجێگە: (بۆ وێ دەچم)؛ ٥) دەسوناندا، پێ: (ئاگرەکە وێ کە، ئاگر وێ بە)؛ ٦) نەقالا، کۆشت: (وێ کەوتوم، وێ کەوە بزانە لەکوێیە)؛ ٧) ویستن، واستە: (دەمەوێ، نایەوێ)؛ ٨) وەك، شیە: (وێ جوون)؛ ٩) نۆڵە: (**وێکردنەوە** واتا: نۆڵەکردنەوە) ف ١) ضمیر مؤنث؛ ٢) خود؛ ٣) داشتن؛ ٤) آنجا؛ ٥) افروخته؛ ٦) کوشش؛ ٧) خواستن؛ ٨) شباهت؛ ٩) انتقام.

**ویارده**: رابردو، بوردو ف گذشته.

**ویانه**: بەهانە ف بهانه.

**وێبو**: ١) تابسا، داگرسیا؛ ٢) بوی: (پارەی **وێ بو**) ف ١) افروخته شد؛ ٢) داشت.

**وێبوون**: ١) تایسان؛ ٢) پێ بوون، لەلابوون ف ١) افروخته شدن؛ ٢) داشتن.

**ویت**: ١) ونراو؛ ٢) سەرگەردان، ویڵ ف ١) گفته شده؛ ٢) سرگردان، ول.

**وێت**: ١) بۆخـــۆت، خۆت؛ ٢) گەلـلایی: (کـاورا شێت و ویتە) ف ١) خودت؛ ٢) لاقید.

**ویتان**: مەلێکـە یە گێژوحوڵـی بۆنە نموونـە ف پرنده‌ایست مشهور به کم‌هوشی.

**وێتان**: خۆتان ف خودتان.

**ویتو**: فیتوو، فینه ف سوت.

**ویت‌ویتك**: بەرتوکێکی بیرۆزی یەزیدیەکانە ف ازکتابهای مقدس یزیدیان.

**ویتە**: ١) جوکەی جوجەڵەمەل؛ ٢) گۆرانی لەبن‌لێوانەوە ف ١) صدای جوجهٔ پرنده؛ ٢) زمزمه.

**ویتەویت**: ویتەی زۆر ف «ویتە» پیاپی.

**ویتیار**: قسەبێژ ف گوینده.

**ویجا**: ١) ئیتر چی؟؛ ٢) ئەوسا ف ١) دیگرچه؟؛ ٢) آنگاه.

**وێجا**: ویجا ف نگا: ویجا.

**وێجاری**: ئەوساکە، ئەوێ‌دەمێ ف آن دفعه.

**ویچ**: ١) بێژ، دابێژان؛ ٢) پڕی دەست لە شتێ: (لاویچ واتا: نیوەمشت) ف ١) عمل بیختن؛ ٢) پریك مُشت.

**ویچالەك**: زۆر بیچکەلانە یەزاراوەی زارۆکان ف کوچك به زبان کودکانه.

**وێچن**: بێژنگ ف غربال، بیزن.

**وێچنە**: وێچن ف غربال.

**وێچوو**: پەسند، شایسە: (زۆر پیاوێکی **وێچوو** بو) ف موردپسند، شایستهٔ احترام.

**وێچوون**: لێ‌کردن: (پایز لە پیرۆت **نەچێ**، کوڕەکەی لە خۆی **نەچێ**) ف شباهت.

**ویچە**: بۆ ئێرە ف به اینجا.

**ویخ**: نست، نبست، نەبوون: (وارو **ویخم** چو) ف نبود، نیستی، مقابل بود.

**وێخستن**: پێوەئاویزان کردن: (زنجیری **وێخستوە**) ف آویزان کردن یه.

**وێخە**: فەرمان بە وێخستن ف امر به آویزان کردن.

**وێدا**: یەوشوێنەدا، بۆ دوور دەڵێن: (وردا **وێدا** واتا: لێرولەوێ) ف ازآنجا.

**وێدان**: دانەدەست ف تسلیم کردن.

**وێدانەوە**: بۆگـەڕاندنەوە: (قەرزەکـەی **وێدامەوە**) ف بازپس دادن، اداکردن.

**وێدن**: ئەوەکەی دیکە ف آن دیگری.

**وی‌دەری**: ئەوێ، وێ‌دەرێ ف آنجا.

**وێ‌دەری**: ئەوێ، پێچەوانەی ئێرە ف آنجا.

**وێدی**: وێدن ف آن دیگری.

**ویر**: ١) بیر، هزر، فکر؛ ٢) بۆ لای، بۆ ئالی؛ ٣) چالاو، بیر؛ ٤) گۆرانی لەبن‌لێوان: (ویرەویرنە بۆ دەنگ بەرز ناکەی؟) ف ١) فکر، یاد؛ ٢) بەسوی؛ ٣) چاه آب؛ ٤) زمزمه.

**ویرز**: ١) زوزە، دەنگی زبری گربانی بەفەو: (ئەم **ویرەویرەت** لەچیە؟)؛ ٢) خبل، جاوخێل ف ١) گریه با صدای بلند و زبر؛ ٢) لوچ.

**وێر**: ١) ئازابەنی؛ ٢) ئازا؛ ٣) پووڵ لەبـــانی خەڵـك دان لە قاوەخـانـەو چێشـتـخـــانـــە؛ ٤) بوار، دەراو، جێگـەی پەرینـەوە لە چەم؛ ٥) برێنی لەفـرۆشتن (ئـاڵـووێردە کـا) ف ١) شجـاعت؛ ٢) شجاع؛ ٣) حسـاب دوستـان را پرداختن در رستوران وقهوه‌خانه؛ ٤) گُدار؛ ٥) کنایه از فروختن.

**وێڕ**: ١) خوار و ناله‌بار: (ئەم‌بزنە گێژ و وێڕە)؛ ٢) مانا، نیاز لە تسەو نوسراو؛ ٣) بۆر، گیایەکی گەڵادەرزی کوێستنانە ف ١) کج و کوله؛ ٢) معنی، گزاره؛ ٣) علفی است.

**ویرا**: بەبیر، بیرتیژ ف دارای حافظهٔ قوی، تیزهوش.

**وێرا**: مامۆستا، فێرکار ف استاد.

**وێرا**: ئازا، نەترس ف شجاع.

**وێڕا**: دەگەڵ، بێڕا، وەل ف همراه با.

**وێران**: ١) نەترسان؛ ٢) کاول؛ ٣) برینی لە حاڵ پەرێشانی: (**وێرانە** هەر باسی مەکەن) ف ١) جرأت کردن، نترسیدن؛ ٢) ویران؛ ٣) کنایه از پریشان‌حالی.

**وێران‌بوون**: کاول‌بوون، روخان، خاپوور بوون ف ویران شدن.

**وێران‌شەهر**: شارێکی کوردەلای ماردینی کوردستانی بەردەستی ترکان ف نام شهری در کردستان.

**وێران‌کردن**: کاول کردن، بەسەریەکا رماندن، خاپوورکردن ف ویران کردن.

**وێرانن**: نەترسین، وێران ف جرأت کردن.

**وێرانە**: کاول‌بوگ، خاپوور ف ویرانه.

**وێرانی**: خاپووربوگی، کاول‌بوویی ف ویرانی.

**ویراهە**: لە جێگەدوورەکە ف ازآنجای دور.

**وێرت**: ١) جێ‌لەوەڕ، چایەر، لەوەرگە؛ ٢) گزیری خان و ئاغـــا ف ١) چراگاه؛ ٢) مباشر ارباب.

**ویرد**: نزای لەبن‌لێوانەوە، دوعای بەپرتەپرت ف دُعای زیرلبی، ورد.

**وێرد**: کێرد، کێر، چەقو کە دەسکی ئانوشتێنەوە ف کارد.

**ویردار**: بیرەوەر، بەبیروهۆش، خودان‌هزر ف منفکّر.

**ویردن**: عافـــوکـردن، بووردن: (بـوبر جە تەقسیر جە پرێنبنسـاقی/ من

ڕۆژەردی ویم کافیەن کافی) «مەولەوی» ف بخشایش، عفو.

**وێردن:** رابردن، بوُرین ف گذشتن.

**وێرده:** رابردو، بوُراو ف گذشته.

**وبرز:** رابە، بلندبە، وەرەسەرپا، بەرزەوەبە ف برخیز، بلندشو.

**وێ‌رزان:** توُرەکردن بەقسەو دەست‌بازی: (**ویم‌دەرزێ دەسنم لێ بەرنادا**) ف سر بەسرگذاشتن.

**ویرغال:** شاهوٚ، شبنەشاهوٚ ف پرندهٔ بوتیمار.

**ویرغە:** جوٚرێ رەونی ولاخی سواریبە ف یورغە.

**وبرق:** قرەی بوٚق ف صدای قورباغه.

**وێرکوٚکانێ:** ئێروٚکانێ، ئائێرە ف همین جا.

**وێرکوٚکە:** وێرکوٚکانێ ف همین جا.

**وبرنج:** سەری پێچی کوٚلاٚن، ئانبشکە ف نبش.

**وێروٚك:** ئازا، نەترس، وبڕا ف شجاع، دلیر.

**وێروٚکانێ:** وێرکوٚکانێ ف همین جا.

**وێروٚکە:** وێرکوٚکانێ ف همین جا.

**ویرون:** ١) وشکاروٚ، بێرون؛ ٢) ئودەی دەرەوە، بیرون ف ١) خشکسار؛ ٢) اتاق بیرونی.

**ویرونە:** وێرانە ف ویرانە.

**وبرە:** ١) بیرهاتنەوە، کەوتنەباد؛ ٢) گوٚرانی لەبن‌لێوانەوە: (**وبرەوبر**)؛ ٣) کانزای سەخت ف ١) یادآوری؛ ٢) زمزمه؛ ٣) فلز.

**وبڕە:** قرە، دەنگی بەردەبەرەقانی ف صدای سنگ پرتاب شده از فلاخن.

**ویرە:** ١) ئێوارە؛ ٢) شی‌کردنەوەی مانا ف ١) غروب؛ ٢) تفسیر، تعبیر.

**ویرەگا:** درەنگان، ئێوارەی درەنگ ف غروب هنگام، سرشب.

**ویرەگە:** ویرەگا ف نگا: ویرەگا.

**وبرەوبر:** گوٚرانی لەسەرخوٚ، سوٚزە، ئێوربن ف زمزمه.

**وبرەوبڕ:** زوٚرەزوٚری گریان ف صدای ناهنجار شیون.

**ویرێ:** وێ‌دەرێ، ئەوێ ف آنجا.

**ویرین:** نەترسان، وێران ف نترسیدن، جرأت.

**وێرینگە:** گیایەکی گەلاٚدەرزی شیرەدارە بوٚ حەیوان خوٚشە شیرەکەی بوٚ دەرمان دەشێ ف گیاه گاوشیر.

**ویز:** وز، دەنگی جانەوەری زیلە وەك مێش‌ومەگەزو مێشوٚلەو زەرگەتە، وزە ف وزوز.

**ویژ:** دلٚ‌ئێك‌چوُن لە شتێ، بێز، قێز: (**قێزو ویز**) ف نفرت داشتن و دل برآمدن از چیزی.

**ویزان:** وزوزکردن، وزەوزکردن ف وزوزکردن.

**ویزو:** بێزو، مەگبرانێ ف وبار.

**ویزوێن:** جوٚرێ قالوٚنجەی کەسکی بالٚدار کە نەفرێ ف نوعی سوسك سبز پرنده.

**ویزویزە:** جوٚرێ مارمێلکەی درشت ف نوعی مارمولك درشت.

**وبزە:** ١) گیزە، دەنگی بەرێوەچوُنی گوللە؛ ٢) بەنامەکی بەلاماربردن بوٚ کەسێ: (**بەدارەوە هاتەویزەم شل‌شل کونامی**) ف ١) صدای گلوله در راه هدف؛ ٢) بواشکی و مخفیانه بر کسی حمله بردن.

**ویزە:** بەلاماری بەنامەکی بوٚ بردن ف بواشکی و مخفیانه سررسیدن.

**ویزەنگی:** زەنگو، ئاوزەنگی، رکێف ف رکاب زین.

**ویزین:** وزاندن، وزەکردن ف وزوزکردن.

**ویژ:** ١) پاشگری بەمانا جاوین، جوُن: (**کاویژ**)؛ ٢) پاشگری بەوانا: دابێژ: (ئاردویژ)؛ ٣) پاشگری بەمانا قسەکەر: (وتەویژ)؛ ٤) قسەکردن: (وتو ویژ)؛ ٥) خوٚی، بوٚخوٚی، وێش؛ ٦) حوٚلو گێل: (گێژو ویژ) ف ١) پسوند به معنی جونده؛ ٢) پسوند به معنی بیزنده؛ ٣) پسوند بەمعنی گوینده؛ ٤) گفتن؛ ٥) خودش؛ ٦) گیج و هالو.

**ویژا:** ١) زوٚر قسەزان‌و زمان‌باراو؛ ٢) کەسێ کە لەدابێژتن‌دا زوٚر خێرایە ف ١) سخن دادن فصیح؛ ٢) بیزندهٔ ماهر.

**ویژان:** ١) گوتن، وتن؛ ٢) دابێژان؛ ٣) قابشی کەلٚەوە؛ ٤) خوٚبان ف ١) گفتن؛ ٢) بیختن؛ ٣) چنیر وسط یوغ؛ ٤) خودشان.

**ویژانبەر:** کەلٚەوەبەند ف سبنج‌بند یا یوغ.

**ویژانن:** ١) گوتن، قسەکردن؛ ٢) بێژنن، دابێژتن ف ١) گفتن؛ ٢) بیختن.

**ویژتان:** خوٚتان، وێتان ف خودتان.

**ویژدان:** ویجدان، هەست‌کردنی دلٚو دەروُن ف وجدان، نهاد.

**ویژم:** دەڵێم، دبێژم، ئەوشم ف گویم.

**ویژمان:** خوٚمان، وێمان، ئەم‌بخوٚ ف خودمان.

**ویژن:** ئێژن، دبێژن، دەڵێن ف گویند.

**ویژنگ:** ١) بێژنگ؛ ٢) جوٚرت، وەنەوز، خەونوچکە ف ١) غربال، بیزن؛ ٢) پینکی، چرت‌خواب.

**ویژننە:** قسەکەر، بێژەر ف گوینده.

**ویژنە:** ویژننە ف گوینده.

**ویژە:** ١) باوێشك، باوشك؛ ٢) گوتە، وتە، بێژە؛ ٣) کەلٚەوەی ناو نیر؛ ٤) چەرمی نەرمی لەدەباغ‌دراو، مێشن؛ ٥) شێعرو پەخشان؛ ٦) بلێ، بێژە؛ ٧) پاك‌وخاوێن، نەمیس؛ ٨) لوس، حولی ف ١) خمیازه؛ ٢) گفتار؛ ٣) سبنج‌بند؛ ٤) چرم‌میشن؛ ٥) ادبیات؛ ٦) بگو؛ ٧) تمیز، پاك؛ ٨) صاف.

**ویژەبرە:** ڕێحانەکێوبلە ف ریحان کوهی.

**ویژەر:** ١) قسەکەر؛ ٢) زانا لە شێعرو نوسراوی پەخشانی دلٚنەڕانە ف ١) گوینده؛ ٢) ادیب.

**ویژەن:** بنێشت، جاجکە، پاچکە ف سقز.

**ویژەوان:** نوسەری شێعرو پەخشان ف ادیب.

**ویژەبی:** سەربە شێعرو پەخشان ف ادبی.

**ویژباگ:** گوتراو، وتراو، بێژراو ف گفته‌شده.

**ویژیاو:** ١) ویژباگ؛ ٢) دابێژراو ف ١) گفته‌شده؛ ٢) بیخته.

**ویژین:** گوتن، وتن ف گفتن.

**ویژینگ:** ویژنگ ف نگا: ویژنگ.

**ویس:** ١) بیست، شازدەو جوار؛ ٢) پاشگری بیستن، گوێ‌لێ‌بوُن: (**گوێ‌نەویس**)؛ ٣) خوُس، خوساو: (**خبس‌و ویسە**)؛ ٤) دەنگی جوجکەمەل: (**ویس‌ویس دەکا**)؛ ٥) روٚشنایی کەمی دوُر: (ئەسنیرە

ویس‌ویس دەکەن) ف ١) عدد بیست؛ ٢) پسوند شنوایی؛ ٣) خیس در آب؛ ٤) صدای نوزاد پرنده؛ ٥) سوسوی نور.

**وێس:** پاشگری بەوانا: ڕاوەستە: (**بوێس**) ف پسوند به معنی ایست.

**وێسا:** ڕاوەستا، جوڵەی نەکرد ف ایستاد.

**وێساگ:** ڕاوەستاو ف ایستاده، بی‌حرکت مانده.

**وێســان:** ١) ڕاوەسـتـان بەبێوە؛ ٢) نەجـوڵان ف ١) بر پا ایستادن؛ ٢) حرکت نکردن.

**وێساندن:** ڕاوەستاندن ف ١) متوقف کردن؛ ٢) بر پا واداشتن.

**وێسانن:** وێساندن ف نگا: وێساندن.

**وێساگ:** ڕاوەستاو ف ١) متوقف شده؛ ٢) بر پا ایستاده.

**وێساو:** ڕاوەستاو ف ١) متوقف شده؛ ٢) بر پا ایستاده.

**ویست:** ١) نارەزو، داوا؛ ٢) دۆست، یار: (**ویست‌و** نەویستم هەن)؛ ٣) بیست ف ١) خواست؛ ٢) دوست؛ ٣) بیست.

**ویستا:** ١) ئێستا، ئەلحان، نوکە، نهۆ، نها؛ ٢) نائێستنی ف ١) اکنون؛ ٢) هنوز.

**وێستا:** ١) ئێستە؛ ٢) نائێستە؛ ٣) ڕاوەستا ف ١) اکنون؛ ٢) هنوز؛ ٣) ایستاد.

**وێستان:** ١) وێسنا؛ ٢) ڕاوەستان بەپاوە؛ ٣) نەجوڵان ف ١) نگا: وێستا؛ ٢) بر پا بودن؛ ٣) نجنبیدن.

**وێستـانـەوە:** ١) دوبـارە وێسـتـان؛ ٢) بەرانبـەری و دەگژڕاچوون: (لێی **وێستامەوە** دوزللەم لێ‌دا) ف ١) ایستادن یا متوقف شدن دوباره؛ ٢) مقابله کردن.

**ویستن:** ١) بیستن، گوێ‌لێ‌بوون؛ ٢) خـواستن ف ١) شنیدن؛ ٢) خواستن.

**ویستە:** ١) پرسیار؛ ٢) دەرەتان، ڕێگەی دەرچوون ف ١) سؤال؛ ٢) مَفرّ، گریزگاه.

**ویسر:** دارێکی ڕەشی بۆن‌خۆشە دەنکە تەزبیحی لێ‌ چێ‌دەکەن ف درخت یُسر.

**ویسك:** لەڕ و لاواز، بەکلکێ ف لاغر مردنی.

**ویسکە:** ویس، ڕووناکی کەمی دوور ف سوی اندكِ دور.

**ویس‌ویس:** ١) دەنگی جوچکـەمـەلی سـورەسـاقە؛ ٢) زریوەزریوی ئەستێران ف ١) صدای جوجه‌پرندهٔ نوزاد؛ ٢) سوسوزدن ستاره‌ها.

**ویسە:** دەنگی بەچکەمەلی نازە لەخادەرچوك ف صدای جوجه‌پرندهٔ کوچولو.

**وێسـە:** ١) ئێستە؛ ٢) پاشگری فەرمان بەوێستان: (**ڕاوێسە، بوێسە**) ف ١) اکنون؛ ٢) ایست، امر به ایستادن.

**ویسەویس:** ویس‌ویس ف نگا: ویس‌ویس.

**ویسیای:** خوساو ف خیسیده.

**ویش:** ئەویش: (بۆویش بێنە، لەویش گەڕێ) ف او هم.

**وێش:** ١) خۆی؛ ٢) خواروخێچ؛ ٣) پەرت‌وبـڵاو، شاش، واش ف ١) خودش؛ ٢) کج و ناهموار؛ ٣) پرت و اشتباه کار.

**وێشان:** خۆیان ف خودشان.

**ویشك:** ئیشك، وشك ف خشك.

**ویشکە:** جیرەی کاڵ‌بۆکرێکار، وشکە ف مُزد نقدی بدون خوراك.

**ویشکەمس:** حەقی مزگەر بێ‌چێشت‌ونان ف مُزد کار مسگر بدون خوراك.

**ویشکەوەرد:** وشکەوەرد ف نگا: وشکەوەرد.

**ویشە:** خێروك ف نگا: خێروك.

**وێشە:** مێشە، بێشە، دەحل ف بیشه.

**ویشی:** ١) وشی میوە، وشـوێ؛ ٢) گوڵی دەخـڵ ف ١) خوشهٔ میوه؛ ٢) خوشهٔ غله.

**ویشی‌چن:** گوڵ‌چن، گوڵ‌چنەوە لە پەریز ف خوشه‌چین.

**ویشـی‌داش:** برێتی لە بێوەژنی فەقیر کە بە گوڵ‌چنی بەرێ‌دەچێ ف کنایه از بیوهٔ بینوا که خوشه‌چینی کند.

**ویشی‌کەر:** ویشی‌چن ف خوشه‌چین.

**ویق:** واق، واقە ف نالهٔ روباه و خرگوش.

**ویقاندن:** واقاندن ف ناله‌کردن روباه و خرگوش.

**ویقە:** ویق، واقە ف نگا: ویق.

**وێك:** وەئێکتر، ئێکی بۆ ئێکی تر ف به‌یکدیگر.

**وێك‌چون:** پێك‌شیبهان، لەئێکترکردن: (سوارەو پیرۆن **وێك‌دەچن**) ف به هم شباهت داشتن.

**وێکڕا:** پێکەوە ف باهم.

**وێ‌کردن:** ئاپساندن، پێکردن ف افروختن آتش.

**وێ‌کردنەوە:** تۆڵەساندن، تۆڵەکردنەوە ف انتقام گرفتن.

**وێك کەوتن:** ١) خۆ لەئێکتـردان؛ ٢) پێکـەوە بەشەڕهاتن ف ١) بەهم برخوردکردن؛ ٢) باهم جنگیدن.

**ویکۆڵ:** کوڵەبی، جۆرێ داربی ف نوعی بیدبُن.

**وێکە:** پاپسێنە، پێکە: (ئاگرەکە **وێکە**) ف برافروز، بیفروز.

**وێکەر:** ئاگرئاپسێن، پێکەر ف آتش‌افروز.

**وێ کەوتن:** ١) وەنـامـانـج کەوتن؛ ٢) تەقالاکردن بۆ بەبدابوونی شتێ: (**وێ‌کەوتوم** سۆراغی کارێ بکەم) ف ١) باهدف برخورد کردن؛ ٢) تعقیب کردن کاری.

**ویل:** زەنازەنا، چەقەو گورە ف سروصدا و جنجال.

**وێڵ:** ١) مرۆی پاش‌و بەشەرم‌وحەیا؛ ٢) شەرم؛ ٣) بەرەڵاو بێ جێ‌ورێ؛ ٤) گوللەی وەنیشانەنەکەوتو ف ١) آدم خوب و آزرم جوی؛ ٢) شرم؛ ٣) ول؛ ٤) گلولهٔ به هدف نخورده، پرت.

**وێڵ بوون:** ١) بەرەڵدابوون؛ ٢) وەدوکەوتن: (لەشوێن یار **وێڵم**) ف ١) ول شدن؛ ٢) به دنبال افتادن و سرگردان شدن.

**وێڵخر:** جەرچی ناوبازاڕ ف کاسب سرپایی در بازار.

**وێڵژی:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**وێڵ کردن:** بەرەڵداکردن ف ول کردن.

**وێلنگە:** وێزبنگە ف گیاه گاوشیر.

**ویلۆلیك:** ڕستـەزەنگولـەی پچـوك کە بەمنـاڵیەوە ناویزان ئەکـەن ف

زنگوله‌های کوچك که به کودك آویزند.

**وێڵه**: ۱) وێل، زه‌نازه‌نا؛ ۲) شوێنێکه له ده‌ره‌وی شاری سنه سه‌یرانگابه؛ ۳) ناوی گوندێکه ف ۱) سر وصدا؛ ۲) گردشگاهی است نزدیك شهر سنندج؛ ۳) نام دهی است.

**وێڵه‌په‌ر**: گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**وێڵه‌ده‌ر**: گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**وێڵه‌که**: ناوی دوگوندی کوردستانن به‌عسی له‌ناوی‌بردن ف نام دو روستای کردستان که توسط بعثیان ویران شدند.

**وێم**: ۱) خۆم؛ ۲) به‌من: (وێمده واتا: بمده‌به) ف ۱) خودم؛ ۲) به‌من.

**وێمان**: ۱) خۆمان؛ ۲) بمان، پێمان: (وێمان‌ده) ف ۱) خودمان؛ ۲) بەما.

**وێمه**: پێمه، لامه: (پاره‌ت وێ‌یه؟ به‌لێ وێمه) ف با من است.

**وێن**: ۱) بین، ئه‌وی ده‌بینێ؛ ۲) ئامرازی دبنن: (دوُروبن) ف ۱) بیننده؛ ۲) ابزار دیدن.

**وێنا**: پێچه‌وانه‌ی کوێر، چاوساغ، بینا ف بینا.

**وێنا**: شکڵ هاتنه‌وه‌به‌رچاو که ئاشنایه ف دیدن و دوباره شناختن.

**وێناکردن**: وێنا، شباندن ف شباهت کردن، بجاآوردن.

**وێناو**: دیتنی ئادباری به دڵ ف دیدن عینبات با چشم دل.

**وێنایی**: چاوساخی، سۆمابی ف بینایی.

**وێنایی**: وێناکردن ف نگا: وێناکردن.

**وێنجه**: گیابه‌کی سێ‌په‌ڕه‌ی به‌پنجه ده‌یچینن له گش ئالفێ بۆ ماڵات خۆشتره ف یونجه.

**وێنۆ**: ئه‌یبینێ ف می‌بیند.

**وێنۆ**: ئه‌یبنم ف می‌بینم.

**وێنه**: ئه‌وان ف آنها.

**وێنه**: ۱) وه‌کو، له‌جه‌شن؛ ۲) شکڵ؛ ۳) ئه‌سك؛ ۴) ئه‌وێ: (وا له‌وێنه)؛ ۵) نربان؛ ۶) گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف ۱) مانند؛ ۲) شکل؛ ۳) عکس؛ ۴) آنجا؛ ۵) سبد میوه‌چینی؛ ۶) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**وێنه‌کردن**: شێوه‌کردن ف نگا: شێوه‌کردن.

**وێنه‌گر**: ۱) شکڵ‌کێش؛ ۲) ئه‌سك‌کێش ف ۱) نقّاش، صورتگر؛ ۲) عکّاس.

**وێنه‌گرتن**: ۱) شکڵ‌کێشان؛ ۲) ئه‌سك‌کێشان ف ۱) نقّاشی کردن، تصویر کشیدن؛ ۲) عکس انداختن.

**وێنه‌گری**: ۱) کاری ئه‌سك‌کێش؛ ۲) کاری شکڵ‌کێش ف ۱) نقّاشی، صورتگری؛ ۲) عکّاسی.

**وێنه‌گوهێز**: ئه‌له‌فیزیۆن ف تلویزیون.

**وێنه‌گه‌ری**: وێنه‌گری ف نگا: وێنه‌گری.

**وێوڵ**: داریکی دارستانه له‌دارمازوُده‌کا، زڕه‌مازوُ ف درختی است جنگلی شبیه مازوج.

**وێوه**: بۆ ئه‌ولا، بۆ دوُر: (وێوه بچو) ف به‌آن طرف.

**وێوین**: خۆبین، خۆپه‌سند ف خودبین.

**ویه**: وشه‌ی بڕواپێکردنه . واتا: بێ‌گومان ف بی‌تردید.

**ویه**: بێلی‌دارین، پاڕۆ ف پارو.

**ویه‌رده**: رابوردو ف گذشته.

**ویه‌رده‌ی**: بگردن ف گذشتن.

**ویه‌یش**: ویایش، خه‌نین، که‌نین، که‌ن ف خنده.

**ویی**: خه‌نین، که‌نین، بیکه‌نین ف خنده.

**ویی**: ۱) خۆی؛ ۲) پێی، به‌ئه‌و: (پاره‌که‌ی پێم‌داناردی ویی‌ده) ف ۱) خودش؛ ۲) به او.

**وی‌یان**: ۱) وێشان، خۆیان؛ ۲) به‌وان: (نانت‌ده‌مێ وی‌یان ده) ف ۱) خودشان؛ ۲) به‌ایشان.

**وه‌یو**: چیت لێ‌قه‌وماوه؟ ف تورا چه‌شده است؟.

**وی یه**: پاڕۆ، بێلی‌دارین ف پارو.



**هـ**: ١) بزاویکـە لەدوی وشـە بۆ خەبەردان لە چۆنبەنی: (کورنە، دریژە، لوسە، زبـرە)؛ ٢) پەسن و سفەت دەکاتەناو: (سەوزە)؛ ٣) پاشگری پچـوك کردنەوە: (کورنە)؛ ٤) نامزازی بانگ کردن: (بابزە، حەسەنە، مامە، بابە) فـ ١) پسـونـد بە معنی است؛ ٢) حرف تبدیل صفت بە اسم؛ ٣) پسوند تصغیر؛ ٤) حرف ندا.

**هٔا**: نە، نەخێر فـ نە.

**هئا**: نە، نەخێر فـ نە.

**ها**: ١) وەرگرە: (**ها** مشت، **ها** نان بخۆ)؛ ٢) پێچەوانەی نیە: (**ها** لێرە، **ها** لەماڵ)؛ ٣) چیت وت؟؛ ٤) ونەی جواو لەجیبانی بەلێ، نا؛ ٥) خەبەر جیە؟: (**هـا** کەی هاتـەوە؟)؛ ٦) نەوەنـا: (**هـا** دەچم)؛ ٧) ونـەی ناگادارکردن یەگەڤەوە: (فومار نەکەی ها، **ها** پێت دەلێم)؛ ٨) پاشگری نیشـانەی کۆ: (سەنەهاساڵە)؛ ٩) گەیشنەبەرەوە، ئاما: (غەلبفە **ها** بۆ ماڵمان)؛ ١٠) دباری‌دا، مەعلوم‌بو: (ها نەوە زانیم جیە)؛ ١١) خەبەر، ناگا: (هـام لیْ‌نیە، های لیْ‌نیە)؛ ١٢) نەم: (هـارۆ وانا: ئەمرۆ) فـ ١) بگیر؛ ٢) موجود است، هست؛ ٣) چەگفتی؟؛ ٤) بلی، آری؛ ٥) چە خبـر است؟؛ ٦) اینـك، اکنـون؛ ٧) حرف تنبیە و تحـذیر، هان؛ ٨) علامت جمع؛ ٩) آمد؛ ١٠) پس معلوم شد؛ ١١) آگاهی، اطلاع؛ ١٢) این.

هاپ: ئاپ، برای باوك، مام فـ عمو، عمّ.

**هاپۆ**: ١) هاپ؛ ٢) بانگ کردنی مام فـ ١) عمو؛ ٢) ای عموا.

**هات**: ١) ئامـا، گەیشـنـەبـەرەوە، ها؛ ٢) بەخت، ئالـح؛ ٣) ساڵی زۆر بەحـاسڵ: (ئەوساڵ ساڵەکەی **هاتە**)؛ ٤) پاشگری کۆ: (میوە**هات**)؛ ٥) خەبەرت، ناگات: (**هات** نیە، **هات** لیْ‌نیە) فـ ١) آمد؛ ٢) شانس؛ ٣) سال پرمحصول؛ ٤) پسوند جمع؛ ٥) خبرت، اطّلاعت.

**هاتگ**: کەسێ گەبشتوەتەبەرەوە فـ آمدە، رسیدە.

**هاتگەخۆیا**: بەخۆدا هانوە، گەشەی کردوە فـ شکوفاشدە، سرحال آمدە.

**هاتم**: ١) گەیشتمەبەرەوە، ئامام؛ ٢) بەختم: (**هاتم** نیە) فـ ١) آمدم؛ ٢) شانسم.

**هاتن**: ١) بەکـۆمـەڵ، گەیشـتـەبەرەوە: (بزن و مەڕ **هاتن**، خەڵفەو دەروێش **هاتن**)؛ ٢) ناخـۆ گەیشتنـەبەرەوە؛ ٣) چاوگەی گەیشتن لەڕێوە؛ ٤) دەست‌بەجێ وڵەکردنی ...؛ ٥) نیشانەی بەرکاری: (**هاتنە**کوشتن، وانا: کوژران) فـ ١) آمـدند؛ ٢) آیا آمدند؟؛ ٣) آمدن؛ ٤) وزیدن باد؛ ٥) علامت مفعولی.

**هاتن‌بەخۆدا**: بەخۆداهاتن، گەشەکردن فـ شکوفاشدن.

**هاتن‌وچـوون**: ١) ئاموشۆ؛ ٢) گەیشتنەبەرو ڕۆیشتن فـ ١) آمدوشد؛ ٢) آمدند و رفتند.

**هاتنە**: ١) هیچ خەبەر نیە؛ ٢) گەیشتونەبەرەوە فـ ١) خبری نیست؛ ٢) آمدەاند.

**هاتنەبا**: وەباهاتن فـ جفت‌خواهی دڵە.

**هاتنەبار**: ١) ڕێك‌وپێك‌بوون؛ ٢) سازان و ڕازی‌بوون فـ ١) هموارشدن؛ ٢) سازش کردن و راضی شدن.

**هاتنەبران**: نزیك‌بە خەلاس‌بوون فـ نزدیك بە اتمام.

**هاتنەبڕین**: شیاوی بڕدران، بڕان: (دارەکە **هاتەبڕین**) فـ قابل بریدە شدن.

**هاتنـەبـەر**: ١) بەرگرتنی دار؛ ٢) نزیك‌بوون فـ ١) بەثمـر نشستن؛ ٢) نزدیك شدن.

**هاتنەبەرِبار**: ملدان، دەست لەسالاری‌بەردان فـ از لج دست برداشتن.

**هاتنەبەرەوە**: بۆ نزیك هاتن فـ نزدیك شدن.

**هاتنەبەرهەم**: گەیشتنەکانی بەروبودان فـ بەثمرنشستن.

**هاتنەپاڵ**: تێکەڵاوبوون، لیْ‌زیادبوون فـ اضافەشدن بە.

**هاتنەپێ**: بەملداهاتن، بەسەرداهاتن، نۆش‌بوون: (قەرزم **هاتۆتەپێ**) فـ بە گردن افتادن، برعهدە قرارگرفتن.

**هاتنەپێش**: ڕوودان، قەومان فـ روی دادن، پیشامد.

**هاتنەتماشا**: بۆ دیتن هاتن فـ بەتماشا آمدن.

**هاتنەتێو**: بۆ ناوەوە هاتن فـ بەدرون آمدن، داخل شدن.

**هاتنەخاڕن:** خوران [ف] خورده‌شدن.

**هاتنەخوار:** ١) بەرەژێر بوون؛ ٢) بڕبنی لە هاتنەبەربار [ف] ١) پایین آمدن؛ ٢) دست از لجبازی برداشتن.

**هاتنەخوارن:** هاتنەخاڕن [ف] خورده‌شدن.

**هاتنەخوران:** ١) هاتنەخاڕن؛ ٢) وەخوروکەوتن [ف] ١) خورده‌شدن؛ ٢) به‌خارش افتادن.

**هاتنەخەلاس بوون:** نزیك بە تەواوبوون [ف] نزدیك به تمام شدن.

**هاتنەخەو:** دەخەوی کەسێدا دیتران [ف] به‌خواب کسی آمدن.

**هاتنەخەون:** هاتنەخەو [ف] به‌خواب کسی آمدن.

**هاتنەدەر:** دەرچوون، دەرهاتن [ف] بیرون آمدن.

**هاتنەدی:** وەدی‌هاتن [ف] به‌وقوع پیوستن.

**هاتنەدیل:** هاتنەدی [ف] به‌وقوع پیوستن.

**هاتنەڕو:** ئاشکرابوون، دیارکەوتن: (کارەکە **هاتەڕو**، عەیب **هاتۆتەڕوی**) [ف] آشکار شدن.

**هاتنەڕەدا:** مل‌دان، ڕازی‌بوون [ف] راضی شدن، زیر بار رفتن.

**هاتنەڕێ:** تووش‌بوون، بەسەرهات [ف] پیش‌آمد، برسرآمدن.

**هاتنەڕێگە:** ١) هاتنەڕێ؛ ٢) هاتنەبار [ف] ١) پیش‌آمد؛ ٢) سازش کردن، به‌راه آمدن.

**هاتنەزمان:** جواب‌دانەوە بەتووڕەیی [ف] به‌حرف آمدن.

**هاتنەزوان:** هاتنەزمان [ف] به‌حرف آمدن.

**هاتنەژان:** وەژان‌هاتن، ژان‌کردن [ف] به درد آمدن اندام.

**هاتنەژوور:** ١) چوونەناو؛ ٢) بەرەوسەرەوهاتن [ف] ١) داخل شدن؛ ٢) روبه‌بالاآمدن.

**هاتنەژۆر:** بەرەوبالا هاتن [ف] روبه‌بالا آمدن.

**هاتنەژێربار:** کەوی‌بوون، ڕام‌بوون، مل‌دان [ف] رام شدن.

**هاتنەساو:** تیژبوونی تیغ بە بەردەسان [ف] تیزشدن تیغ با فسان.

**هاتنەسۆ:** هاتنەژان. بۆ برینی دەڵێن [ف] به‌درد آمدن زخم.

**هاتنەسۆراغ:** سەردان لە کەسێ: (**هاتەسۆراغم** داوای قەرزەکەی کرد) [ف] سُراغ کسی رفتن.

**هاتنەسوێ:** ١) هاتنەسۆ؛ ٢) هاتنەتماشا [ف] ١) به‌دردآمدن زخم؛ ٢) به‌تماشا آمدن.

**هاتنەسەر:** ١) خەیاڵ لە کاری‌دان: (**هاتۆتەسەرم** بچمەشار)؛ ٢) بەسۆراغ‌هاتن: (**هاتوتەسەرم** بۆ بیگار)؛ ٣) هاتنەژوور؛ ٤) تووش‌بوون: (بەڵا بەکم **بەسەرهات**) [ف] ١) خیال کاری کردن، به فکر انجام کاری افتادن؛ ٢) به‌سراغ آمدن؛ ٣) بالاآمدن؛ ٤) دچار شدن.

**هاتنەسەرچاك:** دیدار لە گۆڕی پیاوچاکان کردن [ف] به زیارت قبر اولیاء آمدن.

**هاتنەسەرچاکی:** ١) هاتنەسەرچاك؛ ٢) دەست لەخراپەبەردان [ف] ١) به زیارت قبر اولیاء آمدن؛ ٢) راه صلاح گرفتن.

**هاتنەسەرچۆك:** ١) لەسەر دوو ئەژنۆ دانیشتن بۆ ڕێزگرتن لە گەورەپیاو؛ ٢) بریتی لە بەزین و تەسلیم‌بوون [ف] ١) بر زانو نشستن در حضور بزرگتران؛ ٢) کنایه از تسلیم شدن، به زانو درآمدن.

**هاتنەسەرخۆ:** ١) بووژانەوە؛ ٢) بێداروهۆشیاربوونەوە [ف] ١) سرحال آمدن؛ ٢) هشیارشدن.

**هاتنەسەرشار:** ١) گەیشتنەسەر مەیدانی گەمە؛ ٢) دەورەلەشاردانی دوژمن [ف] ١) به‌آخر میدان بازی رسیدن؛ ٢) شهر را محاصره کردن.

**هاتنەسەرشەك:** ١) هاتنەسەرچۆك؛ ٢) شەگەهاتنی جگ [ف] ١) نگا: هاتنەسەرچۆك؛ ٢) «شه‌گه» آمدن شتالنگ.

**هاتنەسەرکلك:** خۆحازرکردنی مار بۆ شەڕ [ف] آمادگی مار برای جنگ.

**هاتنەسەرلا:** ١) سەرسەختی و لاساری کردن: (لێمان **هاتۆتەسەرلا** بەقسەمان ناکا)؛ ٢) کەوتنە سەرتەنیشت [ف] ١) تمرّد ولجبازی؛ ٢) بر پهلو افتادن.

**هاتنەشکایەت:** چوونەلای دەسەڵاتدار بۆ دادپرسین [ف] به‌شکایت آمدن.

**هاتنەقسە:** وەقسەهاتن، وەدەنگ‌هاتن [ف] به‌سخن آمدن.

**هاتنەقوتان:** لێدران [ف] کتك خوردن.

**هاتنەکار:** ١) وەکارکەوتن؛ ٢) بۆ کارکردن ئامان [ف] ١) به‌کار افتادن؛ ٢) آمدن برای کارکردن.

**هاتنەکایەوە:** ١) بەحیساب‌هاتن لەناوخەڵکا: (مام‌پایز ئێستا **هاتۆتەکایەوە**)؛ ٢) بۆ یاری‌کردن ئامادەبوون [ف] ١) به‌حساب آمدن شخصیّت در جمع؛ ٢) برای بازی آمدن.

**هاتنەکردن:** ١) شیاوی کردن: (ئەم‌کارە **دێتەکردن**)؛ ٢) ئەنجام‌دران [ف] ١) سزاوارکردن، شایستهٔ انجام دادن؛ ٢) انجام شدن.

**هاتنەکرن:** هاتنەکردن [ف] نگا: هاتنەکردن.

**هاتنەکڕین:** ١) شیاوی کڕین: (**دێتەکڕین** گران‌نیە)؛ ٢) کڕدران [ف] ١) سزاوار خریدن، قابل خریدن؛ ٢) خریده‌شدن.

**هاتنەکوشتن:** کوژران [ف] کشته‌شدن.

**هاتنەکوڵ:** دەس‌کردن وە جۆشیان [ف] جوش آمدن.

**هاتنەکۆڵ:** چوونەسەرپشتی کەسێ [ف] برکول کسی سوارشدن.

**هاتنەگرتن:** گیران [ف] گیرافتادن.

**هاتنەگرین:** دەست‌کردن بە گریان [ف] به‌گریه افتادن.

**هاتنەگۆڕ:** هاتنەڕو [ف] نگا: هاتنەڕو.

**هاتنەگوڕ:** بووژانەوە [ف] سرحال آمدن.

**هاتنەگەڕ:** وەگەڕکەوتن [ف] به‌گردش افتادن آسیاب و چرخ.

**هاتنەگیر:** هاتنەگرتن [ف] گیرافتادن.

**هاتنەلا:** ١) سەرلێدان، دیدەنی‌کردن؛ ٢) نزیك‌بوونەوە؛ ٣) بریتی لەمردن [ف] ١) دیدارکردن؛ ٢) نزدیك شدن؛ ٣) کنایه از مُردن.

**هاتنەلادا:** بەلاداهاتن، خواربوونەوە بەلای تەنیشتا [ف] کج شدن به جانب، میل کردن، مایل شدن.

**هاتنەلاوە:** دوورکەوتنەوە لە شتێ [ف] کنار گرفتن.

**هاتنەناو:** ١) هاتنەنێو؛ ٢) تێکەڵاوبوون: (تۆش ناوت **هاتەناو** ناوان) [ف] ١) داخل شدن؛ ٢) آمیختن، قاطی شدن، مخلوط شدن.

**هاتنەو:** ١) گەیشتنەوە بەرەوە؛ ٢) بڕوانە هیچ نیە [ف] ١) برگشتند؛ ٢) ببین هیچ نیست.

**هاتنەوە:** گەڕانەوە ف باز آمدن.
**هاتنەوەجێ:** خۆشەوەبوونی ئەندامی وەرگەڕاو ف جا افتادن استخوان از جا دررفته.
**هاتنەوەحاڵ:** بوژانەوە ف سرحال آمدن بعد از فقر یا بیماری.
**هاتنەوەسۆ:** کولانەوەی برین ف تازه شدن زخم.
**هاتنەوەسەرخۆ:** سانەوە لەپاش دەردو ئازار ف آسودن بعد از درد و ناراحتی.
**هاتنەوەهۆش:** وشیاربوونەوە دوای بێ‌هۆشی ف بەهوش آمدن.
**هاتنەوەیەك:** وێك‌هاتنەوەی لێك‌ترازاو ف بەهم آمدن ازهم دررفته.
**هاتن‌هەڤ:** لەدەوری یەکتر کۆبوونەوە ف گردهم جمع شدن.
**هاتنەهەی:** بەدەعبەبوون، فیزلێ‌بەبدابوون ف منکبّر شدن.
**هاتو:** ١) هانگ؛ ٢) ئەگەرکو: (هاتو لەماڵ‌نەبو چی‌بکەم؟) ف ١) آمده؛ ٢) اگر، در صورتی که.
**هات‌وبات:** خۆ و بەخت ف بسته بەشانس.
**هاتوچو:** ١) هانوچۆ؛ ٢) گەبشنەبەرەوەو ڕۆیشت ف ١) نگا: هانوچۆ؛ ٢) آمد و بعد رفت.
**هاتوچۆ:** ١) ئاموشۆ؛ ٢) لەرەو جوولەی دالەقای؛ ٣) سەفەرکردن‌و گەڕان: (دایم لەهاتوچۆدایە) ف ١) آمد وشد؛ ٢) نوسان؛ ٣) گشت و سفر.
**هاتوچۆن:** گەڕان بەزۆرلادا ف سفر و سیاحت کردن بە اطراف.
**هاتوچۆن کەر:** ڕێبوار، ڕێوگ ف رهگذر، مسافر در راه.
**هاتوَر:** باگردان ف بام غلتان.
**هاتوُر:** تیلای زل کە گێچ‌و شتی تری پێ‌ورددەکەن ف چماق سنبر برای کوبیدن گچ و امثال آن.
**هاتول:** ١) ناربکارانی پارێزگاری؛ ٢) لاگرانی کەسێ لەشەڕوکێشەدا ف ١) گروه دفاعی؛ ٢) هواداران کسی در جدال و نزاع.
**هاتولك:** هانۆل ف نگا: هانۆل.
**هاتـــوُن:** ١) نوُن، ئاگردانی حەمـام؛ ٢) دۆزەهـ، جەحـــەنـــدەم؛ ٣) گەبشنوونـەبـەرەوە: (هاتوُن نەهاتوُن بەهاتوُن) ف ١) گلخن؛ ٢) جهنّم؛ ٣) آمده‌اند.
**هاتـوُنە:** ١) گەیشتوونەبەرەوە، هاتوُن؛ ٢) جەحەندەمە ئەوەندە گەرمە ف ١) آمده‌اند؛ ٢) مانند جهنّم است از شدّت گرما.
**هاتوُمەتەوە:** گەڕاومەوە ف بازآمده‌ام.
**هاتوُنەتەوە:** گەڕاونەوە ف بازآمده‌اند.
**هاتوُنەوە:** گەڕاونەوە ف بازآمده‌اند.
**هات‌ونەهات:** خۆ و بەخت، هات‌وبات ف بسته بەشانس.
**هات‌وهاوار:** دادوفەریاد، جەقەوگوڕە، زەنازەنا ف داد وفریاد.
**هات‌وهوُت:** شات‌وشوُت ف لاف و گزاف.
**هات‌وهەو:** گوڕەگوڕی سواران لە ئەقڵەبازی ف هو و جنجال سواران در مسابقه.
**هاتوُین:** گەبشتو بنەبەرەوە ف آمده‌ایم.
**هاتوُبنەوە:** گەڕاوبنەوە ف بازآمده‌ایم.
**هاتە:** ١) هات، بەخت، تالح؛ ٢) بیرێ کە ئەکەوێتەدڵەوە ف ١) شانس؛ ٢) خاطره.

**هات‌هات:** قسەداکەوتن بە هاتنی کەسێ یا کۆمەڵێ‌و بەدرۆدەرچوُن: (بوُ بە هات‌هاتی ڕۆمێ) ف شایعهٔ دروغین آمدن کسی یا جمعی.
**هاتەر:** ئاتەر، ئاور، ئاگر، ئایەر ف آتش.
**هاتەران:** قسەپەڕاندن، ڕاوانن، وڕێنە ف هذیان.
**هاتەران‌پاتەران:** قسەی بێ‌ماناو هیچ‌وپوُچ ف پرت و پلا، چرندوپرند.
**هاتەرێ‌ماتەرێ:** جێژنەپیرۆزەی نەورۆز بەمـانا ئەی‌ئاگر ئەی‌دا بە. منالگەل لە شەوی نەورۆز دەچنەسەربانان‌و دەڵێن: *هاتەرێ‌ماتەرێ پیرۆزینـان بێنەسەرێ، لەماڵانیشەوە خای سوُرکراویان ئەدەنێ* ف عبارت تبریك عیدنوروز که معمولاً از طرف کودکان برای دریافت عیدی گفته می‌شود.
**هاتەهات:** هات‌هات ف نگا: هات‌هات.
**هاتەهاتە:** هات‌هات ف نگا: هات‌هات.
**هاتی:** ١) هاتگ؛ ٢) گەیشتبەبەرەوە؛ ٣) هات، بەخت؛ ٤) ساڵی پڕ بەهرە ف ١) آمده؛ ٢) آمدی؛ ٣) اقبال؛ ٤) سال پر برکت.
**هاتیار:** هانگ ف آمده، از راه رسیده.
**هاتیت:** گەیشتبەبەرەوە، هاتی، ئامای ف آمدی.
**هاتین:** گەیشتینەبەرەوە، ئامابن ف آمدیم.
**هاتینە:** ١) هاتوبن؛ ٢) هاتون ف ١) آمده‌ایم؛ ٢) آمده‌اند.
**هاتینـەوە:** ١) گەڕاینـەوە، وەگەڕیاین؛ ٢) هاتـوُنـەوە، گەڕاونەوە ف ١) بازآمده‌ایم؛ ٢) بازآمده‌اند.
**هاج:** ١) بزوز، دانـەسـەکنـاو: (منـاڵێکی هارو **هاج**)؛ ٢) گێژ، سەرگێژ: (**هاج‌و واج بوُم**) ف ١) ناآرام، بازیگوش؛ ٢) هاج وواج.
**هاجاڕ:** بنەجاڕ، بنەگیابەکە ئەخورێ ف نگا: بنجاڕ.
**هاجاس:** ١) ناوبژی؛ ٢) ناوبژیکەر ف ١) میانجیگری؛ ٢) میانجی.
**هاجاس کەر:** ناوبژیکەر ف میانجی.
**هاجرە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هاجسنی:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای کردستان که رژیم بعث آن را ویران کرده است.
**هاجڕەشك:** بـەڕەسیلکەی ناومالان، حاجی‌ڕەشـك، هاج‌هەجك ف پرستو.
**هاجوُج:** عاجوُج، ئاجوُج ف یأجوج.
**هاجوواج:** گێژوویژ ف هاج وواج، سرسام و گیج.
**هاجە:** داوێنی چادر ف دامنهٔ خیمه.
**هاجەت:** حاجەت، ئەسپابی ماڵ ف لوازم منزل.
**هاجەر:** ناوە بوّ پیاوان‌و ژنان ف نام مردانه و زنانه.
**هاجی‌بایف:** حاجی‌بابف ف نگا: حاجی بایف.
**هاجەرەمەندا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شده توسط رژیم بعث عراق.
**هاچار:** ئاچەر، کلیل، مفتە ف کلید.
**هاچە:** ١) قافە، لکی دولکە، حاچە: (داریکی دوهاچەی هێنا)؛ ٣) هاچە

ف ١) شاخهٔ چوب دوشاخه؛ ٢) دامنهٔ خیمه.

**هاچەر:** هاچار ف کلید.

**هاچەسو:** ناوی دێ‌یەکە ف نام روستایی است.

**هادار:** نادار، نەجوڵ، بێ‌بزاو ف بی‌حرکت، ساکن.

**هادر:** دەس‌بەجێ، بێ‌درەنگ‌کردن ف فوراً.

**هادری:** هادر ف فوراً.

**هادی:** ناوی پیاوانە ف نام مردانه.

**هار:** ١) سەگێ کە لە نەخـۆشی مێشکەرە شێت بو بێت؛ ٢) بڕێنی لە بیاوی بەدفەڕ بەئازار؛ ٣) بڕێنی لە مرۆی زیرەك و وریا؛ ٤) بڕێتی لە نۆقرەتەگر؛ ٥) خوار، ژێر، ژێرو ف ١) هار، سگ هار؛ ٢) کنایه از مردم‌آزار؛ ٣) کنایه از زیرو زرنگ؛ ٤) کنایه از ناآرام؛ ٥) پایین، پابینی.

**هاڕ:** ١) ئامرازی وەك ئارد وردکردن؛ ٢) کەسێ کە شتێ وەك ئارد لێ‌دەکا؛ ٣) بەرداش ف ١) ابزار آردکردن؛ ٢) کسی که چیزی را آرد کند؛ ٣) سنگ آسیا.

**هاڕئاسیاو:** بەرداش ف سنگ آسیا.

**هاڕا:** وردکرا، کرا بە آرد ف خرد شد، آرد شد.

**هارام:** هێدی، هێمن، ئارام ف آرام.

**هاڕان:** وردبوون، بەئاردبوون ف خردشدن مانند آرد.

**هاڕاندن:** ١) وردکردن وەك ئارد؛ ٢) نارەتەلێدان ف ١) خردخاك کردن؛ ٢) نعره‌زدن، غرنبیدن.

**هاڕاو:** وردکراو ف خردشده، آردشده.

**هاڕاوە:** خاکە، شتێ کە وەك ئاردی لێ‌کراوە ف خاکه، ریزهٔ خردشده.

**هاربر:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هاربـوون:** ١) نەخـۆشی‌مێشك گرتن، تووشی نەخۆشی هاری هاتن؛ ٢) بڕێنی لە بەدفەڕی ف ١) هارشدن، بەبیماری هاری گرفتار شدن؛ ٢) کنایه از مردم‌آزاری و موذیگری.

**هارتوهورت:** هات‌وهوت ف لاف و گزاف.

**هارد:** ئارد، دەخڵی لەئاش و دەستاڕ لێ‌کراو، واتا هاڕدراو ف آرد.

**هاڕدرا:** کرابەئارد ف آردشد.

**هاڕدراو:** هاڕاو ف آردشده.

**هاڕراو:** هاڕدراو ف آردشده.

**هاڕراوە:** هاڕاوە ف خاکه، ریزهٔ کوبیده.

**هاڕە:** دەنگی زۆر بەنەوژمی دڵ‌لەرزێن ف غرنبه.

**هارسم:** ١) بەرسیلە؛ ٢) ناوی بەرسیلە ف ١) غوره؛ ٢) آب غوره.

**هارمـەنـدە:** نۆکێکە ژن نەیکەن واتا: هاربێ تووشی نەونەخۆشبە بێ کە سەگی بێ‌هاردەبێ ف نفرین زنانه، هارشوی.

**هارمێ:** هرمی ف گلابی.

**هارۆ:** ئەمڕۆ، ئیرڕۆ ف امروز.

**هاڕۆ:** ١) بوك، بدو؛ ٢) نارو، خەبار؛ ٣) شەوبلکە، شەوبلاکە ف ١) لثّه؛ ٢) خبار؛ ٣) آرواره.

**هارۆساره:** ئەمڕۆسبەی، نەفرەدان ف امروز و فرداکردن.

**هاروهاج:** ١) بزۆزو نۆقرەنەگر؛ ٢) شەڕفرۆش و بەنەنشقەلە ف ١) ناآرام و بازیگوش؛ ٢) ستیزه‌جو.

**هاروێ:** ١) نارو، هاڕو، خەبار؛ ٢) بوك، بدو، هاڕۆ ف ١) خیار؛ ٢) لثه.

**هارە:** ١) هاڕە، نەعرەنە، نارەنە؛ ٢) بەرداش؛ ٣) نزترە ف ١) غرنب؛ ٢) سنگ آسیا؛ ٣) قارقارك.

**هارەدەسی:** دەستاڕ ف دستاس.

**هارەکردن:** ١) نەڕاندن؛ ٢) تێك‌ڕخانی چیا، داڕرخان ف ١) نعره‌زدن؛ ٢) فروریختن کوه.

**هارەگـل:** ١) دەسـتاڕ؛ ٢) جون، بەردی لەجێگەی دەسکاونگ ف ١) دستاس؛ ٢) هاون سنگی.

**هارەماسی:** هەرەماسی، جۆرێ ماسی ف اره ماهی.

**هارەهار:** هاڕەی زۆر، دەنگی زەلامی بەسام ف غرنبهٔ بسیار.

**هاری:** ١) ناری، ناریکاری؛ ٢) نەخۆشی شێت بوونی سەگ؛ ٣) بڕێتی لە شەڕفرۆشی و نارادردانی خەڵك ف ١) کمك؛ ٢) بیماری هاری؛ ٣) کنایه از ستیزه‌جو یی و مردم‌آزاری.

**هاری:** بەلێ، ئاری ف آری.

**هاڕی:** ڕردی‌کرد وەك ئارد ف آرد کرد.

**هاڕێ:** ١) نزترە؛ ٢) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ١) قارقارك؛ ٢) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هاڕیا:** هاڕدرا، هاڕا ف آرد شد.

**هاڕباگ:** هاڕاو ف خردشده.

**هاڕبان:** هاڕان ف خردشدن.

**هاڕباو:** هاڕباگ، هاڕاو ف خردشده.

**هاریای:** نەشەنەکردو، هێوەچوونی نەخۆشی ف زخم یا بیماری پیشرفته.

**هاریك:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شده توسط رژیم بعث عراق در کردستان.

**هاریکار:** ئاریکار، کەسێ کە کۆمەگ بە بەکێ دەکا ف کمك کننده.

**هاریکاری:** ئاریکاری، کۆمەگ ف کمك.

**هاریکە:** کۆمەگی بکە ف کمکش کن.

**هاریکەر:** هاریکار ف کمك کننده.

**هاڕین:** ڕردکردن وەك ئارد ف آرد کردن.

**هاڕینەوە:** رەك ئارد ردکردن: (ئەم‌دەرمانە بهاڕەوەو دە چارتێ کە) ف کوبیدن و آسیاب کردن.

**هاریە:** کرمی دارو شینایی، نزترە ف کرم آفت سبزی و درخت.

**هاز:** ١) کاردو، کاردی؛ ٢) بیازەخۆگانە ف ١) نگا: کاردو، گیاهی است؛ ٢) گیاهی است رحشی شبیه پیاز.

**هازا:** ١) ئێرە؛ ٢) لەوێ، لە وێدەرێ ف ١) اینجا؛ ٢) درآنجا.

**هازار:** ١) ئازار، ژان، ئەزیەت؛ ٢) دەجار سەت، هەزار ف ١) آزار؛ ٢) هزار.

**هازە:** ١) دەنگی زۆر ناریکی ناوی سەرناور: (هازەی سەماوەر دێت)،

**هەڵپچڕ:** ۱) لەسەر لادراو بەنەوژم: (فوتو سەری **هەڵپچڕاوە**)؛ ۲) لەبەریەكچوونی نەفەڵ [ف] ۱) سرپوش برداشتن با فشار؛ ۲) بر دربدە شدن بخیە.

**هەڵپچڕان:** هەڵپچڕ [ف] نگا: هەڵپچڕ.

**هەڵپچڕاندن:** ۱) لەسەر لاگرتنی پێوەنووساو؛ ۲) دادڕینی نەقەڵ لێدراو [ف] ۱) برکندن درپوش؛ ۲) بردربدن بخیە.

**هەڵپچڕاو:** ۱) سەرلەسەر لاگیراو؛ ۲) دادڕاوی نەفەڵ لێدراو [ف] ۱) سرپوش برداشتە شدە؛ ۲) بخیەزدە دربدە شدە.

**هەڵپچڕاوە:** جێگەی دڕاو لەجێی نەفەڵان [ف] جای بردربدە.

**هەڵپچڕاوی:** هەڵپچڕاوە [ف] جای برردیدە.

**هەڵپچڕكان:** پسانی گەڵاو ڵك لە ڕوەك [ف] گسستن برگ و شاخە از گیاە.

**هەڵپچڕكاندن:** پساندنی گەڵاو ڵك [ف] گسلانیدن شاخە و برگ.

**هەڵپچڕین:** ۱) سەرلەسەر لابردن بەزۆر؛ ۲) دادڕینی نەقەڵ لێدراو [ف] ۱) سرپوش برداشتن با فشار؛ ۲) بخیەزدە را برردیدن.

**هەڵپچكڕان:** هەڵپچڕان [ف] نگا: هەڵپچڕان.

**هەڵپچكڕاندن:** هەڵپچڕاندن [ف] نگا: هەڵپچڕاندن.

**هەڵپچكڕاو:** هەڵپچڕاو [ف] نگا: هەڵپچڕاو.

**هەڵپچكڕین:** هەڵپچڕین [ف] نگا: هەڵپچڕین.

**هەڵپچوڕكان:** هەڵپچڕكان [ف] نگا: هەڵپچڕكان.

**هەڵپچوڕكاندن:** هەڵپچڕكاندن [ف] نگا: هەڵپچڕكاندن.

**هەڵپرتاندن:** دەركردن بە سووكایەتی [ف] دك كردن با اهانت.

**هەڵپرچان:** ڕفان لەنكاو [ف] ربودن یا ربودەشدن ناگهانی.

**هەڵپرچانن:** ڕفاندنی لەنەكاو [ف] ربودن ناگهانی.

**هەڵپڕژان:** ۱) بڵندبوونی تنۆكەئاو لە عەرزەوە؛ ۲) برینی لە خۆ دەگژراكردن [ف] ۱) جهش قطرات آب؛ ۲) كنایە از گلاویز شدن برای جنگ.

**هەڵپڕژاندن:** ئاو بەرەوبالا پڕژاندن [ف] آب رابە بالا پرتاب كردن.

**هەڵپڕژانن:** ئاو بەرەوبالا بڕژاندن، هەڵپڕژاندن [ف] نگا: هەڵپڕژاندن.

**هەڵپروان:** بەوردی ڕژانەخوار، پریوان [ف] ریزەریز، ریختن از بالا.

**هەڵپرواندن:** بەوردی ڕژاندنەخوار، پریواندن [ف] ریز ریز از بالا ریزش دادن

**هەڵپروانن:** هەڵپرواندن [ف] نگا: هەڵپرواندن.

**هەڵپرۆز:** ۱) سوونانی موو بە ئاگر؛ ۲) برینی لە پەلەو لەز ۱) سوختن مو با آتش؛ ۲) كنایە از عجلە و شتاب.

**هەڵپرۆزان:** سوونانی موو [ف] سوختن مو.

**هەڵبرۆزاندن:** سووناندنی موو [ف] سوزاندن مو.

**هەڵپرۆزانن:** سووناندنی موو [ف] سوزاندن مو.

**هەڵپرۆزاو:** مووی بەئاگر سووناو [ف] موی سوختە.

**هەڵپرۆزقان:** ۱) ڕفان لە دەستی كەسێ لەنكاو؛ ۲) ڕەنگپەڕین لەترسان و لە شتی نەكاو [ف] ۱) ناگهانی از دست كسی ربودە؛ ۲) رنگ باختن از ترس و رویداد ناگهانی.

**هەڵپرۆزقانن:** ۱) ڕفاندن لە دەست لەنكاو؛ ۲) بوونەهۆی ڕەنگپەڕینی كەسێ [ف] ۱) ربودن ناگهانی؛ ۲) سبب رنگ باختن كسی شدن.

**هەڵپرۆزكان:** هەڵپرۆزقان [ف] نگا: هەڵپرۆزقان.

**هەڵپرۆزكاندن:** هەڵپرۆزقانن [ف] نگا: هەڵپرۆزقانن.

**هەڵپرۆزكانن:** هەڵپرۆزقانن [ف] نگا: هەڵپرۆزقانن.

**هەڵپرۆزكین:** هەڵپرۆزقان [ف] نگا: هەڵپرۆزقان.

**هەڵپرۆزیاگ:** مووی سووزیاو [ف] موی سوختە.

**هەڵپرۆسقان:** هەڵپرۆزقان [ف] نگا: هەڵپرۆزقان.

**هەڵپرۆسقاندن:** هەڵپرۆزقانن [ف] نگا: هەڵپرۆزقانن.

**هەڵپرۆسقانن:** هەڵپرۆزقانن [ف] نگا: هەڵپرۆزقانن.

**هەڵپرۆسقیان:** هەڵپرۆسقان [ف] نگا: هەڵپرۆزقان.

**هەڵپرۆكان:** ۱) نیوەسوونانی پێست و شتی تر؛ ۲) هەڵپرۆزانی موو [ف] ۱) نیمسوزشدن؛ ۲) سوختن مو.

**هەڵپرۆكاندن:** ۱) سووتاندن كەم ناكورتێك؛ ۲) سووناندنی موو [ف] ۱) سوزاندن سطحی؛ ۲) سوزاندن مو.

**هەڵپرۆكانن:** هەڵپرۆكاندن [ف] نگا: هەڵپرۆكاندن.

**هەڵپرۆكین:** ۱) كەمێ سوونان؛ ۲) هەڵبرۆزان [ف] ۱) نیمسوزشدن؛ ۲) سوختن مو.

**هەڵپریوان:** هەڵپروان [ف] نگا: هەڵپروان.

**هەڵپریواندن:** هەڵپرواندن: (ئانەكە **هەڵپریوێنە**، گەنمەشامیم **هەڵپریواند**) [ف] نگا: هەڵپرواندن.

**هەڵپزگران:** هەڵپزكان، هەڵبزركان [ف] نگا: هەڵپزكان.

**هەڵپسان:** پسان بەهۆی كێشران بۆ سەرەوە [ف] گسستن بە سبب كشیدەشدن.

**هەڵپساندن:** كێشان بۆ سەرەوەو پساندن: (سەری چۆلەكەی **هەڵپساند**) [ف] بركشیدن و گسلانیدن.

**هەڵپساو:** قرتاو بەهۆی كێشران بۆ سەرەوە [ف] گسستە دراثر كشیدن.

**هەڵپسێن:** كەسێ كە شتێ دەكێشێتەسەرو دەیپسێنێ [ف] بركشندە گسلانندە.

**هەڵپسێدراو:** هەڵپساو [ف] نگا: هەڵپساو.

**هەڵپسێنراو:** هەڵپساو [ف] نگا: هەڵپساو.

**هەڵپشافتن:** پشاوتن، لە ناودەستنا گوشین [ف] فشردن و مچالەكردن.

**هەڵپشافتی:** پشاوتو [ف] مچالەشدە.

**هەڵپشاوتن:** هەڵپشافتن [ف] فشردن و مچالەكردن.

**هەڵپشاوتە:** گوشراو لە دەستنا [ف] مچالەشدە.

**هەڵپشكووتن:** ۱) لەپڕ پەیدابوون؛ ۲) گڕ بەرزەوەبوونی ئاگر؛ ۳) پەیدابوونی زیپكەی زۆر لە پێست [ف] ۱) ناگهان پدیدارشدن؛ ۲) زبانەكشیدن ناگهانی آتش؛ ۳) دمیدن جوشهای بسیار بر پوست.

**هەڵپشێو:** كەسێ كە شتێ لە ناودەستنا دەگوشێ و دەشێلێ [ف] مچالەكنندە و چلاننده.

**هەڵپشێوراو:** هەڵپشاوتە [ف] مچالەشدە.

**هەڵپشێوە:** فەرمان بە هەڵپشاوتن [ف] امر بە مچالەكردن.

**هەڵپفان:** ١) هەڵمسان، ماسین؛ ٢) بریتی لە نوزەبوون و باکردن لەزگان؛ ٣) هەلاتن و بەرزبوونەوەی هەویر ف ١) بادکردن، آماسیدن؛ ٢) کنایە از بسیار خشمگین شدن؛ ٣) برآمدن خمیر.

**هەڵپفاندن:** ١) ئاوساندن؛ ٢) نوزەکردن؛ ٣) هەڵهێنانی هەویر ف ١) نفخ دادن، متورّم کردن؛ ٢) خشمگین کردن؛ ٣) برآوردن خمیر

**هەڵپفاو:** باکردو ف بادکردە.

**هەڵپفیان:** هەڵپفان ف نگا: هەڵپفان.

**هەڵپفباو:** هەڵپفاو ف بادکردە.

**هەڵپفیای:** هەڵپفاو ف بادکردە.

**هەڵپفین:** هەڵپفان ف نگا: هەڵپفان.

**هەڵپلو:** کاری لابەلاو بێ‌فایدە ف کار بیهودە.

**هەڵپلۆخان:** داپلۆخان ف از هم دررفتن در اثر حرارت زیاد، لەشدن از گرما.

**هەڵپلۆخـانـدن:** بوونەهۆی داپلۆخان: (ئاوی کولاوی بێداکرد هەڵی پلۆخاند) ف لەکردن بەوسیلۀ حرارت.

**هەڵپلۆخاو:** لەبەربەك چوگ لە تینی ئاگر: (گۆشتەکە **هەڵپلۆخاوە**) ف از هم دررفتە و لەشدە دراثر حرارت زیاد.

**هەڵپلۆخین:** هەڵپلۆخان، داپلۆخان ف نگا: داپلۆخان.

**هەڵپلۆسکان:** گیان‌دان، لە ژیان بێ‌بەش بوون ف مردن، جان دادن.

**هەڵپلۆسکانن:** مراندن ف میراندن.

**هەڵپلۆسکیاگ:** مرێندراو ف کشتە شدە.

**هەڵپلۆسکیان:** گیان‌دان ف جان دادن.

**هەڵپوقین:** هەڵتۆقین، هەڵتۆقان ف نگا: هەڵتۆقان.

**هەڵپـە:** ١) پەلـە؛ ٢) تەمـاح؛ ٣) هەنـاسەدانی سەگ لەگەرمان ف ١) شتاب؛ ٢) آز، شره؛ ٣) لەلەزدن سگ از گرما.

**هەڵپـەڕ:** ١) بزوتن بە نەکـان: (هـەڵپـەڕ داپـەڕت نیە)؛ ٢) بەرەوژوور هەڵبەزین ف ١) جنبش و تکان؛ ٢) جست و خیز.

**هەڵپەڕا:** بەرەوژوور خۆی حەوادا ف جهید.

**هەڵپەڕان:** خۆحەوادان بەتوندی ف جهیدن، جهش.

**هەڵپەڕاندن:** رەقساندن ف رقصانیدن.

**هەڵپەرتـاوتـن:** ١) پەرتـاوتـن، لکـەدار پەڕانـدن؛ ٢) بریتـی لە رێك‌وپێك کردنی شتی نارێك: (ئـاومالەکە **هەڵپەرتیوە**) ف ١) هرس کردن؛ ٢) پیرایە، تنظیم.

**هەڵپەڕداپەڕ:** ١) هاتوچوی بە پەلەپەل؛ ٢) بریتی لە کۆشش و نەفالای زیرەکانە ف ١) جست‌وخیز؛ ٢) کنایە از نشاط در کار.

**هەڵپەرست:** کەسێ کە بۆ قازانجی خۆی گوێ نادانە پەیمان و بەڵێن ف فرصت طلب.

**هەڵپەڕکێ:** رەقس و سەما ف رقص.

**هەڵپەڕوداپەڕ:** هەڵپەڕداپەڕ ف نگا: هەڵپەڕداپەڕ.

**هەڵپەڕین:** سەماکردن، رەخسین ف رقصیدن.

**هەڵپەڕێن:** رەقس پێ کەر ف رقصانندە.

**هەڵپەز:** منالدان، تۆڵدان ف بچەدان، رحم.

**هەڵپەسـارتن:** ١) شتێ بە شتێکـەوە پاڵـدان: (ئـەوگەسکـە بە دیوار **هەڵپەسێرە**)؛ ٢) بریتی لە لەکـارخستن و چاوەنـوڕاگرتن ف ١) تکیەدان چیزی بە چیزی دیگر؛ ٢) کنایە از معلّق کردن از کار.

**هەڵپەسارتو:** ١) پاڵ بەشتێکەوە دراو؛ ٢) بێکارکراوی بەئامانەتی ف ١) تکیە بر چیزی دادە؛ ٢) معلّق شدە از کار.

**هەڵپەسارتە:** هەڵپەسارتو ف نگا: هەڵپەسارتو.

**هەڵپەساردن:** هەڵپەسارتن ف نگا: هەڵپەسارتن.

**هەڵپەساردو:** هەڵپەسارتو ف نگا: هەڵپەسارتو.

**هەڵپەساردە:** هەڵپەسارتو ف نگا: هەڵپەسارتو.

**هەڵپەسێران:** ١) بەشتێکـەوە پاڵدران؛ ٢) بریتی لە بێکـارکـران و چاوەنوڕکران ف ١) تکیە بە چیزی دادە شدن؛ ٢) کنایە از معلّق شدن از کار.

**هەڵپەسێراو:** هەڵپەسارتو ف نگا: هەڵپەسارتو.

**هەڵپەقژین:** مچوڕك پێداهاتن و لەرزین ف چندش و تیرکشیدن اندام.

**هەڵپەل:** داری هەڵپەرتاوتو ف هرس شدە.

**هەڵپەلە:** ١) کاری لابەلاو بێ‌فایدە؛ ٢) وڕاوە ف ١) کار بیهودە؛ ٢) هذیان.

**هەڵپەنمان:** ١) هەڵمسان، هەڵپفان؛ ٢) راپەڕین لە خەو لەنکاو ف ١) بادکردە، آماسیدە؛ ٢) ناگهان از خواب پریدن.

**هەڵپەنمانن:** ١) هەڵمساندن، هەڵپفاندن؛ ٢) لەپڕ لەخەو راپەڕاندن ف ١) آماسانیدن؛ ٢) یکهو از خواب بیدارکردن.

**هەڵپەنمین:** ١) هەڵپەنمان؛ ٢) راچڵەکین ف ١) نگا: هەڵپەنمان؛ ٢) یکە خوردن.

**هەڵپەهەڵپ:** هەناسەدانی زۆری سەگ لەگەرمان ف لەلەزدن بیاپی سگ از شدّت گرما.

**هەڵپیت:** پەرتاوتن، هەڵپەرتاوتن ف هرس و پیرایۀ درخت.

**هەڵپیتـانـدن:** لك‌پەرتاندن و جوان کردنی دار، هەڵپەرتاوتن ف هرس کردن و پیرایش درخت.

**هەڵپێچ:** ١) لە خوارە بۆ سەرەوە بەسـەریەکـا پێچـان؛ ٢) جۆری تاواڵ کراسی ژنانە: (دەرپێی **هەڵپێچی** دەبەردایە) ف ١) ورمالیدن؛ ٢) نوعی شلوار زنانە.

**هەڵپێچان:** ١) هەڵپێچ، بەسەریەکا پێچان بۆ سەرەوە؛ ٢) زۆربۆهێنان و گەڕنێ هالاندن: (**هەڵی پێچاوم** جلکی دەوێ)؛ ٣) پێچانەوەی دۆڵمەی ئاپراغ؛ ٤) بادانی ڕیشو ف ١) ورمالیدن؛ ٢) با اصرار وادار کردن؛ ٣) پیچیدن دلمۀ برگ مو؛ ٤) تاب دادن پرز کنارۀ لباس.

**هەڵپێچـاو:** ١) لە خوار بۆ سەر پێچ‌دراو؛ ٢) زۆربـۆهـاتـو لە لایەن کەسێکەوە؛ ٣) نوشتاوەی ئاپراغ؛ ٤) ریشوی بادراو ف ١) ورمالیدە؛ ٢) زیرفشار قرار گرفتە؛ ٣) دلمۀ پیچیدە؛ ٤) پرز تاب‌خوردە.

**هەڵپێچراو:** هەڵپێچاو ف نگا: هەڵپێچاو.

**هەڵپێچرای:** هەڵپێچاو ف نگا: هەڵپێچاو.

**هەڵپێچیاگ:** هەڵپێچاو ف نگا: هەڵپێچاو.

**هەڵپێچیان:** هەڵپێچان ف نگا: هەڵپێچان.

**هەڵ پێك:** داخـران. بەسـەریەكـاهـاتنی دولای درگاو پەنجەرەو... ف بستەشدن. برهم آمدن و جفت شدن در و پنجره و....

**هەڵ پێكان:** داخستن. بەسەریەكا جوت كردن: (درگاكە **هەڵ پێكە**) ف بستن. برهم آوردن. جفت كردن.

**هەڵ پێكانن:** هەڵ پێكان ف نگا: هەڵ پێكان.

**هەڵ پێكران:** هەڵ پێك ف نگا: هەڵ پێك.

**هەڵ پێكراو:** داخراو. پێوەدراو ف بسته. برهم آمده. جفت شده.

**هەڵ پێكباگ:** هەڵ پێكراو ف نگا: هەڵ پێكراو.

**هەڵپین:** هەناسەسواری سەگ لەگەرمان ف تنگی نفس سگ از شدت گرما.

**هەڵتاش:** ناشین بەرەوژور ف تراشیدن از پایین به بالا.

**هەڵ تاشان:** هەڵتاش ف نگا: هەڵتاش.

هەڵ تاشین: هەڵتاش ف نگا: هەڵتاش.

**هەڵ تاواندن:** عەزم كردن. هەزم كردن ف هضم كردن.

**هەڵ تاوین:** هەزم، عەزم ف هضم.

**هەڵ تاوێن:** هـەزم كەر: (ورگی من بەردیـش **هەڵ نەتـاوێنێ**) ف هضم كننده.

**هەڵ تزاندن:** دەركردن بە سوكایەتی ف راندن با اهانت.

**هەڵ تزانن:** هەڵ تزاندن ف راندن با اهانت.

**هەڵ ترنگانن:** سڵ بوون و خو زبزكردن ف رمیدن و ترسیدن.

**هەڵ تروشكان:** قـونەڵنس دان، لەسـەر چینچـك رونیشتـن ف چمباتمه نشستن.

**هەڵ تروشكاندن:** لەسەر چینچك دانیشاندن ف چمباتمه نشانیدن.

**هەڵ تروشكانن:** هەڵ تروشكاندن ف چمباتمه نشانیدن.

**هەڵ تروشكاو:** لەسەر چینچك نیشتو ف چمباتمه نشسته.

**هەڵ تروشكین:** هەڵ تروشكان ف چمباتمه نشستن.

**هەڵ تروشەكان:** هەڵ تروشكان ف چمباتمه نشستن.

هەڵترە: لاچو لەبەر چاوم، وەدەركەوە ف گم شو.

**هەڵ ترەكـان:** ١) ترەكـان. تەقـاندن؛ ٢) دەرزیێ بردن ف ١) منفجر كردن؛ ٢) شكافتن.

**هەڵ ترەكیـان:** هەڵ ترەكان ف نگا: هەڵ ترەكان.

**هەڵ تلۆپان:** تۆپین. كەوتنین ف مردن نجس، سَقط شدن.

**هەڵ تلۆپین:** هەڵ تلۆپان ف مردن نجس.

**هەڵ تلیشان:** لەبەریەك چوون، لە سەر بو خوار دادران ف از بالا به پایین دریده شدن.

**هەڵ تلیشاندن:** لەبەریەك بردن، دادڕین ف ورشكافتن. وردریدن.

**هەڵ تلیشانن:** هەڵ تلیشاندن ف ورشكافتن، وردریدن.

**هەڵ تلیشاو:** لە سەر تا خوار دادراو ف وردریده، ورشكافته.

**هەڵ توتـان:** هەڵ تروشكـان. قونـەڵنس دان: (كـوچـك **هەڵ توتـا**) ف چمباتمه نشستن.

**هەڵ توترین:** هەڵ توتان ف چمباتمه نشستن.

**هەڵ توتەكان:** هەڵ توتان ف چمباتمه نشستن.

**هەڵ توتەكاو:** هەڵ تروشكاو ف چمباتمه نشسته.

**هەڵ توتەكیو:** هەڵ تروشكاو ف چمباتمه نشسته.

**هەڵ توتێ:** لەسەر چینچك دانیشە ف چمباتمه بنشین.

**هەڵ توڕان:** ١) بەلەفیرە. زگەشۆرە؛ ٢) جوونەهاویشتن ف ١) اسهال؛ ٢) جفتك پرانی.

**هەڵ توڕانـدن:** ١) جوونـەهـاویشتن و قنـگ بەرزكردنەوە؛ ٢) فڕاندن. زگ چوون ف ١) رمیدن و جفتك پراندن؛ ٢) اسهال شدن.

**هەڵ توڕانن:** هەڵ توڕاندن ف نگا: هەڵ توڕاندن.

**هەڵ توروشكان:** هەڵ تروشكان ف چمباتمه نشستن.

**هەڵ توروشكین:** هەڵ تروشكان ف چمباتمه نشستن.

**هەڵتوز:** جوونەهاویشتن و فوشفی بوون ف جفتك پرانی و رمیدن.

**هەڵتوز:** هەڵتوز ف نگا: هەڵتوز.

**هەڵ توزاندن:** هەڵتوزكردن ف جفتك پراندن و رمیدن.

**هەڵ توزاندن:** هەڵ توزاندن ف نگا: هەڵ توزاندن.

**هەڵ توقـان:** ١) قیتـەوەبـوون: (كـارگ **هەڵ توقی**، بەرد لە سەرم درا **هەڵ توقیوە**)؛ ٢) لە بەرزیەوە تەقـانـدن: (دەمـانچـەی بەسـەردا **هەڵ توقاند**) ف ١) بیرون زدن؛ ٢) از بالا تركانیدن.

**هەڵ توقـانـدن:** ١) قیتـەوەكـردن؛ ٢) تەقـاندن ف ١) برجسته كردن، برآوردن؛ ٢) تركاندن.

**هەڵ توقانن:** هەڵ توقاندن ف نگا: هەڵ توقاندن.

**هەڵ توقاو:** بەرزو قیتەوە بوگ ف برآمده از سطح، بیرون زده.

**هەڵ توقیاگ:** هەڵ توقاو ف نگا: هەڵ توقاو.

**هەڵ توقیان:** هەڵ توقان ف نگا: هەڵ توقان.

**هەڵ توقین:** هەڵ توقان ف نگا: هەڵ توقان.

**هەڵ توقیو:** هەڵ توقاو ف نگا: هەڵ توقاو.

**هەڵ تەزبنەوە:** ڕاپەڕین، شورش كردن ف قیام، نهضت.

**هەڵ تەقـان:** ١) لەبـەریەك چوون: (خانوەكە **هەڵ تەقاوە**)؛ ٢) دادڕانی درواو؛ ٣) توسـی یەك هانـن ف ١) ازهم گسستن؛ ٢) جرخوردن بخیه زده؛ ٣) برخورد.

**هەڵ تەقیان:** هەڵ تەقان ف نگا: هەڵ تەقان.

**هەڵ تەقین:** هەڵ تەقان ف نگا: هەڵ تەقان.

**هەڵتەك:** هەڵ تەكان ف نگا: هەڵ تەكان.

**هەڵ تەكـان:** ١) لە خوار بو سـەر تێك چوون؛ ٢) بەرەژوورچوونی ئەندامی لەش: (جـاوی لێ **هەڵ تەكـانـد**، بروی **هەڵ تەكـانـد**، شان **هەڵ تەكێنە**)؛ ٣) داتەقاندنی دەغڵ و توتن: (توتنەكە **هەڵ تەكێنە**) ف ١) از پایین به بالا دررفتن و متلاشی شدن؛ ٢) بەبالا جستن اعضاء بدن؛ ٣) باددادن غلّه و....

**هەڵ تەكاندن:** ١) تێك و پێك دان: (بە بومبا خانوەكەی **هەڵ تەكاند**)؛ ٢) بلندكردن و بەرەژوور بردنی ئەندامی لەش: (بروی **هەڵ تەكاند**. شان **هەڵ تەكینـە**)؛ ٣) تەكـانـدنی شت: (بـەرەكـە **هەڵ تەكینـە**)؛ ٤) داتەقاندنی دەغڵ و... ف ١) متلاشی كردن؛ ٢) بالا انداختن اعضاء بدن؛ ٣) تكانیدن؛ ٤) باددادن غلّه و....

**هەڵ تە کانن:** هەڵتەکاندن ف نگا: هەڵتەکاندن.

**هەڵتـەك و پەڵتەك:** بە لوفاوی دریژو بەپەلە رۆیشتن، قەترەکردن ف با گامهای بلند و با شتاب رفتن.

**هەڵتەك و دەڵتەك:** هەڵتەك و پەڵتەك ف با گامهای بلند و با شتاب رفتن.

**هەڵتەك هەڵتەك:** بە پشوولەسەرخۆ بی هانن ف سلانەسلانە راەرفتن.

**هەڵ تە کیان:** هەڵتەکان ف نگا: هەڵتەکان.

**هەڵ تە کین:** هەڵتەکان ف نگا: هەڵتەکان.

**هەڵ تە کێن:** ١) لەبـەربەك بەر؛ ٢) بلندکەری ئەندام؛ ٣) نەکێنی بەرەو لێفەو... ف اسم فاعل «هەڵتەکاندن».

**هەڵ تە کێنـــە:** ١) فەرمـــان بە هەڵتەکـــانـدن؛ ٢) هەڵتەکێن: (کلك هەڵتەکێنە) ف ١) امر بە «هەڵتەکاندن»؛ ٢) بالا برندە، جنباننده.

**هەڵتیز:** هەڵنۆز ف نگا: هەڵتۆز.

**هەڵ تیزان:** هەڵنۆزان ف جفتك پرانی و رمیدن.

**هەڵ تیزاندن:** هەڵنۆزاندن ف جفتك پراندن و رمیدن.

**هەڵ تیقان:** هەڵبەزین بۆ بازی کردن ف بازی کردن و جست وخیز.

**هەڵجاندن:** پەرەکردن بە هەلاج ف زدن پنبه و پشم.

**هەڵ جۆزان:** هەڵنۆزان ف جفتك پرانی و رمیدن.

**هەڵ جۆزانن:** هەڵنۆزاندن ف جفتك پراندن و رمیدن.

**هەڵ جۆزین:** هەڵنۆزان ف جفتك پرانی و رمیدن.

**هەڵ جۆزین:** حەیوانی جۆنەهاویژو سڵ ف حیوان جفتك پران و رموك.

**هەڵجەر:** خێل، چاوخوار ف لوچ، احول.

**هەڵ چیپاندن:** ئامادەکردن بە نیواونیوی، گەلاڵەکردن ف کم و بیش آمادەکردن.

هەڵچ، کارگە، کوارگ ف قارچ.

**هەڵ چڕان:** ١) هـەڵپچڕان؛ ٢) دڕان ف ١) نگا: هـەڵپچڕان؛ ٢) دریدەشدن.

**هەڵ چڕاندن:** هەڵپچڕاندن ف نگا: هەڵپچڕاندن.

**هەڵ چڕاو:** هەڵپچڕاو ف نگا: هەڵپچڕاو.

**هەڵ چرچـــان:** ١) چرچ و لۆچ تێکەوتـــن؛ ٢) سیس بوون ف ١) چین برآوردن؛ ٢) پژمردەشدن.

**هەڵ چرچاو:** ١) چـرچ بوگ؛ ٢) سیس بوگ ف ١) پـرچین شده؛ ٢) پژمرده شده.

**هەڵ چرچیاگ:** هەڵچرچاو ف نگا: هەڵچرچاو.

**هەڵ چڕین:** هەڵبچڕین ف نگا: هەڵپچڕین.

**هەڵـچـن:** ١) کەسـێ کە شت لەســەریەك دادەنێ؛ ٢) زەمینێ کە ناو هەڵدەمژێ ف ١) برهم چینن؛ ٢) زمینی که آب را زود می‌مکد.

**هەڵ چناو:** لەسەر یەك کەڵەکەکراو ف برهم نهاده شده، انباشته شده.

**هەڵ چنراو:** هەڵچناو ف انباشته.

**هەڵچنك:** قاقەزی مەرەکەف هەڵچین ف کاغذ خشك کن.

**هەڵ چنیاگ:** هەڵچناو ف برهم نهاده شده، انباشته شده.

**هەڵ چنین:** ١) لەسەریەك بە بلندی کەڵەکەکردن؛ ٢) مژینی ئاو بۆ زەوی ف ١) برهم انباشتن؛ ٢) مکیدن زمین آبرا.

**هەڵچـو:** ١) بە دار بان بە شاخـا سەرکـەوتو؛ ٢) کولاوی سەررێژکردو: (شیرەکە هەڵچوە)؛ ٣) هەراش، زۆ گەورەبوگ: (منالێکی هەڵچوە)؛ ٤) بێ فکر لە کاردا، سەرەڕۆ؛ ٥) بلندبوونەوە: (دار تا عاسمان هەڵچوە) ف ١) بالارفتـه، صعـودکـرده؛ ٢) جوشیدهٔ سر رفتـه؛ ٣) بالنده؛ ٤) خودسر درکارها؛ ٥) مرتفع شده، بالارفته.

**هەڵچـۆ:** ١) کەسێ کاری سەربەخۆ دەکا؛ ٢) فەرمان بە ئامادەبوون بۆ شەق نێ هەڵـدان؛ ٣) فەرمـانـه بە سەرکەوتن لە دارو بەرزایی ف ١) خودسـر درکـار؛ ٢) امـر بە آمادەشدن برای نیپاخوردن؛ ٣) امر بە بالارفتن از بلندی.

**هەڵ چۆڕان:** ناخرنتۆك رژان ف تا آخر بن قطره چکیدن.

**هەڵ چۆڕاندن:** دوامین نتۆك رژاندن ف ریختن آخر بن قطره.

**هەڵ چۆڕاو:** هیچ نیانەماو لە تراو ف نهی شده از آب و مایع.

**هەڵ چۆڕیان:** هەڵچۆڕان ف نگا: هەڵچۆڕان.

**هەڵ چۆڕین:** هەڵچۆڕان ف ریزش آخرین قطره.

**هەڵ چۆڕیو:** هەڵچۆڕاو ف نهی شده از مایع.

**هەڵ چۆقان:** ١) چۆقان لەسەر ئاگر؛ ٢) لەرزین لەسەرمان؛ ٣) لەرزین لەبـەر نۆبـەتێ ف ١) صدای روغن نفبده؛ ٢) لرزش از سرمـا؛ ٣) لرزش از تب و لرز.

**هەڵ چۆقاو:** قاڵکراو ف نفیده، روغن نفبده.

**هەڵ چۆقین:** هەڵچۆقان ف نگا: هەڵچۆقان.

**هەڵ چۆقیو:** هەڵچۆقاو ف روغن نفبده.

**هەڵ چوون:** ١) دەبـــالاکـــردن؛ ٢) لە بلـنـد سەرکـەوتن؛ ٣) ئامـادەی نێ هەڵـدان بوون؛ ٤) سەررێژکـردنی کولاو لەسەر ئاگر؛ ٥) دابوون بۆ بەسەر پشنا بازدان؛ ٦) برێتی لە توڕەبوون ف ١) سر بع رشد کردن؛ ٢) از بلنـدی بالا رفتن؛ ٣) آمادهٔ نیپاخوردن شدن؛ ٤) سررفتن مایع جوشان؛ ٥) خم شدن برای پرش همبازی؛ ٦) کنابه از خشمگین شدن.

**هەڵچە:** ١) عەلوکە، ئالوچە؛ ٢) دابە لە کابە؛ ٣) حازر بە بۆ نێ هەڵدان؛ ٤) لە بلنـدی سەرکەوە: (بەودارە هەڵچە) ف ١) آلوچه؛ ٢) خم شو برای پرش؛ ٣) آمادهٔ تیپاخوردن باش؛ ٤) از بلندی بالارو.

**هەڵ چەرخ:** وەرسووڕ، زڤر ف چرخش.

**هەڵ چەرخان:** وەرسووڕان، زڤرین ف ورچرخیدن.

**هەڵ چەرخاندن:** وەرسووڕاندن ف ورچرخاندن.

**هەڵ چەرخیان:** هەڵچەرخان ف ورچرخیدن.

**هەڵ چەرخین:** هەڵچەرخان ف ورچرخیدن.

**هەڵ چەقـان:** ١) تێ ڕۆچـــوون؛ ٢) دەنـاو فوڕ ڕاکـران ف ١) خلیدن، فرورفتن؛ ٢) درگل فروشدن.

**هەڵ چەقـانـدن:** ١) تێ ڕۆکردنی دەرزی و درۆ؛ ٢) دە قوڕ ڕا کردن ف ١) خلانیدن؛ ٢) در زمین فروکردن.

**هەڵ چەقاو:** ١) ڕۆچوونی شتی سەرتیژ؛ ٢) دەزەوی ڕاکراو ف ١) خلیده؛ ٢) فروشده در زمین.

**هەڵ چەقین:** هەڵچەقان ف نگا: هەڵچەقان.

**هەڵچەقیو:** هەڵچەقاو ف نگا: هەڵچەقاو.

**هەڵخران:** وەبەر ناو دران بۆ وشك بوونەوە ف پهن کردن در آفتاب برای خشك شدن.

**هەڵخڕان:** بزوان، هەڵتەکانی دەفریٰ کە شتی زۆری وردی تێدابە: (جەوالی گوێز هەڵخڕێنە) ف تکان خوردن ظرف، یا جعبه با محتویات ریز.

**هەڵخڕاندن:** ۱) تەکان پێدان و بزواندنی دەفری پڕ لە شتی ورد؛ ۲) برینی لە هانەدان و فریودان؛ ۳) لەناو دەستا خڕ هەڵدان ف ۱) تکان دادن ظرف یا جعبه با محتویات ریز؛ ۲) کنایه از تحریك و فریب دادن؛ ۳) دردست گرد کردن.

**هەڵخڕانن:** هەڵخڕاندن ف نگا: هەڵخڕاندن.

**هەڵخراو:** بەرناودراو بۆ وشك بوون ف پهن شده در آفتاب برای خشك شدن.

**هەڵخڕاو:** ۱) دەفری پڕ لە وردەشت تەکان پێدراو؛ ۲) فریودراو؛ ۳) دنەدراو ف ۱) ظرف یا جعبهٔ محتوی خردەریز تکان خوردە؛ ۲) فریب خوردە؛ ۳) تحریك شده.

**هەڵخرباگ:** هەڵخراو ف نگا: هەڵخراو.

**هەڵخڕباگ:** هەڵخڕاو ف نگا: هەڵخڕاو.

**هەڵخریان:** هەڵخران ف نگا: هەڵخران.

**هەڵخڕیان:** هەڵخڕان ف نگا: هەڵخڕان.

**هەڵخز:** بە خشکە بەرەوژوورچوون ف به بالا خزیدن.

**هەڵخزان:** هەڵخز ف به بالا خزیدن.

**هەڵخزیان:** هەڵخزان ف نگا: هەڵخزان.

**هەڵخزین:** هەڵخزان ف نگا: هەڵخزان.

**هەڵخستن:** ۱) بۆ سەرەوە فڕێدان: (خشت هەڵخستن بۆ بەنا)؛ ۲) بەرناودان بۆ وشك بوون؛ ۳) چوێبەتی بیچمی دروست کراو: (خانووەکەی باش هەڵخستوە)؛ ۴) دەرهاویشتنی دەغل لە شەختە؛ ۵) جوونەهاویشتن: (لەفە هەڵدەخاتەوە)؛ ۶) گوێ راگرتن بۆ بیستن ف ۱) بەبالا پرتاب کردن؛ ۲) پهن کردن در آفتاب؛ ۳) طرح ریزی؛ ۴) براندازی غلّه از سرما؛ ۵) جفتك پراندن؛ ۶) گوش فرادادن.

**هەڵخستنەوە:** ۱) جوونەهاویشتن؛ ۲) سەماو خۆ حەوادان لە خۆشیان ف ۱) جفتك پراندن؛ ۲) پایکوبی و جست و خیز از شادی.

**هەڵخشان:** هەڵخزان ف بەبالا خزیدن.

**هەڵخشیان:** هەڵخزان ف بەبالا خزیدن.

**هەڵخشین:** هەڵخزان ف بەبالا خزیدن.

**هەڵخلان:** هەڵخڕان ف نگا: هەڵخڕان.

**هەڵخلاندن:** هەڵخڕاندنی دەفری پڕ لە شتی ورد ف تکان دادن ظرف محتوی خردەریز.

**هەڵخلانن:** هەڵخلاندن ف نگا: هەڵخلاندن.

**هەڵخلەتان:** فریوخواردن ف فریب خوردن.

**هەڵخلەتاندن:** خاپاندن ف فریب دادن.

**هەڵخلەتاو:** خاپاندی، فریودراو ف فریب خوردە.

**هەڵخلەتێن:** خاپینۆك ف فریبکار.

**هەڵخلەتێنە:** هەڵخلەتێن: (شوان هەڵخلەتێنە) ف فریبکار.

**هەڵخلیسك:** جێگەی لووسی سەهۆڵاوی ف لیزگاه.

**هەڵخلیسکان:** شەمتین ف لغزیدن.

**هەڵخلیسکاندن:** ۱) هەڵخلیسکان؛ ۲) بوونەهۆ بۆ شەمتینی بەکێ ف ۱) لغزیدن؛ ۲) لغزاندن.

**هەڵخلیسکاو:** شەمتی ف لغزیده.

**هەڵخلیسکین:** خلیسکان، شەمتین ف لغزیدن، لیزخوردن.

**هەڵخلیسکێن:** ۱) بازی شەمتین؛ ۲) جێگەی خلیسك ف ۱) سرسره بازی؛ ۲) جای لیزخوردن.

**هەڵخلیسکێنە:** هەڵخلیسکێن ف نگا: هەڵخلیسکێن.

**هەڵخواز:** هەلپەرست ف فرصت طلب.

**هەڵخوراندن:** خوراندن لەخوارەوە بۆ سەرەوە: (لاقت هەڵمەخورێنە) ف خاراندن از پایین به بالا.

**هەڵخورانن:** هەڵخوراندن ف نگا: هەڵخوراندن.

**هەڵخۆزان:** هەڵچوون بەرەوبالا ف بالارفتن از.

**هەڵخۆزانن:** بۆ بالا کێشان ف به بالا کشیدن.

**هەڵخۆزتن:** هەڵخۆزان ف بالارفتن از.

**هەڵخۆزین:** هەڵخۆزان ف بالارفتن از.

**هەڵخۆستن:** هەڵخۆزان ف بالارفتن از.

**هەڵخوشان:** ۱) تێکچوونی کار: (کارە کەمان لێ هەڵخوشا)؛ ۲) بەدەمدا چوونەوە ف ۱) بهم خوردن کار، خراب شدن کار؛ ۲) رد کردن گفتار کسی.

**هەڵخول:** گەڕان و سووڕانی زۆر ف چرخش و گردش زیاد.

**هەڵخولان:** هەڵخول ف چرخش و گردش زیاد.

**هەڵخولاندن:** گەڕاندن و سووڕاندن ف چرخانیدن و گردانیدن.

**هەڵخوێنن:** ۱) بەگوێدا خوێندن، زۆر نسحەت کردن؛ ۲) پێدا کاڵان ف ۱) اندرز بسیار گفتن، درگوش کسی زیاد خواندن؛ ۲) با عتاب سرزنش کردن.

**هەڵخوێندن:** هەڵخوێنن ف نگا: هەڵخوێنن.

**هەڵخە:** ۱) بدە بەرناو بۆ وشك بوون؛ ۲) راگرە بۆ بیستن: (گوێ هەڵخە)؛ ۳) نامادەی سزای دوواندن بە: (خۆت هەڵخە با سواری پشتت بم)؛ ۴) بۆ بالا باوێژە: (تۆ خشت بۆ وەستا هەڵخە) ف صیغهٔ امر از «هەڵخستن».

**هەڵخەلەتان:** هەڵخلەتان ف فریب خوردن.

**هەڵخەلەتاندن:** هەڵخلەتاندن، خاپاندن ف فریب دادن.

**هەڵخەلەتاو:** فریودراو، خاپاندی ف فریب خوردە.

**هەڵخەلەتێن:** خاپینۆك ف فریبکار.

**هەڵخەلەتێنە:** خاپینۆك ف فریبکار.

**هەڵداشتن:** لە بەرزەوە فڕێدان: (میزی هەڵداشت، خشتی هەڵداشت) ف از بالا انداختن، ازبلندی پرت کردن.

**هەڵدان:** ۱) بەرەوبالا فڕێدان؛ ۲) لێدان بە شاخ و شەق:

(شەقوٚنیٚ هەڵدان)؛ ۳) بڵندکردن و دامەزراندنی چادر؛ ۴) مەحەت‌کردن؛ ۵) قسە دەست‌پیٚ‌کردن: (لەجوابا **هەڵی‌دابە**)؛ ۶) دەفر لە ناویٚ‌ڕاکردن: (دەناوی **هەڵدە**)؛ ۷) تیٚ‌وەردانی ئاو لە دەفر؛ ۸) گونینی ناو: (ناوان **هەڵدە** بزانین کیٚ‌بو)؛ ۹) گەشەکردن: (شیناوەردەکەت **هەڵی‌داوە**)؛ ۱۰) پابەبەرزبوون: (کاورا **هەڵی‌داوە**)؛ ۱۱) بار خستنەسەر بارەبەر؛ ۱۲) زانینی نەوەچیە: (مەتەڵوٚکە **هەڵدان**)؛ ۱۳) خوٚنیشاندان: (کارگ سەری **هەڵدا**، کاکم لە ناسوٚ سەری **هەڵدا**)؛ ۱۴) باکردنە‌ناو، فوٗدان: (گوٚیٚت **هەڵدە**) ف ۱) بەبالا برت کردن؛ ۲) زدن با شاخ یا نیپا؛ ۳) برپا کردن چادر؛ ۴) ستایش؛ ۵) سخن آغازکردن؛ ۶) با کاسە آب از چشمە یا منبع برکشیدن؛ ۷) آب در ظرف گرداندن؛ ۸) نام گفتن؛ ۹) شکوفا شدن؛ ۱۰) ترقّی کردن؛ ۱۱) بار بر پشت باربر انداختن؛ ۱۲) چیستان و معمّا را حلّ کردن؛ ۱۳) سر برآوردن، دردید قرار گرفتن؛ ۱۴) بادکردن، دمیدن.

**هەڵدانەوە:** ۱) بەرەوژوٗربردن: (پەنجەرەکە **هەڵدەوە**، پەردەی **هەڵداوە**)؛ ۲) شین‌بوٗنەوە دوای بڕین؛ ۳) گەڕانەوەی نەخوٚشی؛ ۴) پەشیمان‌بوٗنەوە بوٚ شتیٚ: (سەرلەنویٚ **هەڵی‌داوەتەوە** و ماڵەکەی دەوینەوە) ف ۱) بالازدن، بالابردن؛ ۲) پس از قطع شدن سر برآوردن، رویش دوبارە؛ ۳) عودکردن بیماری؛ ۴) برای چیزی پشیمان شدن.

**هەڵدران:** ۱) چەقینران: (کە سێدارە **هەڵدران** زانیم شتیٚ هەیە)؛ ۲) بەرپاکران: (چادر **هەڵدران**) ف ۱) نصب شدن بر زمین؛ ۲) برپا شدن چادر و....

**هەڵدڕان:** تەواو دڕان ف جرخوردن، کاملاً پارە شدن.

**هەڵدراو:** ۱) چەقینراو؛ ۲) بەرپاکراو ف ۱) نصب شدە؛ ۲) برپا شدە.

**هەڵدڕاو:** جڕبردو، دڕاو ف جرخوردە، پارەشدە.

**هەڵدراوە:** کوٚگای بەسەریەکاکراو ف تودۀ برهم ریختە.

**هەڵدڕاوە:** جیٚگەی دادڕاو ف جای پارە شدە.

**هەڵدرو:** تەقەڵ‌دانی قەراغ ف بخیەزدن کنارەها.

**هەڵدروان:** تەقەڵ‌درانی قەراغ ف دوختەشدن کنارەها.

**هەڵدرواندن:** هەڵدروٗن ف نگا: هەڵدروٗن.

**هەڵدرواو:** تەقەڵ‌دراو لە کەنارەوە ف پارچۀ دوختەشدە از کنارەها.

**هەڵدروٗن:** هەڵدرو، دروٗنی چوارکەناری شتیٚ ف دوختن کنارەهای پارچە.

**هەڵدڕەهەڵدڕ:** زوٚر دادڕاو: (سێڵاو زەویەکەی **هەڵدڕەهەڵدڕ** کرد) ف بسیار دریدە شدە.

**هەڵدریاگ:** بەرپاکراو ف برپاشدە.

**هەڵدڕیاگ:** هەڵدڕاو ف پارەشدە.

**هەڵدڕین:** تەواو دڕین ف پارە کردن، بردریدن.

**هەڵدڕیٚن:** هەرشتیٚ دەدڕیٚنیٚ ف بردرندە.

**هەڵدوٗر:** هەڵدرو ف نگا: هەڵدرو.

**هەڵدوران:** هەڵدروان ف نگا: هەڵدروان.

**هەڵدورانن:** هەڵدروٗن ف نگا: هەڵدروٗن.

**هەڵدوٗراو:** هەڵدرواو ف نگا: هەڵدرواو.

**هەڵدوریاگ:** هەڵدرواو ف نگا: هەڵدرواو.

**هەڵدوریان:** هەڵدروان ف نگا: هەڵدروان.

**هەڵدوریانن:** هەڵدروان ف نگا: هەڵدروان.

**هەڵدورین:** هەڵدروٗن ف نگا: هەڵدروٗن.

**هەڵدە:** فەرمان بە هەڵدان ف صیغۀ امر از «هەڵدان».

**هەڵدەرە:** گوندیٚکە لە کوردستان بەعسی ویٚرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**هەڵدیٚ:** ۱) رادەکا، غاردەدا؛ ۲) مانگ و خوٚر و ئەستیٚرە دیٚنە بەرچاو؛ ۳) هەڤیر دەگاتیٚ؛ ۴) مدە تەواودەبیٚ: (وادەی قەرزەکەم دووڕوٚژی تر **هەڵدیٚ**، تەوژنە عددەی **هەڵدیٚ**)؛ ۵) دەزاندریٚ: (مەتەڵەکەتم بوٚ **هەڵدیٚ**) ف ۱) می‌دود؛ ۲) طلوع می‌کند؛ ۳) خمیر برمی‌آید؛ ۴) مدّت سرمی‌آید؛ ۵) معمّا حلّ می‌شود.

**هەڵدیٚر:** ۱) تاڤگە؛ ۲) جیٚگەی زوٚر بەرز و قیت لە شاخ و کیٚودا؛ ۳) کەسیٚ ئاو لە سەرەوە بەرەوخوار دەڕژیٚنیٚ ف ۱) آبشار؛ ۲) پرتگاە؛ ۳) آب ریزندە از بالا.

**هەڵدیٚران:** لە بەرزەوە فڕیٚدران بوٚ خوار ف پرت شدن از بالا.

**هەڵدیٚراو:** کەوتو لە بالاوە ف پرت شدە از بالا.

**هەڵدیٚرکە:** جیٚگەی زوٚر سەخت کە پیاوی لیٚ‌دەکەویٚ ف پرتگاە.

**هەڵدیٚرگە:** هەڵدیٚرکە ف پرتگاە.

**هەڵدیٚریاگ:** هەڵدیٚراو ف پرت شدە از بالا.

**هەڵدیٚریان:** هەڵدیٚران ف ازبالا پرت شدن.

**هەڵڕژان:** ڕژان بەرەوخوار: (گەنمەکە **هەڵڕژا**) ف ریزش رو بەپایین.

**هەڵڕژاندن:** ڕژاندن بەرەوژیٚر ف فروریختن، ریزش دادن بە پایین.

**هەڵڕژانن:** هەڵڕژاندن ف نگا: هەڵڕژاندن.

**هەڵڕژاو:** ڕژاو بەرەوخوار ف فروریختە، بەپایین ریختە.

**هەڵڕژتن:** هەڵڕژاندن ف نگا: هەڵڕژاندن.

**هەڵڕژیاگ:** هەڵڕژاو ف نگا: هەڵڕژاو.

**هەڵڕژیان:** هەڵڕژان ف نگا: هەڵڕژان.

**هەڵڕشتن:** هەڵڕژنن ف هەڵڕژاندن.

**هەڵڕوانین:** لە خوارەوە بوٚ سەرەوە تماشاکردن ف ازپایین بەبالا نگاە کردن.

**هەڵڕوٗشان:** ۱) ڕوٗشان، ڕوٗش بردن؛ ۲) نیکچوٗن، هەڵخوٗشان ف ۱) خراش برداشتن؛ ۲) بهم خوردن کار.

**هەڵڕوٗشاندن:** ۱) ڕوٗشاندن؛ ۲) تیٚکدانی کار ف ۱) خراشیدن؛ ۲) بهم زدن کار.

**هەڵڕوٗشانن:** هەڵڕوٗشاندن ف نگا: هەڵڕوٗشاندن.

**هەڵڕوٗشاو:** ۱) ڕوٗشاو؛ ۲) تیٚکدراو ف ۱) خراشیدە؛ ۲) بهم خوردە.

**هەڵڕوٗشیاگ:** هەڵڕوٗشاو ف نگا: هەڵڕوٗشاو.

**هەڵڕوٗشیان:** هەڵڕوٗشان ف نگا: هەڵڕوٗشان.

**هەڵڕەخسان:** دەرفەت دەسکەوتن ف فرصت یافتن.

**هەڵڕەخسین:** هەڵڕەخسان ف فرصت یافتن.

**هەڵڕیان:** گوٚکردنی زوٚر و بەپەلە ف ریدن بسیار و با عجلە.

**هەڵــز:** ١) گیایەکی بەنـاوبـانگی گەڵادەرزیی‌یە لە نیرەی کەمـاو لۆیە بۆدەرمان دەشێ بەچێشت خۆشەو لەوەڕی چاکە؛ ٢) فەت. وێنجە [ف] ١) گیاهی است برگ سوزنی که مصرف دارویی و خوراکی دارد؛ ٢) یونجە.

**هەڵزبڕ:** وەختی دروێنەی وێنجە [ف] موسم درو یونجه.

**هەڵزبەهین:** سیس‌هەڵگەڕان‌و زەردبوونی وێنجە [ف] زرد و پژمرده شدن یونجه.

**هەڵ زڕان:** ١) پڕبوونی پێست لە زیپکە؛ ٢) دادڕان [ف] ١) پرجوش شدن پوست؛ ٢) بردریده شدن، پاره شدن.

**هەڵ زڕاندن:** دڕاندن [ف] بردریدن، پاره کردن.

**هەڵ زڕانن:** هەڵ‌زڕاندن [ف] پاره کردن.

**هەڵ زڕاو:** دڕاو [ف] دربده، پاره شد.

**هەڵ زرنگان:** ١) هانە، دنە؛ ٢) شلەژان، شێوان‌و سەر لێ‌تێکچوون [ف] ١) تحریك؛ ٢) شوریدن.

**هەڵ زرنگاندن:** هانەدان، دنەدان [ف] تحریك کردن.

**هەڵ زرنگانن:** هەڵ‌زرنگاندن [ف] تحریك کردن.

**هەڵ زرنگیان:** هەڵ‌زرنگان [ف] نگا: هەڵ‌زرنگان.

**هەڵ زرەپان:** هەڵ نۆفین [ف] نگا: هەڵ‌نوقین، هەڵ‌نۆقان.

**هەڵ زڕیاگ:** پێستی پڕ لەزیپکە بوگ [ف] پوست پرجوش شده.

**هەڵ زڕیان:** زیپکەی زۆر لە پێست هاتن [ف] جوش زیاد بر پوست زدن.

**هەڵ زڕیاو:** پێستی زۆر زیپکە لێ‌هاتگ [ف] پوست پرجوش شده.

**هەڵ زلەپان:** پۆرگ دەرکردنی پێست [ف] جوش زدن پوست.

**هەڵ زلەپین:** هل‌زلەپان [ف] نگا: هەڵ زلەپان.

**هەڵ زنین:** هەڵچوون بەرەو بالا [ف] بالارفتن از بلندی.

**هەڵ زوڕان:** سوتـانی نوێی سەرەوەی گـۆشت [ف] سـوختن سطحی گوشت.

**هەڵ زەقینەوە:** هەڵ‌پەزینەوە لەترس‌و لەنکاو [ف] جستن ناگهانی از ترس.

**هەڵ زیپان:** هەڵ‌نۆفان، هەڵ‌نوقین [ف] نگا: هەڵ‌توقان.

**هەڵ ژلـیوبان:** ١) پشێوینی زۆدان؛ ٢) دڵ‌تێکجـوون‌و شلەژان [ف] ١) آشوب بر پا شدن؛ ٢) دل بهم آمدن و پیچ و تاب خوردن.

**هەڵ ژمار:** سەرژمێری، ژماردن [ف] احصائیّه، آمار، سرشماری.

**هەڵ ژمـاردن:** ١) هەڵ‌بژاردن؛ ٢) سەرژمـارکردن [ف] ١) برگزیدن؛ ٢) سرشماری کردن.

**هەڵ ژماردو:** ١) هەڵ‌بژێراو؛ ٢) ژمێردراو [ف] ١) برگزیده؛ ٢) برشمرده.

**هەڵ ژمارده:** هەڵ‌ژماردو [ف] نگا: هەڵ‌ژماردو.

**هەڵ ژمێر:** ١) هەڵ‌بژێر؛ ٢) کەسێ کە دانـەدانـە شتێ دەبژێرێ [ف] ١) برگزیننده؛ ٢) برشمرنده.

**هەڵ ژمێراو:** هەڵ‌ژماردو [ف] نگا: هەڵ‌ژماردو.

**هەڵژیویان:** فلیقانەوە [ف] لەشدن.

**هەڵس:** راسنەوەبە [ف] برخیز.

**هەڵسان:** ١) راسنەوەبوون؛ ٢) لە لان دەرچوونی نێچیر؛ ٣) بەرزبوونەوەی ئاو؛ ٤) لە خەو بێداربـوونەوە [ف] ١) برخاستن؛ ٢) از مخفیگاه دررفتن نخجیر؛ ٣) بالاآمدن سطح آب؛ ٤) از خواب بیدار شدن.

**هەڵســـانـــدن:** ١) راستـەوەکـردن؛ ٢) لە لان دەرخستن؛ ٣) لە خەو بێدارکـردن [ف] ١) برخیزانـدن؛ ٢) ازلانه خارج کردن شکار؛ ٣) از خواب بیدار کردن.

**هەڵساندن:** ١) شل‌و سست کردن؛ ٢) وردکردن وەك کونانی گەنم؛ ٣) لاوازکردن؛ ٤) کەم‌کردن؛ ٥) رزاندن؛ ٦) خراپ کردن. لەکارخستن [ف] ١) سست کردن؛ ٢) خردکـردن، کوبیدن؛ ٣) لاغرکردن؛ ٤) کم کردن؛ ٥) پوساندن؛ ٦) ازکارانداختن.

**هەڵسانن:** هەڵساندن [ف] نگا: هەڵساندن.

**هەڵسانەوە:** ١) دوای کەوتن راست‌بوونەوە؛ ٢) لەنەخۆشی چاببوونەوە [ف] ١) پس از افتادن باز برخاستن؛ ٢) از بیماری بهبودیافتن.

**هەڵساو:** بەرکاری هەڵسان [ف] صیغهٔ مفعولی «هەڵسان».

**هەڵ ساوین:** پیاماڵین، ساوین [ف] اندودن، مالیدن.

**هەڵ سپاردن:** هەڵ‌پەسارتن [ف] نگا: هەڵ‌پەسارتن.

**هەڵ سپێران:** هەڵ‌بەسێران [ف] نگا: هەڵ‌پەسێران.

**هەڵ سپێراو:** هەڵ‌پەسێراو [ف] نگا: هەڵ‌پەسێراو.

**هەڵ سپێرباگ:** هەڵ‌پەسێراو [ف] نگا: هەڵ‌بەسێراو.

**هەڵ سپێریان:** هەڵ‌پەسارتن [ف] نگا: هەڵ‌پەسارتن.

هەڵسست: رابوون. هەستان [ف] برخاستن.

**هەڵستان:** هەڵسان [ف] نگا: هەڵسان.

**هەڵستاندن:** هەڵساندن [ف] نگا: هەڵساندن.

**هەڵستانەوە:** هەستانەوە [ف] نگا: هەستانەوە.

**هەڵستاو:** هەڵساو [ف] نگا: هەڵساو.

**هەڵستە:** رابە، راست‌بەوە، هەستە [ف] برخیز.

**هەڵ سزین:** چڵم هەڵ‌لوشینەوە لە کەپۆدا [ف] آب بینی را بالا کشیدن.

**هەڵ سکانن:** بەرجوێن‌دان‌و خراوگوتن [ف] دشنام دادن و بدگفتن.

**هەڵســو:** ١) فەرمـان بە تێ‌ساوین؛ ٢) رابردوی پیاساوین: (مەڵحەمی نێ‌هەڵسوم، قوڕم نێ‌**هەڵسو**) [ف] ١) امر به اندودن؛ ٢) ماضی اندودن.

**هەڵسوان:** پیاساوین [ف] اندودن، اندایش.

**هەڵسوڕ:** ١) خول‌خواردن؛ ٢) بزوتن: (خەریکی **هەڵسوڕ** داسوڕە) [ف] ١) چرخش؛ ٢) تحرّك.

**هەڵ سوڕان:** ١) سـوڕان، خـولانەوە؛ ٢) بـزوتن [ف] ١) چرخیدن؛ ٢) تحرّك.

**هەڵ سوڕاندن:** خولدان: (ناولەمەی **هەڵ سوڕاند**) [ف] چرخانیدن.

**هەڵ سوڕاو:** ١) خول‌دراو؛ ٢) برێتی لە مرۆی بەکـارو تێکـۆشـەر: (پیاوێکی **هەڵ سوڕاوە**) [ف] ١) چرخیده؛ ٢) کنایه از آدم پرتحرّك.

**هەڵ سوڕیان:** هەڵ‌سوڕان [ف] نگا: هەڵ‌سوڕان.

**هەڵ سوڕین:** هەڵ‌سوڕان [ف] نگا: هەڵ سوڕان.

**هەڵ سوڕێن:** ١) کەسـێ کە خول بە شتـێ دەدا؛ ٢) برێتـی لە کار پێك‌هێنـەر: (مـام‌حەسـەن کاروبـاری ئاغا **هەڵ دەسوڕێنێ**) [ف] ١) چرخاننده؛ ٢) کنایه از گرداننده کار.

**هەڵسوون**: پیاساوین ف اندودن، مالیدن.

**هەڵسە**: هەڵسنە ف برخیز.

**هەڵ سەنگان**: ۱) بەراوردکردنی کێش؛ ۲) برێتی لە ئەزموون و نرخ بۆدانان ف ۱) نوزین؛ ۲) سنجش، ارزیابی.

**هەڵ سەنگاندن**: ۱) کێشان بە تەرازوو؛ ۲) بەراوردکردن، نرخ بۆدیاری کردن ف ۱) وزن کردن؛ ۲) ارزیابی کردن، سنجیدن.

**هەڵ سەنگانن**: هەڵسەنگاندن ف نگا: هەڵسەنگاندن.

**هەڵ شاخان**: بەسەردا ئەڕاندن: (نازانی چۆن بەسەرمندا **هەڵی شاخاند**) ف بانگ بر سر زدن، برسر کسی فریاد کشیدن.

**هەڵ شاخین**: هەڵشاخان ف نگا: هەڵشاخان.

**هەڵ شاندن**: ۱) رماندن، روخاندن؛ ۲) هەڵوەشاندن؛ ۳) پاشگەزی؛ ۴) نیکدان ف ۱) ویران کردن، نخریب کردن؛ ۲) ازهم بازکردن؛ ۳) نگا: پاشگەزی؛ ۵) برهم زدن.

**هەڵشتن**: ۱) هشتن، راگرتن؛ ۲) بەجێ هێشتن ف ۱) نگهداشتن؛ ۲) بجاگذاشتن.

**هەڵ شڵنگاندن**: خۆهەڵکێشانی بەدرۆ ف لاف و گزاف گفتن.

**هەڵ شڵەپاندن**: هەڵپشاونن ف مجاله کردن، دردست فشردن.

**هەڵ شڵەپین**: لەئاودا هەڵبەزینەوە ف جست وخیز درآب.

**هەڵ شڵپان**: شڵپەلێ هێنان لەئاودا ف با شبرجه در آب انداختن.

**هەڵ شڵینگاندن**: هەڵشڵنگاندن ف لاف و گزاف گفتن.

**هەڵ شماردن**: دانەدانە باس کردن ف برشمردن.

**هەڵ شنگاندن**: هەڵشڵنگاندن ف لاف و گزاف گفتن.

**هەڵشۆ**: گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف نام دهی است در کردستان که بعثیان ویران کردند.

**هەڵ شۆلان**: زگچوون ف اسهال.

**هەڵ شۆلاندن**: گوی شل کردن، زگەشۆرە ف اسهالی ریدن.

**هەڵ شێل**: پشاوتن و شێلان ف بهم زدن و جلاندن.

**هەڵ شێلان**: هەڵشێل ف نگا: هەڵشێل.

**هەڵ شێوان**: ۱) تێکەڵدران و لێکدران؛ ۲) دڵ تێکچوون ف ۱) بهم خوردن و آشفته شدن؛ ۲) دل بهم آمدن.

**هەڵ شێواندن**: ۱) تێکەڵدان و لێکدان؛ ۲) بوونەهۆی دڵ تێکچوون ف ۱) بهم زدن؛ ۲) دل بهم زدن.

**هەڵ شێوانن**: هەڵشێواندن ف نگا: هەڵشێواندن.

**هەڵ شێواو**: ۱) تێکەڵدراو؛ ۲) دڵ تێکچو ف ۱) بهم زده، آشفته؛ ۲) دل بهم آمده.

**هەڵ شێویاگ**: هەڵشێواو ف نگا: هەڵشێواو.

**هەڵ شێویان**: هەڵشێوان ف نگا: هەڵشێوان.

**هەڵفانەك**: ۱) بەهەڵکەوت، تۆش بوونی بێ چاوەنوڕی؛ ۲) پەل کوتانی ناچاری ف ۱) برحسب اتّفاق، بەندرت؛ ۲) دست و پازدن از روی ناچاری.

**هەڵفڕ**: فڕین، باڵ گرتنەوە ف پرواز.

**هەڵفڕان**: هەڵفڕ ف پرواز.

**هەڵفڕاندن**: بوونەهۆی باڵ گرتنەوە ف پر وازدادن.

**هەڵفڕانن**: هەڵفڕاندن ف پر وازدادن.

**هەڵ فرنان**: قوشقی بوون و ڕاکردن ف رمیدن و گریختن.

**هەڵ فرناندن**: وەدەرنان، دەرکردن ف دك کردن، بیرون راندن.

**هەڵ فرتانن**: هەڵفرناندن ف دك کردن.

**هەڵ فرتیان**: هەڵفرنان ف رمیدن و گریختن.

**هەڵفڕین**: هەڵفڕان ف پرواز.

**هەڵفڕێن**: شتێ کە باڵدار وەفڕین دەخا ف پر وازدهنده.

**هەڵ فریوان**: هەڵخەڵەتان ف فریب خوردن.

**هەڵ فریواندن**: خاپاندن ف فریب دادن.

**هەڵ فریوانن**: هەڵفریواندن ف فریب دادن.

**هەڵ فلبقان**: پلبخانەوە ف له و درهم شدن.

**هەڵ فلیقان**: هەڵفلبقان، پلبخانەوە ف له و درهم شدن.

**هەڵ فلیقاندن**: پلیخاندنەوە ف لەکردن.

**هەڵ فلێقانن**: پلیخاندنەوە ف لەکردن.

**هەڵ فلیقاو**: فلبقاوە، پلبخاوە ف له و درهم شده.

**هەڵ فلیقاوە**: هەڵفلبقاو ف له و درهم شده.

**هەڵ فلیقیاگ**: هەڵفلبقاو ف له و درهم شده.

**هەڵ فلیقیان**: هەڵفلبقان ف له و درهم شدن.

**هەڵفۆ**: ۱) گەلحۆ، تەڵەوی نەمەڵ؛ ۲) هەمەکارەی بێکارە ف ۱) لندهور، چاق تنبل؛ ۲) همه کاره هیچکاره.

**هەڵفۆنە**: سەیران و خواردن لە دەشت ف پیك نیك، گردش تفریحی.

**هەڵ فیڕان**: بەلەفیڕەگرتن ف اسهال شدن.

**هەڵ فیڕاندن**: ریانی گوی شل ف اسهالی ریدن.

**هەڵقا**: ۱) ئاڵقە، گەو؛ ۲) نێ گیرا ف ۱) حلقه؛ ۲) گیرکرد.

**هەڵقابەستش**: بە جەغز دانیشتن، کۆڕبەستن ف دایره وار نشستن.

**هەڵ قاچان**: بە قەیچی بڕان، هەڵپاچان ف برش با قیچی

**هەڵ قاچین**: هەڵپاچین ف بریدن با قیچی.

**هەڵقان**: تێگیران، گیرکردن: (داوێنم دەوبزمارەی **هەڵقا**) ف به چیزی گیرکردن.

**هەڵ قاندن**: کۆڵین، کەندن ف برکندن.

**هەڵقاو**: نیگیراو، گیرخواردو ف درچیزی گیر کرده.

**هەڵ قرتان**: ۱) سەری دار یا گیا یا هەرچی بە مقەس قرتان؛ ۲) لێو وەرگێڕان ف ۱) قیچی برشدن قسمت بالایی گیاه و...؛ ۲) لب برگرداندن از ناخشنودی.

**هەڵ قرتاندن**: ۱) سەر بە مقەس قرتاندن؛ ۲) لچ وەرگێڕان ف ۱) بالای هر چیزی را با قیچی بریدن؛ ۲) لب برگرداندن از ناخشنودی.

**هەڵ قرتاو**: سەر بە قەیچی بڕاو ف سرقیچی شده، با قیچی بر بده شده.

**هەڵ قرچان**: ۱) لەسەر ئاگر چۆقین؛ ۲) گنج و چرچ تێ کەوتن لە تینی ئاگر ف ۱) برآتش تفیدن؛ ۲) ترنجیدگی، از شدّت گرما چروك برداشتن.

**هەڵ قرچاندن**: ۱) لەسەر ئاگر چۆقاندنی ڕۆن؛ ۲) گنجدارکردن، به

جرچ و لوَچ کردن فا ١) برآتش نفانبدن، ذوب کردن روغن؛ ٢) جبن و چروك دادن.

**هەڵ قرچاو:** ١) جۆفاوی زۆن؛ ٢) جرچ و لوَچ بوگ فا ١) روغنِ نفیده؛ ٢) ترنجیده، چروکیده.

**هەڵ قرچیاگ:** هەڵ قرچاو فا نگا: هەڵ قرچاو.

**هەڵ قرچیان:** هەڵ قرچان فا نگا: هەڵ قرچان.

**هەڵ قلیشان:** لە سەر تا خوار قەلْشین فا برشکافتەشدن.

**هەڵ قلیشاندن:** لە سەر تا خوار قەلْشاندن فا برشکافتن.

**هەڵ قلیشاو:** ئەم‌سەر ئەوسەر قەلەشاو فا شکافته شده.

**هەلْقوت:** سەرکێشان بۆ دیتن: (تۆ ئەم **هەلْقوت هەلْقوتەت** لەچیە؟) فا سرکشیدن برای دیدزدن دزدکی.

**هەڵ قوتان:** ١) هەلْقوت؛ ٢) خۆ هێنانەناو کارێ کە کاری بەسەربەوە نیە فا ١) سرك کشیدن؛ ٢) فضولی.

**هەڵ قوتـانـدن:** ١) سەرەتانکێ کردن؛ ٢) دەم‌نێوەردان بە نازەوا فا ١) سرك کشیدن؛ ٢) فضولی کردن.

**هەڵ قوتین:** ١) سەرەتـاتکێ کەر؛ ٢) دەم‌نێوەدەری نازەوا: (کابرایەکی خۆ تێ **هەڵ قوتینە**) فا ١) سرك کش؛ ٢) فضول.

**هەڵ قوزان:** کاری بەفڕ خواردنەوە فا نوشیدن.

**هەڵ قوزان:** هەڵ قوزان فا نوشیدن.

**هەڵ قوزاندن:** خواردنەوەی بەیەک‌سەرە، فڕکردن فا سرکشیدن مایع.

**هەڵ قوزانن:** هەڵ قوزاندن فا سرکشیدن مایع.

**هەڵ قوزانن:** هەڵ قوزاندن فا سرکشیدن مایع.

**هەڵ قوزاو:** فڕکراو فا سرکشیده، مایع یکباره نوشیده شده.

**هەڵ قورت:** ١) هەلْقوت؛ ٢) لێوەرگێڕان فا ١) سرك کشیدن؛ ٢) لب برگرداندن.

**هەڵ قورتـان:** ١) هەڵ قونـان؛ ٢) وەرگەڕانـەوەی لێو فا ١) نگـا: هەڵ قونان؛ ٢) برگشتن لب از ناخشنودی.

**هەڵ قورتـاندن:** ١) هەڵ قوتاندن؛ ٢) وەرگەڕاندنەوەی لیچ فا ١) نگا: هەڵ قوناندن؛ ٢) برگرداندن لب از ناخشنودی، لب ورچیدن.

**هەڵ قورتیان:** هەڵ قونان فا نگا: هەڵ قونان.

**هەڵ قورتین:** هەڵ قوتین فا نگا: هەڵ قونین.

**هەڵ قوزیاگ:** هەڵ قوزاو فا نگا: هەڵ قوزاو.

**هەڵ قوزین:** هەڵ قوزان فا سرکشیدن مایع.

**هەڵ قوزین:** فڕکەر فا نوشنده.

**هەڵ قورینجان:** نقورچك فا نیشگون.

**هەڵ قورینجاندن:** رەبادان، نقورچك گرتن فا نیشگون گرفتن.

**هەڵ قورینجانن:** هەڵ قورینجاندن فا نیشگون گرفتن.

**هەڵ قورینجاو:** جێگای نقورچك لێ گیراو فا جای نیشگون.

**هەڵ قورینجین:** نقورچك گر فا نیشگون گیرنده.

**هەڵ قورینجینراو:** هەڵ قورینجاو فا جای نیشگون.

**هەڵ قولان:** ١) بەئـەوژم دەرچـوونی تراو بەرەوبالا: (**هەڵ قولانی** ناوی کانی)؛ ٢) لەنکاو پەیدابوون فا ١) جوشیدن آب از چشمه یا فوران هر مایعی؛ ٢) ناگهان پدیدارشدن.

**هەڵ قولاندن:** بوئەهۆی هەڵ قولان فا باعث فوران شدن.

**هەڵ قولاو:** ١) تراوی بەئەوژم بۆ سەرەوە دەرچوگ؛ ٢) لەنکاو پەیدابوگ فا ١) مایع فوران کرده، جوشیده؛ ٢) ناگهان پدیدار شده.

**هەڵ قولتان:** ١) هەڵ قولان؛ ٢) لێو کۆکردنەوە وەك خونچە؛ ٣) لەنکاو پەیدابوون؛ ٤) کولْینی تراو لەسەر ناگر فا ١) جوشیدن، فوران کردن؛ ٢) لب غنچه کردن؛ ٣) ناگهان پدیدارشدن؛ ٤) جوشیدن مایع برآتش.

**هەڵ قولتیان:** هەڵ قولتان فا نگا: هەڵ قولتان.

**هەڵ قولیان:** هەڵ قولان فا نگا: هەڵ قولان.

**هەڵ قولین:** هەڵ قولان، هەڵ قولتان فا نگا: هەڵ قولان.

**هەڵ قولیو:** هەڵ قولاو فا نگا: هەڵ قولاو.

**هەلْقون:** قنەکردن، ڕۆیشتنی هێندێك باڵدار فا ورجە.

**هەلْقون هەلْقون:** قنەکردن، بە قنە ڕۆیشتن فا ورجەورجە.

**هەڵ قونیان:** لەبڕ بەرچاوهاتن فا یکهو پدیدار شدن.

**هەڵ قونین:** هەڵ قونیان فا یکهو پدیدارشدن.

**هەلْقە:** ١) ئالْقە، گەو؛ ٢) فێڵ، گزی فا ١) حلقه؛ ٢) حیله، نارو.

**هەلْقەباز:** ١) جادوگەر؛ ٢) فێڵباز فا ١) جادوگر؛ ٢) حقه‌باز.

**هەلْقەبەگوش:** نۆکەری ئەمەگدار فا نوکرحلقه بەگوش.

**هەلْقەبەگوێ:** هەلْقەبەگوش فا غلام حلقه‌به‌گوش، نوکر مخلص.

**هەلْقەتران:** لێك کۆبونەوەی هەتیومەتیو فا گرد هم‌آیی اوباش.

**هەلْقەترانێ:** هەلْقەتران فا تجمّع اوباش.

**هەلْقەتیز:** ئالْقەتیز فا گیاهی است دارای شیرهٔ مُسهل.

**هەلْقەتیزان:** کۆمەڵی جەفەنگ‌بازان فا مجلس بذله‌گوبان.

**هەلْقەتیزانێ:** قسەی گەپ و گاڵتە پێکەوەکردن فا شوخی و هزل با هم گفتن.

**هەلْقەلْك:** هانکەهانکی سەگ، هەلکەلْك فا هِن هِن سگ.

**هەڵ قەمچان:** هەڵ قرچان، ترنجان فا از شدّت گرما چروك برداشتن.

**هەلْقەن:** کەن، زیندەوەرێ کە ئەکوڵێ فا کاونده.

**هەلْقەناو:** کەندراو فا کنده‌شده.

**هەڵ قەندار:** جۆرێ تفەنگی زەشوکی کە قەدیم هەبو فا نوعی تفنگ قدیمی.

**هەڵ قەندراو:** کەندراو فا کنده‌شده.

**هەڵ قەندن:** کەندن، کوڵین فا کندن، برکندن.

**هەڵ قەندنەوە:** ١) دیسان هەڵ قەندن؛ ٢) بەبنەوە دەرهێنانی گیاو ڕوەك لە زەوی: (ئـەوڕو هەرەوەزی جەوەنـدەر **هـەڵ قەنـدنـەوە** بە) فا ١) بازبرکندن؛ ٢) از ریشه‌کندن گیاه و محصولات کشاورزی.

**هەڵ قەنەوە:** هەڵ قەندنەوە فا نگا: هەڵ قەندنەوە.

**هەلْك:** نێزکردن بە کەسێ فا مسخره، تمسخر.

**هەڵ کالان:** بە نێرەیی باس یا تماشاکردن فا حسودانه گفتن یا نگاه کردن.

**هەڵ کالْیان:** هەڵ کالان فا نگا: هەڵ کالان.

**هەڵ کاڵین:** هەڵ‌کاڵان ف نگا: هەڵ‌کاڵان.

**هەڵ کران:** ١) پێ‌بوونی ناگر؛ ٢) هاڵاندنی داو لە شتێ: (گلۆلەکە **هەڵکرا**)؛ ٣) رابواردنی ژیان: (**هەڵ کران** دەگەڵ تۆ گرانە)؛ ٤) بەرەژوور برانی داوێن‌و قۆڵ: (خۆت **هەڵکە**) ف ١) افروخته شدن؛ ٢) پیچیده‌شدن نخ بر چیزی؛ ٣) گذران زندگی؛ ٤) ورمالیده‌شدن.

**هەڵ کڕان:** ١) بە جنگ‌و نینۆك کڕاندن؛ ٢) خوراندن: (خۆ **هەڵ مەکرێنە**) ف ١) حك كردن با ناخن و تیغ؛ ٢) خاراندن.

**هەڵ کڕاندن:** ١) بە نینۆك‌و بە شتێ تیژ شتێ لە شتێ جیاکردنەوە؛ ٢) خۆخوراندنی بەنەوژم ف ١) حك كردن؛ ٢) خاراندن شدید.

**هەڵ کڕانن:** هەڵ‌کڕاندن ف نگا: هەڵ‌کڕاندن.

**هەڵ کراو:** ١) داو لە شتێ پێچراو؛ ٢) داوێن‌و قۆڵی بەرەژوور براو: (دەلینگی **هەڵ کراوە**) ف ١) پیچیده؛ ٢) ورمالیده.

**هەڵ کڕاو:** ١) بە نینۆك کڕاو؛ ٢) خورێندراو، خوراو ف ١) حك شده؛ ٢) خارانده.

**هەڵ کرچان:** جرچ‌و لۆچ‌بوون ف ترنجیدگی، چین و چروك برداشتن.

**هەڵ کرچاندن:** جرچ‌و لۆچ‌کردن ف ترنجیدن، چین و چروك کردن.

**هەڵ کرچاو:** جرچ‌و لۆچ ف چین خورده.

**هەڵ کرچیان:** هەڵ‌کرچان ف نگا: هەڵ‌کرچان.

**هەڵ کرچین:** هەڵ‌کرچان ف نگا: هەڵ‌کرچان.

**هەڵکرد:** گوزەران‌و رابواردن ف گذران زندگی.

**هەڵ کردن:** ١) گوزەران‌کردن؛ ٢) دەلینگ‌و داوێن‌و قۆڵ بەرەژوور بردن؛ ٣) ناگر پێ‌کردن ف ١) زندگی را گذراندن؛ ٢) ورمالیدن؛ ٣) افروختن.

**هەڵ کردنەسەر:** هێرش بۆ بردن ف حمله‌ور شدن.

**هەڵ کرن:** ١) هەڵ‌کردن، گوزەران‌کردن؛ ٢) نواندنەوە؛ ٣) هانەدان. هەڵ‌خراندن ف ١) زندگی را گذراندن؛ ٢) ذوب کردن؛ ٣) برانگیختن.

**هەڵ کرۆزان:** تۆزێ بە ناگر سووتان ف سوختن سطحی.

**هەڵ کرۆزاندن:** کەمێ بە ناگر سووتاندنی پێست‌و گۆشت ف سوزانیدن سطحی.

**هەڵ کرۆزاو:** کەمێ سووتاو بە ناگر ف سوختهٔ سطحی.

**هەڵ کری:** ١) پێکراو، داگرساو؛ ٢) دنەدراو؛ ٣) ناواوە ف ١) افروخته؛ ٢) برانگیخته؛ ٣) ذوب شده.

**هەڵ کریاگ:** پێچباوی داو لە شتێ، گلۆلە‌کراو ف نخ گلوله‌شده.

**هەڵ کریان:** گلۆلە‌کردن ف گلوله‌کردن نخ.

**هەڵ کز:** سوورەوەبوونی گۆشت لەسەر ناگر ف سرخ شدن گوشت بر آتش.

**هەڵ کزان:** هەڵ‌کز ف نگا: هەڵ کز.

**هەڵ کزاندن:** سوورەوەکردنی گۆشت لەسەر ناگر ف سرخ کردن گوشت در تابه.

**هەڵ کزانن:** هەڵ‌کزاندن ف نگا: هەڵ‌کزاندن.

**هەڵ کزاو:** سوورەوەکراوی رەقەوەبووگ ف سرخ شدهٔ سفت شده.

**هەڵ کزیان:** هەڵ‌کز، هەڵ‌کزان ف سرخ شدن گوشت بر آتش.

**هەڵ کزین:** هەڵ‌کز، هەڵ‌کزان ف سرخ شدن گوشت بر آتش.

**هەڵکش:** ١) بەرەژوورچوون: (بۆ کێو **هەڵ کشان**)؛ ٢) دەرکێشانی خەنجەرو شیر؛ ٣) هاتنەبێشی ناوی دەریا ف ١) روبه‌بالا رفتن؛ ٢) آختگی تیغ؛ ٣) مدّ آب دریا.

**هەڵ کشان:** هەڵکش ف نگا: هەڵکش.

**هەڵ کشاندن:** ١) بەرەوسەرکێشان؛ ٢) دەرکێشانی خەنجەرو شیر؛ ٣) دەرهاوردن ف ١) به بالا کشیدن؛ ٢) برکشیدن، آختن؛ ٣) بیرون آوردن.

**هەڵ کشانن:** هەڵ‌کشاندن ف نگا: هەڵ‌کشاندن.

**هەڵ کشاو:** ١) بەرەوبالا رۆیشتو؛ ٢) بۆ سەرەوە کێشراو؛ ٣) دەرکێشراو؛ ٤) نیشانەی دەنگ‌درێژکردن لەسەر بیتی نوسراو، مەددە ف ١) روبه‌بالا رفته؛ ٢) به‌بالا کشیده شده؛ ٣) برکشیده، آخته؛ ٤) علامت مدّ برحروف.

**هەڵ کشاوە:** نیشانەی دەنگ‌درێژکردنەوە لەسەر بیت، مەددە ف علامت مدّ بر حروف.

**هەڵ کشاوی:** هەڵ‌کشاوە ف علامت مدّ بر حروف.

**هەڵکشە:** ١) هاتنەبێشەوەی ناوی کەناراو؛ ٢) بەرەوژوورکشانەوە؛ ٣) بەرەوژوورچوون: (بۆکامە **هەڵکشە**و داکشە دەزانێ) ف ١) مدّ آب دریا؛ ٢) برگشتن رو به بالا؛ ٣) رو به بالا رفتن.

**هەڵ کشی:** بەرەژوور چو ف رو به بالا رفت.

**هەڵ کشێ:** بەرەژوور بچۆ ف روبه‌بالا برو.

**هەڵ کشیان:** هەڵ‌کشان ف نگا: هەڵ‌کشان.

**هەڵ کشین:** هەڵ‌کشان ف نگا: هەڵ‌کشان.

**هەڵ کشیو:** ١) بەرەوژوور رۆیشتو؛ ٢) بەرەوژوور راکێشراو ف ١) روبه‌بالا رفته؛ ٢) برکشیده.

**هەڵ کفان:** ١) هەڵچوون لەسەر ناگرو کەف لێ‌ڕژان؛ ٢) هەڵازنانی پێست لە زیپکە؛ ٣) نەستوور‌بوون لە باکردن؛ ٤) ترشانی هەویر؛ ٥) هەڵ‌مسان‌و نزیك نەقبنەوەی باروت ف ١) لبریز شدن کف از دیگ بر آتش؛ ٢) برجوش شدن پوست؛ ٣) پف کردن و آماسیدن؛ ٤) ترشیدن خمیر؛ ٥) برآمدن و نزدیك به انفجاربودن باروت.

**هەڵ کفاندن:** بە ئەسکوێ نێکەڵ‌دانی چێشتێ کە هەڵ‌دەچێ ف با ملاقه بهم زدن آش در حال جوش.

**هەڵ کفیان:** هەڵ‌کفان ف نگا: هەڵ‌کفان.

**هەڵ کفین:** هەڵ‌کفان ف نگا: هەڵ‌کفان.

**هەڵ کلاش:** بە نینۆك کڕان ف خاراندن و حك كردن با ناخن.

**هەڵ کلاشیان:** هەڵ‌کلاش ف نگا: هەڵ‌کلاش.

**هەڵ کلاشین:** هەڵ‌کلاش ف نگا: هەڵ‌کلاش.

**هەڵ کنیاگ:** هەڵ‌قەناو ف برکنده.

**هەڵکوت:** بەپەلەو بەغار ف با شتاب و دو.

**هەڵ کوتان:** بەلامار ف یورش.

**هەڵ کوتاندن:** ١) بەلاماردان؛ ٢) دەرکێشانی بزمارو.. ف ١) یورش

کردن؛ ۲) برکندن مبخ و....

**هەڵ کوتانەسەر:** پەلاماربۆبردن، هەڵ‌کردنەسەر ف یورش بردن بر کسی.

**هەڵ کوتن:** پەسنددان، پێداهەڵدان ف ستودن.

**هەڵ کوتـــوک:** جۆرێ داوەت‌و هەڵپەڕکێی کوردانە لە کوردستانی بەردەستی ترکان ف نوعی رقص دسته‌جمعی.

**هەڵکوت‌هەڵکوت:** بەغارو پەلەپەل ف بادوبدن و شتاب.

**هەڵ کوتیان:** هەڵ کوتان ف یورش.

**هەڵ کورمان:** ۱) کزکردن‌وخۆمات کردنی باڵدار؛ ۲) برێتی لەکز کردن لە لابەرو بن دیواران ف ۱) کزکردن پرنده؛ ۲) کنایه‌از انزوا و کزکردن در گوشه‌و کنار.

**هەڵ کورمـاو:** ۱) باڵـداری کزکـردو؛ ۲) برێتی لە مروی گۆشەگرتوو لابەر ف ۱) پرندهٔ کز کرده؛ ۲) کنایه از آدم گوشه‌گیر و منزوی.

**هەڵ کورۆزان:** هەڵ کرۆزان ف سوختن سطحی.

**هەڵ کورۆزاندن:** هەڵ کرۆزاندن ف سوزاندن سطحی.

**هەڵ کورۆزانن:** هەڵ کرۆزاندن ف سوزاندن سطحی.

**هەڵ کورۆزاو:** هەڵ کرۆزاو ف سوختهٔ سطحی.

**هەڵ کوروشمان:** هەڵ کورمان ف نگا: هەڵ کورمان.

**هەڵ کوروشماو:** هەڵ کورماو ف نگا: هەڵ کورماو.

**هەڵ کوشان:** کوشین بەتوندی ف فشردن شدید.

**هەڵ کوشین:** هەڵ کوشان ف فشردن شدید.

**هەڵ کولۆش:** هەڵقەن ف کاونده، کننده.

**هەڵ کولۆشان:** هەڵقەندن ف برکندن، کندن.

**هەڵ کولۆشانن:** هەڵ کولۆشان ف برکندن، کندن.

**هەڵ کولۆشیان:** هەڵ کولۆشان ف برکندن.

**هەڵ کولۆشین:** هەڵ کولۆشان ف برکندن.

**هەڵ کوڵـــین:** ۱) دانـــەوەی زەمـــین؛ ۲) ناوەدرێنـــانـــی هەرشتـــێ: (دارهـــەڵ کوڵین، ددان‌هەڵ کوڵین) ف ۱) کنـدن زمین؛ ۲) خالی کردن درون اشیاء.

**هەڵ کوڵین:** هەڵ کوڵین ف نگا: هەڵ کوڵین.

**هەڵکە:** دۆڵچە، سەتڵی چەرم ف دلو چرمین.

**هەڵکـە:** ۱) گوزەران بکـە؛ ۲) بەن بکـە بە گلۆڵـە؛ ۳) داگرسێنە؛ ۴) بەرەژوور بەرە: (فۆڵت هەڵکە) ف صیغهٔ امر «هەڵ کردن».

**هەڵ کەتن:** ۱) مانەوە لە شوێن خۆ؛ ۲) بەرزبوونەوەو بەرەژوورچوون ف ۱) درجای خود ماندن؛ ۲) به‌بالا رفتن.

**هەڵـکـــەر:** ۱) داگیرسێن؛ ۲) گوزەران‌کەر؛ ۳) بەرەژوور بـــەری قوڵ‌و دەلینگ‌و داوێن؛ ۴) بەن بەگلۆلەکەر ف اسم فاعل «هەڵ کردن».

**هەڵ کەفت:** پێش‌هاتی بەدەگمەن ف اتفاق، پیشامد نادر.

**هەڵ کەفتگ:** ۱) بەرکەتی، بلیمەت؛ ۲) پێش‌هاتوی بێ ئاگاداری ف ۱) نابغه؛ ۲) اتّفاق غیرمنتظره.

**هەڵ کەفـتن:** ۱) پێش‌هاتی بەدەگمـــەن؛ ۲) ناو لەقـــورگ گیران؛ ۳) سەرەنگری بردن؛ ۴) رەمت بردن؛ ۵) لەبەرچاوکەوتن؛ ۶) کەم‌وێنەبوون ف ۱) رویداد اتفاقی؛ ۲) آب درگلو گیرکردن؛ ۳) سکندری خوردن؛ ۴) نلوخوردن؛ ۵) از چشم افتادن، منفورشدن؛ ۶) نبوغ.

**هەڵ کەفتە:** بێ‌وێنەو بەرکەتی ف نابغه.

**هەڵ کەفتی:** هەڵ کەفتە ف نابغه.

**هەڵکەڵک:** ۱) هەناسەبڕکێ لە ماندوویی‌و لە نەخۆشی؛ ۲) هانکە هانکی سەگی ماندوو ف ۱) تنگی نفس از خستگی یا بیماری؛ ۲) هن‌هن سگ خسته.

**هەڵکەن:** هەڵقەن ف کاونده.

**هەڵ کەندراو:** هەڵ قەناو ف کنده‌شده.

**هەڵ کەنراو:** هەڵ قەناو ف کنده‌شده.

**هەڵ کەندن:** هەڵ قەندن ف کندن

**هەڵ کەنن:** هەڵ کەندن ف کندن.

**هەڵ کەنیاگ:** هەڵ قەناو ف کنده‌شده.

**هەڵکەوت:** ۱) هەڵکەفت؛ ۲) دەرفەت: (هەر بۆم هەڵ کەوت و دێم) ف ۱) پیشامد نادر؛ ۲) فرصت.

**هەڵ کەوتـــن:** ۱) هەڵ کەفـتـن؛ ۲) مانـــەوە؛ ۳) بەرەژوورچـــوون؛ ۴) تەرەقی کردن؛ ۵) دەرفـەت ف ۱) نگا: هەڵ کەفتن؛ ۲) بازماندن؛ ۳) به‌بالارفتن؛ ۴) ترقّی کردن؛ ۵) فرصت.

**هەڵ کەوتو:** هەڵ کەفتە ف نابغه.

**هەڵ کەوتە:** هەڵ کەفتە ف نابغه.

**هەڵکەهەڵک:** پشوسواری‌و مرخەمرخ ف هن‌هن نفس تنگی.

**هەڵ کێشـــان:** ۱) دەرکێشـــان؛ ۲) بۆســـەردوە کێشان: (هەڵی کێشە با بێنـەسـەر)؛ ۳) قووت‌دانـەوەی ئەفەس: (هەناسەی هەڵ کێشا)؛ ۴) تاریف کردن: (خـۆ هەڵ مەکێشە) ف ۱) بیرون کشیدن؛ ۲) به‌بالا کشیدن؛ ۳) نفس کشیدن؛ ۴) تعریف کردن، مدح کردن.

**هەڵ کێشانن:** هەڵ کێشان ف نگا: هەڵ کێشان.

**هەڵ کێشیان:** هەڵ کێشان ف نگا: هەڵ کێشان.

**هەڵگ:** کۆشش‌و تەقالای زۆر ف تلاش زیاد.

**هەڵگـر:** ۱) کەسێ کە سەنگینی بەرزدەکاتەوەو ڕای‌دەگرێ؛ ۲) ڕاگوێز؛ ۳) بلندڕاگر: (ئەسپی کلک‌هەڵگر باشە) ف ۱) بردارنده؛ ۲) حامل؛ ۳) بلندنگاه دارنده.

**هەڵ گڕا:** ۱) گڕی بەرزەوەبـوو؛ ۲) سوتـا بە گڕ؛ ۳) لەش هەمـوو بۆ بە زیپکەو دومەڵ ف ۱) مشتعل شد؛ ۲) با آتش سوخت؛ ۳) همهٔ پوست را جوش و دُمل فراگرفت.

**هەڵ گڕان:** ۱) گڕبـەرزەوەبوون؛ ۲) سوتان بە گڕ؛ ۳) لەش‌هەڵازتان بە کوان‌و زیپکـە ف ۱) افـروختن؛ ۲) با آتش سوختن؛ ۳) فراگرفتن جوش همهٔ بدن را.

**هەڵ گراو:** ۱) ڕاگیراو: (شتێکی نۆ لای منە هەڵ گراوە)؛ ۲) ژنی ڕفێنراو ف ۱) نگهداری شده؛ ۲) زن ربوده شده.

**هەڵ گڕاو:** بەرکاری هەڵ گڕان ف اسم مفعول «هەڵ گڕان».

**هەڵ گرتن:** ۱) لاگرتن: (سەری ئەم سندوقە هەڵگرە)؛ ۲) قبول کردن: (خـوا هەڵ ناگـرێ، دڵم هەڵی ناگرێ)؛ ۳) بەرزەوە کردن‌و ڕاگرتن؛

(ئەمە لە زەوی **هەڵگرە**)؛ ٤) شاردنەوە: (ئەم پارەیەم بۆ **هەڵگرە**)؛ ٥) ڕەواندنی ژن؛ ٦) جوێن‌دانی زۆر: (**هەڵی گرت** ئەمما **هەڵ گرتن**)؛ ٧) غاردانی ئەسپ بەسوارەوە بێ ڕاوەستاندن: (ئەسپ **هەڵی گرتم**، فیرەهەڵ **گرتنە**)؛ ٨) هەڵبژاردن، نابەنی خۆ کردن: (لەو کەوشانە جوتێکی **هەڵگرە**)؛ ٩) هەڵێنانی لاقی ئەخۆش لە ڕۆیشتنا: (گابەکە باشوی **هەڵ گرتوە**) ف ١) سرپوش برداشتن؛ ٢) روادبدن؛ ٣) برداشتن، بلندکردن؛ ٤) نگهداری کردن؛ ٥) ربودن زن؛ ٦) دشنام بسیار به کسی دادن؛ ٧) دوبدن و از کنترل خارج شدن اسب با سوار؛ ٨) انتخاب کردن، بەخود اختصاص دادن؛ ٩) بلندکردن و بر زمین نگذاشتن پای لنگ.

**هەڵ گرتنەوە:** ١) پەرژو بڵاو کۆکردنەوە؛ ٢) سزا وەرگرتن: (ئەوا **هەڵمان گرتەوە**)؛ ٣) قبوڵ کردنەوەی بێچو لەلایەن دایکی نەبانەوە: (بێچوەکەی **هەڵ گرتەوە**)؛ ٤) سڕینەوەی نوسراو: (ئەم دو کەلیمەی لێ **هەڵ گرەوە**)؛ ٥) چنینەوەی گەوی بەربوگ لە کردا: (گۆرەوەیەکم دوگەوی بەربو **هەڵم گرتەوە**) ف ١) از زمین چیدن پراکندە؛ ٢) پاداش گرفتن؛ ٣) دوبارە پذیرفتن بچە توسط مادرش؛ ٤) سترون نوشتە؛ ٥) بافتن دانەهای دررفتۀ بافتنی.

**هەڵ گرتەیی:** لە زەوی بەرزتر ڕۆیشتنی کەلا ف بالاتر از زمین رفتن نیلە.

**هەڵ گرسان:** گڕ لێ پەیدابوون ف افروختگی.

**هەڵ گرساندن:** گڕ لێ پەیداکردن ف افروختن.

**هەڵ گرساتن:** هەڵ گرساندن ف افروختن.

**هەڵ گرسیاو:** هەڵ کراو، ئاگری پێ بوگ ف افروختە.

**هەڵ گلۆفان:** ١) هەڵ کوشین؛ ٢) لەدەستا گوشین و قلبقاندنەوە ف ١) فشردن؛ ٢) دردست مچالەکردن.

**هەڵ گلۆفتن:** هەڵ گلۆفان ف نگا: هەڵ گلۆفان.

**هەڵ گلۆفین:** هەڵ گلۆفان ف نگا: هەڵ گلۆفان.

**هەڵ گوازتن:** ١) بەرەوژوور ڕاگوێزان: (ئاوێ لە بیر **هەڵ گوازە**)؛ ٢) هەڵ بواردن ف ١) بەبالا انتقال دادن؛ ٢) گذشتن از.

**هەڵ گواستن:** هەڵ گوازتن ف نگا: هەڵ گوازتن.

**هەڵ گوتن:** پێداهەڵدان ف ستودن.

**هەڵ گوزان:** بەرەوژوور گوازتنەوە ف بەبالا انتقال دادن.

**هەڵ گوزان:** هەڵ نۆزان ف جفتك پرانی و رمیدن.

**هەڵ گوزانن:** هەڵ نۆزاندن ف جفتك پراندن و رمیدن.

**هەڵ گوزین:** هەڵ گوزان ف به بالا منتقل کردن.

**هەڵ گوستن:** ئاوهەڵ کێشان ف بالاکشیدن آب.

**هەڵ گوستن:** ڕاگوێزان ف انتقال دادن.

**هەڵ گوسیار:** وشەیەکە بۆ بانگ کردنی گەمەکەر وانا: کێ دێ یا بێ ف ندا برای شرکت بازیگران در بازی.

**هەڵگوش:** هەڵکوش ف فشردن و مچالەکردن.

**هەڵ گوشان:** هەڵ کوشین، کوشین بەتوندی ف فشردن شدید.

**هەڵ گوشین:** هەڵ گوشان، هەڵ کوشین ف فشردن با فشار زیاد.

**هەڵ گولۆفان:** هەڵ گلۆفان ف نگا: هەڵ گلۆفان.

**هەڵ گولۆفتن:** هەڵ گلۆفان ف نگا: هەڵ گلۆفان.

**هەڵ گولۆفین:** هەڵ گلۆفان ف نگا: هەڵ گلۆفان.

**هەڵ گەران:** ١) هەڵچوون بە دارو بلندیدا: (بە دار **هەڵگەڕا**، بە چیا **هەڵگەڕا**)؛ ٢) ڕۆیشتنی جانەوەر بە لەشدا: (ئەسپێم پێ **هەڵگەڕا**، دڕپشکێکم پێ **هەڵگەڕا**)؛ ٣) خراپ بوونی شیر لە کوڵاندا: (شیرەکە **هەڵ گەڕاوە**) ف ١) بالا رفتن از بلندی؛ ٢) عبور حشره بر تن جاندار دیگر؛ ٣) بریدن و خراب شدن شیر هنگام جوشیدن.

**هەڵ گەڕاندن:** ١) وەرگەڕاندن؛ ٢) بەرەوژوور سوڕاندن؛ ٣) بەرەوژوور گەباندن: (پەز **هەڵ گەڕێنە** چیا) ف ١) واژگون کردن؛ ٢) بەبالا چرخاندن؛ ٣) بەبالا رساندن.

**هەڵ گەرانـدنەوە:** ١) وەرگێڕان؛ ٢) برینی لە پەژیوان کردنەوە ف ١) زیرورو کردن؛ ٢) کنایە از پشیمان کردن.

**هەڵ گەرانەوە:** هەڵ گەڕاندنەوە ف نگا: هەڵ گەڕاندنەوە.

**هەڵ گەرانەوە:** ١) ژێروژوور بوون؛ ٢) بڕیتی لە پەشیمان بوونەوە ف ١) زیرورو شدن؛ ٢) کنایە از پشیمان شدن.

**هەڵ گەڕاو:** ١) شیری بزرکاو؛ ٢) پێستی پڕ لە دومەڵ و زیپك، داگەڕاو: (لەشی بە زیپکان **هەڵ گەڕاوە**)؛ ٣) داقناو بە ئەسپێ و زیندەوەر ف ١) شیر بریدە؛ ٢) پوست پر از دمل و جوش؛ ٣) پوست پراز حشرە.

**هەڵ گەڕاوە:** ژێروژوورکراو ف زیرورشدە.

**هەڵ گەڕباگەوە:** لە دۆستی پەشیمان ف روگردان، از دوستی پشیمان.

**هەڵ گەڕیانەوە:** هەڵ گەڕانەوە ف نگا: هەڵ گەڕانەوە.

**هەڵگێڕ:** ١) گوازتنەوە: (ئەم هەمو **هەڵگێڕوەرگێڕە**ی بۆ پێدەکەی)؛ ٢) ژێروژوورکردن؛ ٣) وەرگەڕێن ف ١) انتقال دادن؛ ٢) زیرورو شدن؛ ٣) زیروروکنندە.

**هەڵ گیران:** ١) ڕاگیران؛ ٢) شاردرانەوە؛ ٢) ڕفانی ژن ف ١) نگهداری شدن؛ ٢) وسیلۀ کسی پنهان شدن؛ ٣) ربودەشدن زن.

**هەڵ گێڕان:** وەرگێڕان، نخوون و سەروژێرکردن ف زیر وروکردن.

**هەڵ گێڕانەوە:** ١) وەرگەڕاندن؛ ٢) پەشیمان کردنەوە ف ١) برگرداندن، زیروروکردن؛ ٢) پشیمان کردن.

**هەڵ گیراو:** ١) داندراو بۆ ئاگالێ بوون؛ ٢) شاردراوە؛ ٣) ژنی ڕەوێنراو؛ ٤) بەرزەوەکراو ف ١) نگهداری شدە؛ ٢) پنهان کردە؛ ٣) زن ربودە شدە؛ ٤) برداشتە شدە.

**هەڵگێڕوەرگێڕ:** ١) ژێروژوورکردن؛ ٢) بڕیتی لە جوڵانەوە: (پیر بوە **هەڵگێڕوەرگێڕی** پێ ناکرێ) ف ١) زیروروکردن؛ ٢) کنایە از جنبش و تحرك.

**هەڵگێڕوەلگێڕ:** هەڵگێڕوەرگێڕ ف نگا: هەڵگێڕوەرگێڕ.

**هەڵ گێڕەوە:** وەرگەڕێن ف زیروروکنندە.

**هەڵ گیریاگ:** هەڵ گیراو ف نگا: هەڵ گیراو.

**هەڵ گیریان:** هەڵ گیران ف نگا: هەڵ گیران.

**هەڵلا:** ١) هەراو زەنازەنا؛ ٢) وتەی سەبرمان و پەسندکردن: (**هەڵلا** لەو جوانیە)؛ ٣) بەرەوژوور؛ ٤) لرفەی خواردن؛ ٥) گەرمی داوەت و

